* ناوی کتێب: ئەندێشەو هونەر لەپێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا
* شوکر مستەفا
* گفتوگۆی: سەرۆ قادر
* پیتچنینی : شیلان جەلال
* هونەرکاریی بەرگ: محەمەد قادر
* نەخشەرێژی ناوەوە: رێبوار کەریم وەلی
* چاپ : چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین

# نێوەرۆک

# کوزارش و
# شاهیدییەک

من هەرکە مامۆستا شوکور مستەفام بۆ یەکەمجار دیت، لە خۆمدا کەوتمە کێشەیەکی گەورە؛ منێك وام دەزانی ئەو کوردیزان و وەرگێڕێکی گەورەیە، چونکە هیچ نووسینێکی ئەوم لەسەر بیروئەندێشە نەخوێندبۆوە و نەمدەزانی لە بواری فەرهەنگ و فەلسەفەدا چەند قاتی ئەوەی کە پێناسراوە شارەزا و بلیمەتە. حەزم لە مەدح کردن نییە بەڵام توانایی مامۆستا لەو بوارەدا کە کەمتر پێناسراوە، وامڵێدەکات بێ ڕوودەوایسی بێژم شوکور، لە بێبەختیی ئێمە ئینجا خۆی؛ بە هەڵە هەموو تەمەنی بە وەرگێڕانەوە خەریك کردووە. تێشمدەگەن کە قەت مەبەستم کەمکردنەوە لە بایەخی وەرگێڕانەکانی نییە.

بەڕاستیش تا پێش ساڵی ١٩٩٧ کە مامۆستا بە یەکجاری بەغدای بەجێهێشت و هەولێری کردە مەفتەن، بواری ئەوەی بۆ نەڕەخساوە بەبێ ترس و منەت، دەستان لە فەرهەنگ و فەلسەفە تاو بدات. ئەوە تەنیا چارەنووسی وی نەبووە بەڵکو ئەو کاروانە تەپ و تۆزاوییەی کە دەیانی وەك ئەو تەمەنی خۆیان لە ناو گەردەلوولی زەمان بڕینیدا دەبردەسەر، لە خۆیدا

نوقمـی دەکـردن و ناچـاری دەکـردن لـە پەرۆشـی سـەرەکی خۆیـان دوورکەونەوە و بە چەنگەچرەی دیکەوە سەرقاڵ بن.

هەر کە بۆ جاری یەکەم بیستم هاتۆتە کوردستان، خۆم گەیاندێ و لە هوتێل شیرین پالاس وێرای چەند ڕووناکبیرێکی دیکە لـە دەوری مێزێکی زل وەکۆبووین؛ ئەو قسەی دەکرد و جارجـاریش دەیکـردە نوکتەگێڕانـەوە، دەیگەیاندە سنووری گاڵتە و زۆربەی قونکی قسەکانیشـی بـە (چـوزانم)ێك بەجێ دەهێشت.

هەر ئەو کات گۆڤاری (ڕامـان)م تێگەیاند کە گفتوگۆیەکی تێروتەسەلی لەگەڵدا بکەن و ئەو بەشەشی کە لە گۆڤارەکە زیادە وێرای سەرجەمی دیدارەکەی بکەن بە کتێبێك و دواجاریش لە هاوینی ١٩٩٨ لە دەزگـای ڕۆشـنبیریی گـوڵان بڵاومـان کـردەوە. برایـان مـەحموود زامـدار و ئـازاد عەبدلواحید کارەکەیان بەڕێوەبرد. پێش ئـەویش خـۆم گفتوگۆیەکی دیکەم لەگەڵدا ساز کرد و لە هەفتەنامەی (گـوڵان)دا بڵاوکرایەوە. جیـا لـە گۆڤـاری گـوڵان العربـی، رادیۆ و تەلـەفزیۆنی گـوڵانم تێگـەیاند زنجیرەیـەك بـاس و گفتوگۆی لەسەر زمان و فەرهەنگ لە تـەکدا ساز بدەن. لـەوێدا کـاك ئـەمیر فندی کارەکەی بەڕێوەبرد. دواجار خۆشم لە چەند دیدارێکـی تەلـەفزیۆنیدا - کە لە یەکێکیان هەمیشە زیندوو مامۆستا مەسعوود محەمەدیش بەشـدار بـوو - درێژەم بە باسەکان دەدا. کار وای لێـهات مۆنتـێری تەلـەفزیۆن کـە خـۆی دەیگوت تێناگەم ئەم پیرەمێردە بۆ هێندە دێننە ناو بەرنامەکان، هەر کە لە پەردەی تەلەفزیۆنەوە پیرەمێردی دەدیت، دەیگوت: شوکور باشی مستەفا.

ئەوانە هەموویان دڵی منی ئاو ئەدا و ئەگەیشتمە قەناعەت کە دەبێ مامۆستا شوکور هەر ئەوەندەی لە باراندابێت. دیدارمان فرەببوون، هەر کە بە فرێك قورگی تەڕ دەکرد، من یەك دوو پرسیارم لێدەکرد و ئەو دەبۆوە. زۆر جارانیش دەیگوت: کوڕی خاس خۆ ئەگەر تەسجیلێکت دانابا ئەم باسەمان لە هەموو جاران بە پیێزتر دەبوو. لێ من پەلەم لە تۆمار کردن نەبوو، گەرەکم بوو لێی شارەزا بم و تێبگەم سەرگەی دەریاچەکەی لە کوێ پەنگاو دەداتەوە. ئەم بەزمە شەش ساڵی رەبەق بەردەوام بوو. بەرێز سەلاح بەدرەدین بە گاڵتەوە دەیگوت: وات کرد هەموومان بەجیدی ببینە موریدی شێخ شوکور مستەفا. شوکوریش دەیگوت: جا من خۆم چم، تا موریدم هەبن. کێشکە دەبێ گۆشتاوی چبێ جارێکیان گوتم: نا نا هەی. دەستێکی بە ریشە هەڵپاچراوەکەیدا هێنا: کوڕە چوزانم.

ساڵێك لەوەوبەر، رۆژانە و بۆ ماوەی سێ مانگ سەر لە بەیانیان خۆم و رێکوردەرێکی بچووك دەچوومە لای، نەك لە نادی و لە ماڵان، بەڵکو لە ژوورە بچووکەکەی ئەو لە کۆڕی زانیاری دەستمان بە قسان دەکرد. من پرۆژەیەکی فکری و فەرهەنگی و فەلسەفی بیرلێکراوم چنیبوو کە شەش ساڵ بوو کارم تێدا دەکردو دەمزانی مامۆستا حەز لە دەربڕینیان دەکات. پرۆژەی گۆرین بووە نەخشەی ئاپارتمانێکی فەرهەنگی کە وەستایەکەی کارامەیەکی تەمەن هەشتا ساڵانەیە، ئەویش ئەم کتێبە و نووسەرەکەی شوکور مستەفایە.

گفتوگۆکان لەلایەن چەند لاوێکی رووناکبیر بە پوختی دەخرانە سەر کاغەز، دوای ئەوەی خرانە سەر کومپیوتەر، پرسیار و وەڵامەکانم دایەوە دەست

خۆی. دوای گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوانماندا، قەناعەتی هات سەرلەنوێ دایڕێژێتەوە و دۆڵەمەندتری بکات. لە خۆشیان لەسەر پارچە کاغەزێکی بچووک بۆم نووسی: هەر بژی پیرەمێردی ئازا.

پیرەمێرد کەوتبووە ناو ئیشەکە و شەووڕۆژ وردەکاریی تێدا دەکرد. بەرهەمی ماندووبوونی ئەو بووە ئەم کتێبەی بەردەستتان کە پێموایە بۆ یەکەم جارە بیرمەندێکی کورد بە شارەزاییەکی شاهیدی بۆ دراوەوە کار لەسەر بنەماکانی فکر و فەرهەنگی کوردان دەکات. لێرەدا زمان، ئەفسانە، دین، تەسەوف، هونەر، مێژوو، میللەت ئەوجا مۆدێرنیتە و تەئویل و پۆست مۆدێرنیزم لێیان کۆڵدراوەتەوە. مامۆستا شوکور لە ڕوانگەی خۆیەوە شانی داوەتە بەر بژار و چاکسازی ناو فەرهەنگی (کەلتوری) کوردی و سەرەتای پرۆسەیەکی مەزنی بنیادناوە کە لە خانەی لێکۆڵینەوە، ڕەخنە، دارشتنەوەدا تئۆریزە دەکرێ.

لە ١٨/ئەیلولی ٢٠٠٣دا، پیرەمێرد لە تەمەنی هشتا ساڵیدا، سەعات شەشی سەر لەبەیانی، زۆر بە زەحمەت دوا پشووی دایەوەو ئیتر وەرینەگرتەوە، چاوەکانی لێکنان بەڵام دەمی خۆی دانەخست. کاتێك گەیشتمە سەری ئاوها بوو وەك باسی دەکەم؛ هەردوو دەستیشی بە حاڵەتی قسەکردن قرژ ببوون، ڕێك وەك هەمیشە. ئەوەی پێیاندەگوت شوکور مستەفا– وەك خۆشی دەیگوت نازانم من کێم و چیم– ئاوها دنیای بەجێهێشت. ڕۆژی ١٤/ئەیلول، لە تەلەفۆندا بانگی لێکردم: ئەرێ ئەوە لەکوێی لێمان بووی بە هەنارە خۆشە؟ بە تەواوی دیار بوو پشوی هەڵماڵدراوەو قسەی باش بۆ نەدەهات.

گوتم : خێرە وا دەنگت گۆڕاوە؟ پێیگوتم: ئۆکسیژنم لێ قاتی بووە، دەتوانی سەرێکم لێبدەی؟

لە کۆڕی زانیاری بوو، دەرگای ژوورەکەیم کردەوە، لەپشت مێزە زل و قەرەباڵغەکەی کورژ دانیشتبوو. تاوتوێی دوا کتێبی نووسراوی خۆی( ئەمەی بەردەستتان) دەکرد کە منیش لە ئامادەکردنیدا هاوکاریم دەکرد. وەك هەمیشە دەیویست پێشوازیم بکات و لە شوێن خۆی رابێت، لێ دیار بوو تاقەت یاری نەدەکرد. خۆم گەیاندێ و نەمهێشت هەڵسێتە سەر پێ. خەمی ئەوە بوو نەیتوانیوە ئەندیکسی ناوەکان و سەرچاوەکان و فەرهەنگۆکی زاراوەکان ئامادە بکات. گوتی: سەگبابخێوە ئەم سینگەم نایەڵێ ئیش بکەم، هەناسەم نایەتەوە.

رەنگی بزرکا بوو، سپی وەك کەللە قەندی مێندوئاوی لێهاتبوو. جلەکانیشی وەك رۆژان پۆشتەو شیك نەبوو، تەنانەت پرچی خوشی دانەهێنا بوو. ئەو بە هەناسەبڕکێ دەیەویست تێمبگەیەنێ کە دەبوا کاری کتێبەکەی بە کۆتا گەیاندبا و منیش بە پەلە کاغەزەکانیم کۆکردەوەو خستمە ناو کارتۆنێك و پێیمگوت: عایدی من، هەستە با بچینە لای دکتۆرێك. لە رێگا دەم دەم دەیگوت: من لە مردن ناترسم بۆ هێندەم خۆ پێوە ماندو دەکەی؟

لە نەخۆشخانەی کۆماری، خێرا فەحسیان کرد، دکتۆر پێیگوت: دڵت زۆر باشە، تەنیا پێویستت بە ئیستراحەتە. لە پاشنیوەرۆکەشدا سەردانی دکتۆری هەمیشەیی خۆیمان کرد، ئەویش هەندێك دەرمانی بۆ نووسی و هەمان پێشنیاری پێکرد. رۆژی یەکشەممە، لە ماڵەوەیان تەلەفۆنیان کرد: مەلا داوات ئەکات.

دیتم حاڵی قسە کردنی نیە. چوومەوە لای دکتۆرەکەی. گوتم من فلانیم و تەندروستی مامۆستام بەلاوە گرنگە، وێدەچێ حاڵی باش نەبێ. دکتۆر بە مۆرەیەکەوە گوتی: بچۆ داخڵی بکە. کە ژووری عیادەکەم بەجێهێشت، لای دەرگاکە ئاوڕێکم لێیدایەوە، ئەویش لە پشت عەینەکە زلەکانیەوە لە منی دەنۆڕی. قەت نەمدیتبوو، لێ ئاکاری لە نەیارێکی سیاسی دەچوو نەك پزشکێکی مرۆڤدۆست. پێش بەجێیبێڵم گوتم: ئەوە من هیچ، جەنابت مامۆستا شوکور دەناسی؟ گوتی: ئەدی.

مامۆستام تێگەیاند کە دەبێ داخڵی خەستەخانە بێت و عینادیمان لەگەڵ نەکات. حاڵی شپرزە ببوو، سەرو پێی خۆی پێڕانەدەگیرا، هەناسەبڕکێی بوو. بە لۆژە لۆژ چاکەتەکەی خستە سەر شان و هەر بە تراکسودەوە پێشمکەوت. گوتم ئەی پانتۆڵەکەت؟ بە بۆڵەیەکەوە: ئەدی لەوێ هەر فڕەی نادەم؟. گوتم: نابێ، ئەوە پڕۆتۆکۆلە خۆ بە قسەی تۆ نیە. لەگەڵ هەڵکێشانی پانتۆڵەکەی، لە بن لێوان خەندەیەکی بە خینکەخینکی هەناسەبڕکێی هاتێ.

لە نەخۆشخانەی رزگاری، دکتۆرێکی گەنج هەردووکمانی ناسی، لە راپەڕاندنی پێداویستیەکان کوتایی نەکرد. دکتۆرێکی دیکە ئافرەت بوو، هات ناو و پێناسەکانی دیکەی لە فایلەکەیدا بنووسێت. پرسی ناوت چیە مامە؟ منیش لێی چوومە پێشەوە: جارێ پێش ئەوەی ناوی مامە بنووسی، تۆ رۆمانەکانی یەشار کەماڵت نەخوێندۆتەوە؟ ژنە ئەم قسەیەمی پێ سەیر بوو، وەڵامیدامەوە: من هەر کوردی ناخوێنمەوە.

مامۆستا شوکور، هەرچەند سات بە سات بەرەو پەشێوی دەڕۆیشت، دەستێکی لێهەڵوەشاندم و ئیشارەی بۆ دەمامکی ئۆکسیژنەکەی سەر دەمی کرد کە لایبدەم. کاتێك دەمی بۆوە گوتی: ئەو دەمامکە دەڵێی پوزبەندی سەر قەپۆزی ئەو هێسترانەیە کە بۆ خەساندن دەیانخەن. ئەوجا خەندەیەکی کرد. منیش گوتم: دەڵێی زۆربای یۆنانیت تا دوا هەناسەش هەر پێدەکەنی.

هەرچەند بەجێمهێشت چونکە دەبوو ئیستراحەت بکات، بەڵام زۆر نیگەران بووم. دەستی کوڕە مێرمنداڵەکەی خۆمم گرت و لە دەرگاکە هاتمەدەرەوە. سەهەند پرسی: بابە بۆ کەس بۆ نیگەرانی لەبەر دەرگا نەوەستاوە؟ ئەی بۆ لە ئێران بۆ شاملۆ و شەهریار خەڵك بەردەرگایان گرتبوو، لە تورکیاش کە شەعبان مرد ئەو هەمووە بۆی دەگریان.

لەسەرەوەڕا تەماشایەکی سەهەندی بچکۆلانەم کرد، بەهێواشی دەستیم گوشی بەڵام قسەیەك نەبوو بیکەم. لەبەر دەرگاکە دوو پیرەژنی نەخۆش درێژ ببوون، کاتێك لەگەڵ مامۆستا دەچووینە ژوورەوە، ئەوان هەر لەوێ بوون. سەرباری حاڵی خۆی گوتی: کە ئەوانە دەبینم بۆ دایکم ئاگرم لە هەناوان بەردەبێ، ئەویش ئاوها لەبەر پەساران گیانی دەرچوو.

بەرێگاوە کە دەمبرد، گوتی دنیایەو هەڵنەستامەوە، با چەند وەسیەتێکت لەلا بکەم، لەوانیش: ئەمن لە ژیانمدا خۆشیم نەدیت، لە ماڵەوە تا شوێنی کار، ئازاری خەڵکم نەداوە کەچی هەر لەخۆوە دژایەتی کراوم. کەم کەس لێمتێگەیشتووە، بۆیەش دایم لەم دنیایە بە باغی ناسرام و دنیاش بە هەموو سەختی خۆی بە رووومدا رادەپەڕی.

پیرەمێردی زانا، دوای هەشتا ساڵ ژیان، نووسین و وەرگێڕانی دەیان کتێب و سەدان وتارو لێکۆڵینەوە، لە کاتێکدا لەسەر گردێکی بەرزی زانین وەستابوو، ئازارێکی باس دەکرد کە من دەبێ زۆر هەوڵبدەم تا تێیدەگەم. ئەندیشەکانی ئەو شیوەنی ئینسانی بوون. شوکور مستەفا رۆژگار ناچاری کرد لە کاری نووسیندا بە لاڕێوە خەریك بێت، ئەگینا سەرباری بایەخی بەرزی وەرگێڕانەکانی، دەبوا ئەو بە نووسینەوە خەریك بێت، لێ لە بێشانسی خۆی و میللەتەکەی هەر ئەوەندەی رێگا دەدرا کە دەیکرد و وەریدەگێڕا. زاتی شوکور مستەفا بیرمەند بوو نەك وەرگێڕ، مامۆستا بوو نەك گوێگر، فەیلەسوفێك بوو کە تەنیا لە ساڵی کۆتایی ژیانی بە جدی بە کاری خۆیەوە خەریك بوو؛ ئەویش لێکۆڵینەوە لەسەر فکر و گۆڕانکاری کۆمەلایەتیە. بیروڕاکانی شوکور مستەفا زوو یان درەنگ جێی خۆیان لە ناوەندە زانستیەکان دەکەنەوەو ئەوەی ئەو پێیوابوو لێیتێناگەن، دەبێتە هەوێنی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی میللەتەکەی.

ئەو بەیانیە بە تەلەفۆنێك لە خەو هەڵسێندرام، کە لە هۆدەکەی نەخۆشخانە وەژوورکەوتم، پەتویەك بەسەر سەریدادرابوو، تاڵێك لە پرچە سپیەکەی بە ئاڵۆزی بەدەرکەوتبوو. ساتێك وەستام، بە ئەسپایی نێوچاوانیم ماچ کردو چەند دڵۆپێك

لە کۆتاییدا دەبێ سوپاسی ئەو تاقمە لاوە رووناکبیرە بکەم کە لە کارە تکنیکیەکانی ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا هاوکارییان کردم: رێبوار کەریم وەلی لە هەڵەچنی و پێداچوونەوەدا هاوکاری کردم و تمایەی ناو و زاراوەکانی

دروست کرد و نەخشەڕێژی ناوەوەی ئەنجامدا، سەلام سەعدی، جەلیلی عەبباسی، بەکر ئەحمەد لە ڕوونووس کردنەوەی گفتوگۆیەکاندا بەشدار بوون، هەروەها شیلان جەلال تایپیستی کارەکانی مامۆستا زۆر ئاسانکاری بۆ کردم.

سەرۆ قادر

٢٠٠٢/١١/١٠ هەولێر

گەردوون و مرۆڤ: تا ئەمڕۆ قوتری جیهانی بێ پایان، بە نزیکەی ٧ تا ٨ ملیارد "ساڵی ڕووناکی" لێکدراوەتەوە.

ملیاردها کاکێشان کە هەریەك میلیۆنها ئەستێرەی دە قەڵەمڕەودان، لە نێو هێدرۆژێن و گەرددا لە بزووتنەوەدان. لە کۆمەڵێکدا لە بیست کاکێشان، کاکێشانێ هەیە کە "ڕێگای شیر"ی پێ دەگوترێ و ئەو کۆمەڵە شێوە هێلکەییە لە ملیاردها ئەستێرە پێکهاتووە بە خێراییی کە هەرگیز بە خەیاڵدا نایە، لە فەزای بێ کەنار و بێ سەرحەدوسنووردا لە بزووتنداں. قوتری گەورەی ئەم "هێلکە"یە تەنها سێ هەزار و قوتری چکۆلەکە پازدە هەزار ساڵ ڕووناکییە.

لە یەکێ لە "باڵ"ی شێوە مارپێچییەکانی ئەم "هێلکە"یە ئەستێرەیەکی چکۆلە هەیە کە هەر ٢٠٠ میلیۆن ساڵ جارێ بە دەوری چەقی خۆیدا دەگەڕێ و ئەمە خۆرە. بە دەوری خۆردا ٩ ئەستێرەی گەڕۆك لە خولانەوەدان و "هۆنراوەی خۆری" لەمە پێك دێ. زەوی کە بۆ خۆی یەك میلیۆن جار لە خۆر چکۆلەترە، یەکێ لەم ٩ گەڕۆکانەیە.

نزیکەی ٢٥٠٠ میلیۆن ساڵ بەسەر تەمەنی زەویندا تێ دەپەڕێ. ئەمە لە سەرەتاوە کۆمەڵێ لە گازی داخ بوو، پاشان بوو بە شلەیەك و دوایی وردە - وردە کاژە بەستەڵەکێ دایپۆشی. میلیۆنها ساڵ گۆی زەوین سەرتوویەکی ئەستوور لە هەڵمی ئاو دایپۆشیبوو. لەگەڵ ساردبوونەوەی زەویندا، نزمان و بەرزان پەیدابوون و بە ساردبوونەوەی ئاسمانی هەڵمی، ئۆقیانووسەکان و ڕۆخانەکان پەیدابوون.

له ژیان، نیشانەیێ، سەرەودەرێ نەبوو، دوور نییە لە هەلومەرجێکی تایەن (معین)دا گەشەکردنی پێکهاتنی کاربۆن کە بـوو بـە هۆی پێکهاتنی ئەمینـە (NH33) و پرۆتین، پێداویستییەکانی داهاتنی ماددەی زیندووی لەسەر زەوین ئامـادەکردبێ. وا دیـارە کـە یەکـەم زیندەوەرانـی گـۆی زەویـن جــۆرە ڤایرۆسهایێ پێکیانی هێناوە کە لـە نێـو ئـاودا بـە بێ ئۆکسیژین سـەربەخۆ ژیـاون. بـە ڕەوالێ ئـەم بوونەوەرانـە وەك مێنـدیێ گیـاوگۆلی یــەك خانــەیی ئەمرۆ، کە نەك تەنها بە بێ ئۆکسیژین دەژیێن، بـەلکو بلاویشـی دەکەنـەوە، دەچن. هەر هەمان بوونەوەر بوون کە دەورویەری سـازگار و هـەمواریان بـۆ گەشـەکردن و کـامڵبوونی پاشـانەکێی گیـاوگۆلێ و زینـدەوران لەسـەر ئـەم زەوینە خۆش کرد. هەلومەرجی کەشوهەوا و جوغرافیاییی زەویـن دەگـۆڕا و گەشەکردنی بوونەوەری زیندووش بەو جۆرە درێژەی دەدایێ، تا سـەرەنجام گوانداران پەیدابوون.

لە دوادوای سەرویەندی سێیەمی زەوین ناسـیدا، یـا سـەرەتای سـەرویەندی چوارەمدا، ڕاستییەکەییت گەرەکە جۆرە مەیموونەیلێ هەبووگن، کـە دەشـێ ئەمانە وە باپیرە گەورانی مرۆڤ لە قەڵـەم بدرێـن. دوور مـەڕۆ لـە باشـووری ئەفریقا کۆمەڵە هێسکێکی زۆر لە مەیموونەیلێ کـە بـە نێـوی ئوسـترالۆپیتیك (بە زمـانی یۆنـانی، مـەیموونی باشـووری Australopitiqu)ـەوە نێونـراون، وەگیر کـەوتوون. ئـەم مەیموونانـە لـە ئـاران و دەشـتی پـڕ دار و درەختـاندا دەژیـان، بەسـەر پێــوە دەوەســتان و دەڕۆیشــتن، زینـدەوەری چکۆلــە و گەورەیان ڕاو دەکرد و بۆ هەڵمەت و بەرگری لەخۆ، داردەستێ یـا ئێسـکێکی ئەستووری زەلامیان بە دەستەوە بەکار دەبرد، خۆراکی لـە بابـەتی گۆشـت،

بەسەر پاشووەوە ڕاوەستان و بەکار ئێخستنی ئەندامانی پێشەوە لەبۆ شت پێ گرتن، ئەمانە سەرلەبەر، بەلای گەورەبوونی مێشکیدای وەکێشا.

جا پرسی: داخوا ئوسترالۆپیتیك باپیرە گەورەی بێ چەند و چۆنی مرۆڤە یا لە پێوازۆی (وتـــیرە) پێکهاتنی مرۆڤدا (وەچەیێ پێك دێنیێ؟) قسەی بێ مشتومڕ ئەوەیە کە مرۆڤی بەردوارە - homm fassile - لەو مەیموونە ڕەسیوە هاوشێوانەی کە کۆمەڵە ئێسکەکانیان لە زۆر شوێنی ئەملاو ئەولای جیهانی کۆن، ئەمازا لە قەفقازدا، دۆزراونەوە، هاتووەتە گۆڕێ. لەنوای سەروبەندی چاردەمەوە (نزیکەی بەر لە میلیۆن ساڵی خشت) گەلەوڕانی مرۆڤەیلی سەرەتایی، جێی مەیموونەیلی مرۆڤ ئاسایی - Anthropoides - یان گرتەوە.

کێشەی ئەوەش داخوا لە کێهە ناوچەی دنیایێ پێوازۆی مەیموون بە مرۆڤ بوون، ڕووی داوە، ئەمە بگرەوبەردەی فرە لەسەرە.

برێ لە زانستمەندان بڕوایان بە ڕامانەی پۆلی ژنیسم - Polygenisme - هەیە. ئەم ڕامانەیە ئەوە دەگوردێنێ کە پێوازۆی مەیموون بە مرۆڤ بوون، شان بە شانی یەکدی لە چەند شوێنێ ڕووی داوە و مرۆڤ لەگەڵ جۆرەیلی جوێ-جوێی مەیموونا خزمایەتییان هەس. وەلێ زانستمەندانی ڕووس ئەی ڕامانەیە وە دما ئەدەنەوە، لە گۆشەنیگای ئەوانەوە، گۆڕانی مەیموون وە بنیادەم لە بەشێ لەسەر زەوینێکی پان و بەریندا کە ئاسیا، ڕۆژهەڵاتی نێزیك، پشت قەفقاز و ناوچە کاکی بە کاکییەکانی ئەفریقا، دەگرێتەوە، ڕووی داوە، زانستی ئەوڕۆ ڕێ خۆش دەکا کە بەرسڤی ئەم پرسە بە وردتر بدرێتەوە.

برێ لە لێوەکۆڵان، پەیدابوونی مرۆڤ دەبەنەوە سەر هۆکارگەلی بە ڕێکەوتی لە خواسایی بەدەر. وە نموونە: ئەکادیمیسیێن پ. سوشکین —

P. Soushkine - لە ناوچوونی جەنگەڵستان و لێرەواران بە هۆکاری چارەنووس دیاریکەر لە قەڵەم دەدا. بەڕای وی، گۆڕانی بارودۆخی دەوروبەر کە مەیموونی بە زۆرەملێ ناچار کردووە لەسەر بسات گوزەران بکا ئەم ئاکامەی لێ کەوتووەتەوە کە ئەندامانی لە یەکدی جوێ بکاتەوە و ناچاری بکا بە ڕاوەستانەوە لەسەر هەردوو لاقی بڕوا. ئەم تێئۆرینە، ڕامانەی گۆڕانی ڕێکوپێکانەی مەیموون بە مرۆڤ بوونی بەرپەرچ داوەتەوە. شرۆڤەی زانستمەندانەی ئەم دیاردەیە لە سای فەردریک ئەنگلسەوە لە کتێوی ئەخش و کاریگەریی کار لە گۆڕانی مەیموون بە مرۆڤدا، بە ڕوونی نووسراوە. خاوەن کتێوەکە دەڵێ، "کار" لە گۆڕانی مەیموون بە مرۆڤدا هۆکارێکی ڕەسەن و کاریگەرە. دەڵێ خودی مرۆڤ "کار" گووراندوویە و هێناویتیە گۆڕێ. (1)

---

وێنەکێشانی واقیعییەتی دەرەکی و کۆمەڵایەتی لە ڕەنگدانەوەکانی زەیندا، وەک چاوی کامێرا بە شێوەی ئاوەژوو بەدیاردەکەوێ. بە نەقڵ لە مارکسەوە، لە هەموو ئایدیۆلۆژییەکاندا بە تەمی، مرۆڤەکان و هەلومەرجەکانی وان، بە ئاوەژوو دەبیندرێن، کوتومت هەروەک لە دارک ڕووم (ژووری تاریکی وێنەکێش بۆ فیلم شوشتنەوە)دا ئەنجام دەدرێ". مەبەست ئەوەیە کە هۆکار (علە) لە شێوەی ئەنجام (معلول) و ئەنجام لە شێوەی هۆکاردا بەدیاردەکەوێ، یان بڵێین: سەرخان خۆ بە ژێرخان دەنوێنێ ((The German Ideology, New York, P. 14..) (لە هێندێ هەلومەرجی کۆمەڵایەتیدا ئەم جۆرە ئاوەژووبوونە لە تەواوی بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا هەڵ دەکەوێ. لە ئابووریی بازاڕی و پووڵیدا، هۆکار و ئەنجام بە ئاوەژوو یە دیاردەکەون. مارکس لە کتێبی سەرمایەدا ئەم مەسەلەیە لە باسی کاڵادا دێنێتەپێش. کێشە و هەرای نێوان چینەکان لە شێوەی ئاوەژوویدا دە شێوەی کێشە لە نێوان ئەسڵە سیاسییەکاندا بە دیاردەکەوێ. هەروەک ئەسڵە مافەکییەکان جیلوەی واقیعییەتی ئابوورییە، واتە: ڕەنگدانەوەی واقیعییەتی پێوەندییە ئابوورییەکان لە شێوەی ئەسڵە مافەکییەکاندا بەدیاردەکەوێ، لە ئەنجامدا مافناس وا دەزانێ کە دەگەڵ ئوسوولە پێشەکی دراوەکان (پێشتر هەبووەکان)دا سەروکاری هەیە، کەچی ئوسوولەکە کوتومت ڕەنگدانەوەی ئابوورییە. ئایین و فەلسەفەش بە لای ئەنگلسەوە، نموونەگەلێکی دیکە لە ئایدیۆلۆژین، واتە: پێوەندییان دەگەڵ بنیاتی

ئابووریدا هەر بە تەواوەتی فەرامۆش دەکرێ. باشە ئەم ئاوەژووکارییە ئایا خوایشتانەیە یان ناچارییە؟ لەم ڕووەوە مارکس و ئنگلس وەلامەیلێکی دووفاق و یەك لە شام و یەك لە حەڵەبیان دەدایەوە. ئەوان لە هێندێ شوێندا جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە ئاوەژووبینی کارێکی ناخوایشتانە و نائاگیانەیە و مرۆڤ لە ڕەنێوهێنانی ئایدیۆلۆژی و بە هۆی خۆیەوە ئاگادار نییە: "ئەگەر بە گشتی ئایدیۆلۆژیی خەڵك ئاوەژوو بەرچاویکەوێ، ئەم دیاردەیە لە پرۆسێسەکانی ژیانی مێژووبینەی وانەوە، هەروەك ئاوەژووبوونی چێتان لە شەبەکییەی چاو لە پرۆسێسەکانی ژیانی فیزیکیی وانەوە دێتەگۆڕێ". وێنەگرتنی واقیعییەت لە زەینی مرۆڤدا ئاوەژوو دەبێ، چونکە واقیعییەت بۆ خۆی ئاوەژووە. ئایدیۆلۆژی، وەك ئاگایی ئاوەژوو، بەرهەمی بارودۆخی مەوجوودی کۆمەڵایەتی و سیاسییە؛ چونکە ئەو بارودۆخە مەوجوودە، هەر بۆ خۆی دنیایەکی ئاوەژووە. ژێرخانەکە دە خودی خۆیدا دووفاق و تاکەوتاکە..

ئەم واقیعییەتە کە ژێرخانی مادیی دە بەرابەردا دەوەستێ و قەڵەمڕەو (مەلەکووت)ێکی سەربەخۆی لە ئاسمانان لێ پەیدا دەبێ (واتە: ئایدیۆلۆژی)، تەنها بەم ڕاستییە دەشێ لێك بدرێتەوە کە بنەمای ماددی بۆ خۆی پەراگەندە و یەك لە شام و یەك لە حەڵەبە (هەروەیەش، وێڕای پاسامەندیی خۆڕسك، هیچ چتێ بۆ ئامانجێکی پێشەکی بڕیاردراو، بە پێچەوانەی "ئامانجگەرییەکان" (غائیون)، نەهاتۆتەگۆڕێ و بە هیچ ئەقڵ و ئاوەزێکی پێشەکی بەرنامەی بۆ دانەڕێژراوە).

لە لایەکی دیکەوە، مارکس و ئنگلس لەمەڕ چییەتی (ماهییەت)ی "ئایدیۆلۆژیك"، بیروئەندێشەکانی مرۆڤ، بیروبۆچوونەیلێکی دووفاق و یەك لە شام و یەك لە حەڵەبیان هێنابووە بەرەوە. بە پێی ئەم بیروبۆچوونانە ئاوەژووکاریی واقیعییەت لە لایەن مرۆڤەوە خوایشتانەیە، واتە: کارێکی بە ئەنقەست و لە ڕووی فریودان، یان بۆ پاساودان و دەسپێچك هێنانەوەیە. بە ئەقڵ لە ئایدیۆلۆژیی ئاڵمانی: "بیروبڕوای چینی حوکمڕان لە هەر چەرخ و چاخێکدا، بیروباوەڕی حوکمڕانە. حوکمڕانان بە ناوی چینەوە، وەك بیرمەند و ڕەنێوهێنی بیروئەندێشە حوکم دەڕانن و بەسەر ڕەنێوهێنان و دابەشکردنی بیروئەندێشەکانی چەرخ و چاخی خۆیاندا، هەر خۆیان دەسەڵات بەدەستن (Ibid , P.39). هەروەها مارکس و ئنگلس باسی چینێکی وا دەکەن کە کار و ئەرکی سەرشانیان پڕوپووچ (أوهام) هەڵێنان و ڕەنێوهێنانە (Ibid, p. 40). ئەم بەشە بەرژەوەندییەی چینی حوکمڕان بە ناوی بەرژەوەندیی گشتەوە، پاکانە بۆ خۆی دەکا. هەروەها لە ئایدیۆلۆژیی ئاڵمانیدا قسە لەمەڕ چۆنیەتیی پێکهێنانی ئایدیۆلۆژیی درۆزنانە و ساختە دەکرێ. چینی حوکمڕان شموولییەت و ڕەوایی بە بەژنی بیروبڕوای خۆی دەبڕێ و تەنها بیروبڕوای ئاقڵانە و بەوەجی دنیایی تیلقینە دەدا. ئایدیۆلۆژیی درۆزنانە و ڕووکەش لەسەر بنەمای بە وەستایانە و ئاگادارانە و فرۆفێڵاویانە پڕوپووچ ڕەنێوهێنان، هەڵ دەنرێ.

"هەرچی ئەو بیروباوەڕە، زێتر بە ناوی دروودەلەسە و ساختەچێتییەوە مەحکووم کرێ و کەمتر قەناعەت بە مەعریفییەت بکا، بە جەزمییەت و دۆگماتییەتێکی گەرموگوڕترەوە بە کەشکەلانی ئاسماندا بەرزدەکرێتەوە و پتر تاسولووس و تیفتیفەدەدرێ و زمانی کۆمەڵی بەستەزمان هەرچی زێتر و تادێ فریوئامێز و پاساوگەرانەی لێدێ" بە هەر حاڵ، لە ڕوانگەی مارکس و ئنگلسەوە، چ بە شێوەی ناچاری و لە خولیشت بەدەر و چ بە شێوەی بەدەستەخۆ و خوایشتانە و فریوئامێز، واقیعییەت ئاوەژوو، بەدیاردێنی. بەڵام لە مارکسییەتی ڕووسی ـ مارکسیسزم ـ لێنینیزمدا کە ئایدیۆلۆژیی دەوڵەتی سۆسیالیستی بوو، بە ڕەنگدانەوەی کوتومتی واقیعییەتی مێژوویینە (ئەوەی کە بە قۆناخەکانی خۆیدا دەڕوا و بە خۆڕسک گەشەی کردووە) دەسەلمێندرا، نەک ئاوژووکاریی وی. ئوسووڵی بیرونەدێشەی مارکسیستانە کە لە بنەڕەتەوە بە ناوی ڕەخنەیێ لە واقیعییەتی مەوجوود مەترەح کرابوو، لە مارکسییەتی ڕەسمیی ڕووسیدا بە ناوی ڕاستینەکانی لەمێژووبەدەر و سەروو نەقڵانی، خرایەگۆڕێ. ئەو چەکانەی کە لە بنەڕەتدا بەرهەمی هەلومەرجی مێژوو بوو و بوون و نەبوونی بە هەلومەرجەوە شەتەک درابوون، بە چەمکانێکی بێ سەرەبەرەوسنوور (مطلق) لەقەڵەم دران. مەنتیقی دیالێکتیکی مارکس لە مارکسییەتی ڕووسیدا بوو بە مەنتیقێکی ڕەواڵەت (شـــــکلی) و ئایدیۆلۆژیی کۆمۆنیستی بە پێناسەی ڕەنگدانەوەی دروستی پێوەندییەکانی کۆمەڵایەتیی "ڕاستەقینە" ناسێندرا.. مارکسییەتی ڕووسی، ڕاستیت گەرەکە، دەیگوت: جیاوازیی ئایدیۆلۆژیی زانستانە و نازانستانە وەک جیاوازیی ئاسمان و ڕێسمانە، بەڵام لەو بڕوایەدا بوو کە زانستانەبوونی ئایدیۆلۆژییەت لەسەر بنەمای ناسینی بەرچاو قابیلی ئیسپاتکردن نییە و بە هیچ پشتڕاست ناکرێتەوە. ناسین (معرفە)ی ئیسپاتی (پۆزیتیڤیستی)، تەنها هەر واقیعییەت ئاشکرا دەکا و بەس، نەک "ڕاستی" (جیاوازیی واقیعییەت و ڕاستی بە لای مارکسییەکانەوە ئەوەیە کە واقعییەت بەبێ خولیشتی من و تۆ و هەرچی مرۆڤی دنیایێ هەن، بوونیان هەیە، بەڵام ڕاستی دەخڵی بە خودی واقیعییەتەوە نییە، بەڵکو بەبیروبۆچوونی خەڵکانەوە، هەیە، کاتێ دەگوترێ ئەوە: "ڕاستە، یان ڕاست نییە" واتە: ڕادەی دەرکی مرۆڤ و ئەندازەی تا چەند لە واقیعییەتەوە نزیک بوون دیارە هەر لەبەر هەندێکەش، ڕاستییەکان ڕێژەکی (نیسبی)ن.. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ڕاستی هەمیشە هەر بە ڕەهایی و موتڵەقی نامێنێتەوە: چونکە پێناوەکانی لە ڕاستیی موتڵەق گەیشتن، هێشتا بە ڕادەی پێویست فەراهەم نەبوون. ڕاستییە موتڵەقەکانی ئەمڕۆ دەبن بە ڕاستییە ڕێژەکییەکانی دواڕۆژ. زانستی بەرچاوەکی (عینی) دەبێ بە لەمپەر لە ڕێی لە جەوهەری ڕاستی گەیشتن. جا دەستنیشان کردنی ئەوە کە ڕاستی چییە، ئەوە کاری زانست نییە، بەڵکو ئەرکی سەرشانی پرۆسێسی مێژووە کە بە شێوەیەکی ئەسرارئامێز (رمزی) بە قیبلەنمای ڕاستی و ڕزگاری بەخش لەقەڵەم دەدرێ و بەم جۆرە

وەلێ ئەی کاری مرۆڤە لە کوێرا دەستی پێ کردووە؟ مەیموونان دەیان کاری تەوەنێ، کەوریێ، خرکێ، یان گالۆکێ، داردەستێ بە دەستەوە بگرن. مەیموونەکانی باشوور توانستی ئەی کارەیان هەبووگە، ئەما، هیچ مەیموونێ نەیتوانستگە تەنانەت ساکارترین ئامێر و ئەوزاریێ دروست بکا. خۆ هەر وە سازدان و دروست کردنی ئامێر و ئەوزارە، کە کار دەست پێ دەکا. وەبێ ئەوزار هیچ کاریێ ناکریێ. مرۆڤ وە ئەوزار و ئامێر قەرەبووی چنگۆڕك و کەلّبەی کردووەتەوە.

چالاکی دە کار و سازکردنی ئەوزار و ئامێرگەلی سەرەتاییدا دابەشبوونی کار و ئەرکەکانی دە نێوان ئەندامانی پاشەوە و پێشەوەدا، لێ دەکەوێتەوە. سازکردنی ئەوزار دەبێ بە ئەرکی تایبەتی ئەندامانی پێشەوەی و ئەم کارەش دەبێ بە مایەی ئەوە کە دەسوبرد و مەهارەتی وان پەرە پێ بدا و بگۆڕێن بە دەست. بەم پێیە دەست نە تەنێ پێناوی ئەنجامی کارە، بەلّکو بەرهەمی کاریشە". .

بەرە – بەرە کە دەستی مرۆڤ بە کارەوە پتر ڕادێ و مەهارەت و دەستوبرد زێتر دەردەست دەکا، خوو و خدەی بەسەر پێوە ڕاوەستانەوە، بەرێوەڕۆیشتنەوەی تا دێ بەهێزتر و بەگوردتر دەبێ. جا ئەی کارە وە نۆرەی خۆی لە سەرێکەوە بە لای ڕەسیوی و کامڵ بوونی دەستیدا دەشکێتەوە و ئەمانە لە جێوەجێکردنی چالاکییەکانی بابەتی کار

---

بیروبروا ستالینانەیە بناخەی کلێسەی پرۆلیتاریایی لێ دەدرێ. مارکسیزم - لینینیزم بە ناوی سیکرلاستیزمی پرۆلیتاریا، یان نوسوولی پیرۆزی ئۆلی ستالینیستییەوە لە گوێن ئایین هانەگۆڕێ و ئەم ئۆلە ستالینییەش، یاخودا، ناخودا، کافر، وشکەسۆفی، حەتبەلی و ئەرتەدۆکسی و لەئایین وەرگەڕای تێدا پەیدابوون و بە ڕووخان و داتەپین دوایی هات..

ڕاپەڕاندندا، ئازاد دەکا و لە سەرێکی دیکەوە ڕەسیوی و فراژووبوونی گەروو و تار و ڕایەڵە و ژێیەکانی دەزگای دەنگ، ئەو کارە سانا دەکا.
لە کۆمەڵە سوقانەیلی مرۆڤی وەبەرد بووگ (فۆسیل) وەکۆڵین، وای بە دیار دەخا کە لێکدی جوێ بوونەوەی ئەندام و پیلان، بەو مانایە کە هەریەکە کار و فرمانێکی ئازادانە و تایبەتی بۆ دەرەخسێ، بەر لە ڕەسین و فراژووبوونی کاسەسەر، ڕووی داگە.. ئەم مەبەستە ڕامانەی ئنگلس لەمەڕ نەخش و کاریگەریی کار لە پەیدابوونی مرۆڤدا، بە باشترین شێوە پشتڕاست دەکاتەوە.

بەش وە حاڵی بەردوارە، ئەوە نموونەگەلی پاشماوەکانی هەرە کەونارای مرۆڤی وە بەردبووگ بە نێوی پیتیك ئانترۆپ – P. Anthrope. – یان مەیموون – مرۆڤ، لە ساڵەکانی (١٨٩٠–١٨٩٤)دا، لە جاوە دۆزرایەوە. پاشانەکێ هەر لە هەمان شوێن نموونەگەلی دیکە پیتیك ئانترۆپ وەگیر کەوتن. لە ساڵی (١٩٢٥)دا دێرینە ناسی چینی پی ئون چونگ ناو، لە شکەفتێکدا بەنێوی شۆکۆتین، لە نێزیکیی پکەن، (٢٥) پارچ جوێ – جوێش جێی هێسکی مرۆڤی بە بەردبووی پەیدا کرد کە بە نێوی سین ئانترۆپ – Sinantrope – مرۆڤی چین – نێونرا. لە مەڵبەندی ڤییەتنام، لە باشووری ئەفریقا و نزیکی هایدڵبێرگ – Heldeberg – لە ئاڵمان چەند پارە ئێسکێ و لە هەموویان گرینگتر بڕێ چەناگە و شەویلاگە و ددانی مرۆڤ دۆزرانەوە کە زێتر وەکوو نی مرۆڤی چین دەچوون، کە لە (١٩٤٤)دا، دێرینە ناسانی فەرەنسی دە نزیکیی جەزائیرێ پاشماوەیلێکی نموونەی دیکەی مرۆڤی پێش مێژووی وەدەست هاورد کە بە ناوی ئاڵتان ترۆپ – Altantrope –وە ناوی دەرکرد.

بەرەبابەکانی پاشینەی بێ کێشە و چەندوچۆنی مرۆڤگەل بە بەردبوو، نیاندەرتاڵەکانن. بەر ماوەی ئەم جۆرە مرۆڤە دە سالی ( ١٨٥٦ )دا لە دۆڵێ بە نێوی نیاندەرتاڵەوە، لە نێزیك دسلدرۆف دەردەست كراو و هەر بەو ناوەشەوە ناوی دەرکرد.

نیاندەرتاڵەکان لە دنیای کەونارادا پەرت و بلاوبوون و پاشماوەکانیان لە جاوە، ئەفریقا، ڕۆژهەلاتی نێزیك و لە چەندین جێگای نێزیك و جوێ – جوێی ئەورووپایێ بەرچاو دەکەوتن. لە ولاتی شۆرەویی جارانێ پاشماوەی ئەم جۆرە مرۆڤە، بە هۆی دێرینەناسانی شۆرەوەییەوە، دۆزراوەتەوە؛ دە سالی (١٩٢٤)دا گ. یونج ئۆسمۆلسکی پارەکانی ئێسکبەندی نیاندەرتالێکی لە شکەفتی کیك کۆبا، لە کریمێ دەردەست کرد. هەروەسا لە سالانی (٣٨-١٩٣٩)دا ئا. ئۆکسلادنیکۆف هەستیێن زارۆکێکی نیاندەرتالی لە شکەفتی تیشك تاش، لە باشووری ئوزبەکستاندا، بە دەست ئانی. مرۆڤی بەردوارە لە مرۆڤی وێستاکە کە هەنیەیەکی شۆر و تەپلەسەرێکی کورتیلەی هەبووە، تاقی برۆی پەیوەست و بەسامی بەسەر چاوانیدا سوارە، هەستییێن چەهرەیێن وی پر زەق و زۆپ بووینە و چەناگەی بۆ ژووری ڕۆچووە. مرۆڤێ ب کەڤربوویی ب چۆکێ ڤەنوشتای شاقاوی هەل دێنا دە کاتی دەو و بەزین و هەڕاکردندا هەر بە تەواوەتی بەرەو پێشێ دادەتەوی و دەڕۆیشت. دەستەکانی وەك پەنجە دەچوون، واتە کەلەنگوستی لەوەی کە لە مرۆڤی ئەوڕۆدا دەدیترێ کەمتر هەمبەری ئەنگوستەکانی دیکەیدا بوو. سەرەڕای وەش سەرلەبەر، مرۆڤی بە بەردبوو (فۆسیل) لە ڕووی بەرێوە ڕۆیشتن و دەفرێتیی کاسەسەر، لێل مەیموونە وە پلە هەورازترەکاندا فرە جیاواز بوو.

بارست (قەبارە)ی مێشکی پیتیک ئانترۆپ، مرۆڤە مەیموون (٩٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو) لە چاو گۆریل و ئوسترالوپیتک، مەیموونی باشووری، بە چەندین پلە گەورەتر بوو و مێشکی سین ئانترۆپ– مرۆڤی چین– دیسان هەر بارستی قەبەتر بووە ١٢٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو) و مێشکی مرۆڤی نییاندەرتاڵ (نزیکەی ١٤٠٠ سانتیمەتر شەشباڵوو) لە دەفرێتیی مامناوەندیی کاسەی سەری مرۆڤی ئەورۆکەوە (لە ١٢٠٠ تا ١٥٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو) نێزیک بوو.

مرۆڤەیلی وەکەمەر بووگ، وە بەرەوازیی ئوسترالوپیتیک، نەک تەنێ دەسکاریی (داردەستێ، گاڵۆکێ لە پێشە)یان دەکرد، بگرە دەیان توانی ئامێر و ئەوزارانیش ساز بکەن، هەروەک لە ئامێرە وەکەمەربووگەکانی نێوان پاشماوەکانی مرۆڤی چین و نییاندەرتاڵان بە دیاری دەخەن. کەوناراناسان ئەو ئامێر و ئەوزارانەیان لە گەلەک شوونان، بێ پاشماوەی پێشەی مرۆڤی وەتەوەن بووگیان دۆزیوەسەوە. دەورانێ کە پیتیک ئانترۆپ و سین ئانترۆپ لەو شوونانەدا دەژیان دەورانەکە دەورانی پالیۆلیتیکی کەڤنارای دێرینە.

خۆ هەرچی سەروبەندی کۆنەبەردینی دێرینە ئەوە دە سەرەتای چاخی چارەمی زەویناسیدا، سەروەختێ کە کۆمەڵی مرۆڤەیل بۆ یەکەمین جار پێیان دە گۆرەپانی پەیدابوونێ نا، بارودۆخی هەرێمیی زەوین لە بارتر و تەڕ و شێدارتر بوو: ئەورووپا جەنگەڵستان و لێرەوار و چڕستانانی گەرمەسێرەکان دایان پۆشیبوو و پڕی بوو لە بەوری جۆری ئاماشرودۆس و فیلی بابەتی پرۆبوسیدین و کەرکەدەنی تەرحی ڕینۆسرۆس کە لەم زەمانەدا نەماگن. بەرانەکینێ وە دەم گوزەری ڕۆژگارەوە هەلومەرجی ئاووهەوا

سەختتر و دژوارتر گەڕا: چاڵە بەفر و سەهۆڵبەندان کە لە باکووردا داخزیبوون، تا دەهات بەرەو پێشتری ئازن و شالآو و ماشاولیان دەهێنا و کارێکی ئەستووری شەختە و بەستەڵەك و سەهۆڵبەندان، سەرزەوینانی پان و بەرین و کاکی بەکاکیی ئەورووپا و ئەمەریکای باکووری گرتەوە. چاڵە بەفرەیلی دیکەش لە کوێستانەکانی زنجیرە چیایەکانی ئەلبورز و هێمالایا سەرەونشێو دەبوونەوە. هەر لە پاڵ چاڵە بەفرەکاندا لێرەواری ژێر ئیستیوابیەکان لەنێوچوون و توندرایەکان (زەلکاوی بێ درەختی وەك ئەی نووکی زەوی (قوتب))، جێی وانی گرتەوە. لەم توندرایانەدا گەلە ماموتی بەخوری، گاکێوی و ئەسپی کێوی بڵاو بوونەوە. سەروبەندی کۆنەبەردینی دێرین، بە وردی، سەردەمێك دەگرێتەوە کە لە سەرەتای چاخی چارەمرا دەست پێ دەکا و تا پایینی دوا تەشەنەکردنی چاڵە بەفرەکان (نزیکەی چل هەزار ساڵ بەرێ) درێژا دەکێشێ.

سنعەتی دەستکردی مرۆڤ لە سەروبەندی کۆنەبەردینی دێریندا قۆناخی سەرەتاییانەی خۆی بڕی. جگە لەبەردەستێ، پارژە بەردی مەودا تێژی بەکاردەهێنا. کەم کەمە، داتاشینی ئەوەنی مشتە لەبەردەستێ بوو بە چتێکی خواسایی و ئەوەی چەکێکی بەردین بوو لە شێوەی چوالە کە درێژییەکەی بە (٢٠٠) سانتیمەتر و کێشی بە دوو کیلۆگرام دەگەیشت. ئەم بەردانەیان بە کۆمەکی بەردەستێیەکانی دیکە دادەتاشین. ئەم ئەوزارە سەرەتاییانە لەبۆ سازکردنی مێخی دارینە، ڕەگ و کۆتە و کۆتەرە هەڵکەندن، لانە و کاشانە ڕماندن و جانەوەر و دڕندەکوشتن و زامدار کردن وە کار ئەهاورد. پێ دەچێ ئەم بەردەمشتانەیان یەکراست بۆ ڕاووشکار

وەکار نەبردبن؛ چون ڕەنگە گورز و گالۆك، یا کوتەکێ، کوتکێ، تێلایێ، گاڕانێ لەبۆ ئەم کارە لەبارتر بووبن.

سەرباری بەردەمشتە، زوێلەگەلێ لەبەردەستێی بڕندە سازدەکران کە بۆ ساودان و تیژکردنی ئەوزارەکان بەکاردەبران.

وردە – وردە ئەزموونەکان باری شایستەتر وە خۆوە دەگرێ، تەکنیك بەرەو پتر پەرەساندن و گەشەکردن و ڕەسیوی دەچێ. مرۆڤگەلی سەرەتایی لەناوچەی جوێ – جوێدا و بە شێوەی جۆراوجۆر ئەوزاری چکۆلەتر و ڕێکوپێکتر و زەریفتریان لەبۆ فەراهەم دەبوون.

ئەوزاری هەرە سەرەکیی نیباندەرتالان لە شێوەی زوێلێ و تەلەزمی سێگۆشە لە بەردەستێ دێنە گۆڕێ. نووکەکەی بۆ چت تیژکردن و کون کردن و مەودایەکەی بۆ پێست کەولێ کردنی جانەوەرکوشتن بەکاردەبرێ، ئەوزار و ئەسپابی ڕاووشکار، چەنگالێ و نێزە و نەجاخی دارینەن.

مەیموون – مرۆڤەکان، لەوە دەچێ نە پاسار و پەنایێ و نە پۆششت و پۆشاکێکیان هەبووبێ. زلنایان وای بۆ دەچوون، کە مەودا و چەنانێکی دوور و درێژ، دە پەنای دارودرەختی وەشارتیدا خۆیان لە گەڕوگێچەلێ و گوڵمەزی جانەوەری دڕندە، وەلادابن. ئەوجا پاشانەکێ مرۆڤ هینی ئەوەبوو کو خۆ لە ڕەشەبا و زریان و باهۆز و بۆران بپارێزێ... سپەر و سەنگەر و لەمپەرەیلێکی ئەڕای خۆی دۆزییەوە. دەستی بەسەر ئەشکەوتەکانی جانەوەرانی دڕندەدا گرت و لێی داگیرکردن و لەو ئەشکەوتانەدا هێوری و ستاری گرت. لە پێستەی جانەوەران، ئەڕای ڕایەخ و پێخەو و پۆشاك و

جلوبەرگ، کە بۆ خۆی جۆرە کەڕك و کورك و کەوڵ و پەلاسێ بوو و بە بەن و خرێنە و داو تێك دەبەستران، سوودی وەردەگرت.

مرۆگەلی سەرەوەختی کۆنە بەردینی دێرین، سوود لە ئاوروەرگرتن فێربوون – ئەدی ئەڤە چاوا بوویە؟، لەوە دەچێ، پێشان کەلکیان لە ئاوری خواسایی و خۆڕسکی وەك: گڕکان و سووتمانان وەرگرتبێ و چاودێرییان کردبێ و ئینجا کاریبێتیان، سا یا بە پێکداداتی دوو بەردەستێ بە یەکدیدا – یا وە مالشتدان و لێك خشاندنی دارو درەخت، پەرژاینە ئاورهەلایساندن. لە گەرمەی مالشتدان و دارودرەخت لێك خشاندندا، خاکەیەکی وردی نەرمی، کە لەدار و درەختە هەلایساوەکان هەلّ دەوەری، گەرم دەبوو و ئاوری دەگرت، هەنگین پلیتەیەکی لە خوری، یا پووشوو و قاو و توێکلی دار و دەوەن و کرۆکەداریان لێك نێزیك دەئێخستن و هەلیان دەگیرساندن و ئەوجا بەفوو دەیان دەماند و ئاگرەکەیان وە گڕ و بلێسە دەئێخست، ئاور هەی ئاور...

دە بەرابەر سەختی و دژوارییی ئاور هەلایساندندا، مرۆڤ ناچار دەبوو، بۆ وەی ئاوری لێ نەتەمرێتەوە و دانمرکێتەوە و نەکوژێتەوە، چاوێری و پاسەوانیی لێ بکا.

سوود لە ئاور وەرگرتن چتێکی فرە وە بایەخی وەدەمەوە بووگە و نێستەکەش هەس؛ ئایر (ئاگر) ئەڕای ئایەم لە وەی و گەزەن و بڤەی سەرماوسۆلە و دڕندە و پیاوخۆر پاراستن، تا بێژی قیمەتی تەواو ناوێ. خۆراکی لەبەر دەبرژێنێ، کەبابی لەسەر دەکا، چتی کالّ و کرچی لەسەر دەکولێنێ، خۆلاسە کاری زۆری لۆ ساناا دەکرد.. هونەری ئاورهەلایساندن بۆ یەکەم جار دەسەلاتی بەسەر یەکێ لە هێزەکانی خۆڕسکدا ڕۆیشتنی بە

مرۆڤ بەخشی و لەوێڕا بۆ هەمیشە و هەتا هەتایە لە سەرلەبەری زیندەرانی دیکەی جویێ کردەوە.

لە شۆڕەویی بەریێ، کەوناراترینی ئەوزارەکانی مرۆڤی بەردوارە لە گردەکانی ساتانیدار، لە ئەرمەنستان دۆزرایەوە. ئاسەوارێکی دیکەی سەروبەندی کۆنە بەردینی دێرین لە قەفقاز، لە ئوێزبەکستان و لە باشووری ئۆستی، لە کریمێ لە گۆلاوەکانی دنێپەر و بەشی نێوان فۆلگا وەدەست کەفتن.

بەڕاستی ئەوەی سەرنجبزوێنە، لە کوردستان بەش بەوەندەی بەندە لێی ئاگام، لە ناوچەی قەرە حەسەن لە سەرووی گوندی تەپە سەوزەوە، کە مەڵبەندی شێخانە، بە بڵێندایییەکی بەرانبەر جەوەڵناساز، بە هەزاران سەرە ڕمب و سەرە نێزەی لە بەردەستیێ داتاشراو، تا وێستاکەش هەر وەو بانەوە ماون. گردە شێخەیی ئەویەری بەستەکەی پێش گوندی مەحمەشا (مامشە) بەرانبەر بە گوندەکە، کە جۆگەیەکی چکۆلەی بە بندا دەڕوا، تا سەردەمانێکی من ئاموشۆی گوندەکەم دەکرد و بەعس ئەنفالی نەکردبوو، ناو بەناو کە ئاو گردەکەی بنکەن دەکرد ئاسەواری لە گڵێنە و بەرد و شاخی کێوی لێ بە دیار دەکەوتن. خەڵکی ئەو گوندانە بە زۆری ئاوریان بە قاوچەخماخ و بەردە ئەستێ دەکردەوە... سبیلکێش زۆرینەیان تا چەرخ و شقارتە و شەمچە پەیدا نەببوون، بە بەرد و ئەستیێ سویل و قەنەیان دادەگیرساند. ئێمەی منداڵی ئاوایی کە خڕەکە بەپێش گوندەکەدا بەرەو خوار دەڕوا، هەمیشە بە بەرد بە یەکدی دادانمدا سەرقاڵ بووین و پریشکە ئاورمان لێ وەدەست دەهێنا و کەیفمان بەو کارە دەهات. ژنان کوورە

ئاوریان لە گڵ دروست دەکرد و گلێنەیان پێ دەگوت. لە بنــە قــالۆری زهـا و ئیشك و کرۆکی داری پووکاو و پووچ و پووت، قاو و پووشوویان ساز دەکرد. مشتووی چەقۆ و قەڵەمبڕ و ســیکارت و کــێرد و خــەنجێریان لــە شــاخی کەڵەکێوی و گا و نێری دروست دەکرد. کەڵەشاخیان بە شــاخی کێــوی دەگرت. خوێنیــان بــە زەروو بــەر دەدا، دۆڵ و دەسـکە دۆڵیـان لەبـەرد سـاز دەکرد، چتیان بــە ســەنگ و تــەرازوو دەکێشا. سـەنگیان لـە برپـە و گۆتـرە گەلاڵە دەکرد، ساواریان لە چاڵێکدا کە لـە تاوێرەکـانی پشـت ئـاوایی هـەڵ کــەندبوو، دەکوتــا. ئاســیاوەکەی ســەرحەد لــە ڕۆخانــە (ئاوەکــەی لـــە دەریەندباسەڕەوە سەرەونشێو دەبێتەوە) بەرداشەکانی هێندێ جار هەر لەو ناوە دروست دەکرا، دەستهاڕ زێتر خۆیان دروستیان دەکرد، هەرواسا دنـگ، دۆڵ، دەسکەدۆڵ، ئەمانەیلەش هەر هوێشیان دروستیانشان مەکەردن.

بە مەزەنەی بەندە ئاوری پیرۆزی باوەگڕگڕ لــە کـەرکووکێ فـرە کۆنـەس.. خەڵکی ناوچەی زاموا، هــەر بـۆ یەکـەم جـار بـە ئامــەدەیی و حــازرەکی و خۆڕسك سوودیان لێ وەرگرتووە – دوور نییە، پێش وەی مرۆڤ ڕێی کەوێتە ئەو ناوچەیە: ئەو ئاگرە هەر لە کۆنەوە هەبووبێ. بۆ خۆی نێوی باوەگڕگڕە، زمان خواران بە بابەگوڕ گوڕی یەژن، زوانیان بوڕێ... زەرتوشتییان ئاوری ئاورخانە (ئاتەشکەدە)کانیان نەدەکوژاندەوە، ئەوەش لەوەڕا کـەوتبۆوە کـە مرۆڤ وەختێ ئاوری هەڵدەگیرساند، نەیدەویست لێی کۆر بێتەوە و بتەمرت؛ چون ئەسپابی ئاورهەڵایساندنی بەوی ساناهییێ دەست نەکەفتییە، گاڤا کــو خاستبت هــەڵی بکـا، یەکســـەر هەڵیگیرســێنێ، لەبــەر هــەندێ ئاورخانــان پاسەوان و چاوێرییان بۆ داناوە و هەمیشە پاراستوویانن.

قسه قسه دێنێ، ماڵه مێر و بەگلەری کوردان ئاورخانه و وەجاخیان هەرگیز نەکوژاوەتەوە و هەمیشه دووکەڵی لێ هەڵستاوە. کەسێکی منداڵ و دۆمۆنیی نەبێ وێستاکەش له کوردەواریدا خۆی به وەجاغ کوێر و ئەستێور دەزانێ، ئەمەش له قۆناخێکەوه که پیاوی تێدا له جیاتیی ژن بوو بەخێوی هەموو دەسەلاتێ، ئاو دەخواتەوە. کەسێکی دەسکورت، یا پیسکه و ڕژد بێ، پێی یەژن: ئاوری له ماڵێدا ناکرێتەوە، دووی لەخانەی هەڵ ناستێ، خانەوێرانه..

بەش به حاڵی ئایین ژیان و سازمانی کۆمەڵەکیی کۆمەڵی مرۆڤەکی دەتوانین بێژین پاشکەفتیترین هۆز و تیرەگەلێ که ئێتنۆگرافییان لێیان وەکۆڵیون به چەندین پله و پایه له مرۆگەل وەتەوەن بووی کۆنه بەردینی دێرین پەرەیان ساندگه و وەگەشه کەفتگن. لەم ڕووەوه چۆنیەتیی ژیان لەناو کۆمەلانی سەرەتاییی مرۆڤدا تەنها و تەنها له ڕووی ماتریاڵ و بەرژەوەندەکانی دێرین ناسییەوه وەگیردەکەوێ و هەر لەبەر هەندێکەش ڕاوبۆچوونەکانی مه لەمەڕ سازمانی کۆمەڵەکیی وی ناتەواوه و لەسەر هیمی گریمانه و قیاس کردنێیه..

مرۆڤ لەسەروبەندی کۆنه بەردینی دێریندا، وه گردوکۆی خۆراکیCuillett -
-و ڕاووشکار بەڕێوه دەچوو — به میوه و ڕیشەی داروەدرەخت و واردەنیی وەك: توو، تووتڕك (گاتوو، تووڕك، دڕی)— baie — وەڕێوه دەچوو. مەمکداران (پستانداران)ی چکۆله، مارمێلکه و کەوڵه و بزنمژه و قۆڕی و گەزنده و خزندەی ڕاو دەکرد و فرەی نەخایاند پەرژایه ڕاوکردنی گیانلەبەری گەپ و زل. دێرین ناسان له هەوارگایەکانی بەر له مێژوو، به زۆری لەناو

ئەوزار و ئامێرەیلی نوابیندا، پێشە و هەستیی مـاموت و گامێشـی کێوی – Bison – و ئەسپ و گاکێوی دەدۆزنەوە کە مرۆڤەیلی سەرەتایی، ژیـۆ نـەفێ یەکێ کو مۆخی نێو ئەم هەستی و پێشانە دەربێرن، قەڵاشتوونیان. مرۆڤـی سەرەتایی گۆشـتخۆریش بووە و گیـاوگۆڵخۆریش بـووە و لـەم ڕووەوە بـۆی لواوە کە وەرزێری بتوانێ لە گشت جێیێ بژیێ و هەڵ بکا.

بارودۆخی ژیانی مرۆڤ سەخت و بە سام بووە، نەیتوانیگە لێـل درندەگـەلی هەراسانکەری سەرەتای سەدەی چارەمدا پێشبڕکێیان لێلا بکـا و پەنجەیان لە پەنجە بدا، نە لەز و خێراییی وان و نە هێز و گـوردی لـەش و لاری وانیـان هەبووە. برسێتی و مەرگی ژێر چنگڕکی جانەوەرانی، هەمیشە لۆ لـە بۆسـە و کـەمیندا بـوون. ئـاژن هـاوردنی چاڵـە بـەفران ململانێـی ویـی دەگـەڵ خۆرسکیشدا هێندەی دیکە دژوارتر و مەرگەساتتر کرد. وێڕای ئـەوان هـەموو کۆسپ و هەڵەمووتان، بنیایەمی بەردوارە لـە سـای دوو هۆکـارا وە زنگـی ماگنەسەوە و سەرکەوتوون و زاڵ بووگن: یەکەم ئەوەسا کـە ئەمانەیلـە ئیـتر بوونـەوەریلێکی وریـا و وشـیار بووگـن کـە ئـەوزار و ئامێریـان سـاز دەکـرد. دووەم لە سۆنگەی ئەوە کە ئەمانە هەر لە نواوە وە شێوەی دەسەجەمعی و لێل یەکا، وە کۆمەڵ – کۆمەڵ و بڕ – بڕ دەژیان.

بگرە سازدانی ئەوزار و ئامێر، ئەسڵەن بێ ژیانی کۆمەڵەکی و دەسەجەمعی هەر سەر ناگرێ و مەحاڵـە، چـون پاراستن و پێڕەست کردنـی زانیارییـەکانی مـرۆڤ و کـاری ئـاڵووێر و بازرگـانیی وی لـــە زەوینـــەی ڕەنێوئـــانیندا و پشتاوپشـت لـە وەریتانـەوە ئـەڕای ئـەوە و ئـەویران و ئـەتیژەیل وە مـیراتی مانەوەیان، تەنیا و تەنیا هەر لەو هەلومەرجەدا ژ کرنێ دهـات. نێچیرڤـانیێ،

ئەمازا نێچیرڤانییا جانەوەرانی گەپ و زەلام (لە هێندێ ناوچەی کوردستانی ئێرانێ واژەی زەلام بۆ چارپێ و بارگین و چتی لەی جۆرە بابەتەیلە دەگوترێ) وە شێوەی دەستەجەمعی و دەسیاوی و گەلەکۆمەکی ڕاووشکار ئەنجام دەدرا، ئیدی بەم جۆرە ئەوانەیان وە ئاییر دەتۆقان و وەپەلێ و خڕك و کەور تێ سرەواندن بەرەو هەڵدێر و زۆنگ و زەلکاو و زەمەندیان هەلێ دەبرین و تەنگاو دەکردن، سەروو و کەور دەکەم، بنوو خاك دەکەم بۆ کوێ دەڕۆن...

ئەی کۆمەڵە ئایەمییانە لە دەورانی کۆنەبەردینی دێریندا، بە نێوی ستانداردی گەلەوڕانە سەرەتاییەکانەوە ناودێر دەکرێن. ئەی گەلەوڕانەیلە ڕەنگە چکۆلە و تا ئەندازەیێ ناپایەدار بووین. کەسانێد وان کاربوون بچنە ڕێزی گەلەیەکی دییەوە. گەل هەمیشە پێشەنگ و قەڵەوزێکی ڕێشاندەری، پیاو یا ژنی لە تەکا بوو.

وێڕای وەش دامەزرانی سازمانی جووتەکیی کەم و زۆر چەسپ و پایەداریش، کارێکی کردەنی نەبوو.

شرۆشکڵی ناقۆلاً و فاچەڵفیچی ئەوزار و ئامێری سەرەتاییی کار پەست و نزمیی ئاستی ئابووری، ململانێی سامناك دەگەلێ خۆرسکدا، ئەمانەیلە سەرلەوەر گشتی لەناو گەلەی سەرەتاییدا حاڵەتی ئیندیویدوالیزمی دڕندە — Individualisme — یان کە مرۆڤی وەکەمەریووگ (فۆسیل) لە باپیرەگەورانی خۆوەیان وەمیراتی بۆ مابووگەوە —دەپاراست. ئەو حاڵەتە ناو بەناو لێل وەیەکا دان و تێکچڕژیان و تێکیران و لێکدی هەڵکردن و لێکدی ڕۆمانتنی

خوێنینیدا، کە دە هەلومەرجی ململانێ لەپێناوی ماندا، دەهاتە گۆڕێ بە دیاردەکەوت... بگرە مرۆڤی پیاوخۆریش هەبووگە.

بەرە – بەرە، کاتێ سازمانی کۆمەڵەکیی کۆمەڵە مرۆڤەکی دامەزریا و بنچەسپ و پایەدار و ڕوختە دەبێ و دەسرەنگینی و دەسوبرد و مەهارەتی مرۆڤ لە کاروباری بەرهەمهێناندا پەردەسێنێ و تەشەنە دەکا و دەتەنێتەوە، سریشتی ئاژەڵانە دەداتە باری کزی و کەنەفتی. هەروەك فلادیمیر ئولیانۆف فەرموویە: گەلەی سەرەتایی و کۆمەڵی هاوبەشەکیی سەرەتایی سنوورێکی بۆ حاڵەتی دڕندایەتی (ئیندیویدیوالیزم)ی سەرەتاییی مرۆڤی سەرەتایی دانا.

باشە کەسی برای ئەدی بیر و ئەندێشە کوو پەیدا بوو؟ پەیدابوونی بیرو ئەندێشە ئەنجامی چالاکی و ئەمسەر و ئەوسەر و هەڵپە و خۆ بە داروبەردا دانی ڕەنێوهێنانەی مرۆڤە. لە هەوارگەی کاڵۆك و داردەست، یا خڕك و کەور وەکارهاوردنی ڕەمەکی و ئاژەڵەکی بۆ هەوارگەی ئەوزار و ئامێر سازکردن – با ناقولاّو نارێکوپێکیش بوویبن – چالاکیی وشیارانە و ئاگایانە و هەستوخوستی تیژی مرۆڤ وە دەنگ تێرێ. ئەزموونەکانی مرۆڤ لە کاروباری بەرهەمهێنیدا، نوخشەی تاقیکردنەوەی وی ساز دەدا و دە ویژدان و نیهادی ویدا ئاشکرا ڕەنگ دەداتەوە و شۆپ و شوێنەوار بەجێ دێڵێ.

لەوەڕا کە کار بە شێوەی دەستەجەمعی و دەستیاوی و گەلەکاری ئەنجام دەدرا و ئەزموون و تەجرەبەکانی دەستەی کۆمەڵ، پاسدارییان لێ دەکرد، کار و خەسڵەتی بیرکردنەوەی سەرەتاییی بەشەریش حاڵەتێکی کۆمەڵەکیی بەخۆوە گرت، واتە: کە کارکردن کۆمەڵەکی و گەلەکۆمەکی بێ، دیارە

بیرکردنـەوەش کـە ڕاسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ، هـەر بـە دەوری کـاردا دەخولێتـەوە، حاڵـەتی کۆمەڵـەکیی بـە خـۆوە گرتـووە، مـرۆڤ لـە چـەرخ و چاخـەکانی سـەرەتاییدا خـۆی لەکۆمـەڵ بـەجودا نـەدەزانی. ئێسـتاش لـە کۆمـەڵی کوردەواریـی عەشـیرەتیدا، کەسـێکی نـابینی پێناسـەی هـۆز و هۆزگەری و خزمایەتیی خۆی بە چتێکی پـیرۆز نـەزانێ، ئـەوڕۆ هـەر جـافێك، هەر بڵباسێك، هـەر مزوورییـەك، هـەر بریفکانییـەك، هـەر سوورچییەك، هـەر مـەنتکێك، هـەر مەنمییـەك، هـەر براندۆسـتییەك، هـەر زێبارییـەك و تـاد... دەگری، بەوپەڕی شایی بەخۆبوونەوە شـانازی بـە عەشیرەتەکەیەوە دەکـا، خۆی بە یەکێ لە عەشیرەتەکەی بەجودا نازانێ، نەك هەر ئەوەندە بگـرە کـە ڕەواندزییـەك، هەولێرییـەك، ئامێدییـەك، سـلێمانیەییەك، خانەقینییـەك، بتلیسـییەك و تـاد.. دەڵـێ: مـن ڕەواندزیـم، یـان هـەولێریم یـان فـلانم یـان فیسـارم، ئـەوەش هـەر لـە ڕەگ ئەسـتووریی ڕۆحـی عەشـیرەتگەرییەوە چەکـەرەی کردگـە. سـەرلەبەری چالاکییـە کۆمەڵەکییـەکانی کۆمـەڵی کوردەواری لە گوێن پرسە و تازێمانە و شین و شایی و سەیران و بنـدارۆك و مازی چنین و گەلەسرەو و گەلەجووت و سـەرلەبەری کاروبـاری هـەرەوەزی و تاد.... کە زۆریان نەماون، پاشماوەی هەستی ڕۆحی کۆمەڵەکییە و خۆ بەبێ کۆمەڵ بەهیچ نەزانینە. بەڵێ ڕاسـتە ئـەوڕۆ تـاك دەوری زۆرە، بـەلام هـەرگیز لەوەلامدانەوەی ئـەرێنیی پێداویستی کۆمـەڵ دوا ناکـەوێ، ئـەوەتا هەمیشـە هـێزوگوڕدی دە پـەنای خێزانـە گەڕۆکەکـەی، گوندەکـەی، شـارەکەی، هۆزەکەی، نەتەوەکـەی، چ لـە ڕووی ڕەگـەزەوە و چ لـە ڕووی حیزبایـەتی و سیاسییەوە دەبینێ، بەلام دیموکراسـییەتی گـەرەکـە، دەبـەوێ وەك تـاکیش

ڕێزی لێ بگیرێ، نەك هەر ئەوە بگرە، دەیەوێ لە شێوەی سەرۆکێ، شێخێ، ئاغایێ، مەلایێ، زانایێ، شاعیرێ و سیاسیێ تاد... حیسابی لە کۆمەڵ پتریش بۆ بکرێ.

بەش وە حاڵی ئاین، زانستمەندانی بۆرژووا لای ئەوە لێ دەدەن، کە مرۆڤ هەر لە سەرەتای چاوپشکووتوونیەوە، بڕوای بە سەرووی خۆرسك هەبووگە و باریتەعالا - Etre Supromo - خوداوەندی پەرستووە. کەشیشی فەرهەنگناسی ئوتریشی بە ناوی پ. و. شمیت و پەیڕەوانی وی مەردم فێرە رامانەی یەکتاپەرستیی ئەزەلی - Primonotheisme - دەکەن. ئەم ڕامانە ممبارەکە یەژێ: مرۆڤ لە سەرەتای دروست بوونیەوە، بڕوای بە هەبوونی یەك خوداوەند هەبووگە و هەر ئەو بڕوایەیە کە دە نیهاد و ویژدانی مرۆی سەرەتاییدا پەیدابووە، بۆ خۆی نیشانەیێکە لە بوونی خوداوەند، کەچی ئەم ڕامانەیە لەگەڵ وەی کە لە گۆڕانکارییەکانی ڕەوانی و ڕۆحیی مرۆڤەوە زانراوە دووفاق و تاق و جووتن.

دە بارودۆخێکدا کە تاکە مرۆڤێ سەرقاڵی سەروبەرنانی خۆراکی ڕۆژانەی خۆی بووە و یەکەم بیروبۆچوونی وی لە کار بەولاوە سەروکاری بە هیچ چتێکی دیکەوە نەبووە، نەیدەکاری بیر لە شرۆڤەی جیهان بکاتەوە.

لەمەش بترازێ، کرچ و کاڵیی تەواوی مێشکی وی دەرفەتی ئەوەی نەداوە لەم جۆرە چەمکە ڕووت و پەتییانە بکاتن.. مرۆڤ دەربارەی خودی خۆی و خۆرسکێ کە دەوراندەوری تەنیبوو بیروباوەڕی ئایینی، واتە: بیروبڕوای تەمومژاوی و هەڵە و وڕێنە هەر نەش بووە. ئێمە دەتوانین لەسەر ئەوە پێ دابگرین کە مرۆڤی وەتەوەنبووگ (فۆسیل) هەر حیچ نەوێ بەش وە حاڵی

مرۆڤ – مەیموون و مرۆڤی چین، کە هەر لە بنەڕەتدا فریـان بەسـەر بیر لە ئایین کردنەوە نەبووگە.

هەرچی ئەو قسەیەشە، کە یەژێ مرۆڤی نییاندەرتالٚ چتێکی پەرستووە یا نە، خۆ ئەوە کێشەیەکی وە گرێوگۆلترە و ژمارەیەکی فرە لە زانستمەندان لەسـەر ئەمە تـا ئـیها ژی مشـتومڕ و گوێپچـڕ – گوێپچڕیانـە. بـەپێی ئـا. ئۆکلادنیکۆف گۆڕخانەیلێ کە لە دماذمای دەورانی کۆنـە بـەردینی دێرینـەوە وەجێ ماگن، گەواهیی هەبوونی بیروبۆچوونی سـەرەتایی لـە نییاندەرتاڵـەیل ئەدەن، ئەم گۆڕخانانە لـە نـاو شـکفتەیلێکدا کـە ڕۆژگـارێ لانە و کاشـانەی مرۆڤ بووگن هەڵدەکەنران و لەبۆ مردییـان چـاڵی چکۆلـەیان هەڵدەقـەناند و چـەند گلمتکـە گۆشـتێکیان لـۆ تێـدا دادەنـان. نییاندەرتـاڵان بـە دیمـەن پاسەوانی و پارێزگارییان لە مردووی خۆ دەکرد و لە گوێن زیندییانیان ڕفتار دەگـەڵدا دەکردن، وەلێ هێمـان بـیروبۆچوونی جیهانی نـەهاتبووە ئـاراوە. ئەوان لەبۆ مردیی، هاژ بڕوایان بە توانستێکی سەرووی خۆڕسك و لە هێزێکی کە لە گوێن هێزەکانی سەر زەوین نەبێ نەدەکرد.

لەم چـەرخ و چاخـەدا یەکـەم سریشـتەکانی پەرسـتن، گیـان لەبـەرەکان – Zoolatric –ن، لە چوارەدەوری گۆڕخانەی نییاندەرتاڵەکاندا، لە تشـیك تـاش لـە باشـووری ئوێزبەگسـتان شـاخەیلی بزنـەکێوی هـەبوون و لـە هێنـدێ شکەفتاندا کاسەسـەری ورچـی شکەفتنشین دۆزرانـەوە کـە چـواردەوری وە کەمەر و بەرد هەڵچنرابوو. هەنگێن زانیاریی مە لەمەڕ چۆن پـەیدابوونی فـرە ئایینی کەم بووگە و ورد نییە... یەکەم نیشانە و شایەتی بـێ چـەند و چۆن

له مشتومڕبەدەر تەنێ باس و خواسی پەیدابوونی ئایینە لە چەرخ و چاخی پاشانەکێ، واتە لە چەرخ و چاخی بەردینی دێریندا.

لێرەدا بەش بە حاڵی کوردەواری، تا ئەمڕۆش زۆر لە تەکیە و مزگەوت و خانەقا و جێی تایبەتی لە کوردستاندا گۆڕستانی تایبەت بەرچاو دەکەون و کەسانی خانوادە و بنەماڵەی پیرانی تەریقەت و شێخ و مەلا و ئاغا و بەگ و گەورە پیاوان، لەو گۆڕستانە تایبەتانەدا بە جودا دەنێژرێن. جارێکی دیکە بەسەر باسی ئایین رادەگەین.

ئەوجا پاش کۆنە بەردینی دێرین، کۆنە بەردینی نوێ دەست پێ دەکا (لە ٤ هەزار ساڵەوە تا ١٢ ساڵ پێش لە دایك بوونی عیسای مەسیح دەڕوا) بە درێژاییی ئەم سەوربەندە، هەلومەرجی هەرێمی، چەندین جار دەگۆڕێ، چاڵەبەفران هوێر- هوێر پاشەکشێ دەکەن و ئاووهەوای ئەورووپا و سیبیریای باشوور خۆش دەبێ، پاشان سەهۆڵبەندان سەرلەنوێ دەست پێ دەکاتەوە و ئەمە چارەمین و دواهەمین هێرشە، سەرەڕای وەی کە لە سەرپاکی سەهۆڵبەندانەکانی دیکە کز و بێ زەبروزەنگترە، ئاووهەوا زۆر ناهەموار دەکا. مامووتان دە گەرووی خامۆشیی هەتا هەتاییدا لوول دەدرێن، کەچی گاکێوییان بە سەرانسەری گوێ دەریای ئاوین و کریمێ و قەفقازدا پەرت و بلاو دەبنەوە.

پەڕینەوە بۆ دەورانی کۆنە بەردینی نوێ بە پێشکەوتنێکی بەرچاوی ساختمانی لەش و لاری مرۆڤ قەڵەمداد دەکرێ و دەگەڵ خەسڵەتی بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی سازمانی کۆمەڵەکیدا بە دیاردەکەوێ. ساختمانی مرۆڤی هاوچەرخ – Homo - Sapiens – دەگاتە ئەوپەڕی پێشکەوتن، هونەر و

ئابووریی کۆمەڵی مرۆڤین کاملتر و بەگرێوگۆڵتر دەبن و ئەخوازا ئەوزارەیلی تایبەت کە بۆ سازدانی ئەوزارەیلی تر وەکار دەهێندرێن و ئامێر و ئەوزارەیلێ کە لە دار و سوقان یا لە دار و بەردەستێ دروست کراون لەم سەردەمەدا پەیدا دەبن. مرۆڤ شکەوتان بەجێ دێڵن و دەست دەدەنە سازدانی پەناو پەسێوی گەرموگوڕ، شێوەی نوێباوی سازمانی کۆمەڵەکی – کۆمەڵی خێڵەکیی سەرەتایی – Clan Primirf – دێنە گۆڕێ، پاشانەکێ هونەر پێ داوێتە گۆڕەپانی پەیدابوونێ. بە ڕاستی هەروەک زانستمەندان دەڵێن، بۆ دەورانی کۆنە بەردینی نوێ پەڕینەوە، واتە: مرۆڤی نییاندەرتاڵ کە بە مرۆڤی ئەوڕۆکە بوون، بە تەکانێکی چۆنەکی و بنواشەکیی تایبەت لە قەڵەم دەدرێ.

لەم سەروبەندەدا تەکنیک بە چەند پلە لە ئی بەرێ، پێشڤەتر چوویە، ئەڤزار و ئامێرێن ژ کەڤر دروست کری کامڵ دبن، مرۆڤ زۆڵە بەردەستێی تەنک و ناسك بەهۆی ئامێری هێسکانی دادەتاشێ. لە دماترین ڕۆژگارانی سەروبەندی کۆنەبەردینی نوێدا کارویار ئیتر هەر وە بەرد و کەوڕەوە قەتیس نامێنێ و پەکی لەسەریان ناکەوێ، بگرە هەستی و شاخیش بەکاردەهێنرێن..

ئەوزار و ئامێرەیلێ کە بۆ خۆراك ئەیار کردن وەکارتێن، جۆراوجۆرترن. نێزەی لە نووکە شفرەی عاجی مامووت، لە بەردەستێن، خەنجەری لە شاخ دروستکراو، نێزە بۆ ڕاووشکار و ماسیگری، ئەو زارەیلێ بۆ پۆست کەندن و کەوڵ کردنی جانەوەران بەکارهاوردن، دێنە گۆڕێ. لە سووژن و گۆشەوەنی سوقان بۆ دروونی پۆشاکی کەوڵ و کورك و لە پاژە بەردەستێی تیژ بۆ

پەرداخ و لیکۆلووس و مشتومال کردنی شاخ و سوقان، سوود وەردەگیریّ. ڕاووشکاری گیانلەبەری زەلام و گەورە و زەبەلاح کە لە شێوەی گەلەوڕاندا دەچێرن وێنەیەکی بیّ پێشینە بەخۆوە دەبینیّ. لە بیرکدمۆستن لە چیکۆسلۆڤاکیا کۆمەڵە هێسکی هەزاران مامووت دۆزرایەوە. لە دماندمای ئەم سەروبەندەدا ڕاوەماسیش بە فرەوانی پەرە دەستێنیّ. ئەم پێشکەوتنە لە کاری بەرهەمهێناندا دەرفەت و هەل بۆ مرۆڤ فەراهەم دەکا کە شێوەی ژیان و هەوارگرتنی یەکجیّ نشینی — Sadentaire — بگرێتە بەر.

مرۆڤ هەواری خۆی لە پەناگای دەستکرد، سەیوانان، کولبە و کۆلیتان، زنج و کۆڕان دەست پیّ دەکا. لە کوردستان لە شکەفتی شانیدەر و هەزارمێرد و شوێنانی دی ئاسەواری زۆر لە نیاندەرتالان و خانوویەرە و چتی لەم جۆرە بابەتێلە بەرچاو دەکەون.

ڕووسیا (سۆڤیەتی بەری) ئاسەواری چەرخ و چاخەکانی کۆنەبەردینی نویّ لە پشت قەفقاز، کریمیّ لە کۆلاوەکانی دنیپەر و دۆن، بە درێژاییی چوسووابا و لە سیبیریا دۆزراونەوە. هۆز و خێڵەساتیّ کە دوور لە ناوچەکانی چاڵەبەفران دەژیان، بە شەقڵ و مۆرکی تایبەتی خۆیان لە ئی دیکە جویّ بوونەوە. لەو سەروبەندەدا لە ئەفریقای باکوور شارستانیەتیّ کە پاشانەکیّ بە نێوی کاپسا (قفچاو، ئەمرۆ لە توونسە) نێوی دەرکرد، بە ورشە و ڕەونەق دەکەوت. خەڵکی کاپسا، بە پێچەوانەی ڕاوچی و ماسیگرانی باشوور بە زۆری، ژیانیان بە گردوکۆی میوە و سەوزی و لەوان بابەتان بەسەر دەبرد. ئەوان لە هەڵکردنە سەر درندەیلیّ لە گوێن شێر و پڵنگ سامیان ڕیّ دەنیشتیّ، وەلیّ بەڕێوەچوونی وان بە شێوەی سەرەکی وە گردۆکویّ وردە

نەرم تەنەیلی خۆراکی، کیسەڵەیل، هێلکەی وشترمر و لەی جۆرە بابەتەیلە، سەرویەر ئەنریا، لەی ڕۆژگارەیلە لە خاوەری زرێی سپی، کریمیێ و پشت قەفقاز؛ کە شارستانییەکی وەك شارستانییەتی کاپسا لەوراکە چەری پژیاوی حاڵوبارێکی ئابووریی هاوشێوە هەبوو.

باشە، ئەی کۆمەڵی تیرەگەری چۆن – چۆنی چاوی پشکوتوو؟ بێ گومان، گەشەکردنی هێدییانەی لەسەرەخۆی هێزەکانی بەرهەمهێنان و بەرەو ژیانی یەکجێ نشینی پەڕینەوە، ژیان و گوزەرانی بە کۆمەڵ و دەستەجەمعیی مرۆڤی بنچەسپ و ڕوختە کرد و لە ئەنجامدا حاڵەتی "ئیندیودوالیسمی درندان" لەنێو چوو. گەلەی سەرەتایی جێگای خۆی لەبۆ سازمان و دامەزراوێکی کۆمەڵەکیی هەورازتر و بالاتر و پێشکەفتیتر چۆل کرد. ساختمانی گەلە بە شێوەیەکی سەرەکی لە سێ لاوە بەرەو کامل بوون دەڕوا: یەکەم ئەوەیە کە زێدەبوونی دەسکەوتی بەشێکی کار وا لە مرۆڤان دەکا کە لە دەستە و گرۆی کەم خەڵکتردا، کە لەگەلەی سەرەتایی جوێ ببوونەوە، وەلێ هاوپێوەندیی ئابووریی خۆیان هاژ هەر دەگەڵ واندا پاراستبوو؛ خڕ دەبوونەوە. ئەم دەستە و گرۆیانە خۆیان بە خزم و کەسی یەکدی دەخوێندەوە و لەوانەش بوو، لەسەر یەکدیشیان کردبایەوە و بگرە ناوبەناو یەکدیشیان بۆ ناوچە و قەڵەمڕەوی ڕاووشکاری خۆش، گاس دەکرد. دووەم ئەوەیە کە مرۆڤگەلی سەرەتایی بە پلە و پایەیێ دەگەیەن کە لە هاوسەروساختیی ژن و مێردایەتی لە چارچێوەی دەستە و گرۆدا بەرەوبڕی بکەن. ئەم کارە کە بە لە هاوسەری بەدەر (ئێگزۆگامی – Exogamie) نێو دەبرێ لێل گەشەکردنی ئابووریی مرۆڤەیلدا هاوسەروکارە. ژن و مێردایەتی

ئیدی کاریکی ژیانی نییه، بەڵکە دیاردەیەکی کۆمەڵەکییە کە بە هۆی کۆمەڵەوە ڕەوایەتی (شەرعییەت)ی دەدرێتێ، واتە: جووت بوونی ژن و پیاوێ تەنیا بۆ پاراستنی ڕەگەز و جۆر نییە و کاری تاك نییە، بەڵکو کۆمەڵە و کۆمەڵ شەقڵ و مۆرکی خۆی پێوە دەنێ. تەنانەت تا ئەوڕۆکەش لە زۆرینەی کۆمەڵانی پاشماوەکانی ئەم سەروبەندەدا، ژن هەروا بە سانایی خۆ بە دەستی مێردەوە نادا و بگرە تا بۆی بکرێ ناهێڵێ مێردی چاوی بە شەرمی بکەوێ، یەکەم: (هەروەك لە نێو دڕنداندا بە دیاردەکەوێ) بۆ زێدە دنەدانی سێکسی، دووەم: لە بەر ئەو سیفەتە کۆمەڵایەتییەی، سێیەم: لەبەر ئەوەی کە ڕۆژگارێ بە سەرچاوەی ژیان زاندراوە و پیرۆز و ئەسرارئامێز و مەڕموز بووە ئەدی نازانی میسرییەکان تا سەتان ساڵ هێندەی لێ ناشارەزا بوون کە پێیان وابووە زایمان لە سۆنگەی "باو"ە دێتەگۆڕێ؟! ئەو هەڵۆیەی کە بەسەر دارئاسایەکەی فیرعەونەوەیە نیشانەی ئەوەیە. تەنانەت ئاوسبوونی حەزرەتی مریەم بە بای ڕۆحی خوداوەند، هەر لەم بیروئەندێشەیە ئاودەخواتەوە.

هاوسەربەدەری تەنیا لە قۆناخێکی دیاریی کۆمەڵدا دەتوانێ بێتە گۆڕێ؛ چونکە گەلەی سەرەتایی یەکانەیەکی کۆمەڵەکیی سنووردار بوو و دەگەڵ کۆمەڵانی دیکەدا هاوسەروکارییەکی ئەوتۆی نەبوو؛ تەنیا پاش ئەوەی دەستە و گرۆیەکانی دایك و فرزەندی یەکدییان بەخزم ناسی و ئەندامانی ئەم گرۆیانە لە سای لێل یەکترا ژن و ژنخوازییان درێژە پێ دا، داسەکێن و چەسپانی هاوسەربەدەری لێرەڕا ئەوجا سەری گرت و بوو بە چتێکی کردەنی و خواسایی.. ئەی کارە لە هەمان حاڵدا کە مانایەکی فەلسەفییانەی

هەس– فەلسەفەی هاوسەریی لە چارچێوەی دەستەیەکی کۆمەڵەکی (گرۆ)دا– ئەسڵێکی ئەرێنی (ئیجابی)یشی وە بەرەوە هەس و ئەوەش ئەوەیە کە ژن مارەبڕین لە دەستەیەکی دیکە، دەستەیەکی دەستنیشان کەری دەبێ بەکارێکی ناچاری، واتە: ئیدی ناتوانێ سەرپێچی و کەڵەوەکێشیی لێ بکا، ئیتر لەمە وەپاش دوو دەستەی خزم و خوێش بەرێوەڕەسمی دوولایەنە پێوەندی دەگەڵ یەکدیدا دەگرن و دەبن بە هاوسەروکاری یەکدی: لە سەرێکەوە ژنهێنان لە چارچێوەی یەك دەستەدا پاوان و قەدەغان بوو و لە سەرێکی دییەوە کەسانی دەستەکە تەنیا دەگەڵ ئەندامانی دەستەی خزمدا دەیانتوانی ژن بێنن. رێوەڕەسمی ژنهێنانیش دە چارچێوەی کۆمەڵێکی گەورەدا، بە ژن و مێردایەتی – Endogamie – ناودەبرێ و هۆزی ژن و مێردایەتی کە لە دوو کۆمەڵی هاوبەش – Communatte – خزمی یەکدین، هاوکات لەگەڵ پێکهاتنی کۆمەڵی خێڵەکیی ناژن و مێردایەتیدا دێتە گۆڕێ. ئنگلس ئەم سازمانە دووبینەیەی بە شێوەی سەرەتاییی کۆمەڵی ناژن و مێردایەتیی بنەماهۆز داوەتە قەڵەم. پاشماوەکانی ئەم سازمانە دووبینانە، دە ئاستێکی گەشەکردوو و پێشکەوتووتردا، تا ئەوڕۆش هەر ماون. کەلەپوورناسان پاشماوەکانی ئەم سازمانە کۆمەڵەکییانەیان لە ناو تورکمانەکان، ئەڤینەکان، قرغزەکان قەرەقاڵپاخەکاندا بەرچاوکەوتوون. ژمارەی دەستەی ناژن و مێردایەتی لە چارچێوەی یەك هۆزدا لە شێوەی دەستە – دەستە – Maringe pur groupe – دا بوو. واتە: سەرلەبەری ژنانی کۆمەڵی هاوبەشەکی هاوسەری ڕاستەقینەی بیلقووە (Potential)ی پیاوانی کۆمەڵی هاوبەشەکیی دیکەمان هۆزن.

(بەداخەوە تا ئێستاش ئەم دوو زاراوەیە (بالقوە و بالفعل) بە زمانی کوردیمان نییە. کەچی لە زۆر ڕستەی زانستەکاندا بەکار دەبرێن..

وێڕای وەی کە جەمسەربوونی گرۆ بە پێکهاتنی بە ڕێکەوتی جفتەیلی کەم تا زۆر چەسپ و پایەداری، فت نەدەکرد، وەلێ سەرەڕای ئەوەش هەموو، هیچ کەس بەش بە حاڵی هاوسەری خۆی خاوەن مافی پاوانکراو نەبوو.

پاشماوەکانی جەمسەربوونی گرۆیانە، بە نموونە لەکن ئوستراڵیاییەکان کە هۆزەکانیان بە دوو یا (چار) گرۆ کە بە شێوەی هاوجەمسەریی بەرابەر، تێک بەسترابنە، تا هەنووکەش پارێزراینە و بووینە کەرەستەی لێوەکۆڵ و لێوەتوژانی ڕەگەزناس (ئێتنۆگراف)ان. لە ڕووسیای دوادوای سەدەی نۆزدەهەمدا ل. شتێرنبەرگ، بابەتێکی لەم جۆرەی لەناو نیوخەکان (گلیاک)ەکاندا دیتووە. ئەم پیاوە حوکوومەتی قەیسەری، لەسەر چالاکییەکانی لەناو ڕیزی نارۆدنایاولیا – Narodnaia Volia –دا بۆ ڕۆژهەلاتی دووری ڕەهەنە کردبوو.

سێیەم ئەوەیە کە ساختمانی گەلەی سەرەتایی لە ئەنجامی کامڵ بوونی دابەش کردنی خۆڕسکانەی کاردا، شێوەیەکی بەگرێ و گۆڵ پەیدا دەکا. وێدەچێ، دابەش کردنی کار بە پێی تەمەن هەر لە هەمان سەرەتای هاتنە گۆڕێی کۆمەڵی مرۆڤەوە سەری هەڵ دابێ، بەلام لەو زەمانەدا پیاو و ژن لە شابووریدا دەورێکی چونیەکیان دەگێڕا. تەنیا لە ئاخروئۆخری دەورانی کۆنەبەردینی دێریندا، کە دابەش کردنی کار لەنێوان ژن و پیاودا دێتە گۆڕێ؛ پیاوان بە ڕاووشکارەوە خەریک دەبن و ژنان و دۆمۆنی (مندال) بەسەر میوە خڕکردنەوە و گیاوگۆڵ کۆکردنەوەدا ڕادەگەیەن. دێرینە ناس پ. ئەف

مەنکۆ، وای بۆ دەچێ کە ئەوزار و ئامێری نیشاندەرتالآن سەر بە هەردوو ڕەگەز – ژن و پیاو – بووگن. پاژە ئەوزارەیلی نووك تیژ، کێردی پیاوان بوو و هەرچی ژنان بوون پێناوەیلی شمەك ڕووشێن و داروبەردتاش – Radoir – یان بەکار دێنا. کاردابەش کردن بە پێی تەمەن و ڕەگەز، نەتەوەکانی هەریەکە لە تەرحێ و هەریەکە لە ڕەنگێ کەلەپووروناسانی وەسەر کەلکەڵەی لێوەکۆڵین و وردکردنەوە ئێخستییە. وە نموونە: لە ئوستڕالیا ژن و دۆمۆنی، ماسییان دەگرت و خێروبێر و بەخششتی خۆرسکیان گرداری دەکرد و پیاوان بە ڕاووشکارەوە سەرگەرم بووگن. ئیدی بەم ئاوایە کاردابەشکردن لە نێوان پیاوانی هۆزدا جۆرە جیاوازییەکی لێ دەکەوێتەوە: پیاوان بە جیا لە ژنان، خانوویەرە لەبۆ خۆ هەڵدەبژێرن، ژنان جۆرە خۆراکێکی جوداواز و پیاوان تەرحێکی دی بۆ خۆ تەیاردەکەن و زمانی ئاخاوتن لەنێوان ژن و پیاودا بەرەو فەرق و سوو دەڕوا. فەرقی نێر و مێ لە ئەغڵەبەی زمانانی نەتەوەکاندا پەیدا دەبێ، تەنانەت ئەدەبیاتی ژنان کە تا ئەوڕۆکەش لەنێواندایە و هەیە، هەر پاشماوەی ئەم لێك جوداوازییە لە مێژینەیەیە.. پۆشاکی ژن، لە زۆر سەرەوە لە ئی پیاو جوێ دەبێتەوە، تەرزی ڕەفتار و کردار و هەڵسوکەوت و تاد هەموو تا ڕادەیەکی بەرچاو دەگۆڕێن. ئەدەبیاتی ژنان، ڕەنگی پۆشاکی ژنان، تەرزی ئاخاوتنیان، لەنجەولاریان، جۆری پیاو لە خشتەبردن و مەکرۆیی و دەهۆ و پیلانیان لە ئی پیاوان جوێ دەبێتەوە، ئارایشتیان، خۆ دە بەزەك و دۆزەك دانیان، وەك ئی پیاوان نابن... تا ئەوەڕۆش تەرزی ڕەفتار و کرداری پیاو و ژن جوداوازن و تا دێ لێکدی دوورتر دەکەونەوە، ئەمەش لە یەکەم کاردابەشبوونەوە ئاو

دەخواتەوە. ئەم کاردابەشبوونە لە بنەڕەتدا دەبێتە هۆی ئەوە کە بڕێ ڕدێن سپیی بە ساڵداچوو کە بە دەم ڕۆژگارەوە ئەزموون و مەهارەتێکی کۆمەڵەکییان دەردەست کردووە، پلەو پایەیان لە سەرووی هەموانەوە بێ و ببن بە دەمڕاست و قسەڕەوای هۆز و جڵەوی سەرلەبەری کاروباری کۆمەڵی هاوبەشەکی وەدەستەوە بگرن و ببن بە پێشەوای کۆمەڵ و وەو سانە لە بەرابیی دەورانی کۆنە بەردینی نوێوە، کۆمەڵی مرۆڤەکی مالآوایی لە ساختمانی گەلەی سەرەتایی دەکا و ئەو جۆرە سازمانە بەجێ دێڵێ: بەرە - بەرە کە هێزەکانی بەرهەمهێن و کاردابەشبوون فراژوو دەبێ و وەگەشەکردن ئەکەڤێ و کامڵ دەبێ، گەلەکە جێی خۆی بۆ سازمانێکی کۆمەڵەکیی بالآتر - شێوەی سەرەتایی هاوبەشەکیی خێڵەکی - بە جێ دێڵێ، دیارە مرۆڤ کە بەم هەموو گۆڕانکاری و هەوار و قۆناخگۆڕییەکییەدا تێدەپەڕێ و سەربەنی یەکەم گۆڕانی کۆمەڵی لە دابەشکردنی کاردا وەدەس ئەکەڤێ و ڕەگەز و تەمەن و ئەزموون و فەرق و سووی وەدەس هاوردن و هتد فەرق دەکەن. ناشێ لەش و لار (تیپی بیۆلۆژی)ی هەروەك خۆی بمێنێتەوە. مرۆڤ لەش و لاریشی لە ڕووی بیۆلۆژییەوە بەر گۆڕان و گەشانەوە و لێکولووسی و ڕێکوپێکی و مشتومالْ بوون کەوت. مرۆڤی سەروبەندی کۆنەبەردینی نوێ لە ڕووی لەش و لارەوە لێل مرۆڤی نییاندەرتاڵدا جیاوازە. ساختمانی هێسکبەندیی مرۆڤ لە باروشووشی، بەسەر هەردوو پێوە بە تەواوەتی ڕاوەستانی، شایەتیی ئەوە دەدەن کە: گەرچی قەوارەی مێشکی ١٤٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو بووە) دەفرێتیی کاسەسەری پێشینیانی هێندە زێتر نییە، بەلآم شکڵ و بیچمەکەی گۆڕاوە،

پاژەکـانی: تەپڵــەکی Parietac – بەردەمــەکی – Frontal – و لاجــانگی – Tamperal –، واتە: ئەو پاژانەی کە سەروکاری بـە ئـەوزاری نوتقـەوە هەیـە و مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی جیاواز نیشان دەدا بە شێوەیەکی بەرچاو گـەورە بوون. سەرەنجام کاسەسەری مرۆڤ بە شـێوەیەکی درێژکۆلـە (دۆلیکۆسـڤال – Dolchocephal – دێتە گـۆڕێ)، هەنیـە شێوەیەکی ڕاستەوڕاست بـە خـۆوە دەگرێ و ئیدی برۆ بەو ناڕێکوپێکییە نـامێنێ و پاشـانەکێ شـەویلە سـووکتر دەبێ و چەناگە بەهۆی کامڵ بوونی زوانەوە زەق و زۆپی پەیدا دەکا.

زانستی بۆرژوازی لە زەوینەی مێژوودا چـەندین جـار هـەوڵی داوە کـە گۆیـا مرۆڤی - Homo Sapiens - هەر لە سەرەتای پەیدا بوونیەوە، هاوچەرخ بـووە و بەم جۆرەی ئـەمڕۆ بـووە و هاوکـات دەگـەڵ نیياندەرتاڵـەیل زەوینیـان ئێخستیتە بن ڕکێفی خۆ و ئیدی بـەم ئاوایە، مێژوونووسـانی بـۆرژووازی لـە هەڵپـەی ئـەوەدان بــەندواریی مرۆڤــی هاوچــەرخ وە وەرینانیــەوە بـوڕن و پـەیدابوونی وی وە جۆرێ لـە پـەرجوو لــە قەڵــەم بـدەن، کـەچی مرۆڤــی هاوچەرخ، یا بێژین، مرۆڤی بە ژاوەز- Hommo Sage لـە دوادوای سـەروبەندی کۆنەبەردینی دێرینـدا هـەر یەکسـەر و ڕاسـتەوخۆ لــە مرۆڤــی نیياندەرتـاڵ کەوتۆتـەوە. ئەمرۆکە ئێسکبەندەکانی چەندین لە نیياندەرتاڵان ناسراون، کە نیشانەیلی جۆرەکانی هەڵوژێردە نیشان دەدەن. یەکێ لەو ئێسکبەندییانە لە ساڵی (١٩٥٣)دا لە ستارۆسی لێ – Starosselie – کە لە کریمێیە بـە کۆمـەکی دێرینە ناس ئا. فۆرمۆزۆف دۆزرایەوە.

ئەوجا با بزانین مرۆڤی هاوچەرخ کوو بووە بەو کوڕەی ئەوڕۆ؟ ئەو کارە بە فرە هۆکـار و سـەوەو و سـەوەوکار لێـك دەدرێتـەوە: بـەهێزبوونی نـەخش و

کاریگەریی ڕاوشکار لە ئاخروئۆخری سەرویەندی کۆنە بەردینی دێریندا و سەرەنجام فرە پەرەساندنی بەشەخۆراکی گۆشت، کامڵ بوونی لەش و لاری باووباپیرانی مەی سانا کرد، جۆراوجۆری و بەگریوکۆلیی کاری ڕەنێوهێنان پەرەی وە بەهرە و هێزوگوردی بیرکردنەوە و ئاخاوتن دا؛ کز و سووك بوونەوەی هێدی - هێدیی غەریزەی ئاژەڵەکی و وەسنووری و سەروساختەکانی زایەندی لەناو گەلەشدا، دەورێکی گەورەی لە کاری کامڵبوونی مرۆڤدا، گێڕاوە. ئەسڵەن بە پەیدابوونی مرۆی بیرمەند و ئەندێشمەند کاری هاتنەگۆڕێی تیپی بیۆلۆژیکی مرۆڤی هاوچەرخ دوایی هات، واتە، کە مێشك بوو بە ئامێرێکی کامڵ، ئیتر مرۆڤ شێوەی نموونەکی (تیپیکال)ی خۆی وەرگرت و بڕایەوە.. مرۆڤ دوای ئەمە هیچ گۆڕانێکی نموونەکیی بەسەردا نەهاتووە..

مرۆڤی سەرویەندی کۆنەبەردینی نوێ بە چەند نموونەیەکی نەژادی دێتە نیشاندان. لە ئەورووپا نموونەی ئەورووپایی کە کرۆمانیۆن- Cro - magnou - یشی پێ دەگوترێ (ئەم ناوە لە ناوی ئەشکەوتێ کە لە باشووری فەرەنسایە وەرگیراوە)، پەرت و بڵاوبووە. بەرماوەکانی ئەم نموونەیە لەسەر زەویی شۆڕەویی پێشووشدا دۆزراوەتەوە. مرۆڤی کرۆمانیۆن ئەندامی شووش و دەموچاوی پان و کەپۆی قوڵنگی و چەناگەی زۆپ بوون. لە ئەفریقا (لە باشووری بیابان) و لە ئەورووپا باشووری (ئیتاڵیا) ئێسکبەندگەلێکی دیکەیان دیتووەتەوە کە زۆر وەك نەژادی نیگرۆیی دەچێ. بەشەکانی Negroides سەرویەندی کۆنەبەردینی نوێ، دێرزەمانێ لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و بگرە لە بەشی سەرووی ڕۆخانەی دۆندا دەژیان. لەچین لە پاژی سەرووی شکەفتی

شۆكۆتین و له سیبیریا، نێزیكی كراسنایارسك، پاشماوەیلی مرۆڤی تیپیكـالی مەنگۆلییان دیتەوە.

بەڕاستی، مەسەلەی نەژاد و ڕەگەزان مەسەلەیەكی ئایدیۆلۆژیك و سیاسیی فرە توند و تیژە. بیرمەندانی كۆنەپەرستی دنیای سـەرمایەداری دە هەڵپـەی ئەوەدابوون كە بە هۆی ڕامانەی نەژادییەوە، دەسەڵاتی سەرمایەداری بەسەر گەلاندا سەپاندن پاساو بدەن. ئەمانــە پروپاگانتـەی ئـەوەیان بڵاودەكردەوە كە گۆیا زانست پەژێ هەندێ لە تیرەی مرۆڤ لە هەندێكی دیكەیان ڕەسـەنتر و باشـترن. هـەروەها لاڤ ئەوەیشـیانە لێـداوە كـە ئـەورووپا هەمیشـە بنیادەمـەكانی لەگـەڵ بنیادەمـەكانی ئاسـیا و ئـەفریقیادا جیـاوازن، شۆڤینیستانی عارەب و عەجەم و تورك هەر لە هـەروگیڤی ئـەوەدان نەتـەوە بە زۆر پێوە لكێندراوەكانیـان، وەك وە نموونـە: كـورد: گۆیـە بەچكـەی جنۆكەن، لە دێو و درنجن و ئیتر لەم قسە قۆڕەیلە وە با بدەن.. بەڵام ئەمڕۆ زانسـت ئـەم قسـە بێئامانـەی سـەر لەبەر پووچاندووەتـەوە و كـەم كـەس باوەڕیان پێ دەكەن.

خوێندەی بەرێز، حەزدەكەم هێندێكیشتان لەمـەڕ شـارەگەكانی سـەروبەندی پێش مێژوو، سەروبەندی مێژوو: سەردەمی دێرین، بووژاندنـەوە (ڕێنەسـانس - زیندووكردنەوەی كەلەپووری ڕەسەنی ڕابردوو)، بە ئەقڵ ئـایین لێكدانـەوە (إصلاحـی دیـنی (Reformation)، ڕۆشـنگەری (تنویـری) و (شۆڕشـگێڕی Revolution) قسـان بۆ بكـەم. بـێ گومـان شـارەگەكانی بـیری پێـش مێـژوو بەروبووی زێتر خەیاڵ و وەهمە تا ئەقڵ و ئاوەز، چـون مـرۆڤ - گریمـان لـە مرۆڤـی نیاندەرتاڵـەوە پێدا بێـین- لـەو تاریكولێڵـەی مێـژوودا، مێشـكی

ئەوەندەی بە بەرەوە نەبووە لە ئەوزاری هەرە سەرەکیی لە زوێلّ و تەڵەزمی سێگۆشەبەردەستێ و ئەوزار و ئەسپابی ڕاووشکار، وەك: چەنگالّ و نێزە و نەجاخی دارینە بەولاوە، زێتر بڕ بکا؛ چونکە گوتمان مێشکی مرۆڤی نییاییندەرتالّ کە لە کوردستانیشدا، لە شانیدەر و هەزارمێرد (نزیکەی ١٤٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو) لە دەفریتییی مام ناوەندیی کاسەسەری مرۆڤی ئەوڕۆکەوە ١٢٠٠ تا ١٥٠٠) سانتیمەتر شەشپاڵوو نزیك بووە، بەلاّم هیچ سەرەودەرێ دەربارەی ئەوە کە چتێکی پەرستووە، یا نەیپەرستووە، تا ئێستە ساغ نەبۆتەوە و هەر لە بگرەوبەردەدایە. بەپێی ڕای ئا. ئۆکلادینکۆف، وەك گوتمان، مرۆڤی نییاندەرتالّ هێشتا لە گەشەکردنی مێشکدا بە پلەیەکی وا نەگەیشتبوون بیر لە هێزێکی سەرووی خۆڕسك و سەر زەوین بکەنەوە، لەبەر هەندێ، تەنها لە هەندێ ئاسەواری بەرچاو، وەکو بە نموونە: شکەفتی گوندۆك و وێنە لە بەرد هەڵکەندراوەکانی، بە پێی ڕامانەی دەستەی لێوەکۆلّ کە ئی دەورانی ژیانی ڕاووشکارە، نەك کشتوکالّ، بەولاوە چیتر نییە. بەم پێیە ئاسەواری فیتیشیزم و ئانیمیزم و تۆتەمیزم و تاد... کە بیروباوەڕی ئایدیالیستان لە بڕوا بە ئەرواو چتی سەرووی خۆڕسك و زەوینەوە هەڵدەقوڵێن، نە دینداری، نە بتپەرستی بوون و نە تەڕەماش... چونکە بڕوا بە ئەروا، واتە: بە چتێ کە لە شێوەی خۆڕسك نەبێ و هەرگیز لەچتێ نەچێ کە بە مرۆڤ ئاشنا و ڕۆشنایە، لە مرۆڤی سەرەتایی ناوەشێتەوە... بڕوا بە ئەروا وا دەگەیەنێ کە مێشکی مرۆڤ بە قۆناخێکی زۆر پێشکەوتوو گەیشتبێ و توانستی ئەوەی هەبووبێ وێنەی چتێ، لە ماددەی چتەکە، دابڕێ و بە لەبەرچاولاچوونی ئەو چتە، وێنەکەی لە مێشکدا

گل بداتــەوە و هــەر کـاتێ ویسـتی، بێتــەوە بــەرچاوی، هێنابێتــەوە... واتــە: مێشکی بە جۆرێ گەشەی کردبێ کــە وێنەلەبــەرکردنی لا بووبــێ بــە کـارێکی میکـانیکی. دیـارە ئەمــەش، وەك زانسـت ســـاغی کردووەتــەوە وا نــەبووە، چونکە مرۆڤ وەختێ بووە بە خــاوەنی ئـەم بـەهرە و توانستە کـە هــەزاران ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە و مێشکی تەواوێ گەشەی کردووە. میسرییەکان تــا (١٠–١٢) هەزار ساڵ لەمەوپێشیش کە زۆریش پێشکەوتوو بوون، هێشـتا بــە خەتی هیرۆگلیفی چتیان دەنووسی کە لە فینیقییەکانەوەی فێر ببوون. واتــە لە قۆناخی بەرجەستەکردندا دەژیان. میســرییەك نەیتوانییــە مانایــەکی وەك، بە نموونە: خۆشەویستی، سۆز، هۆش و تاد... بە واژە، وەك ئێمــە ئاسـاییی ئەمڕۆ، دەربڕێ. مامۆستا جەلال حەنــەفی کــە بــۆ خــۆی کـوردی کەرکووکــە، چەند ساڵ لەچین بوو، جارێکیان لە خزمەتیدا بووم، لێم پرسی: ئەرێ چینی فێربووی؟ فەرمووی: کــەم. گـوتم ئەگــەر گــەرەکت وێ بێـژی وەشـت و واران ئــەوارێ، چۆنــی دەنووسـی و چۆنـی دەڵێــی؟ لەســەر کاغــەزێ وێنــەی وەك زەلامێك ســەیوانی بەدەسـتەوە بــێ، بـۆ کێشــام، فــەرمووی، واتــە: بــاران دەبارێ.. گوتم ئەی ئەگەر بە گوتنی بێژی؟ دەنگێکی لێوەهات وەك دەنگــی باران دەچوو ششش.... نە هــاژە بــوو نــە گڤــە..،بــەلام بـۆت هەیــە بپرســی: باشە خــۆ ئــەمڕۆ چینییــەك، ژاپۆنییــەك، ســەرەڕای ئــەوە کــە وێنــە: واژە و دەستەواژە و ڕستە دەنووسن، مانای ئەوە نییە کە بەهرەی بۆ ماناچوون، وێنەی چتی ماددی لە مێشکدا گلدانــەوەی نییــە، وەلام ئەوەیــە کــە ئێمــەش وەك: هــەر وەکـو چینــی و ژاپۆنییەکــە واساین، کـە باڵندەیــەك، بــە نموونــە پێشکە دەنووسین، بەلام ئێمــەش و چینییەکــەش و ژاپۆنییەکــەش، فــەرق و

تۆفیرمان لەگەڵ مرۆڤێکی میلیۆنێ ساڵ لەمەوپێشدا، ئەوەیە کە ئێمە مێشکمان یەك میلیۆنە ساڵ بەر گۆڕان و گەشەکردن و گرێ و گۆڵی و هەزاران خانە لێ زیاد بوون کەوتووە، ئەوجا بەم بەهرەیە گەیشتووە، بەلاّم مرۆڤێکی پێش یەك میلیۆنە ساڵ لەچاو مێشکی ئێمەدا سادە و خاو بووە. زانست ساغی کردۆتەوە کە گیانلەوەر یەکەم جار لە تاکە خانەیەك گووراوە، وەلێ پاش میلیۆنەها ساڵ ئەوجا بەم هەموو جۆر و ڕەنگ و تەرح و تاد...یە گەیشتووە. ئێمە، کە بە نموونە پیتی A دەنووسین، هەرگیز ئەوەمان بەبیردا نایە، کە ئەم A یە وێنەی سەری گا AlFA = Faox - یەك بووە، پاشان بەم شێوەیەی ئەمڕۆی لێ هاتووە. یا چینییەك ڕستەی "باران دەبارێ" بە وێنەی کابرایەك سەیوانێکی بە دەستەوە بێ و ڕێ بکا، دەنووسێ، هەرگیز کابرایەکی سەیوان بە دەستی وەڕێوەچووی بە بیردا نایە، هەروەك ئێمە کە A دەنوسین وێنەی سەری گایەکمان بە بیردا نایە..بە ڕاستی لێرەدا ئەوەمان بە بیردا دێ کە هەر نیشانەیەکی کە مرۆڤ لەگەڵ ئەفرادی کۆمەڵەکەیدا لە سەری ڕێك کەوتبێ، یا ڕێك بکەوێ، بە مانای ئەم چتە یا ئەو چتەی بەکاری هێنابێ یا بەکاری دێنێ، ئەوە نماد، ڕەمزە و دیاردەی ڕەنگدانەوەی مەرجەکی (المنعکس الشرطي) Conditinal reflection - یە، کە زانای نامێی پووس کردوویە بە ڕامانەی بەناووبانگ. بەمە هەرچی چتێ لە مێشکی مرۆڤدا، وەك کۆمپیووتەر، هەس، لە نماد بەولاوە چی دی نییە. سەرلەبەری زانیارییەکانی مرۆڤ لە دنیادا لە زانست، وە گشت ڕشتەکانیەوە، لە فەلسەفە، وە هەموو جۆرەکانیەوە و لە هونەر بە سەرلەبەری تەرحەکانیەوە، چ وەك مایەی بەرجەستە و بەرچاو و بێن و بیست و چەش و

لەش، هەموو هەر ڕەمز و نمادن. ئەسڵەن مرۆڤ بەم نیشانە و نماد و ڕەمزە زۆر و زەوەندانەوە بووە بە ئاشنا و ڕۆشنای خۆیشی و غەیری خۆیشی کە وجوودە. بە قسە زۆروانییەت بیروبۆچوونی هەرە کۆنی ئێرانی نەژادان بە خودای چاکە و خراپە زاندراوە و گۆیا لە پەیدابوونی ئارياييەكانەوە تا سەروبەندی ساسانییان کەم و زۆر لە باو بووە. هەروەها لە ئێرانزەمین (ئیندرا) سەر بە میترا بووە و خوداوەندی گشت بووە. لە بەردەنووسێکەوە کە لەسەروبەندی هیتەکانەوە لە ئاسیای گچکەدا دۆزراوەتەوە دیاردییەك بۆ میترا کریاگە و میدراشیل (Midrashil)یان پێ گوتووە کە لەوە دەچێ خوداوەندی تیرە و هۆزە میتانی (Mitani)یەکان، واتە: جگە لە میترا لای میتانییەکان ئوراواناشیل (Urawanashil)ێکیش (ئۆرانۆس) لەپاڵ میترادا هەبووە و لە پەرتووکی (ڤیدا)دا بە واروونە (دەمەوڕوو) نێوبراوە. هەروا (ئاشا) و (ئارتا) و (ڕیتا) و (ئاسفین) و (ئاشادتیانا) کە پاشانەکێ بووگە وە (ڤایا) (با) لە کوردستاندا هەبووگن. لە لوڕستان کەڵگامێش (وە سەر مێشن، مەڕ و وە لەش (گا) کە لە نك کاسییەکان نیوە خوداوەندێ بووگە (لەلای کوردەکانی لوڕستانی ئەمڕۆ بە پلەی خودایی گەیشت). کەڵگامێش لە شێوەی پیاوێکدایە کە دوو شاخی هەبێ، دوو شاخیش لەنێو کوردەواری و مۆزەپۆتامیادا نیشانەی خودلوەندی بووە. ئەم کەڵگامێشە پارێزگاری چارەوێ و گەلەوڕانی پەز و مەڕومالات بووە. دیارە شوانکارەییی گەلەوڕان و ئاژەڵداری تا سەت ساڵێك لەمەوبەریش لە زۆرینەی زۆری کوردستاندا هەر دەتگوت دەقاودەق بە بالای کوردەواری براوبوو. ئەوجا بەش بە حالی مرۆڤگۆوڕاندن و هێندەی کە سەروکاری بە بیروبڕوای کوردەوارییەوە هەبێ،

ئەوەیە کە ئەهورا دە پێشدا کەیومەرت، مەردی (فانی)ی گووراندووە. بە ڕاستی، کە باسی دووروودرێژی ڕسکانی کەیومەرت دەخوێنییەوە، ئەوەهێت لە بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە حیکایەتی ئایەم گووراندن، زێتر بەڕووبووی نوسخەیەکی زەینی چۆلگەڕ و دەشت و ئارانانە تا ئی خەڵکی چیاو کۆ و کۆساران..ئەتۆ هەر وا بڕوانە واژەی (کەی) بە مانای پاشا، سەرگەورە (کویخا، کەیا، کەویوانتۆ، خانوو) بە زۆرینەی زارە کوردییەکان بە تایبەت ئەمەی دواییان لە دملیدا، لە باوە. واژەی "مەرت" مەردم بە مانای خەڵك، پیاو، پیاوی ئازا لە زۆر ناوچەی کوردستان لە باوە، مەردە، لە ناوی "باوەمەردە" کە زێدی دالکمە و لە خوار سلێمانییەوەیە و قوڵدەرەسی و باوەگێڵدیی لە تەکەوەن، تا وێستاکەش هەر ماوە. تەنانەت واژەی (مەردۆخ) یان (مەردوك) کە نێوی خوداوەندی بابلستانە، تیرەی (مەردۆخی) لە کوردستاندا، هەر لەو مەردەوە کەفتگەسەوە. وەلێ کاکەییەکانی سەر بە تۆلی ئەهلی هەق، باوە ئایەم گووراندنیان، وەك لە تەزکەرەی ئەعلادا نووسراوە بەم جۆرەی پایینی وێنە کێشاوە: چون جیهان ئافەرین لەسەرەتای دنیا ڕسکاندنەوە لەپێشدا بە قوورەتی تەواوی خۆی دوڕێکی گووراند و لەناو ئەو دوڕەدا پێنج وێنە لە وێنەی خۆی بە دیارکەوتن و کەرەمی فەرموو لە قوورەتەوە، قوربانی ئامادەکرا و لە بەزەی خۆیەوە ناو تەیارکرا، لە پێنج وێنەکان یەکێکیان هەڵستا، دەستی ڕاستی قوربانییەکەی بڵێند کرد، "هەوەڵ و ئاخر هەر یار و یا هەق"ی فەرموو و دوعای خوێند و هوویان کێشا و قوربانییان کوشتەوە و فەرمانی فەرموو، ئاورێ هاتە گۆڕێ و گەنجینەیەکیان دەبن گەرووی قوربانییەکەوە دەرهانی و قوربانیان کوڵاند و

هێنایان بەسەرجەمیاندا بەشیبەوە و دوعایان کرد و هوویان کێشا و ئەوجا پاش ئەوە هەزار و یەک وێنە بەدیارکەوتن و ئاویان گێڕا و لە قوورەتەوە سفرە و خوان هات، سفرەیان ڕاخست، قوربانییان هێنایە نێو جەمی، یەک لەوان ئێسکەکەی ڕووتاندەوە و ئەوجا بەشییانەوە و دوعایان کرد. سەرلەنوێ لە قوورەتەوە نیاز هات، گۆشت بەشرایەوە، هەمدیس دوعا خوێندرا و پاشانەکێ سفرە و خوانیان پێچایەوە و دیسانەکێ دوعایان کرد. پاشانەکێ ئاو گێڕدرا، ئەوجا دەستیان شوشت و دیسانەکێ دوعایان کرد و دوایی دوعای قەبزیان کرد پاشان یەک تنۆکە نوور لە هەنیەی یەک لەوان چکیا و بوو بە گوێز و خرایە نێو جەمی و کەرەمی فەرموو بڕیار وایە کە هەژدە هەزار عالەم ئیجاد کرێ، فەرمانی فەرموو لە قوورەتەوە قەواڵەی "سڕ مەیەژە" هات کە هەزار و یەک مۆر بە ناوی خوداوەندی عالەمەوە لە بابەتی خێوی ئەم گوێزە لەسەر قەواڵەکە بە دیارکەوت، پاش ئەوە هەر بە قوورەتی تەواوی خۆی لە وێنەکە نزیک بۆوە و دوڕ (مرواری)ی تایەن پێوار بوو خوداوەندی هەر هەبووەگە و هەر ئەوێ و تاق و تەنیا، هەر خۆی ماگەوە.هەفتا هەزار ساڵ ڕابرد و خوداوەندی عالەمیش دوڕێکی ئەفراند و لەناو ئەو دوڕەدا ٧ وێنەی خۆی دیتن و پاشان ٢١ وێنە بەدیار کەوتن و پاشەنەکێ ٤١ وێنە بە دیار کەوتن و پاش ئەوەش ئەوجا دوڕ پێوار (غەیب) بوو و خوداوەندی گێتیش خۆی لە نێو گێتیی دەرووندا بە تەنێ دیت (فەرمووی: (لیس فی الدار غیرة الدیار). (غیرە الدیار) نووسراوە، هەڵەیە، دەبوا (غیر الدیّار) بلێ، واتە: لەخۆی زێتر کەس لە ماڵێ نییە.دوای ئەوە، حەفتا هەزار ساڵیش بەسەر چوو، دوڕێکی گووراند و لە نێو جیهانی

دەروونیدا گوورا و لەنێو ئەو دوڕەدا حەفدە وێنە و پاشان سی و حەوت وێنەی دیتن و پاش ئەوەی چل و حەوت وێنەی دیتن، دوای ئەوە خۆی بە حەوتا و دوو وێنە دیتن و ئەوجا پاشانەکێ دوڕەکە بۆ خۆی غەیب و پێوار بوو و بۆ خۆشی بە تاقی تەنێ مایەوە و حەفتا هەزار ساڵی دیکەش بەسەرچوو و ئەوجا فەرمایشتی فەرمووی: دوڕێك گوورا و خۆی لەنێو ئەو دوڕەدا بە سێسەد و شێست وێنە دیت. پاشان خۆی بە چوار سەد و چل و چوار وێنان دیت و هەمدیس فەرمانی فەرمووی: دوڕەکە پێوار بوو و بۆ خۆشی بە تاقی تەنێ مایەوە و حەفتا هەزار ساڵ ڕابرد و پەروەردگاری جیهان فەرمانی فەرمووی: دوڕێك گوورا و خۆی دە نێو ئەو دوڕەدا بە حەفتا هەزار وێنە دیت و هەمدیس ئەو دوڕە پێوار بوو، حەفتا هەزار ساڵی دیکە بەسەرچوو، خوداوەندی گێتی فەرمانی فەرمووە: دوڕێك گوورا و خۆی لە نێوان ئەو دوڕەدا بە نۆسەت و نەوەت و نۆ وێنە دیت و پاشانەکێ لە سەت و بیست و چار هەزار وێنەدا خۆی نواند و هەمدیس فەرمانی فەرمووی: ئەو دوڕەش پێوار بوو و دیسانەوە خۆی بە تاقی تەنێ دیتەوە، ئەوجا پاش چەندین هەزار ساڵ دەگەڵ خۆیدا لە قسە و وتوویژ و سەیر و سەیراندا بوو و ویستی خۆی لە سەرلەبەری بوونەوەران ئاشکرا کا کە لە نووری پاکی خۆی دوڕدانەیەکی دە شێوەی چرای ڕسکاند و شێست هەزار ساڵ دەگەڵ زاتی پاکی خۆیدا لە گەشتوگوزار و سەیراندا بوو و هیچ بوونەوەرێ حەددی بوونی لەپێش ویدا نەبوو و نییە کە بقامێ یان قامیدەبێ کوو بووە و چۆن بووە و چۆنە. ئەوجا لە کەرەمی تەواوی خۆڕا چار دانە نووری لە نووری پاکی خۆ چکاند و جبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل و عیزرائیل لەو نوورە نەفیسەن و

ئەو چرایەش بوو بە ئاو و لەوی چار دانە نووری دە شێوەی گەوامێری نەسمرِاو ڕسکاند و لەو گەوامێرانە یەکیان بوو بە ئاو کە سەرلەبەری عالەمی حالّ وا دیارە، هەموو ئاو بوو و شێست هەزار سالّی دیکە جیهان هەموو هەر ئاو بوو و بۆ خۆی دەگەلّ ئەو ئاوە لە گەشتوگوزار و سەیراندا بوو، پاش ئەوە "ساجی نار"ی ئەفراند کە ئاوی بە کولّین هێنا و ئاوەکە وەك کەفی دەریای لێ هات و پاشانەکێ کەفی پێ بننایەوە و هەلّمێ لەو ئاوە بلّیند بوو، بوو بە هەور و لە ئاسمان قەتیس وەستا تا بۆ هەمیشە ببێ بەچی و لەهەوای ئەو ئاوە بای گووراند کە هەوران وە جموجوولّ بێخی، ئەوجا ڕاوەستان و ڕۆیشتنی هەور بە دەستی بایە و وەك چۆن مرۆڤ ڕۆحی لە قالّبدا هەس، ئەوژی لە حوکمی ڕۆحدایە و شکلّی هەور دە شێوەی بێژینگیە و هەر بۆ وەیش ئاو دەبارێنێ. فەرمان بە کەف درا کە ئارام بگرە، کەف ئارامی گرت و هاتە سەر زەوین و سەبری ئارام گرتنی نەبوو. لەو سێ گەوامێرە کە هەبوون کێوەکانی بۆ لەنگەرگرتنی زەوین و تەپە و تەلان ئەفراند و لە دلآوایی خوداوەندی شکۆدار بۆ خۆی دەبوا لە هەور کە کاری وی ئاوەلگرییە، باران ببارێنێ و کۆ و کۆساران تەڕی بۆ خۆ ڕاکێشن و کاتێکی نم دێتە خوارێ، ئاوی لێ هەلّێنجن و بۆ بنەوەی برێژن، تا ئاو لە کانیاوانڕا بڕوا، کەچی سەرباری ئەو هەموو هەول و دەولە، لەنگەری زەوین دابین نەکرا، ئەوجا کەرەمی فەرموو کە ئەی زەمین ئارام بگرە، زەوین بە زمانی پەرجوو بە عەرزی ڕاگەیاند کە ئەی دین و ئیمانم ئەو نانموودییە چیی تێدا بەستەیە کە لە قوورەتی تەواوی خۆت ڕازاندووەتەوە و دووەم بە چی ئومێدەکەوە ئارام بگرم؟ پادشای بێ هاوتا کەرەمی دەربارە نواند،

فەرمووی: ددانت بە داماویی خۆتدا ناو بەم جۆرە خۆت عەرزت کرد، دە بڕۆ وا مز و پاداشتی تۆ ئەوەیە کە جێی ئەولیا و ئەوسیا بی و هیچ پاژێکت لە کڕنووش بردن لە بۆ مە خاڵی نەبێ و هەمیشە جێگەی کڕنووشی خەڵك بە، جێگەی چاکە و خراپە، مرتکانی و لە گوڵی ڕەنگینت تەژە کەم، موتمەئین بە، ناوەکەی دیکەشت موتمەئەننە (جێی دڵنیایی)، ئیدی زەوین بەم ئومێدە لەنگەری گرت و هێوری و داسەکنی و ستاری گرت، وەلێ هەر لە کەف و کوڵ و شەپۆلدا بوو. شای جیهان دەگەڵ چار مەلایەکەتی نێزیکیدای ڕۆنیشتبوون، لە پڕ نواڕییان زاتی پاکی حەزرەتی ڕەزبار، کە خاتوون قیام (قیامەت)ـە بە ڕواڵەت کولیچەیەکی لەنێو دەریا دەرهێنا و بۆ خزمەتی پادشای جیهانی هاورد، پادشای جیهان فەرمانی فەرموو، دەگەڵ چار مەلایەکەتدا جەمیان گرت و بەشییانەوە و دوعایان خوێند و هوویان کێشا، هەنگێن زەمین و ئاسمان هێورین و ئارامیان گرت و ئاسمان بوو بەو کولیچەیە و دە بن زەویندا گابەردێکی دروست کرد و دەبن گابەردەکەدا فریشتەیەکی خوڵقاند کە هەردوو دەستی وەك ئەستوندەك وەبن گابەردەکەی دان و دەبن پێی فریشتەکەدا گایەکی گووراند و پێی فریشتەکە بە شاخی گاوە گیر بوو و گای لەسەر پشتی ماسی ڕاگرت و ماسییەکەشی لەناو ئاو ڕاگرت و دەبن ئاوی گابەردێکی دانا و گابەرد لەسەر بایە و با لە قوورەتی خوداوەندەوە لە گەڕوخولدایە، بەم تەرزە خوداوەند هەر یەکەی دە جێگایەکیدا ڕاگرتووە و چتاقیان لە کەرەمی فرەوانی وی بێ بەهرە نابن و ئەوجا هەرحەوت تەوەقەی ئاسمانی دروست کرد و هەر تەوەقەیێ بوو وە چەند ئیقلیمێ و لە هەر ئیقلیمێکدا چەندین هەزار بوونەوەر لە دەریایی و

بەژەکی جێیان هەس کە جگە لە زاتی پاکی کەسێکی لێ باخەوەر نییە و هەر گرۆیەك بە هەوپای شوێنێکەوەن، وەلێ ڕێ هەر ئەو ڕێیە و مەنزڵ هەر هەمان مەنزڵ. دەبێ مرۆڤ تێ بگا کـە دارایـەك بتوانـێ هـەژدە هـەزار سـەر لەسـەر شاخی گایەك جێ بکاتەوە و بزانێ کە ئەم کارگەیە بێ کارگوزار نییە، بۆچی بە بێهوودە سەر بە هەر ڕێیەکدا بکا؟ لە پریشکی ئـەو ئاوری ساجە کە بـە دیارکەوت، ئاوری گووراند لەسەر زەوین جێی بەویش دا کە ڕاڤـە و شـرۆڤەی ناکەین، نێویان لێ نـا دۆژەه و لـە گـەوامێراتی دیکـە ئاسمـانی خولّقـاند، کە جیهانی باڵایە و بەژەك و دۆژەکـی لـە زەویـن زێـتردا و ئارایشـت و ڕەونـەقی پتردا و لـە ڕێـزەی نـووری پـاکی، ئەسـتێرە و مـانگ و ڕۆژی ئـەفراند و هـەر یەکەیانی بـە زەڕ و زێـوەران ڕازانـدەوە و خـۆری لـەبۆ ڕوونـاکیی ڕۆژ کـە خەلّکوخوای جیهان هەریەکە سەر وەکارێکن و دەبێ وە ئـەنجامی بگەیـەنن، خولّقاند و مانگی لـەبۆ ڕۆشـنایی شـەو و ئەسـتێرەکانی هەریەکـە بۆ کـارێ گووراند چ لەبۆ ڕووناکی، چ لەبۆ ئەزموونی ستێرە ناسان و کارەیلێ کە لـە ئەختـەران دەکەونـەوە و شـەو و ڕۆژی دانـا و ئەمانەشـیە هەریەکـە وە کارێکەوە بەست، تا خەلّك دڵیـان تـەنگ نـەوێ و وەڕەز نـەبن، چـون ئەگـەر دنیا هەمیشە ڕۆژ با، خەلّك وە ڕەحەتی نەدەژیان و ئەگەر سەرومڕ دنیا هـەر شەویش با، هەمدیس کارەکە هیچی تێدا بەستە نـەدەبوو. لـە پێشـەوە ئـەم جیهانەی ڕازاندەوە و بە ڕای کامڵی خۆی هـەمووی بـە دیـار کـەوت و کـات و سـەعاتی دانـا و چـاروورزەی ڕانـا و زانایـانی سەرسـامی ئـەو مانایـە کـرد و بەهەشتی لە گەوامێری دیکە کە گەوامێری زانستە و لەوی چکیا بـوو، ڕازاوە کرد و جەبرەئیلی داوا نەفەرموو تا پاش سی هـەزار سـاڵ، نێویـراو فـەرمانی

فەرموو: کە ئەی جەبرەئیل تۆ کێ و من کێم؟ چون لە سەرڕشتەی خۆی باخەبەر نەبوو، بێ باکانە گوتی: تۆ تۆی و من منم، تا ئەوە بوو کە تا سی هەزار ساڵی دیکەی لێ وەڕکدا چوو، دووری خستەوە پاش سی هەزار ساڵ وەگەڕایە حوزوور، فەرمووی تۆ کێ و من کێم؟ هەمدیس وەرام وە هەمان تاس و حەمام، تا چەندین هەزار ساڵ ڕابرد. پاشانەکێ فەرمانی فەرموو کە ئەی جەبرەئیل ئەتۆ سەیرانی لامەکانت پێ دەوێ، هەڕۆ، گەشت و گوزاری لامەکانی خۆت بکە. جبرائیل بە فەرمانی پەروەردگاری مەزن وە پەیجووی ناچێ (لامکان) کەوت، تا پاش سی هەزار ساڵی دیکە بە وڵاتێ گەیشت کە لە دەریای ئۆقیانووسدا بوو، چاوی بەرجەستانە پێ کەوت کە بەرماڵی پیرۆزی لەسەر دەریا ڕاێخست و دەگەڵ دەریاییاندا لە سەیر و سوحبەتدا بوو، بێ ئەدەبانە لێی چۆ پێشێ و چاو قایمانە هاتە گوفتار، کە ئەتۆ کێی و ئەمن کێم؟ ئەوە سی هەزار ساڵە لە سەیر و سەفای بەژ و دەریای جیهاندام و چاوم بە کەسێ نەکەوت، هەر هێندەی بەخۆ زانی تووڕە بوو و بە گۆشەی نیگایەك پەڕوباڵی بە جارێ هەڵپرووزا، واتە: تێ بگە کە بێ ئەدەبی لە مەنزڵی هەقدا سزای ئەمەیە، ئەوە بوو تا سی هەزار ساڵی دیکە بێ پەڕوباڵ، بوو بە مەلەوانی سەردەریا، پاشانەکێ وە هەزار ناری عەلی ویڕای عەرزی خزمەتی بکا، بۆ گوناهی ڕابردووی لێ بووردنی خواست و بە داماویی تەواوەوە ڕووی ئەدەبی بەرەو ئەو خاوەن مروەتە نا، کە ئامان هەزار ئامان، ئەی دین و ئیمانم ئەتۆ خاوەن کەرەم و کانی مەرحەمەت و مایەی بەزەییت، زوانی دەستەپاچە توانستی داوای لێ بووردنی نییە ئامان بخوازێ. خاوەن بەزە و مروەت گۆشەنیگای چاکەی وەکرد و لە دەریای بێ پایانی چاکە، دەرکەی

خوانی بەخششی ئاوەڵەکرد و لە گوناهی رابردووی خۆش بوو: کە ئەی جبرائیل ئەگەر ئەفرانکاری مەزن پرسی من کێم و تۆ کێی، عەرزی بکە، بێ هاوتا تۆی و ئەفرانکار و پەروەردگاری مەزن هەر تۆی و ئەمن کەمینەی بەر دەرکەت، جبرائیلم و تۆ خودای هەژدە هەزار جیهانی، ئەمن کەمینەی جیهانی تۆم. ئەگەر جارێکی دیکەی پرسییەوە کە تۆم بۆچی ئەفراند؟ عەرزی بکە ئەی دین و ئیمانم، منت بۆ ئەوە گووراند کە بتپەرستم و بەندەیەکی کەمینەی تۆ بم، بەڵام ئومێدوارم کە لێم خۆش بی و بە گوناهی خۆمم دەگەڵ نەکەی. جا، ئەو جارێکی دیکە کە جبرائیل بەر نیگای فەیزی خوداوەند کەوت و خۆی ناسییەوە و خودای خۆی ناسییەوە. بە ترس و لەرزەوەی عەرز کرد کە ئەی رێنشاندەری رێگای ونبووان و ئەی خاوەن کەماڵی روو لە راستییان، بە هەققی زاتی بێ زەواڵت، ویستوومە تێ بگەم کە تۆ کێی؟ خاوەن مایەی بەزە، کەرەمی فەرموو، کە جگە لە خودا خۆم، کەس لە زاتی من خەبەری نییە، جبرائیل سەری گوێبەفەرمانیی داهێنایەوە و مەرەخەس بوو و ئەوجا هاتە بەر نیگای خاوەنی جیهان و دروستکەری ئایەم، پاشان دەنگێ لە پێوارڕا هات، ئەی جبرائیل بێژە یائەڵڵا، جبرائیل بە فەرمانی جیهانئافەرین یائەڵڵای گوت و خوداوەندی جیهان بەو چوار رێژە نوورەی خۆی کە لە جبرائیلدا بەرجەستە بوو، بەو تەرزی یەکەم جار، بەو تەرزەی کە رێی هیدایەتی بۆ ئاشکرا بوو، عەرزی فەرموو: ئافەرم لە مامۆستا بێ، تۆ کە سەری گوێ بە فەرمانی و زوانی داماویت بۆ ئەم دەرگایە داهێنا، سوێند بە زاتی مەزنم و جوانی مێران تۆم کرد بە بەرپرسی ئەمینی کاروباری رووحانی و لەشەکی.ئەوجا، جبرائیل بە کڕنووشدا هات، سپاسی

بۆ هاوتای بەجێ هێنا، خوداوەند فەرمانی فەرموو، حەفتا هەزار مەلایەکەتی لەخۆ نزیکانی ڕسکاند، لە ڕێزەی ڕووناکیی خۆی حۆری و خولاّمانی گووراند و چەندین هەزار فریشتەی ڕسکاند، جبرائیل عەرزی کرد: ئەی پەروەردگار، هۆی ئەفراندنی ئەم کەمینانە چەس، چ کاروبارێکیان دەعۆدە دێخی؟ دەنگ هات، ئەی جبرائیل سوێند بە زاتی گەورەم کە ژمارەی ئەمانە تەنها زاتی خاوەن شکۆ دەیزانێ، فەرمانی دا: کە سەرپاکی مەلایەکەتانی نزیك بڕۆن بۆ سەر زەوین، لە وێرا بەهەشت هەلگرن و بۆ ئاسمانی بەرن. هەرکە هاتنە سەر زەوین، هەزار کروکۆششتیان بە خەرج دا، بەهەشت لە جێی خۆ نەدەبزووت و هێزی هەر مەلایەکەتێ سەد هەزار بوو، لە هەزار مەلایەکەت زێتر لێی نەوین، دیسان هەر نەبزووت. دەنگ هات: کە ئەی بەهەشت یانی چی نابزوێی؟ ئەتۆم بۆ جیهانی بالاّ هێنان فەرمان داوە، بەهەشت بە فەرمانی خاوەنمیننەت بە زمان هات: کە ئەی پەروەردگار، بەچی ئومێدارییەکەوە ببزوێم. تۆ پێم نایەژی ئەفراندنی ئەم کەمینەیە لەبەرچی بوو؟ هەروەها شتی بێ گورد و بێ هێز چ سوودێکی هەس؟ دەنگ هات: کە ئەمە وایە، واتە: دەبێ ئەفراندەیەك بئافرێنم و ئێوە بکەم بە فەرمانڕەوای و بە سەریان ڕابگەن: میکائیل ڕێبەر، ئیسرافیل دەفتەرداری چاکە و خراپە نووسین و عیزرائیلیش بۆ گیان کێشان، جبرائیل ئامانی کێشا و عەرزی وانی کرد: ئەی دین و ئیمانم، ئەوەتا عیزرائیل گوێڕایەڵیت ناکا و ئەتۆ کە ئەم بوونەوەرە دەگوورێنی و ئەمانە دەکەی بە پێڕەو و ڕێنما و دەفتەردار، ئایا ئەمانە چاکە دەکەن؟ دەبێ ئەمانە چوار پیر بە شەفاعەتخوازی خۆیان بێنن کە چاکە و گرفتڕەوێنییان ڕایی بێ. باشە، ئەم کەمینانەت بە

شەفاعەتخوازی وان فەرموو، ئەدی کوا؟ پاشان دارندەی جیهان و سازندەی ئایەم، بە تەوەججوهی سەرڕێژی (فیض)، لە عیزرائیلی نواڕی، عیزرائیل بوو بە دوو بەشەوە، هەر یەکەیان لە جۆری یەکدی و لە نێوان هەرتکاندا دوو نوور هەڵ تۆقین و وەکو کولیچەیەکیان لێهات. فەرمووی: ئەم وێنەیەم کە لە عیزرائیل جودا بۆتەوە، کرد بە خاتوونی ڕۆژی قیامەتێ و دەبێ لە ڕۆژی قیامەتێ ئەویش بە شەفاعەتخواز بێرن و عیزرائیلیشم کرد بە گیان سێن... بەزەشم بە ڕەزیاردا هاتەوە، ئەم کولیچە (پەپکە)یەش خەڵاتی ئەو بێ و هەر لەبەر هەندێکەش زەوین و ئاسمان لەو کولیچەیەس و کانی گیانانیش هەر لەوییە، کە تۆش بەو جۆرەت قسە کرد، بە هەقی یەکتایی خۆم و جوانیی مرۆ، هەرچی بەرەی هەق ناس و یەك ڕەنگ و دڵسۆز هەن و سەد و بیست و چوار هەزار نوتفەی پێغەمبەرایەتی هەن و هەڵوژێردەی تەواون، مەنزلێ و واری وانم بەرەو ڕووی تۆ کردۆتەوە. ئەوجا بارەگا بەم ئومێدوارییە بڵند بوو و دە جێی خۆدا توێتکەی گرت و پاشان هەندێ فەرمانی بە جبرائیل فەرموو: کە بڕۆ لە زەوین چنگێ خاك بێرە، جبرائیل بە فەرمانی خودلوەندی مەزن چوو چنگێ خاکی هەلگرت، زەوین وەناڵە و زاری کەوت و جبرائیل ڕۆیشت و وەگەڕا، گوتی خوداوەند، زەوین دەناڵی و دەگریا بۆیە خاکم نەهێنا. پاشان میکائیلی نارد، ئەوژی هەر بەوی تەحەری، پاشێ ئەو ئیسرافیل شاند، ئەوژی هەر بەوی جۆری، پشت وی ئەو عیزرائیل شاند، عیزرائیل چوو، قەبزەکا ئاخ ئانی، زەمین ناڵە و زاری کر، گۆت فەرمانا خوداوەندێ جەببارە، خاکی پیشانی نیگای ڕووناکی پیرۆزی خاوەنکار دا، کەرەمی فەرموو، مادامێکی ئەتۆ ئەو خاکەت ئانی و بەزەت بەزەویندا

نەهاتەوە، وا کرىمى بە گيانكێشى وان، خاكەكەى بە حەزرەتى جبرائيل دا و فەرمانى دا، برِو قالّبى ئايەم بە هەمان شێوە، كە لە شێوەێ مە بچىّ تەيار و ئامادە كە. هەژدە هەزار جيهان لەم شێوەيەيە و بريتين لە هەر پێنج بەرەى عەبا، دەبىّ لەم وێنەيەدا زاتى وان بە تەواوەتى بەديار كەون، هەر بۆيە هەنيە نێوى خودايە و هەردوو لێو نێوى محەمەد و چاو نێوى عەلى و برۆى ڕاست نێوى ئيمامى حەسەن و برۆى چەپ نێوى ئيمامى حوسەين و ڕوخسارى نێوى فاتيمەيە و هەر لەبەر هەنديە كە نوورى جيهان ئافرين لە سيفەتدايە. هەنگىّ جبرائيل بە فەرمانى پەروەردگارى مەزن قالّبى ئادەمى ساز كرد، سەروسوورەتى مرۆ، هەر يەكە تا چل ڕۆژ بە ئاكام گەيشت و نوورى حەزرەتى محەمەدى لە هەنيەى ويدا چەسپاند و فەرمانى بە گيان فەرموو: كە هەرِۆ ئەو قالّبەوە. گيان جێگايەكى تاريكى بەرچاو كەوت، گوتى، پەروەردگار ئەوە قەد بە نسيبى كەس نەبىّ، تا لە دووڕا نواڕى، هەر هەمان نوورى ئەو سەروەرەى دە قالّبى مرۆى ئێخست، گيان بە چالاكى تەواوەوە لە قالّبى ئايەمدا دامەزرا و تا زەمانێك كە ئايەم هێمان بە بزووت نەكەوتبوو، فەرمانى فەرموو: ئەى جبرائيل، با ئايەم جووت بن، لە پەراسووى چەپيڕا حەواى گووراند، ئەوسا ئايەم وە بزفت كەفت، فەرمانى بە سەرلەبەرى مەلايەكەتان فەرموو: كڕنووشى بۆ بێرن. ئيدى سەرلەبەريان كڕنووشيان بۆ ئايەم برد، جگە لە دەركرياگى دەرگاى خوداوەند كە سەرى بۆ فەرموودەى پادشاى جيهان دانەنواند. خۆلاسەى قسە، كە ئايەم گوێى لەم وتووێژانە بوو، حەزرەتى جبرِائيل بە ئايەمى ڕاگەياندبوو كە، ميوانێكى دێ نيشان بەو نيشان كە چاوى نێرگسى و ڕيشى دوو فليقانەيە. ئيدى

ئەوەبوو، ڕۆژێک ئایەم لەناکاو شاسوارێك و پیادەیەکی هەژاری دەروێش سەروسیمای تەوزین بە ئەڕەی شانەوە لەپێشدا قووت بوونەوە، ئایەم چوو دەستە ڕێشمەی ئەسپەکەی گرت و شاسوار لە ئەسپ هاتە خوارێ و بوو بە میوان و باسی ئەم میوانەش بەم ڕەنگەیە. "گەی بندە گەی خالق کە ماییم کە ماییم" کاویێ بەندە کاویێ خالق کە ئێمەین کە ئێمەین. ئەمە دەقی بە کوردیی تەزکەرەی ئەعلا. ئەمەی دوایی دەقێکی کوردیی جیهان گووراندنی شێوەزاری باکورییە، کە لە ساڵی (١٩٣٩)دا، قەناتی کوردۆ، لە زاری عەلۆی تەمەن (٩١) ساڵی، لە گوندی تێسیل، ناوچەی ئاخالکالان، کۆماری گورجستانی دەردەست کردووە و نووسیویەتەوە. ئەم دەقە لە زیمنی وتارێکدا، کە ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد، پرۆفیسۆر ق. کوردۆ بە سەرناوی "ل بابەت نڤیسکارا، زمان و ئەلفبایێ پەرتوکێت دینێ ئێزیدیاتی" لە کۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا، بەرگی یەکەم، ساڵی (١٩٧٣)دا پاش ئەوەی داوا لە شوکور مستەفا کراوە کە لە نووسینی کوردییەوەی وەگۆڕێتە سەر پیت و ڕێنووسی کوردی — عەرەبی و کورتەیەکی بۆ بنووسێ، بڵاوی کردۆتەوە و بەندە وا لێرەدا دووبارە دەقەکە بڵاو دەکەمەوە و مەبەستم لە بڵاوکردنەوەشی ئەوەیە کە جگە لە دەقی "تەزکەرەی ئەعلا" کە بە بڕوای من ماکەکەی بە شێوەی کوردیی گۆرانی بووە و کراوە بە فارسی، دەقێکی دیکەی نووسراوی سەرچاوەکانی بیر—ی کوردەواری، بخەمە پێش چاوی خوێندەی کورد و دەگەڵ نێوەڕۆکی بیروبڕوا ئاینییەکەی لەمەڕ "چۆن دنیا گووران" سووکە بەراوردێ بکەم و دیاردی بۆ بیروبڕوا ناوچەقەکانی کوردەواری لە نیگای زانستەوە بکەم، ئەمەش دەقەکەیە:

**قەولێ سورا ئەفرینا دونیایێیا**

ڕەبی دونیا هەبوو تاری،

تێدا تونەبوون مشك و ماری،

تە زیندی کر تەزە حالی،

چ نەما گول ژی باری.

یارەبی، تو هۆستایێ کەریمی،

تە ڤەکر دێ و دریا تاری،

تو هۆستایێ هەر تشتی،

بهوشت چێ کر ڕەنگە بی،

ئەرد و ئەزمان تونە بوون،

دونیا فرەهـ بێ بنە بوو،

ئیسان و حەیوان ژی تونە بوون،

تە خا لێ ساز کر،

د بەحردا تەنێ هەبوو دوڕ،

نە دیماشییا، نە دیمەشییا،

تە خاش ڕۆح ئانی بەر،

نوورا خا لێ پەیدا کر،

گۆشت و ڕۆح هاتنە بەر،

نوورا چاڤان لێ هاتە دەر،

دەست و پێ کرە لەش،

لێ شیرن کر گۆت و بێژ،

خوداڤەندێ مە هۆستایێ ڕەحمانی،

ڕێ و دەرگەیێ دونیایێ ڤەکر،

هەر تشت ژ مەڕا دەرئانی،

بوو بهوشت ئەرد و ئاڤانی،

خوداڤەندێ مە تشتی دناسە،

دوڕا کەسێ ژێ کر ئەساسە،

ژێ پەیدا کر مێری خاسە،

گۆت: "ئەڤا هێ نە بەسە"

.دوڕ ژ هەیبەتا ئێزدان هنجنی،

تاقەت نەکر، هلگەڕی،

ژ ڕەنگێ نیسان خەملی،

سۆر و سپی لێ هێوری؛

ئێزدانی مە ب ڕەحمانی،

حوسن و جەمال ژ مەڕا ئانی،

دەستوور دا قەلەمێ قودەرتێ،

ئەم ئاڤێتن ناڤ دوڕا مۆبەتێ،

هاڤێن ئاڤێتە بەحرێ، بەحر پێ مەیانی،

دەخانەک ژێ دەر خوەنی،

چاردە تەبەق ئەرد و ئەزمان پێ نژنی،

ئێزدانێ مە دۆڕ دەرئانی،

مۆبەت ئاڤێتە ناڤێ،

ژێ پەیدا کر دوو چاڤێ،

ژێ حەڕکی پەڕ ئاڤێ،

ئاڤ ژ دوڕێ حەڕکی،

بوو بەحرا بێ سەری بێ بنی،

بێ ڕێ و بێ دەری.

ئێزدانێ مە سەر بەحرێ گەڕی،

ئێزدانێ مە سەفینە چێ کر،

ئیسان حەیوان تەیر و توو،

جۆت ب جۆت ل سەفینێ سیارکر.

خوداوەندێ مە سەفینە سەرە،

سەریکی دگەڕە چارکەنارە،

سەفینە قول بوو، ئاڤ کەتە سەرە،

مارێ خەرێ خا دانە بەرە،

خوداوەندی مە سەفینە ئاژۆت،

ژ کەنار چوو بەر کەنارە،

ئاژۆتە لالیشێ گۆت: "هەق بەرە".

سوڵتان ئێزدی خوەش ڕێبەرە،

لالیش کو ڕکنێ بەشەرە،

نها ئێزدی ژێ خەبەرە،

یا رەبی، بانگ دکم شێخێ مەزن،

چاڤ کانی، ئاڤ ژێ دزێن،

یا ڕەبی تە دنیا چێ کر، دنیا ب خێر،
ئیسان تێدا دژین ب تێر،
شەڤێت ڕەش، شەڤێت تاری،
جی نەما گول ژێ بارین،
خوداڤەندی، کەریم و ڕەحمان،
کرە ڕکن ئەرد و ئەزمان.
دا بەر مە ڕۆح و زمان،
خوداڤەندێ مە ڕەبل سەمەد،
ئەفراندن شەش ملیا کەت،
جوداکر دۆژ و جنەت.
خوداڤەندێ مە ئەرد چێ کر، ئەزمان گوهاستن،
مجاله ئه ردێ ب ڕاستن، تۆبەتا قەزا گوهاستن
ل گونەهباران بوو روهستن،
چقاس خوداڤەندێ مە دنیا دکر سەفەرە،
سەخر دکر دار و بەرە،
پێ نژنینە ڕکنێ مەخبەرە،
خوداڤەندێ مە هۆستا بەرە،
لالیش ژۆردا ئانی خوارە،
لالیش بوو خاش جی و وارە،
ل ئەردێ شین بوو نەباتە،
پێ زەینی زێندی قنیاتە.

خوداڤەندێ مە ڕەحمانی،

چار قسم ژ مەڕا دانی،

پێ حەبیبا ئادەم نژنی،

خوداڤەندێ مە ڕەحمانی،

چار قسم ل ڕوو دنێ دانی،

یەك ئاڤە یەك توورە،

یەك ئاخە، یەك ژی ئاگرە.

خوداڤەندێ مە ب ڕەحمە،

دیار کر ساز و قودوومە،

هاڤینە ئادەم مەڤسوور زۆر تخوویە،

مەڤسوور گەڕییا، هات هنداڤە،

غالبا ئادەم مابوو بێ کاڤە،

گۆ: ڕوحۆ، چما ناچی ناڤە؟

خوداڤەندێ مە قودرەتە،

زەیاندی چقاس خولیاقەتە،

ژێرا چێ کر دۆژ و جنەتە،

خداڤەندێ مە ئەرد چێ کر، ئەزمان گوهاستن،

مە جالا ئەردێ ب ڕاستن،

نۆبەتا قەزا ڕاستن، ژ نیسان قەنجیتی خاستن،

لالیش ژ ئەزمان دهاتە،

ئەرد شین دبوو گیهاتە،

پێ چەران چقاس قنیاتە،
خوداڤەندێ مە ئێینی کر ئەساسە،
شەمبی بڕی کراسە،
چارشەمێ کر خلاسە،
هەڤسەد سال پاش هەڤسوور هات دورا نکاسە،
هەڤسەد سالی ژ بەری ئادەم ژمارە،
ئەردێ خارا نەگرتی شیارە،
هەتا لالیشا نووری ناڤدا هنارا،و
باندا ڕۆح هەردی،
هات و چوو بهری،
نوورا مێبەتێ هنکاڤتە سەری؛
هات غالبێ ئادەمدا مێوری؛
خوداڤەندێ مە ڕەحمانی،
کاسا سوڕێ ژ ئادەمرا ئانی،
ئاڤ ژ کاسێ ڤەخار، ڤەژی یا،
جیدا مەست بوو، هەژی یا، گۆشت ژێ خاست وی ڕۆحی،
خوین ل جانێ وی گەوڕی،
خیرەت کەتە ناڤ سەری،
ئادەم خار ژ وێ کاسێ،
سڕا کاسێ خاش لێ تێ،
کەرەمەتا کاسێ گیهیشتێ، بهوشتێ،

مەلەکا ملیّ وی گرت، ئاڤێتە بەهوشتیّ.

ئادەم ژ کاسیّ ڤەدخارە،

کەرەمەتا کاسیّ پێڤا دیارە،

خا بێنژی، بوو هشیارە،

گۆ: "ئەڤ ئەرد چ خاشە"

گیهاییّ شین سەر گەشە،

ڕۆژ ڕۆژا مێریّ کەلەشە.

خوداڤەندیّ مە ڕەحمانی،

ژ مەرا کەرەمەك ئانی،

دەم و دەزگیّ باش دانی.

هەی ئادەمۆ ڕۆ دنیّ،

هەردەم بکە ئیمانیّ،

خوداوەند ئەم خلاس کرن ژ تۆفانیّ،

گەلی مریدان بکن کاریّ،

خێرا قودرەتیّ ژ ژۆر باری،

خا دوورخن ژ نەیاری،

کەرەمەتا خوداڤەندیّ مە هاتە خواریّ،

ئەرد و ئەزمان ددن خێریّ،

هوین ژی ببن خودانیّ خێریّ،

قەت ژ بیر نەکن ڤیّ خەبەریّ.

شیکردنەوەی دەقەکان و ئەنجامگری

یەکەم: بیروبڕوایەکان شەقڵ و مۆرەی ئەفسانە ئامێزیان بە ئاشکرا پێوە زەق و زۆپ دیارە. ئەوجا با لە بەراوردکردنێکی خەست و خۆڵدا دە نێوان ئەم دوو دەقە لەمێژینەیەدا، دیاردی بۆ هێندێ بیروبڕوا ناوچەقەکانی کوردەواری بکەم: (١) بیروبڕوای دۆناودۆن Pantheism = حلول = تناسخ = کڵێشە گۆڕی = وحدەتی وجوود = وحدەتی مەوجوود = یەکتاییی فیزیك و میتافیزیك هەموو لە زاراوەی Pantheismدا کۆدەبنەوە. ئەم زاراوەیە لە دوو واژە پێك هاتووە: Pan، کوڕی هێرمیس، خوداوەندی لێڕەوار و جەنگەڵستان و زۆزان و لەوەڕگا و چێرەگایان و پارێزگاری شڤان و گاڤان و نێچیرڤانانە. یۆنانییان Pan – یان دە شێوشکڵی ڕمووزنێکی ناشیرنی کرێتی کوڵکن و شاخداری ڕدێندرێژی کەنهێنی سامناکی زەندەقچوێنی زاڵووتەقێنی بە بەرچاو دێنا. هەروەسا ژی، بە مانای "هەموو چت دەنێو شاخن" بە مانای "سەر بە هەموو چت بوون" دێ و دەبێ بە پێشگر، وەك Pandetia پاندێتیا و پانزوێتیا Panzooetya. جا ئەم Pantheismە، لە Pan + theos خودا، پێك هاتووە. لە ڕووی مانای فەلسەفییەوە واتە: یەکتابوونی جیهان لەگەڵ خوداوەندا. فەیلەسووفی ئینگلیسی ج. تۆلاند (١٧٠٥) زاراوەی Pantaeistی هێنایە نێو زانستەوە، بەڵام هەرچی زاراوەی Pantheismە تیۆلۆجی ئێندەرلاند، خەنیمی وی 1709 (Fai. j) بەکاری هێناوە. هەندێ جار مەیلی ناتورالیستانە، بیروبڕوای ئەوانەی لە خۆڕسك بەولاوە بیروایان بە چیتر نییە و لایان وایە خودا لە خۆڕسك و مرۆڤیشدا هەیە، کە ئەوە دژ بە خودایە، کارەکەی لە ماددەگەری بە تەواوەتی نزیك خستووەتەوە، نەك هەر ئەوەندە، بکرە هەندێ جار خۆڕسکی دەگەڵ خودادا جۆشداوە و دە بۆتەیەکیدای تواندووەتەوە و دە

شێوەی سۆفیگەریدای نیشان داوە. لەساڵی (١٨٢٨)دا فەیلەسووف ئاڵمانی، ك.كراوزە، بۆ ئەوەی سیستمی دۆناودۆنی ئایدیالیستانەی خۆی لە بیروباوەڕی خۆڕسککەری و ماددەگەری هەڵاوێری، زاراوەی دۆناودۆن (Panthcism)ی یۆنانیی بە مانای هەموو چتێ (لەخودا دایە)ی هێنایە گۆڕێ. دۆناودۆن لە شێوەکانی (Atheist) واتە ناخوداییەکاندا هەن. لایەنگرانی دۆناودۆنی ناخودایی وەك: کاردانۆ، ف. پاتریچی، ت. کامپانیلا و ج. برونۆ، بڕوایان بە خودایەکی شەخسیی سەرووی خۆڕسك نەبووە و دەیانگوت خۆڕسك کەس دروستی نەکردووە. فەلسەفەی خۆڕسککەریی سەروبەندی وریابوونەوە کە "خودا" و "خۆڕسك" ی بە یەك چت لەقەڵەم دا، بەلای سپیۆنازەوە کارێکی هەروا فشەکاڵتە نەبوو. گ. هێردەر، ی. گۆتە و ئایدیالیزمی کلاسیکی ئاڵمان، لە خەباتی دژ بە بڕوای ئۆرتۆدۆکسانە (حەنبەلییانەی خۆمانیش) و میکانیزمەی ماددەگەریی فەرەنسزیشدا، سوودیان لە دۆناودۆن وەردەگرت. دۆناودۆن بە پێچەوانەی بۆچوونی فەیلەسووفە هاوچەرخە پێرسونالیستەکانی وەك: یۆمان سکۆت، ئێریێوگینا، ن. مالبرانش، ف. ب. د. شلەیماخێر، خودا بە سەرەتای سەرووی خۆڕسکانەی سەر لەبەری چتەکان و ڕووداوەکان نازانن. Pan — لە سەرێکی دیکەوە، وەك لە ئەفسانەکانی یۆنان و ڕۆمدا هەیە، هەمیشە لەگەڵ نێر و مێشدا هەر خەریك بووە و قوورەتی شەهوانیی لەوەدا نەبووە !.. دە ئاشقێتیدا، کە تیری بەر دڵان نەدەکەوت، لەگەڵ خۆیدا خەریك دەبوو و بیلامانێ و شەرع شەرمی نییە، وە دەسپەڕ خۆی ڕەحەت دەکرد. نیشانەی Pan شمشاڵ بووە، شوانەوێڵەی کوردەواری تا ئەوڕۆش بێ شمشاڵ نین.. و

چەندین دار و کۆچان و گالۆك و قلاّنگ و چتی دیکەیان لەم جۆر و بابەتانە هەیە.Pan – بە پێی ئەفسانەکان، بەچکەی خەیالّ پلاوی شاعیرانی ئەسکەندەرییەیە کە بە مەحرەمی ئەشق و ئەویقەکانی سادە و ساکاری گوندییانیان لە قەڵەم داوە. دیارە لەمەڕ لەدایك بوونی (Pan) شێوەی سەرچاوەکان جۆراوجۆرن و هەریەکە بە جۆرێکی دەگێڕنەوە. لە هۆنراوەکانی هۆمەر–دا دیاردییەك بۆ ئەم (جۆرپەروەردگار – رب النوع)ە نەکراوە، بەلاّم دە سروودێکدا کە بە نێوی (سروودی هۆمەری)یەوە نامێیە، بە کوڕی هرمس (هورمز = ئەهورامەزدا، هورمزیار؟) زاندراوە و گویا سەر بە چیای (Cyllene) بووە. هرمس کیژی (Dryops)ی مارە کردووە و ئەم (Pan)ە فەنییە لەوییە. دە کاتی زایماندا، دایکی لە دیمەنی سەیروسەمەرەی وی رادەچەنیّ، وەلّ هرمس دە پێستی کەروێشکێکی وەردەپێچێ و لە بۆ ئۆلەمپی دەبا و لەوێندەرێ، لە نزیکی زیۆسەوەی دادەنیّ و بە هەموو خودایانی نیشان دەدا و خودایانیش سەرلەبەر، ئەمازا، دیۆنیزۆس بە دیتنی ئەو حاجباتییەی زۆر کەیف خۆش دەبن. ( تا ئەوڕۆش لە ئاکامی بە نەوەکامی گووران و ڕسکانی مندالّ لە زگی دایکدا، ئەم دیاردەیە دە شێوەی دوو سەر و یەك یەکدەس و هتد.. هەر هەیە، کەچی هیچ ئەفسانە و پڕوپووچی بە دوردا هەلّناپێچرێ) بەش بە حالّی وەی کە مانای Pan – (هەمرو = گشت)ە ئەوە لەوەڕا هاتووە کە (Pan) بەر دیمانەی هەموو خودایان کەوتووە. واژەکە تا ئەوڕۆکەش بە زمانی یۆنانی بەو مانای (گشت)ەیە. دیقەت بفەرموو: مێژوو، جوغرافیا، کۆمەلّناسی، ئابووری، ڕەوانشناسی، میتۆلۆگیا (مەتەلّۆگ = ئەفسانەشناسی) و تاد... چەندە بۆ

لێوەتۆژینی مانای واژەیەك لە زمانێکدا، زەروور و پێویستە؟! بە ڕیوایەتێکی دیکە، گۆیا ئەو مانای (گشت)ە لەوەڕا هاتییە: پەنلۆپ-ی خانمی ئۆلیس دە یەك لە گەشتەکانی شووەکەیدا، داوێن پیسیی دەرهەق بە ئۆلیسی کردووە و گەلەوڕانێ لە ئاشقی فاسق و فاجیری حەز لێ کردەی وی لێی چابوون و ئەو (Pan)ە لە یەك لەوان لەدایك بووە و چون نەزاندراوە، ئی کێیە لەو فاسقانەیە (سەروبەندی کۆمۆنەی داکسالاریمان بە بیردێنێتەوە، کە پێناسە (نەسەب)ی بە داکەوە بەستراوە) مرۆڤ، گۆتیتیان: ئی (هەموو)انە (مباح) و بۆیە (Pan) بە مانای گشتە. ئەدی نابینی کە دەپێش واژەیەکی وەکە Turanisme و Iranism-ەوە دێ، دەگوترێ: PanTuranism و PanIranism. واتە: هەموو تورك دەخۆئاخن و هەموو ئێرانی نەژاد دەخۆ ئاخن. ئەمە لە فەرەنگستان دوور نییە دەگەڵ "پان" و "پهن"ی کوردی و فارسیدا والێ بن.

بەش بەحاڵی دۆناودۆن لە نیگای سۆفییەتی و هەروەها حرووفیەتی چەرخ و چاخەکانی ناوینەوە ئەوە جیهان بینیی شەقڵ ومۆرەجیاوازیی خۆی بە خۆیەوەیەتی و نمایینە نامێ و بە ناوویانگەکانی ئەم بیروباوەڕە بڕێ کەڵەزانا و سۆفی و فەیلەسووف وەك: سەنایی، ڕۆمی، سەعدی، ئیبن عەرەبی، یوونس عەمرە، باباکێویی باکۆیی (١٠-١١)، عەینولقوزاتی هەمەدانی (سەدەی (١٢)، شەمسی تەورێزی (سەدەی (١٣)، مەحموودی شەبوستەری (سەدەی (١٤)، نەعیمی (سەدەی ١٤)، نەسیمی (سەدەکانی ١٤-١٥)، قاسم ئەنوەر (سەدەی ١٥)، یووسفی قەرەباجی (سەدەی ١٦) و تاد... ئەم فەلسەفەی دۆناودۆنەیان لە ڕێی ڕامانەی سەر ڕێژکردن (Emanation = انبثاق = صدور= فیض)ەوە بەم جۆرە لێك دەدایەوە: هەرچی چتی دووفاق و لێك

تاق و جووتی وەك (خوداوەنـد و مـرۆڤ، ئـایین و نائـایین (بدعـت)، چاكـە و خراپە و تاد...) هەیە، بەپێی ئـەو فەلسـەفەیە، ئـەوە هـەر لـە ڕواڵـەتدا لێك دووفاق و تاق و جووتن، (مۆنادەكانی لایبنتز) نـەك لـە گەوهـەر و بنیچـەدا. ئـەم بیروبڕوایـە لـە دژی هـەرچی بیروبڕوای بـە زۆر سـەپێندراوی دەسـتەی فەرمانڕەوای سەردەمدار هەبووە، خەباتی دەكرد، هـەر لەبـەر ئەمـەش ئـاڵا هەڵگر و كەوڵ سووری بەر لەشكرانی ئـەم بیروبڕوا، بـە ئیسـتیلاحی ئـەمڕۆ (شۆڕشگێڕانە)یـە لـە گوێـن هـەڵلاج، نەسـیمی، ئیـبن عـەرەبی، مـەحمودی پسیخانی، بابەكی خوڕەمی و تاد... كەوڵیان كـردوون و پۆسـتیان گـروون و كوشتوونیان. بێ گومان، ئەمانە بـە پێچەوانـەی سۆفییەكانەوە، لـە بابـەتی سـەختگری وەك بایـەزیدی بوسـتامی، حوسـەینی مەنسـووری هـەڵلاج، عەینولقوزاتی هەمەدانی و مەحمودی پیسخانی و تـاد... لەمـەڕ فەلسـەفەی وەحدەتـی وجـوود و تەناسـوخ، چـەندین شـاكاری شـیعر و پەخشـانی دەگمـەنیان نووسـیوە. ئـەوجا بـا بزانـین ئـەم فەلسـەفەی دۆناودۆنـە لـەناو بیروبـاوەڕی كوردەواریـدا چـۆن چۆنـی ڕەنگـی داوەسـەوە؟ دیـارە بـە خوێندنەوەی دەقە كوردییەكەی "تەزكـەرەی ئـەعلا"ی ئـەهلی هـەق، چـەند بیر و چەمكێ بـە دیار دەكـەون.أ– خـودا بـە هـەزاران سـاڵ، لـەناو مـرواری (دوڕ)یەكدایە و (كنت كنزاً مخفیاً) یان وەك هیگڵ دەڵێ: "ڕۆح، خوداوەنـد، خوڕسكی دروست كـرد، تووشـی نـامۆیی بـوو، چونكـە ئـەو "لیس كمثلـه شیء"ە (قورئان) یان وەك سۆفییە وەحدەتـی وجوودییـەكان دەڵێـن "ئـەم وجوودە لە سەرڕێژكردن (فیض)ی خوداوەند هاتۆتەكۆڕێ.) مرواریـش لـەناو دەریادا پەیدا دەبێ و هەموو دەزانین كە مرواری جیسمێكی وشـكەڵ و خـڕ و

گرۆڤەر و بە چریسکەی قەپێلکەییە. ئەو مروارییە لەو چڵمانەی کە لە چەند جۆرە لەشدەڵەمەی دوو قەپێلکیی "سەدەف مرواری" ناو کە بە دەوری چتەکانی نێو لەشی گیانلەبەردا دەئاڵێن، پەیدا دەبێ.

لە ڕووی میتۆلۆجیا (ئەفسانە)ی کوو ژین هاتنەگۆڕێوە، زانست دیاردیی بۆ بەکتیریای یەك خانەیی کردووە و لە قورئانیشدا کە دەفەرمووێ: "وخلقنا الإنسان من صلصال من حمأ مسنون" و "وخلقنا من الماء كل شيء حي" ئاشکرایە بەپێی هێندێ فەلسەفە، هەموو گیانداریێ مێژووی دوور و درێژی خۆی هەس. ئەو مێژووە لە ڕووپەڕەکانی هەموو خانەیەك لە خانەکانی لەشیدا تۆمار کراوە، بە زمانی فسیۆلۆجی– بایۆلۆجیانە دەیخوێنێتەوە. تەنانەت بیرێکی فەلسەفییانەی وەسا هەی دبێژت، گاڤا کو زیندی دەمرێ، تەنێ پەیکەرەکەی لەشی دەگۆڕێ، دەنا هەرچی پێکهێنی لەشیەتی هەر دەمێنێ و هەر جۆرەی دەچتەوە پاڵ جۆرستانی خۆی. کاتێ کە جارێکی دیکە یا هەزاران جاری دیکە دێتەوە پەیکەرەیەکی دیکە، هەنگێن بیرەوەریی لەمێژینەی خۆی هەموو جارێ دەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە و لە بیری ناکا. هێندێ لە زانایان بەژن: خەون بە شتهایەکەوە، کە خەونبینەکە هەرگیز نەیدیتووە و نەیبیستووە و لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نییە و چتی سەیروسەمەرەن، ئەوە یادگاری خانەیەك لە خانەکانی ژیانی زیندییەکە، گیایەکە، دەرختێکە، بەخەون یان بە خەیاڵ بە بیریدا دێ... بیروبڕوای دۆناودۆن، واتە ئەم چت بچتە کڵێشەی چتێکی دیکەوە، ڕۆح لەپاش مردن دەچتە جەستەی زیندییەکی دیکەوە، بە دوور زاندراوە لە ڕووی فسیولۆجی – بایۆلۆجییەوە، لەمە کەوتبێتەوە.شایانی باسە، زاراوەی "دووڕناس"

دوور نییە دیاردی بۆ ئەو مرواریییە بێ کە مرۆ پێی وا بووە هەوارگەی خوداوەند بووە؟!

ب– رامانەی گوورانندنی یەکەم مرۆڤ، کە بە باوکی مرۆڤ حەزرەتی باوکە ئایەمە نامێیە، لە ڕووی بەرەوبۆچوونی مێتۆلۆجیا و میتافیزیکەوە، زانستی فیزیك بەرپەرچی دەداتەوە. مرۆڤ لە نیگای زانستەوە، لەسەرەتاوە لە بەکتریایەکی یەکخانەییەوە کەوتۆتەوە، پاشان وەك ئۆبجەیەکی مێژوویینە، هەم بە پەیڕەویکردن لە هاوپێوەندی دەگەڵ دیاریدەکاندا و هەم بە پەیڕەوی کردن لە یاسا و ڕێسا بیۆلۆژی (بیۆفیزکی، بیۆکیمیاوی، فیزیۆلۆژی)یەکاندا، پلە بە پلە و پێ بە پێ بە میلیۆنەها ساڵ پێ گەیشتووە نە بە خۆڵی فلانە کێو و نە بە خاکی فیسارە چیا، قووڕی بۆ گیراوەتەوە و نە وەك تاکە نموونەیەك هاتۆتە گۆڕێ. بەڵکو لەشکڵ و شێوازی زۆر لە مرۆڤی ئەمڕۆوە دوورکەوتۆتەوە، بەڵام با بزانین مرۆڤ لە سۆنگەی چییەوە هێندێکیان خۆیان لە هێندێکی دیکەیان بە بەرتر و باڵاتر و ڕەسەنتر زانیوە و دەزانن و برێ خەڵك کۆمەڵە خەڵکێکی دیکەیان بە کوێلەی خۆیان زانیوە و بە جۆرێ لە ئاژەڵ، نەك بە مرۆڤیان لە قەڵەم داون؟

ئەگەر نووسینەکانی سەد و پەنجا ساڵێکی لەمەوبەری ڕۆژاواییان بەسەرکەینەوە، بە نموونە دەبینین زاراوەکانی "ئاری"، "ڕەگەزی ئاری"، "بیری ئاری" مانا و چەمکی نوێباون. ڕەنگە هەر سەد و پەنجا ساڵێکیان تەمەن هەبن. نوخشەکانی لە سەدەی (١٦) وە چەکەرەی کردووە، بەڵام سەروبەندێ کە نە بە گشتی "ڕەگەز" و نە بە تایبەتی "ڕەگەزی ئاری هەبووە، کۆمەڵانی مرۆڤ بیریان لەوە کردۆتەوە کە ئەم نەتەوە دەگەڵ ئەو

نەتەوەیەدا، ئەم کۆمەڵ لەگەڵ ئەو کۆمەڵدا، ئەم هۆز دەگەڵ ئەو هۆزدا، ئەم شار لەگەڵ ئەو شاردا، ئەم چین لەگەڵ ئەو چیندا فەرق و سوویان هەیە. لەو ڕۆژگارانەوە تا ئەوڕۆ تەنها هەر تەرزی بیرکردنەوە و مێتۆد گۆڕاون، ئەنجامەکە هەر هەمان ئەنجامە، کورد واتەنی هەر هەمان جاشە و کورتانی گۆڕاوە. دەقاودەق هەر هەمان ئەنجامە کە زانا "مۆدێرن"ەکانی ئەمڕۆ وەك هەمیشە، دەیچوونەوە و دەیچوونەوە، واتە: هەرکەسە نەتەوەکەی خۆی لە ڕووی مەزییەتە مرۆڤییەکانەوە بە ڕێکۆردشکێن، بە دەقشکێن، ژمارە قیاسی شکێن لە قەڵەم دەدا. ئیدی بەم جۆرە ئەمڕۆ ئەو چتەی کە لە بیچم و شرۆشکڵی "ئارێتی"دا بووەتە بنێشتە خۆشەی بن ددان، لە دۆن و کڵێشەگۆڕی: جارێ لە ڕووی نەتەوەوە، کاوێ لە ڕووی چینەوە و تاوێ لە ڕووی چەرخ و چاخەکانەوە، بەولاوە چیتر نییە.ئێمە لە پێشەوە باسی مرۆڤی– مەیموون، نیاندەرتاڵمان کرد، ئاشکرایە، کە لە کوردستانیش نیاندەرتاڵ هەبووە. باشە ئەم نیاندەرتاڵەفەندییە لەکێهە ڕەگەز بووە؟ دیارە مادام کورد بوویێ، دەبێ "ئاری" بوویێ! مرۆڤی سەرەتایی، خۆ لە مرۆڤێکی دیکە بە بالاتر زانینی بردۆتەوە سەر خوایشتی خودایەکان، بۆ سەر هێزەکانی سەرووی خۆڕسك.

کۆمەڵانی مرۆڤ، دوور مەڕۆ، هەر لە کوردستانەکەی خۆماندا، وەك جاف و بڵباس و سورچی و گاوەستیای و گامری و عەلکان و تاد... کە پاشماوەی سەروبەندی ئاژەڵدارین و هێمان سەروساختیان دەگەڵ کشتوکاڵدا پەیدا نەکردووە، لەبۆ لەوەڕ و چێرەگای بە بژوێن و لە تەڕی لەوەڕان و لە وشکی ڕاکشان، هەمیشە لە هەڵپە و ئەمسەر و ئەوسەردا بوون و بەیانی وەختە و

ئێوارە وەختە لە جەختا بووگن و هەرچی بەرەوبرِیی لێ کردبن هەڵیان کردوونیێ و تێی ڕۆهاتوون و دەگەڵ ڕەوەند و کۆچەری دوور و نێزیک و دراوسێ و ئاشنا و ڕۆشنادا لەسەر لەوەڕگە و چێرەگە و زۆزانان بە شەڕ هاتوون و زۆر جار لە شەڕدا کەلاکیشیان لێ بەجێ ماوە. وە فەرمایشتی بریکارەیلێکی خوداوەندی ڕووی زەوین دیل و یەخسیرەکانیان قەڵتوبڕ کردوون، وەلێ ئەتەوە ڕەوەندەکان بەرە - بەرە، قوونیان لەسەر زەوین تۆتکە دەگرێ و هەواریەند دەبن و دادەمەزرێن و بە کشتوکاڵەوە دەورووکێن و کردار و ڕەفتاریان لەحەن دیل و یەخسیرەکانیان بەرەو گۆڕان چوو، دەستیان لە دیل و یەخسیرکوشتن هەڵ گرت، وایان بە باش زانی کە دە کێڵگە و مەزرایاندا دەکاریان بەرن، ئیدی خودایان، ئەو ڕەوەندە کۆنانەی کە هێزرین و توێتکەیان گرت، چارەنووسی ئەوانی لە تیرە و هۆزەکانی دیکەیان بە دیل گرتبوون و ئەیان دەپەرستن، دیاری کردن و ژن و ژنخوازییان دەگەڵ ئاغایەکانیاندا لێ پاوان کردن.

وێستاکەش کە کوردێکی سوننی مەزەوی فرە وشکە بڕوا دەگەڵ تەنانەت شیعەیەکی وشکە بڕوادا، کاکەییەک دەگەڵ موسڵمانێکدا، ئێزدییەک دەگەڵ کاکەییەکدا، یا موسڵمانێک دەگەڵ سارلییەکدا، یان وە پێچەوانەوە، سەروساختی خزم و خۆیشاوەنی دەگەڵ یەکدیدا ناگرن، هەر ئەخش و دەوسی ئەو حەرام (تابۆ)انەی ئەو ڕۆژگارانەیە و لە نێو کوردەواریدا هەروا بارەیان لێوە دێ، نەک هەر لە سۆنگەی لێکدی جوداوازیی ئایینی و مەزەبیی نێوان کورد، بگرە سەبارەت بە لێکدی جیاوازیی هۆز و خێڵ و تیرە و ڕەگ و ڕەگەماش، وێستاکەش کوردەواری بە سانایی ژن و ژنخوازی دەگەڵ یەکدیدا

ناکەن. فەرموودەی پەیامبەر "تخیَّروا نطفکم فإنَّ العرق دسَاس" تا ئەوڕۆکەش بەسەر زارانەوە دەگەڕێ. مەسەلەی "نەسەب" و خزمایەتی گرتن لە کوردەواریدا کارێکی زۆر هاسان نییە، بەلاّم جاری واش بووە و ڕەنگە ئەوڕۆش هەر وابێ کە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری ئەو کەوشکەنە دەبەزێنێ و دوو هۆزی لێك دڕنۆنگ و ناتەبا بەژن و ژنخوازی کێشە و هەرای سیاسیی نێوانیان سست دەکەن یا هەر بە تەواوی دەبڕێننەوە.

ئەوجا با وەگەڕێینە سەردەمانی دۆنکیشۆتان. ئاتینا و ڕۆما بە پلە و پایەیەکی فرە بەرز و بڵیند گەیشتبوون. لە سەروبەندی خونچە هەڵپیکانیاندا، ئیلیادە و ئۆدیسسە نووسراون و سیستەمەکانی ئەرستوو و دیموکریتس دامێندرابوون، شێوازی ئاکرۆپۆل و ڕۆمێن، کۆشك و تالاری لەمەڕمەڕی ئۆیمە و قەبارتە، شاری یەك لە یەکدی جوانتر و تەرزتر کە سۆمای چاویان دەبرد، ڕانرابوون. ئەوانەی ئەمانەهێیان ڕانابوون هەزاران باسك و مەچەککەلێ بوون، کەس هەر نێویشیان نەدەزانین و باسوخواسیان لە کوولەکەی تەڕیشدا نەمابوو. بە هەزاران باسك و مەچەك بەرد و مەرمەڕیان تاشیوە و گەمیەی زەلام زەلامیان بەهێز و گوردی بازوو و سەولاّن، لێ خوڕیوە، وە تاکە واچەیەك، کاری هەرە قورس و گران و پیسیان پێ کریاگە و ئەم بە هەزاران بازوو و مەچەکە بێ ناوونیشان و مفت و وە بەلاش و حەلاشانە سەرلەبەر بەرووبووی شەڕوشۆڕ و کوشتوکوشتار بوون. مایەوە چارەنووسی نەتەوەکانی لە ئاتێنا و ڕۆما پایینتر و خوارەوەتر، ئەوانە بە دیلێتی و یەخسیرییان بریار لەسەر دەدران و ئەوەی بە کارێکی حەلاّل و پیرۆز ئەمر دەفەرموو، خودایەکان بوو. ڕۆماییەکان و یۆنانییەکان

که له ئابووری و زانستدا له خەڵکی دیکە زۆرزانتر بوون، لەم ڕووەوە هاوکارێکی تازە کوورەیان بۆ خوداوەندی ئەویٚ ڕۆژیٚ دیتەوە، بۆ ئەوەی دیلێتی و یەخسیری بە کارێکی "مەعزوورانە" و "گەردن ئازادانە و "هەق وەدەسانە" پاساو بدەن، هانایان وەبەر خۆرسك برد.

ئەرەستووەفەنی دەی فەرموو:

"خۆرسك، نەتەوە هەرچی و پەرچییەکانی بە چەند پلەوپایەیەك پایینتر و نزمتر و کەمتر گووراندووە و بە دیل و یەخسیری یۆنانییەکانی بە ڕەوا فەرمووە".

خۆرسك فەرق و جیاوازیگەلێکی لە نێوان یۆنانییەکان و نەتەوە هەرچی و پەرچییەکاندا (؟) لە خۆڕاییی نەهێناوەتە گۆڕیٚ. ئەو فەرق جیاوازییانە بیٚ حیکمەت و بیانگە نین، فەرق و جیاوازییەکان ئەوەندەی فەرق و جیاوازییەکانی نێوان لەش و ڕۆح، مرۆڤ و ئاژەڵ، زەق و زۆپ دیار و ئاشکرا ڕۆماییەکان هێندەیان گویٚ بە زەردی، یان ڕەشی ڕەنگی دیلەکانیان، یان خڕی وگرۆڤەری، یا درێژکۆلەییی سەروسەکوتیان، یان ئەمەیان ئی ئەرمەنستانە و ئەوەیان ئی حەبشستانە، نەدەدا، وەلیٚ ئەم جۆرە لێوەکۆڵینە (زانستانە بەرزە) بەرووبووی نامبارەکی سەدەی بیستەمە. هەروەك لە پێشەوە گوتم ئاتێنا و ڕۆما هەریەکە بۆ خۆی ڕامانەیەکی چینبەندیی ڕەگەز و تیرەکانی هەبوو. هەرچی دیل و یەخسیریٚ کە لە شەڕدا دەردەست دەکران، ئەوە بە پێی ڕامانە و تیۆریی خۆیان، خۆرسك گۆیا، هەر بۆ وەی دروست کردبوون، ببن بە دیل و یەخسیری چاوی کاڵی وان.

بەلام خـۆت دەزانـــی دنیـــا منـــدۆق مندۆقـــە کەســـی بـــرای، قەومـــە ڕەگەزپارێزەکەی ئەرەستوو، واتە: یۆنانییەکان کە مافی ئەوەیان بـە خـوت و خۆرایی بەخودا دابوو کە خۆپسك غەیری خۆیانی بۆ بەندەگیی وان دروست کردووە، هەر ئەو نەتەوە نـەجیو و فەیلەسووف پەروەرانـە، ڕۆژێ لـە ڕۆژان تەقا بوون بە تەڵە و تەپکەی کۆیلەتیی ڕۆمانەکانەوە.

بەلام بـابێژین یۆنـان و ڕۆمـان، لەبەر ئـەو بیروبڕوا پووچانـە، خۆیـان بـەو جـۆرە و خـەڵکانی دیکـەیان وەو تەرحـە لـە قەڵـەم داگـە، ئـەی باشـە محەمەدەفـەنی– کـە کوردیش بووگـە و مێژوونووسـیش بووگـە هـا– خـۆ پیاوێکی موسڵمان و ئـاقڵ بووگـە و نـە یۆنـانی و نـە ڕۆمـانی بووگـە، (بـەلام دیارە وە زوان عارەبیی نووسیگە، ئەو زەمانە هەرکەسێ وە زوانی عـارەبیی نووسـیبا و موسـڵمان بـا، گوێـی وە ڕەگـەز و تـیرە و تایەفـە نـەدەدا) باشـە ئەڕای چە لە "تاج العروس" ەوەی فەرمووگە: "الاكراد طائفة من الجن" و لـە ڕاڤە و شرۆڤەی ئەم فەرمانیشتەیدا مەرەمۆ: لەبەر وەی کـە ڕەگـەمای کـورد جندۆکەیە، هەر کوردێ لەم سەر بسـانە هـەس چارەکە بەشـێکی لەشـی لـە جندۆکانە و هۆی ئەمەیشە ئەوەسا کە کوردەیل لە بەڵقیسای ژنی حـەزرەتی سلێمانن، کـە ئـەویش دایکـی درنـج (جندۆکـە) بووگـە... هـەروەهاش ئـەبو موعینی نەسـەفی لـە پـەرتووکی "بحـر الكلام"دا دەنووسـێ کـە: جندۆکـان هەڵیان کردە سەر حەرەمسەرای حەزرەتی سلێمان ئەو کەتن و کەتنکارییەی لەوێ کردیان (ئای داخوا چەندیان کەیف کردبێ) کردیان... هێندێ لە ژنـانی حـەرەمی حـەزرەتی سـلێمان لـە جندۆکـان ئـاوس بـوون و زۆڵـەیلێکیان لێ کەفتنـەوە کـە ئـەی کوردەیلـەی ئاڕۆکـەن... شـەرەفخانی بتلیسـیش، لـە

شەرەفنامەکەیدا دەنووسێ: هێندێ وا دەگێڕنەوە کە تیرەی کورد لە ژن و ژنخوازی دەگەڵ دێواندا، کەوتوونەوە. مەسعوودییەفەندی مەرەمۆ: حەزرەتی سلێمان، بۆ چەنانێ لەسەر کار دەرکرا، شەیتان لەپێستی بنیادەمدا کەنیشکەکانی بیلامانی سەقەت و سوقووت کردن، ئەوانی کە خێوی بڕوا بوون، قوتار بوون، وەلێ کەنیزەیلی دووڕوو و کافر کە لێل شەیتانا بیلا مانێ کەیفیان کردبوو لە شەیتان ئاوس ببوون.

ئەوجا کە جارێکی دیکە حەزرەتی سلێمان وەگەڕا سەر تەختی پادشاییێ، فەرمانی لەمەڕ ئەو کەنیشکانەوە دەرکرد: "أکردوهن في الجبال و الأودیة" واتە: ئەمانە بۆ چیا و دۆڵان قاو دەن و فەوت و فەنتەشیریان کەن. ئینجا ئەمانە کە زاڕۆڵەیان لێ کەفتنەوە، بوون وەم کوردەیلی ئەمڕۆکە...

باشە ئەوە شەمەیەک لە مێژوو.

**ئەدی فەلسەفەی مێژو چییە؟**

ئەم گۆی زەوینە کە ئێمەی بەرەی مرۆڤی لەسەر دەژیێین یەکێکە لەو نۆ ئەستێرە گەڕۆکانەی کە بە دەوری خۆردا هەمیشە دەخولێنەوە. ئەمە یەک ملیۆن جار لە خۆر گچکەترە، نزیکەی (٤٥٠٠) ملیۆن ساڵ زێتر لە تەمەنی تێپەڕیوە. لە پێشدا کۆمەڵە گازێکی داخ بوو و پاشانەکینێ ئەو کۆمەڵە گازە خەست بۆوە، بوو بە ترنگێ و وردە وردە کاژە بەستەڵەکێك دای پۆشی. ملیۆنەها ساڵ کاژێکی فرە گەورە لە هەڵمی ئاو، دای گرتبوو. بە ساردبوونەوەی پۆستی زەوین، نزمان و بەرزان و هەڵەت و زورگ و چیا و کۆ و کۆسار و شکێر و قەڵش و زەندۆڵ و ڕەهۆڵ و تەختان و کۆسپەلان و لێژ و ڕك و هەوراز و نشێو و نەورایی و ڕووکار و بەریانان هاتنە گۆڕێ و بە

ساردبوونەوەی هەڵمان ئۆقیانووسەکان و ڕووبار و ڕۆخانە و جۆگە و جۆباران پەیدا بوون. لە ژێ، نیشانە و ئاسەوار مانا چییە، نەبوو، دوور نییە دە باروئۆخێکی تایەندا گەشەکردنی ئاوێتەکانی کاربۆن، بەرەو پەیدابوونی ئەسیدەکانی ئەمینیدای ڕاکێشابن و بووبن بە پرۆتین و پێویستییەکانی داهێنانی مایەی ژیی لەسەر زەوین دابین کردبێ. لەوە دەچێ کە یەکەم بوونەوەرانی زیندوو لە جۆرە ڤایرۆسەیلێ پەیدا بووبن کە لە ناو ئاو و بێ ئۆکسژێن سەربەخۆ ژیابن. ئەم بوونەوەرانە وەك ئەو گیاوگۆڵانەی کە نەك تەنێ بێ ئۆکسژێن دەژیێن، بگرە تێراویشیان دەکەن، دەچن. هەر ئەم بوونەوەرانە بوون کە هەلومەرجی دەوروبەری لەبار و گونجاویان بۆ کامڵ بوون و گەشەکردنی پاشانەکێی ژیی گیاوگۆڵان و گیانلەبەران لەسەر زەوین تەیار و ئامادەکرد. هەلومەرجی ئاووهەوا و جوغرافیایی زەوین، پەیدەرپەی دەگۆڕا و کامڵبوونی بوونەوەرانی زیندوو، درێژەی دەدایێ و پێڤەدەچوو، تا سەرەنجام مەمکداران پەیدا بوون. لە دوای سەروبەندی سێیەمی زەویناسی و سەرەتای سەروبەندی چارەم (نزیکەی پێش یەك ملیۆن سال) یەکەم مەیموونەیلی مرۆڤ ئاسایی، کە دەتوانین بە باپیرە گەورانی مرۆڤیان لە قەڵەم بدەین، هەبوون. بە کورتی، مرۆڤ بە کاوە خۆ، پاش چەندین گۆڕانکاریی بایۆلۆجییانە، کامڵ بوو و شۆپ و شوێنەواری خۆی بە دیار ئێخست و پێ بە پێی پێشڤەچوونی زەمان، ئەم شۆپ و شوێنەوار بە دیار ئێخستنە پێتر دەبوو. ئەمەش (٩٠٠٠٠٠) سالی درێژە کێشا، تا مرۆڤ کاری یەك دەورەی ململانێ و پێشڤەچوون و کامڵبوونی بە ئاکام گەیاند و ئەوجا بەم لووس و پووسی و تیفتیفەکراوی و پەرداختکراوییە، بوو بەم کوڕەی

ئیرۆ: مرۆش ئەندێشمەندە و – Hommo Sapiens، بەم دارشتە و قەلآفەتەی ئەمرۆوەی پێ هاویشتە دنیای بوونەوە. دیارە پێش مێژوو، لەو ترووکەیەوە کە مرۆڤ لە قەڵەمڕەوی ئاژەڵ جویێ بۆتەوە، دەست پێ دەکا. نێوەرۆکی ئەم جوێبوونەوەیە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ بەسەر چەندین لەمپەر و کۆسپ و هەڵەمووتاندا، کە جارێکی دیکەی لە ژیانی کۆمەڵەکیدا، بۆ دواڕۆژ، هەرگیز ڕووبەڕوو نابێتەوە، زاڵ بووە. ژیانی مێژوویینە لەو سەرویەندەڕا کە نوخشەی دەوڵەتان لە ناوچەی کەنارای – دۆلی نیل و ناوچەی دیجلە و فوراتدا بە دیار دەکەون، سەری هەڵ داوە. ئەمانەش، وێدەچێ چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر پەیدابووبن. مێژوو بە زۆر مانا و چەمك، دەربڕین و لێکدانەوەی بە خۆوە دیتووە. لە سەروبەندی چاخەکانی ناویندا بە شێوەیەکی نامەقوول و خەیاڵپلاوانە دەناساندرا. لە سەردەمی بووژاندنەوە (ڕێنەسانس)دا یەکەمین سریشتەکانی بە دیار ئێخستنی قووڵی ڕووداوەکانی مێژوو – سەرچاوەکانی مێژوو بەر ڕەخنە و توانج و تاوتووکردن دان – بە دیار کەوت و لە ئاسەواری مێژوونووسانی سەدەی (١٨)دا هەولودەول و ڕەنجێکی زۆری بۆ دراوە و ڕووداوەکانی ڕابردووی کۆمەڵی مرۆڤیان بە فەلسەفەیەکی ئاقلآنە (ڕاسیۆنالیستی) تێدا لێك دراوەتەوە. ئەم سەروبەندە لە ڕووی لە دیرۆك حاڵی بوونەوە، ڕاستیت گەرەکە، دەورێکی لە قۆناخێکەوە بۆ قۆناخێکی دیکە پەڕینەوە ڕەفتەنییە، واتە: سەردەمی لێکدانەوەی مانای مێژوو لەسەر بنچینەی "خوایشتی خوداوەند" جێگای خۆی بۆ سەردەمێ بە جێ دێڵێ کە ڕووداوەکانی کۆمەڵی مرۆڤ لەوێدا، لەسەر پایەی چالاکی و هەڵپەی تاکەکەسانی بەرچاو و هەر

خۆی حسێو، لێك دراوەتەوە. لە نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، دەورانی ئەو ڕۆژگارە لە ڕووی ئابووری – كۆمەڵەكییەوە بە دەورانی پێشڤەچوون و گەشەكردن و تەشەنەكردن و تەنینەوەی سەرمایەداری دەژمێردرا، زانستی مێژوو كامڵ بوو و دیرۆكنووسانێكی زۆر كاری كامڵ بوونی كۆمەڵی مرۆڤیان لەسەر بنەمای یاساوڕێسای كەوشەن و سەرحەد و سنووردیار، لێك دەدایەوە. وەڵ بە تێكڕایی لە مێژوو حاڵی بوونی ئەم سەردەمەش، هەمدیس هەر لەسەر بنەمای ماكی چەمكی " كاریگەریی تاكەكەس" ریشاژۆ بووە و هەر وەو سەنگ و تەرازووەی ئەو كە: گۆیا مێژوو "قارەمان" دەیگووڕێنن و تەنها، مێژووی قارەمان و كەڵەمێردانە و ئەودواكەی سەرلەبەر، هۆكار و پێناوی جموجووڵی ڕەوڕەوەی مێژووە و لە كۆمەڵە ئەوزار و ئەسپاویێ وەولاوە چیتر نییە و بەس. وێرای وەش هەموو، مێژوو، هاژ نەببوو بە زانستێكی ڕاستەقانی. یاساوڕێساگەڵ كە دیرۆكنووسانی بۆرجوازی دەیانویست ڕووداوەكانیان پێ شی بكەنەوە، بە هیچ ئاوایەك یارمەتی و كۆمەكی شیكردنەوەیەكی ڕاستەقانی و لەگشت سەرەوەی ڕووداو و هۆكار و سەوەوكارەیلی گۆڕانكارییەكانی كۆمەڵیان نەدەدا. لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٩)دا لە زەوینەی دیرۆكدا، ڕامانەگەلی نرت و نوێباو هاتنە ئاراوە. ئیدی مێژوو پێ داوێتە وارێكی نوێوە و دەبێ بە زانستێكی ڕاستەقینە و واقیعییانە. لەم سەروبەندەدا تەنیا ئانینەئاراوەی مەسەلەی سۆسیالیزمی زانستییانە و بابەتی چینەكانی ناو كۆمەڵ بوو كە بە لای خستنەگۆڕێی ڕامانەگەل نوێباوەوە لە زەوینەی مێژوودا، شكایەوە. ڕامانە نوێباوەكان و مەسەلەكانی دیرۆك لە هەموو سەرێكەوە و فرە وە

داوێنشۆڕی و بە سەنگوتەرازوویەکی جیهانییەوە وەبەر شیکردنەوە دەدرێن و هەڵ دەسەنگێندرێن و تاوتوودەکرێن. ناتەواوی و کەموکووڕیگەلێ کە لە زانستی بۆرجوازییانەی مێژوودا عەمارەپوو ببوون و بڕستیان لێ بڕابوو، لە نێو دەچن. مێژوو دە شێوازی جۆرە زانستێکی ئەوتۆدا کە ئیدی دەتوانێ ریشاڵەکانی ئەسڵیی ڕووداوەکانی مێژوو و گۆڕانکارییەکانی ناو کۆمەڵ بە ڕوونی نیشان بدا و کاریگەریی چینەکانی ناو کۆمەڵ زەق کاتەوە و کاری گەشەکردن لە هەموو سەرێکەوە، ڕوون کاتەوە و شارێی پێشکەوتن و کامڵ بوونی پاشێ وەکا و خۆش و هەموار کا، چاوی دەپشکوێ. جەماوەر زۆریان کەیف بە مێژوو دێ، زێتر ڕابردووی خۆیانیانی تێدا دەبینن و پتر ڕێی دواڕۆژی خۆیانیانی تێدا بەدی دەکەن. جا هەر لە سۆنگەی ئەوە بووە کە چینی فەرمانڕەوا، لاگوێلی لاسایی کەرەوەی خۆیانیان وەکار خستوون و لەم شەوق و واز و سۆ و ئالهایانەیان فرە وە نەگریسی و چەپخوونانە و نامەردانە سوود و بەهرەی خراویان لێ وە دەست هاوردووە و وە ناو "مێژوو"وەوە ڕێشمەی دووباد و سێبادیان بۆ لغاو کردنی مێشك و دەست بەستنەوەیان وە گورزەهۆن و پەلکەهۆن بۆ ڕێساون و بە بەزەك و دۆزەکی ساویلکە فریوانە ئارایشت و پەرداخ و تیفتیفەیان داگە... ئاشکرایە، لە دوولۆی ئەم نووسینە ساویلکەخاپێنانە و بە زۆر بە ناو مێژووەوە سەپێندراوانەوەدا، نەك تەنیا هیچ خەبەرێ لەمەڕ سەرەودەری زانستانە لە مێژوو حاڵی بوون سۆسەی سۆسەئاسایی ناکرێ، بگرە مەبەستەکانی بە جۆرێ دیزەوەدەرخۆنە کراون و پەردەی چەواشەکارییان بەسەردا دراونەوە، کە لە پەسنوێژی و بە شان و باهوو هەڵدان و مەدیحەسەرایی زێدە و بێتام و

ستایشتی کاروکردەوەی زۆرداران و بە هەموو جۆرێ بۆ بە ناوبانگ جاڕدان و نامێ کردنیان سەرپێوە نەبوون و تەوەمین و سەرکۆنەی جەماوەر و دەوری لێ کەم کردنەوەیان و ئاوەژوو و هەڵگێرانەوەی ڕاستییان، هیچ چتێکی دیکەیان تێدا بەدی ناکرێ. لەم "مێژوو"انە، لە هەموو چەرخ و چاخەکاندا، تەنیا بۆ پایەدارکردنی دەسەڵاتی چینی فەرمانڕەوا و سەرکوت کردنی خەبات و تێکۆشانی جەماوەر و بەرەوبڕی لە پێگەیشتن و کاملبوون و پێشکەوتن و ڕێگا لێ بەستنەوە بەولاوە هیچ سوودێکی دیکە وەگیرنەکەوتووە. ئەدی نابینی فاشیزمیش (کە لە چینی بۆرجوای چکۆلەڕا سەری هەلداوە) لە ستایشت و بەشان و باهووی "نەژادی لەبەرتر" و ئافەرین لە زۆرداری و هەلایساندنی ئاوری شەڕ و کوشتاری بەکۆمەلێ، هەر بەو جۆرە "مێژوو"انە و قارەمان پەرستی و خەیالپلاوانەوە خەون دەبینن و پشت دەبەستن؟! تەنانەت لەم کەش و هەوایەدا زۆر جار کار بەلای قارەمان بە خودازانیندا شکاوەتەوە و وشاری چینی فەرمانڕەوای کەلەگا و دیکتاتۆر هەر بۆ خۆی زەوینە بۆ قارەمان بە خودازانین و ڕزگارکەر (کارزما) خۆش دەکا. دیارە ئەمە دوو لایەنی، ئەرێنی و نەرێنیی هەیە: چینی فەرمانڕەوا بە هەموو جۆرێ بەشی خۆی، چ بە قاییلکردن و چ بە زۆرەملێ، لایەنگری زۆروزەوەندە لە هەموو چین و توێژاڵەکانی کۆمەلێ دەسەبەر دەکا: لە چەکدار، لە دوعاگۆ، لە سیخوڕ، لە ڕاپۆرتنووس و ماستاوساردکەرەوە، لە کۆلکە خوێندەوار و زوڕناژەنی پشتماڵە و پێشماڵە و تاد... وە نموونە: دڕندەیەکی وەك هیتلەر، مۆسۆلینی، ستالین، فرانکۆ، مستەفا کەمالی دژمنی نەتەوەی کورد، ڕەزا شا، عیدی ئەمین، مۆبۆتۆ، سەددام حوسەین، ئەمانە

سەرلەبەر بەرووبووی نامبارەکی ڕژێمێکن کە بیرمەندانی بۆرجوا و وردە بۆرجوا، بۆ پاراستنی بەرژەوەندەکانی خۆیان، هەزار و یەك پاساوی خەیاڵچن و چاوچنۆکی هەڵبەست و وڕێنەی میتافیزیکییانەیان بۆ دێننەوە و دەیکەن بە ئایەتی (نامەخوا) ئایدیۆلۆجیای وشکەسۆفییانەی پیرۆز... ئەمە لایەنی ئەرێنی بۆ بەرژەوەندی حوکمڕانی کەڵەگا و دیکتاتۆر، کە بەش بە حاڵی جەماوەر دیارە کارێکی نەرێنییە. نەرێنیی کار لەوەدایە کە فەلسەفەی ڕژێمی بەزۆرەملێ و فرتوفێڵ داسەپاو و دووگونەشۆڕ، بە هەموو شێوەیەك جەماوەر بەرەو نەزانی و چەواشەکاری و گومڕایی و لە واقیع دوورخستنەوە هان دەدا، نەزانی و سەرکوێرکردن، هەمیشە جەماوەر سست و گۆج و بێ دەسەڵات دەکا و بەرەو نائومێدی و تاریکی و پشت بە پێوار بەستن ڕادەدا. لە جیاتیی ئەوەی هۆی بێچارەیی و دەستەپاچەیی و کوێرەواری و کۆڵەواری و بێ دەسەڵاتییان لە وشیاربوونەوەدا بدۆزنەوە، ڕووی ئاوەزیان، مێشکیان بەرەو فەنتازیا و ناواقیعییانە و خەیاڵپڵاوانە و چت بەزۆر بە ملێ خەڵك دادان و لەم جۆرە بابەتانە دەدەن. بزاوتە سیاسییەکان بە زۆری پەردەیەکی ئەفسووناوی بە دەستی ئەنقەستیان بە سەر دادەدرێ، پشوویان کورت دەبێ، لە کاتی هەڵچوون و گەرمەی خۆپیشاندانێکی، مانگرتنێ، شۆڕشێ، یا هەر کارێکی جەماوەریدا، کارەکە لە کەفوکوڵێ بەولاوە هیچی تێدا بەستە نابێ و وەکوو کەفی دەریا لە پڕ دەنیشێتەوە، یا بۆ تۆڵەساندنەوە لە یەکدی و قەڵتوبڕی یەکتر ئاوری خۆش دەکرێ. بۆیان وەگێڕام: لە کاتی ڕاپەڕیندا جەماوەر لە گەرمە تسکۆهێناندا دە گیانی یەکدی بەربوون و ماڵی یەکدییان تالان و بڕۆ دەکرد.. مرۆڤ، هەرچەندە لە پلەیەکی زۆر بڵندی

پێشفەچووندا، پێگەیشتبێ، بەڵام هەرکە شوان نەیپەرژایە مێگەل پاراستن کار لە کار دەترازێ، هەنگینێ، یا گورگ دەیان خوا، یان ئاوەکی و ئاوارە دەبن...ئەوەکەی بەغدا[سەددام] (٦١) نازناوی هەس. ڕۆستەمولحوکەما لە کتێبی "ڕۆستەموتتەواریخ"دا کە لە سەروبەندی کەریم خانی لەکیدای نووسیوە، لە باسی دوا شای سەفەوییاندا، شاحوسەینی بە بنەچەکە باب کوردی شاری زنجان و خەلیفەی شێخ زاهیدی هەردەوێلی و پاشانەکێ زاوای بەڕێزی وە قۆپیە خزمی ئیمام مووسای کازم، دەفەرموێ: دیرۆکنووسانی پێشە خۆم فرەیان لەمەڕ پیاوی زلوزەبەلاح نووسیگە، بەڵام خۆ تەنێ هەر پادشا و میر و گزیر ناوی ممبارەکیان لە کتێودا نەنویسریاگە، بگرە لە بەرەی ناودارانی شاری ئەسفەهان دەتوانم، بە سەتان ناوی ئێشیك ئاغاسیتان ئەڕا بنویسنم، کە پادشا وە منەتبارییەوە هەر ڕۆژە نازاناوێکیان پێ دەبەخشێ. باوەڕ بفەرموو، زێتر لە (١٥٠) نازناوی زێتر تەنێ هەر بۆ (دلیل العشاقان) نووسیوە، ئەی هاوار وە ماڵم... ئەوجا با ئەوەش عەرزی خزمەت کەم کەسی مامی، خۆ لە مێژووگەیشتن کارێکی ڕێژەکی (نسبی) یە.
وێڕای ئەمەش بە درێژاییی مێژوو، لە سەروبەندی دێریندا بگرە تا دوا قۆناخی سیستمی سەرمایەداری، دیرۆکنووسانی هەبووگن کە هەزار ئەمسەر و ئەوسەریان فەرمووگە و خۆیان وە هەزار دار و بەردا داگە تا لە گەوهەری مێژوو و لە فەلسەفەی وی حاڵی بن و پەی وە سۆنگە و هۆکارەیلی ڕووداوەکانی مێژوو بوەن و زانستانە هەڵیان سەنگێنن. ڕوونە، ئەم لە مێژوو گەیشتنە و هەڵسەنگاندنی سۆنگە و هۆکارەیلی ڕووداوانە نەدەکرا لە ژێر ڕکێفی بارودۆخ و هەلومەرجەکانی کات و شوێندا نەبن. زووتر، ئەم

مێژوونووسانە دە سەرویەندێکدا پەیدا بوون کە گۆڕانکارییەکانی ئابووری و کۆمەڵەکی تازە پێڕۆکە دەبوون و ڕوونتری بێژم، مێژوو قۆناخی خاڵیٚ لە خاڵەکانی وەرچەرخانی خۆی دەبوارد. جا وەم بۆنەیەوە، ڕەنگە لەبار ویٚ ئەم ناوی زانایانە بێرینە سەر زوان: پۆلی بیۆس، سوماتیسن، ئاگاڕجوونا، تۆرلیۆس، ئیبن خەلدوون و دیرۆکنڤیسانی سەدەی هەژدەهەم، وەك: ڤۆلتێر، مۆنتسکێو، دیدرۆ، سن سیمۆن، ژ.ب. ویکۆ و پاشانەکیٚ دیرۆکنیڤسانێد هەڤچەرخ بێد مینانیٚ شپینگلەر... تا ئەویٚ کە ئاشکرایە و کێشەی لەسەر نییە، یەکەم نووسیاریٚ کە مێژووی وەك زانستێکی تایبەت و سەربەخۆ لەقەڵەم دا و لێی وەکۆڵیٚ، ئیبن خەلدوونە. مانای مێژوو، ناساندنی مێژوو، بە زۆر قۆناخ و لە زۆر سەرەوە باسی لیٚ کراوە. هەر لە کۆنەوە یەکێکی وەکوو پۆلی بیۆس و سوماتسین کە هەر یەکە لە بانێك و هەوایەکەوە ئۆڕیتیانە مێژوو، یەکەمیان خەلکی ڕۆژ ئاوا و دووەمیان خەلکی ڕۆژهەلاتە، بەلاٚم ئەوەت لەبیر نەچیٚ کە سەنگەر لە نیگای مێژووبینەوە، لەم دوو بەشەی جیهاندا بە تەواوی، لێکدی دەچوون. پۆلی بیۆس لەسەروبەندی هیلینیدای ڕۆژگار بە سەردەبرد و ئەوەش ڕۆژگاریٚ بوو کە ئیمپراتۆریی ڕۆم لە ناوچەی دەریای سپیدا، بە نێوی شوانی نەتەوەکان و ئێکنێخەری وان و وە شێوەی ڕمووزنی دووگونەشۆڕکەرەوە و هەر خۆی حسێو، لە دنیایەکی پان و بەرین، کە لە گراڤەکانی بەریتانیاوە تا باختەریانای (Bactariana)، لە ئاسیای ناویندا دەگرتەوە، رادەگەیشت. سوماتسین لە ئیمپراتۆریی هاندا دەژیا، ئەم ئیمپراتۆرییەتە، سەرزەوینی ئێستاکەی کۆماری مەزنی چین و ماچینی دەگرتەوە و فەرمانڕەوای بلندی ویٚ، ناوچەیەکی بەرفرەوانی، لە

گراڤەکانی ژاپۆنڕا تا ئاسیای ناوین، بەڕێوەدەبرد. لە نیگای کۆمەڵەکی و ئابوورییەوە سەرویەندی پۆڵی بیۆس و سوماتسین قۆناخی کۆتاییی مێژووی بگۆڕی دووروودرێژی کۆمەڵی کۆیلەتییە کە لەم دوو ناوچەی دنیای کۆنەدا فەرمانفەرما بووە. ئەم دەورانە کە یەکەم وەرچەرخانی مێژوو بوو بەسەرویەندی ڕووداوگەلی قووڵ و ئەزموونگەلی سەختی جەماوەر لەقەڵەم دەدرا. وەلێ هەمان دەوران بە تۆرەی خۆی گەنجینەگەلێکی گەورەی وەبەر هاورد و ئەڵها و تاسەی مرۆڤی بۆ فامین و زانینی وی بە چوار دەوریدا تەشەنە و حەوزەڵساندن دەدا. بگرە هەر ئەو ئەڵها و تاسەیە بوو کە شاکارەکانی پۆڵی بیۆس و سوماتسینیان هێنایە گۆڕێ. ئەم دوو دیرۆکنڤیسە هەردووکیان، پەیدابوونی ئیمپراتۆریی سەربەخۆیان، دەقاودەق، وەك ڕاستەقانییەکی مێژووینە کە نێوەرۆکێکی بە سوود و فرە بە نرخی هەڵسەنگاندن و هەریەکە بابیی چەندە، بەو تەرحەیان نرخ بۆ دانان. ئەم سەرویەندە، لە نیگای هەردووکیانەوە سەرویەندی بەرەو لووتکە هەلکشان بوو. جگە لەم دوو زاتە، کۆششتی ناکارجوونا لە ڕۆژهەلات و ئۆرلیۆس و ئۆکۆستیۆس لە ڕۆژاوا لە سەرویەندی وارگوێزیی کۆمەڵی کۆیلەتییەوە بەرەو فیۆدالیزم زۆر بەرچاوە. ناکارجوونا، کۆشەنیگایەکانی خۆی لەسەر بنەمای یاساوڕێسای، کە بە بیروباوەڕی جیهانییەوە ئامێژن کردبوو، پەروەراند؛ بیروباوەڕێکی ئەوتۆ کە ئاییینی بوودایی وای لێ کرد بە سەر لایەنی نەتەوایەتیی هینددا زاڵ بێ و تخووب و کەوشەنی بەرتەسکی وی ببەزێنێ و بە کەوشەن و سەرحەدەکانی دنیای ڕۆژهەلات بگەیێ. ئاییینی بوودا، کە نوتفەی وی دە پزدانی کۆمەڵی کۆیلەیەتیدا گیرسابۆوە، ئیدی بە

شێوەی ئـاینیێ لـە داییك بـوو، کـە چـاوەڕێی ئـەوەی لیّ دەکرا، خزمـەتی کۆمەڵی فیودالی ئەو سەردەمە، کە کۆمـەڵێکی نویێ و تـازە پشـکوتوو بـوو، بکا. هەرچی ئایینناکانی ئۆرلیـۆس و ئۆگستینۆس بوون، ئـەوە سـەر بـە دنیـای عیسـەوییەتە و ئـەوە ئـایینێکی دیکەیە کـە لـەگوێ ئـایینی بـوودا، هەستەی وی لە کۆمەڵی کۆیلەیەتیدا چەکەرەی کردووە و ئێستێکە لە دنیای هێلینیدا، لە قاڵبی ئایینێکی جیهانیدا داڕێژراوە. ئەم دوو مێژوونووسە، وایان هەست کرد کە لە مێژووی مرۆڤدا سەروبەندێکی نوێ گەلاڵە بوو کە هەریەکـە ئەم سەروبەندەیان وەك بەرەو لووتکەهەڵکشانیێ وەسف دەکرد. پێیان وابوو ئەم لووتکەیە ڕزگاریی مرۆڤ لە لایەن دەسەڵاتێکی ئاسمانی بەش بەحاڵی یەکـەمیان، بـوودا و بـەش بـەحاڵی دووەمیـان مەسـیحەوە یـە، بـەڵام لـە سەردەمی فیودالیزم (دەرەبەگایەتی)ەوە بەرەو کاپیتـالیزم (سـەرمایەداری) وارگوێزیـدا لـە خـاڵێکی وەرچـەرخانی دیکـەی مێـژوودا گەوهـەری مێـژوو بـۆ جارێکی دی هەڵدەسەنگێندریێ و بە بەهایەکی دیکەوە دەنرخێندریێ. ئەم لـە مێـژوو حاڵیبوونـە تازەیـە، لـە ڕۆژاوادا، زەق و زۆپـتر بـەرچاو دەکـەویێ. نامیینەی ئەمە، (ژ.ب. ویکۆ)یە. ڕامانەکەشـی بـە نـاوی خولێکـی گەڕانـەوە Cycles Recurning – یە. بـەڕای وی مێـژوو چـەند دەورانێکـە و هـەر دەوریێ، سیێ قۆناخی وەدەمەوە هەس. دەوری بەربەرییەت، سـەردەمی قارەمانـان و چەرخی مرۆڤایـەتی. دیـارە چـەرخی مرۆڤایـەتی، بـە لووتکـەی هـەر دەوریێ دەزانی و باوەڕی وابوو کـە لـە دووی وی، دەوری ئـاوابوون، واتـە: دەورانـی بەربەرییەت دادیێ. بە بڕوای ویکۆ، هەر خولێکی گەڕانەوە ئـاوابوونی مرۆڤـی تێدا بـە پلەیـەکی پاییـنتر لـە پلـەی پێشـینی دەبیـنیێ و هـەر هەڵکشـانێکی

بەرەودوا گەڕانەوەش، مرۆڤ بەرەو لووتکەیەکی بڵندتر، کە تا ئەو سەردەمە هاژ، ڕێی نەکەوتووەتێ، هەڵدەکشێنێ. ویکۆ، بڕوای بە کامڵبوونی ساکاری مێژوو، ڕاستەوخۆ، نەبوو، پێی وابوو، مێژوو بە دەوری خۆیدا ناخولێتەوە، بەڵکو بزاوتی وی مارپێچانەیە. جفرێ، واتە: هەرگیز بە جۆرێکی دیکە دووبارە نابێتەوە، بگرە هەمیشە هەر بەرەو پێشێ هەڵدەکشێ. بە ڕاستی ئەوەی کە لە ڕامانەکانی ویکۆدا سەرنج ڕادەکێشێ، ئەوەیە کە ئەو بۆ خۆی دەگەڵ چەرخی خۆدا هاوچەرخە، سەردەمی خۆی بە سەردەمی مرۆڤایەتی ، سەردەمی یاساوڕێسا و ئەقڵ و ئاوەز دەزانێ. ئەم خولە لە نیگای وییەوە بە سەردەمی مرۆڤایەتی و لەم ڕووەوە بە خولی لووتکە لە قەڵەم درا. کاتێ مرۆڤ لە قۆناخی سەرمایەداری و سۆسیالیزمەوە بەرەو پێشتر دەپەڕێتەوە و ئەڵها و تاسەی بۆ لە گەوهەری مێژوو حاڵی بوون پەرەدەستێنێ و تەشەنە دەکا، دیرۆکنووسانی تازەنەفەس هاتنەگۆڕێ: شپینگلەر و توینبی، دوو نمایینەی سەرمایەدارین. مارکسییەکان وایان سەدەق بۆ لێ دەدان کە پایدۆسکردن و لەناوچوونی سەرمایەداری لە چەند بەشێکی دنیایێدا وا بە چاوە خۆ دەبینن، بەڵام سەرمایەداری لەناو نەچوو؛ بە پێچەوانەوە، سۆسیالیزمی ڕووسیا و ئەورووپای ڕۆژهەڵات لە ناوچوو و ڕووخا. هەر بە پێی لێکدانەوەی مارکسییان، ئەم دوو دیرۆکنووسە بیروبۆچوونیان دەگەڵ دیرۆکنووسانی دیکەدا لێکدی تاق و جووت و دووفاق بوون. ئەگەر بیروبۆچوونەکانی پۆلی بیۆس و سوماتسین، خۆشبینانە بوون، ئەوەتا ئەم دوو فەیلەسووفانەی فەلسەفەی دیرۆکە، بە چاوێکی تا ئەندازەیەك، بەدبینانە و ڕەشبینانەیان دەڕوانییە دنیایێ. توینبی بە قەناعەتێ گەیشت

کە سەرمایەداری لە تاو چاوچنۆکی و چڵێسیی خۆی ڕووی لە مرۆڤ و خۆڕسك کردووە، مرۆڤیش و خۆڕسکیش بۆ قازانجی بێ سنووری خۆی بە هەموو بارێکدا دەتەقێنێتەوە. تەنانەت کارەکەی بە ئەندازەیەك هەڵکشاندووە، کە مرۆڤ لە چاو کەرەستەی بێ گیانەوە دەبینێ و وەك دار و بەرد و مەکینە و... تاد، هەروەك چارلی چاپلن پیشانی دا و هەروەك مارکۆس دەڵێ، ڕەفتار دەگەڵ دەکاو بەیەك ڕەهەندی لە قەڵەم دەدا، وەلێ ئەم نووفاقییە لە دیرۆك حاڵی بوونە، لە کوێڕا سەری هەڵدابوو؟ ئەمە لەوەڕا سەری هەڵدابوو کە توینبی بە قسەی خۆی، گۆیا هەر بیر و ئەندیشەیەکی دیرۆکینە هەیە بە ئیستیلاح ڕێژەکییە، واتە: هەر یەکە لە چاو بیروئەندێشەیەکی دیکەدا جوداوازە و بە هەلومەرج و بارودۆخی کاتی - شوێنەکیی خاوەن بیرو ئەندێشەکەوە، سەروکاری هەس. ئەمە باسی خۆڕسکی بەرەی مرۆڤ. مرۆڤ سوود لە پەندەکانی ڕابردووی خۆی کەم و زۆر هەر وەردەگرێ، لێ ئەمە سەروکاری بە سەنگی زانیاری و ئاستی زانستی وێستاکەیەوە هەس. ئەم زانیارییانەش هەمیشە ڕێژەکی و لە چاو یەکدیدا لێکدی جوداواز و مێژوویینەن. کە دەڵێم مێژوویینەن، واتە: کەڵەکەی ئەزموونی ساڵەهای ساڵی کۆمەڵە و هەر وا لە پڕێ نەهاتوونەگۆڕێ؛ چون هیچ چتێ بە کون فەیەکوونێ - مەگەر فەرمانی خودا بێ(؟) - نایەتە گۆڕێ.. لە دووەم دەیەی نیوەی پاشینی سەتەی بیستەمدا زانیاریی مرۆڤ لەمەڕ خۆی، لە زانستی دیرۆکینەی وی لە نیوەی سەتەی نۆزدەهەمدا، زۆر دەوڵەمەندتر و هاوداوێنتره. لە دواڕۆژیشدا زانستی دیرۆکینەی مرۆڤ، تا دێ فرەوانتر دەبێ؛ چونکە ئەگەر وا نەبێ، دەبێ مرۆڤ بەرەو هەڵدێر و زەلکاو

سەرەونشێو بێتەوە. دیارە لەویٚ ڕۆژێوە دیرۆك وەك زانستیٚ لە پێش مرۆڤدا قوت بۆتەوە تا ئـەمڕۆ، زانستی دیرۆکینـەی مـرۆڤ لەمـەڕ ڕابـردووی خۆی، بـەرە — بـەرە، ڕووی لـە فرەوانی و تەشـەنە و تەنینـەوە کـرد. لـە ئاکـامی نۆزینـەوەی چتـەیلی نـرت و نوێیـاو کـە ڕێیکـەوتووەتیٚ و هەڵیسـەنگاندوون، ڕووی لە وردبینیتر کرد. دواڕۆژیـش لـە چتی نوێیـاو ئاوسـە و مـرۆڤ تـا دیٚ چتی نوێیـاوتر دەنۆزێتـەوە. خـۆ ئەگـەر گریمـان، مـرۆڤ لەمـەڕ هێڵـە بنەڕەتەکانی پایەی ڕابردووی خۆی بە تەواوی حاڵی بوویٚ و سریشـتەیلێکی تازەی کە ڕەنگە لـە دواڕۆژدا وە سـەر خـەرمانی زانستی دیرۆکینـە کەڵەکـە کرێن، ئـەوە تـەنیا لـە زەوینـەیلێکی تایبـەتیدا دەتوانـن کاریگـەر بـن، جگـە لەوەش، زانستی دیرۆکینەی مرۆڤ، پیٚ بە پێی باروداۆخ و هەلومەرجی کـات و شوێنی بە کەوشەن، هـەر بـە کەوشـەنە و لـەو کەوشـەنانە زیاتر ناتوانیٚ بترازیٚ. هەر جۆرە لێکدانەوەیەکی کە لە بابەتی دیرۆکی ژیانی مرۆڤ بـەش بەوەندەی لە توانستی مەدایە و لە ئەزموونەکانی پێشووی خۆمان ئـەنجام لیٚ وەرگرین و بەش بەوەندەی کـە بتوانیـن دواڕۆژ لەسـەر پایـەی ئەزموونـەکان پێشوێژی بکەین، ئەنجامبەخش دەبیٚ. هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەزموونی مێژوویینەی مـرۆڤ فـرە گـەورەس. تەنانـەت ئەگـەر ئێمـە بەسـەرکردنەوەی ڕابردووی خۆ لە سەزویەندی بە دیارکەوتنی نوخشـەی نیشانەکانی دەوڵـەت هاتنە ئـاراوە، دەست پیٚ بکەین، واتـە: بـەر لـە هـەزارەی چارەمی پ. ز. هەنگێن خۆ هەر هیچ نەبیٚ لە ژیـانی مرۆڤمـان لـە مەودایـەکی لـە (٦) هـەزار ساڵ زێتردا، وەکۆڵیوە. دیارە ئەم شـەش هـەزار سـاڵە بـە تـەواوەتی بەشـی ئەوە دەکا کە هێڵە ئەسڵییەکانی ئەو ڕێگایەی کە مرۆڤ بڕیویـە، نێوەڕۆکـی

ئەم ڕێگایە و هۆ و بەریانی هەموانییی وی نیشان بدا. لەمەش بـترازێ، هۆکاری ئەزموونی مێژووییەی سەروبەندی هاوچەرخیش، لەمەڕ سوود لە ڕابردووەوەرگرتنی مرۆڤ کاملتر و دیارتر دەکا و هێڵەکانی دوارۆژ، یان بە لای کەمەوە دوارۆژی نێزیك بەدیار دێخن. لە مێژوودا، هێندێ سەروبەندی ئەوتۆ هەن کە دەلالەت لە سەرڕوینی دوو خولن، لە دوا دوای سەردەمێکی گەورە و سەرەتای خولێکی تازە بۆ دەکەن. جا ئەم زەمانەیلە کە لە دوارۆژدا پەردەیان لە ڕوو هەڵدەماڵدرێن، بە وەرچەرخانی شۆڕشگێڕانەی مێژوو وەسف دەکرێ. نوخشەی یەکەم وەرچەرخانی مێژوو، داتەپینی دنیایێ بوو کە جیهانی کۆنی پێ یەژن. لەم سەروبەندەدا سیستمی بەندەگی، بە ناوی سیستمی کۆمەڵەکی – ئابووریی داسەپاو، فەرمانفەرما بوو، بەڵام ڕۆژگاری هاتەگۆڕێ ئەم سیستمی بەندەگییە، وەك سیستمێکی داسەپاوی جیهانی لەبەر یەکدی هەڵوەشایەوە. دوا نماینەی بەندەگی لە ئاسیای ڕۆژهەلاتدا، ئیمپراتۆریی هان و لە ئەورووپای باشووری و ئەفریقیای باکووری و ئاسیای ڕۆژاوا، ئیمپراتۆریی ڕۆمی ڕۆژاوایی بوو. ئیمپراتۆریی هان لە سەتەکانی دووەم و سێیەم و ئیمپراتۆریی ڕۆم لە سەتەکانی چارەم و پێنجەمی ز. دا ڕووخان. ئەم گۆڕانکارییانە، بەرە – بەرە، ڕووناکیی لێکەوتەوە و پەردەی لە ڕووی دوارۆژ هەڵماڵی و مـوژدەی پشکووتنی سیستمی کۆمەڵەکی – ئابووریی فیودالیزمی هێنا. دووەمین وەرچەرخانی گەورەتری مێژوو، لەبەریەکداوەشانی دنیایەکە، کە سەدەکانی ناوینی پێ دەڵێن. نێوەڕۆکی کۆمەڵەکی – ئابووریی ئەم خولە، دەرەبەگایەتی بوو. خاوەنیەتیی زەوین بوو. ڕۆژگارەکیش داهات کە ئەم سیستەمە داسەپاوەش پایدۆسی پێکرا.

دیاره ئەم گۆڕانكارییانە بەش بەحاڵی وڵاتە گەورەكان، لەسەرەتاڕا لە ئینگلستان و فەرەنسا ڕوویان دا، بەڵام پێوەندییەكانی كۆمەڵەكی - ئابووری وردە - وردە چاویان دەپشكووت و سەروسیمایان ئاشكرا دەبوو. ئیدی سیستمی سەرمایەداری داهات. سێیەمین خاڵی وەرچەرخانی شۆڕشگێڕانەی جیهان، لە سەدەی بیستەمدا ڕووی دا. ئەوەش ئەوە بوو كە سیستمێكی كرچ و كاڵی بە پەلەی سۆسیالیزم لە ڕووسیا و بە زۆرە ملێی پاش شەڕی فاشییەت و نازییەت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و لە چین و كۆریا و ڤێتنام تاد... هاتە گۆڕێ. لە هەر یەكێ لەم شۆڕشە كۆمەڵەكی - ئابوورییانەدا، سیستمێكی چینەكیی لێك دووفاق و دڕدۆنگ، جێگەی خۆی بۆ سیستمێكی لەو بابەتە بەجێهێشت. بەڵام لە سێیەم خاڵدا كارەكە لە ڕەگ و ڕیشەڕا گۆڕابوو، ماركسییەكان لەو بڕوایەدان كە دەبوا ئەم گۆڕانكارییە بە كشكردن لە چینەكانی لێك دووفاق و دڕدۆنگ، دوایی هاتبا.. جا لەبەر ئەمەیە سەردەمی ئەمڕۆ دەرفەتگەلێكی گەورەتری لە تێگەیشتنی ڕابردووی مرۆڤ و هەروەها دواڕۆژی وی بە دەستەوەدەدا. دیارە سەردەمی هەوڵدان بۆ یەك تەوەرەیی، یەك جیهانی، سەرلەنوێ بە شێوەیەكی دیكە لە دیرۆك حاڵی بوون، ئەمانە سەرلەبەر بە دیموكراسییەوە، كە بووە بە بنێشتە خۆشەی بن ددانی هەموو نەتەوەكانی هاوچارەنووسیش و لێك دڕدۆنگیش لەم چەرخەدا. ئەوەی یارمەتیی خاڵێكی دیكەی وەرچەرخانی ڕەوڕەوەی مێژوو دەدا، من بەش بە حاڵی خۆم، سریشتی مرۆڤ بۆ خۆی، تا دێ ڕێگا بەرەو یەكلاكردنەوەی كێشەكانی بە زۆرەملێ ماف لە خەڵكی داگیركردن، بە بۆمبای كیمیاوی و گاز و بایۆلۆژیك مرۆڤ قڕكردن، خەڵك لە برسان

مرداركردنەوە، ژن بە بەندە و كاڵای فرۆتـەنی لـە قەڵـەم دان و حـەز لـە هەڵایسانی شەڕ و ئاژاوەگێڕی كردن و تاد... خۆشتر دەكا.باشە، نێوەرۆكـی مێژوو چییە؟ دیارە هەر كۆششێ لـە بۆ دەركـی مێژووی جیـهان، بتـەوێ و نەتەوێ، ئەمانەت لە پێشدا قوت دەكاتەوە: گەلۆ مێژوو بە بەریانێكی دیار و بەرچاودا دەڕوا؟ ئایا ڕەوڕەوەی مێژوو گەوهەرێكی هەیە؟ بە پێی وەرامـی ئـەم پرسـیارە، دوو جۆرە تێگەیشـتنی فەلسـەفییانەمان لەبـەردەمدا زەق دەبنـەوە: ڕامانـەیێ دەڵـێ: هیچ مانـا و مەبەسـتێ لـە ئـارادا نییـە. مێـژوو دووبارەبوونەوەی هەتا هەتاییی ڕووداوانە و هیچی تێـدا بەسـتە نییـە، بـەڵام بەرپەرچدانەوەی ئەم ڕامانەیە تا بێژی سـانایە. شـایەتیی واقیعییانـە لەمـەڕ ئەمـە زۆرن. هیـچ سـەروبەندێ، هەرچـەندە هێڵەكانیشـی ڕەنگـە وەك سەروبەندی پێشـە خـۆی بچـن، وەلێ دەقـاودەق دووبارەبوونـەوەی هـەمان نوسخەی وی نییە. كەس ناتوانێ لاف ئەوە لێ بدا كە دیموكراسـیی ئـەورووپای سـەدەی نۆزدەهـەم دووبارەبوونـەوەی دیموكراسـییە كۆنەكـەی ئاتێنـە. شۆڕشـی سۆسیالیسـتی سـەدەی بیسـتەم دووبارەبوونـەوەی شۆڕشـی بۆرجوازیی ئینگلیس و فەرەنسایە. كە دەڵێم دیموكراسیی كە ئـەوڕۆ وەختـە بێژم جێگای هەموو سیستمەكانی گرتووەتەوە، ڕەنگە لەبەر ئەوە باش بێ؛ چونكە هەر لەسای ویدا مرۆ چ وەك تاك و چ وەك كۆمەڵ، دوور لـە كشكردن لە بەرابەر، دەتوانێ بێ ترسی فتكردن بیربكاتەوە. ڕامانەیەكی دیكە یەژێ: نەخێر مەیل و لایەنگری لە مێژوودا هەیە. مێژوو بـەرەو سەروو هەڵكشینە و گەوهەر و نێوەرۆكی وی پێشكەتووانەیە، وەلێ بەشی هەرە زۆری ڕەخنەگەلێ كە لەم ڕامانەیە دەگیرێ ئەوەی بیروبۆچوون و دەركی پێشكەوتوو چتێكـی

ڕامانەکی و بێ سەروبەرە، یا هەر هیچ نەبێ بابەتێکی بە مشتومڕە و بە گۆشەنیگایەکانەوە بەندە، هەر یەکە لە ئاوازێ دەژەنێ. نموونەگەلێ کە بە پێشکەوتوو دەزاندرێن، بە زۆری لە بۆتەی مێژوودا چتێکی ناپێشکەوتوون. بە ڕاستی ئەم ڕەخنەیە زۆر جێگای سرنجدانە؛ چونکە مەسەلەکە خۆی کە کێهە پێشکەوتووە و کێهە ناپێشکەوتووە، ئاغڵەبە، لەسەر بنەمای پێشەکی ڕیزکردنی لۆجیکانەی ڕووتە ڕامانەکی و وشکەکەڵەك سەروبەر دەنرێ. لەوە دەچێ، لەبارترین ڕێگا بۆ چارەسەری کێشەی لە گەرمەری مێژوو حاڵی بوون، ئەوەیە دەستەوداوێنی مێژوو، هەر خۆی ببین و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەیەکی بێ لایەنانە – ئەگەر بکرێ، بەڵام هەرگیز ناکرێ – لە مێژووی شەش هەزار ساڵەی مرۆڤ، لە هەموو بوارەکاندا، وەکار ئێخرێن. جا هەر لەبەر هەندێ، تەشەنەکردنی مێژوو و پاشان لە نێوەڕۆکی مێژوو وەتۆژین، کارێکی خراپ نییە. بە پێی چەمکێ کە لە پێشەوە لەمەڕ مێژوو گوترا، دەبێ لە هەزارەی چارەمی پ. ز. ەوە، کاتێ شارستانیی میسر لە دۆڵی نیل و شارستانیی سۆمار لە مۆزەپۆتامیا بە ناوی نوخشەی دەوڵەتان سەری هەڵ دا، دەست پێ دەکا. یەکێ لە نیشانەکانی ئەم سەدە تازەیە ئەوەیە کە بە پێچەوانەی پ. ز. کە گۆی زەوین، تا ڕادەیێ تەڕاتێنگای مرۆڤ بوو، ژیانی لەمێژینە لە ناوچەگەلێکی جوغرافییانەی دیاردا – لە کوانووی دەوڵەتە سەرەتاییەکاندا، خەستوخۆڵ ببۆوە، واتە: کە باسی مرۆڤ دەکرێ، زێتر ئەو مرۆڤانەی کە لە قەڵەمڕەوی ئەم دەوڵەتانەدا ئاسەواریان بە دیارکەوتووە، بە نموونە لە قەڵەم دەدرێن. کەواسا: ڕەوڕەوەی دوایی مێژوو، درێژای تەشەنە و تەنینەوەی بێ وچانی شانۆ

جوغرافیایی و نەتەوەکییەکانی کۆمەڵانی مرۆڤایەتییە. بە نیوچە چاوگێڕانی بە ڕابردووی دوور و درێژی مرۆڤدا، ئەو ڕاستییەمان بۆ ئاشکرا دەکا کە مێژوو لە هەمان ترووکەی پەیدابوونی خۆیەوە، هەمیشە ڕوو لە تەنینەوە و تەشەنەکردن بووە و تا خەیاڵ بفەرمووی خەڵکێکی بێ شوماری دنیا دەبەر دەگرێ. ژیانی لەمێژینە لە دوو مەڵبەندی ناوچەقی سەرەتای خۆوە — میسر و سۆمار وردە وردە دەتەنێتەوە و سەرزەوینانی دراوسێ بە لای خۆدا ڕادەکێشێ. ڕەوڕەوەی مێژوو لە میسرەوە بەرەو باشوور دەتەنێتەوە و پێدەشتی حەبەشستان وەبەر خۆ دەگرێ و ڕوو لە ڕۆژهەڵات دەکا، نیوچە گراڤی عەرەبستان و لە پێش هەمووانەوە، بەشەکانی دراوسێی وی، کە پاشان بە فەلەستین نێو نراوە، بە خۆوە تێکدەبەستێ و بەرەو کەنارەکانی دەریای سپی پێش دەکەوێ و لە ئاسیای ڕۆژاوا سەرزەوینی ئێستای سووریا و لوبنان وە پاشە خۆ دەدا و ئەوجا بەرەو مێزۆپۆتامیا دەتەنێتەوە. ناوچەقی شارستانییەتێکی دیکەی سەرزەوینی مێزۆپۆتامیاش، لە دوو لاوە بەرەو پێش دەچێ: لە لایەکی بەرەو ئاسیای بچووک، سووریا و لوبنان و فەلەستینن کە دەگەڵ شارستانیی میسردا تێکەڵ دەبوونەوە و لە لایەکی دیکەوە بەرەو پشت قەفقاس و ئێران. ئەوجا، بەندە لێرەدا بەوەندە ڕەوتەی مێژوو دادەکەوم و هەر هێندەم کار پێیە، چونکە کوردستانەکەم کەوتۆتە نێوان ئەم سەرزەوینانە. ئەگەر وەگەڕێمە ناوکرۆکی باسەکە، کە بە سەرناوی : سەرچاوەکانی بیری کوردەواریم نووسیوە، دیارە کوردەکە لە پێشان دەگەڵ ئەم وڵاتانەدا جۆشی خواردووە و سەروکاری دەگەڵ ئەوانەدا پەیدا کردووە. باشە، ئەم حەمکە تەنینەوە جوغرافیاییانە، کە تەنیا

ئاماژەمان بۆ چەند پاژێکی کرد، بەش بە حاڵی نەتەوەکان چەند کار لە دابەشبوون و لەت و پەت بوون، یان یەك گرتنیان کردووە؟ بێ گومان ئەم تەنینەوە لەمێژینە جوغرافیاییە، لایەنی نەژادیی (نەتەوەیی)شی هەبووە؛ چون لەم تێکە و لێکەیەدا هەمیشە لکێکی نوێ لە کۆمەڵانی مرۆڤ، پێی هاویشتۆتە گۆڕەپانی مێژووەوە. لە هێندێ شوێن ناوچەگەلی تازە کە خەڵکەکانیان هێمان ڕێیان نەکەوتبووە گێژەنەی مێژوو، لەسەر جۆخینی ناوچە کۆنەکان کەڵەکە بوون. لە هێندێ جێگای دی نەتەوەگەلی تازەکوورە لە مەفتەن و زێدی خۆیانەوە بەڕێ کەوتن و ناوچە تازەکانیان وەبەر تاخت و تاز دا. مێژووی خەڵکانی ژاپۆن، کورە، لاتینەکانی ئیتالیا، نەوەکانی گال و ڤەندال و غەیری وان نموونەگەلێکن ئەوە نیشان دەدەن کە چۆن نەتەوەکان بە وەرسووڕ و داسووڕی مێژووی دراوسێیەکانی خۆ کەمەنکێش کران. هێورینی هۆزەکانی یۆنان لە ناوچەی می سین "Mycenas" کە بەشێ لە ناوچەکانی لەمێژینەی کۆنی ئاخروئۆخری هەزارەی سێیەمی پ. ز. بووە، نموونەیێ لە کۆچ و ڕەوی نەتەوە تازەکان بەرەو ناوچە کۆنەکانی مێژوو. مێژوو زۆرمان لەم نموونانە بە بیر دێنێتەوە: هەوارگرتنی ئارامییان لە سووریا، فینیقیا، بابلستان و باکووری مێزۆپۆتامیا لە هەزارەی دووەمی پ. ز. سەیمەرییان بەرەو پشت قەفقاس و ئاسیای بچووك لە سەتەی هەشتەمی پ. ز. ، هەوارگرتنی هۆزەکانی "هسین پی" Hsin Pi ، هوون، "کیتان" Kitan و "چورچێن" Churchen لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی، باکوور و باکووری ڕۆژاوایی چینی ئەمڕۆکە، کۆچ و ڕەوی گەتەکان، یارمانەکان

**Sarmate و سلاڤەکان بۆ باڵکـان و تـاد... نەخشـەیەکی بزفـت و سـووڕوگوڕی نەتەوەکانمان پیشان دەدا.**

***لە سەروبەندی*** باوك سالاریدا زەویوزار بۆكشتوكاڵ و باخ و باخات و میوەچاندن، بە هۆی كوڵینگ و پاچ و پێمەڕە و گاسن و ئیروئامورر و هەوجاڕ و قورەمەوە، كێڵدراون و ئاودراون، گەلە و ڕانە گەورەكانی ئاژەڵ و گاوگۆتاڵ، ئەمانە سەرلەبەر، بە شێوەیەكی بەرچاو دێنەبەر و داهاتی كار زیاد دەكا و ئیدی مرۆڤ دەتوانێ زێتر لە ئەندازەی وەی كە بۆ پاراستنی هێز و گوردی خۆی و بەخێوكردنی زارۆكان پێویستی بێ، ڕەنێوبێنێ. وەرزێر و شوانكاران داهاتێكی زێتر لەوەی نێچیروانان و ماسیگران بە بەرهەمیان دەهێنا، مەیسەردەكەن. دەسكەوتی وان لە بەرهەمی نێچیروانی، كە ڕەنگە بە ئاسانی دەردەست نەكرابێ، بە شێوەیەكی مسۆگەرتر دابین دەكرێ. خێڵە كشتوكاڵكارەكان دەتوانن برێ لە داهاتی خۆراك كە بۆ ئەوە بشێ لە چاڵان، یان لە لایەكی چەپەكی ناو لێڕەوارێكدا، بپارێزرێ، خڕكەنەوە و هۆزە شوانكارەكان لە مێگەلەكانیان، شیر، ماست، گۆشت، خوری، چەرم، بۆ سازكردنی خانووبەرە، هێسك و تەپاڵە و پشكەڵ بۆ تەیاركردنی سووتەنی و ئاورودوو و گەرمی، بە دەست دێنن.

مرۆڤ دەگاتە پلەیەك ئیدی دەتوانێ لە مەسرەفی خۆی زێتر ڕەنێوبێنێ و ئەمەش چەوساندنەوە كە بریتییە لە كەڵەكەبوونی داهاتی زێدە (فائض القیمة) لەسەر حیسابی ڕەنجی یەكێكی دیكە دێنێتەگۆڕێ ئەگەر ئەو سەروبەندە دیل و یەخسیرەكان، بۆ قوربانی لە پێشگای خودایاندا یان بۆ خواردنی گۆشتیان دەیانكوشتن، یان هەر دە چوارچێوەی تیرە و هۆزەكاندا، قوبووڵیان دەكردن، ئیدی ئێستا زێدەبوونی داهاتی بەشێ لە كار

وا دەکا کە لە کاری ئەم زیندانییانە سوود وەربگرن و ئەمانە بە ناوی بەردەوە، بچەوسێننەوە و کەڵکیان لێ وەربگرن.

زانیارییە فەرهەنگ ناسییەکان، بە چلۆنایەتیی بەردەیی سەرەتاییمان ئاشنادەکەن و هاوسەروکاریی کۆمەڵایەتییەکی تایبەتیمان کە لەسەردەمی پێکهاتنی یەکەم چینەکاندا پەیدابووە، بەبیردێنێتەوە.

بەردەگی لە کن ڕاوچییانی هیندیی باکووری ڕۆژاوایی ئەمریکای باکووری لە باشووری ئالاسکا) بە شێوەیەکی سرنجبزوێن پەرەی Voncuver(گرداوی ساند. ئەم نەتەوانە هێشتا هەر لە ئامێری بەردینە و مسینەیان ، نەخوازا بۆ پەرداخکردن و مشتومالی بەردی ڕازاندنەوە و بەزەکی و دۆزەکی، سوود وەردەگرت، کشتوکاڵیان پاشکەفتی بوو، زێتر بە ڕاوەماسی بە ڕێوە دەچوون. وەلێ فرەوانیی لە ڕادەبەدەری ماسی (ماسیی ئازاد ـ Saumon ) یارمەتیی دان زێدەداهاتێکی بەرچاو گرداری بکەن. لەم ڕووەوە، فرەوانیی داهات لە کن سووربێستانی ئەمریکای باکوور، بە بنەمای شابووریی پەرەساندنی بەردەگی لەقەڵەم دەدرێ. جاری وا هەبووە، ڕێژەی بەردەکان لە نێوان هۆز و خێڵەکاندا دەگەیشتە حەوتیەک، یان سێیەکی کۆمەڵ. سەرچاوەی بەردەگی لە پێش هەموو چتێکدا شەڕوشۆڕ بوو. ئەوەی لە شەڕدا بە دیل دەگیرا، دەکرایە خولام. بەردەی واش هەبوون بە کرین دەکڕدران. لە زۆر ڕشتەی کاردا سوود لە بەردە وەردەگیرا. بەردە لە هەر جۆرە مافێ بێ بەهرە بوو. ژیانی هیچ نرخێکی نەبوو. دە کاتی بە خاک سپاردنیدا، سەرەك هۆز دەی کرد بە قوربانی. گ.د. ئەفیدۆف، ئەفسەری دەریاییی ڕووس لە سەرەتای سەتەی ١٩دا لە ئالاسکا ژیاوە، دەگێڕێتەوە،

که لەم ڕێوڕەسمە شوومەدا، هیندییەکان بەردەکانی خۆیانیان ناچاردەکردن سەما بکەن و ئەوجا خۆیان لەسەرڕا تیربارانیان دەکردن و منداڵەوردەکەش لە خواری بە نووکە نێزە تێیان بەردەبوون. بەردە لە کاتی خانوویەکی نوێ بنیاتنان، یان هەڵبژاردنی سەرۆکێکی نوێدا، بۆ قوربانی دەکوژران. ئینسانخۆری زۆر لەباو بوو. ئەم قەڵتوبڕە گشتییانە پاشماوەکانی سەروبەندێ بوون، کە هێشتا سوود لە کاری زیندانییانی شەڕ وەرنەدەگیرا. دیارە، شێوەی ئەشکەنجەدان و قەڵتوبڕی بەردە هێندە زۆربوون، لە ژمارە نەدەهاتن. بەردەگی، یەکەم شێوەی چەوساندنەوەی مرۆڤە بە دەستی مرۆڤ. پەیدابوونی بەردەگی دیاردەیەکی خۆڕسک و مەنتیقیی تەرلوشی پەرەساندنی هێزەکانی ڕەنێوهێنانە. سەرەڕای ئەوە، پەیدابوونی بەردەگی لە هەلومەرجی ئەو زەمانەدا، بە هەنگاوێکی گەورە لەقەڵەم دەدرێ. چەوساندنەوەی بەردەکان، لە کەڵەکەبوونی زێدەی داهاتدا کە لەبۆ تەشەنەکردن و زێدەبوونی دواییی ڕەنێوهێنان پێویست بوو، دەورێکی کاریگەری گێڕاوە.

کۆنترین شێوەی بەردەگی، بە بەردەگیی باوك سالاری Patriarcial یان ناومالی Domestic نێودەبرێ. بەردە لەم قۆناغەدا هێشتا لە بواری ڕەنێوهێناندا، دەورێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵکو تەنها هەر لە تەك مرۆڤی ئازاددا و بە ناوی یاریدەدەری وییەوە کاری دەکرد. تەنانەت دەیتوانی کۆلێتێ، چەند بەرازێ، یان لەتە زەوینێکی هەبن. لەم هەلومەرجەدا دەگەڵ مرۆی ئازاددا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو. جلوپۆشاکی هەر وەکو جلوبەرگی مرۆڤی ئازاد وا بوو و زاڕۆڵەکانیان لەگەڵ زاڕۆڵە ئازادەکاندا

یارییان دەکرد. کەچی کوردەکە نە خۆی و نە زارۆڵەکانیان تا ئەوڕۆکەش لەم بەری سنوورە خەیاڵییەکانی نێوانیاندا لەگەڵ ئەوبەردا ناتوانن یاری بکەن، ئەحمەد عارفی شاعیری تورك زمانی بە داك کورد و بە باب تورکی باڵکان گوتەنی "تەنها مریشکەکانیان دەگەڵ یەکدیدا گەمە دەکەن

نەك هەر ئەوە، بگرە بەردە دەشیتوانی ژنی ئازاد بێنێ و منداڵی ئازادیشی ببن، هەروەهاش خوڵامیش دەیتوانی ژنی ئازاد بێنێ و لەگەڵیدا لە بنەماڵەیەکدا ژیان، بەسەر بەرێ. کەچی وێڕای وەش بەردە، هەر کاڵای خاوەنەکەی بوو و مافی ژیان و مردنی بە دەستە وی بوو.

بەردە لە ئیمپراتۆریی بابلستاندا، بەرە ـ بەرە، هەر هەمان تایبەتمەندیەتیی کە لە هەزارەی سێیەمدا هەبوو، دەپارێزرا. بەردەی ناومالٌ هێشتا هەر وەك جاران، ملکی بێ چەندوچوونی خاوەنەکەی بوو، دەیتوانی بیفرۆشێ، بە یەکێکی دیکەی ببەخشێ، وەك هەر مەتاعێکی دیکە گرێوی لەسەر بکا. هەر کاتێ بەردە سەرپێچیی لە فەرمانی ئاغایەکەی کردبا، یاسا رێی دەدا ئەندامێ لە ئەندامەکانی داپاچێ (بەندی ٢٨٢). هێندێ بەردە نێوچاوانیان، ڕوومەتیان بە داخ کردن نیشانە دەکران، هەر کاتێ دەلاکێ بە بێ ئیجازەی خاوەنەکەی ئەو نیشانەیەی سڕیباوە، پەنجەکانی دەبڕدران (بەندی ٢٢٦) و هتد

لە کۆمۆنەی خێزانیدا ئەگەر کەنیزێ ببوایە بە ژنی پیاوێکی ئازاد، پلەوپایەیەکی تایبەتیی دەبوو (ئەحمەد قامەچیی مامم، بابی ڕەفیق قامەچی و نازم قامەچی کە لە بەغدایێ بە ڕوتبەی ئەسکەرییەوە چەخماخسازی کارخانەی چەکسازیی عوسمانی بوو و لە تەپەتولکورد

"قەراغوول"[*] دادەنیشتن، کەنیزێکی ڕەشکەلەی لە ماڵێ بوو، بۆ بەردەستیی سەلما خانم، پاشان مارەی کرد و شەفیقەڕەشی زڕبابی سوعادی لێ بوو. ئەگەر ژنی بەمارەوتەلاق نەزۆک و ئەستێور بوایە، شووەکەی دەیتوانی ژنێکی بێ مارەوتەلاقی هەبێ (شوکتوومیان پێ دەگوت) کە ئاغڵەبە کەنیزێکی (عەبدووم) بوو. ژنی ڕەسمی هێندێ جار بۆ خۆی ژنی دووەمی لە کەنیزانی خۆی بۆ شووەکەی هەڵ دەبژارد. بەڵام بەو کارەش هەر ئازاد نەدەبوو، وەلێ کە دەبوو بە ژنی پیاوێکی بە دەسەلات، پلەو پایەی ژنی گەورەی دەهێنایە خوارێ. حەزرەتی ئیبراهیم لە سارای ژنی منداڵی نەدەبوو، کەنیزێکی هاجەر ناوی هەبوو، سارا لە حەزرەتی ئیبراهیمی مارە کرد. کەوابوو ئەمە هەر لە کۆنەوە هەبووە. پاتشایان و خەلیفەکان و سوڵتانەکان هێندێکیان خێزانەکانیان کەنیزەك بوون، بۆ نموونە: خاتوخورەمی خاسەکی، ڕۆکسیلانە، کە کەنیزێکی ڕووسی دەرباری سوڵتان سلێمانی یەکەم بوو و زۆر زیرەك و لێوەشاوە بوو، سوڵتان لە خۆی مارەکرد و سوڵتان سەلیمی دووەمی لێ بوو و دەورێکی گەورەی لە کاروباری دەرباری عوسمانیدا گێڕا. مستەفای کوڕی سوڵتان سلێمانی لە بەر خاتری کوڕەکەی خۆی بە کوشت دا.

مارکس، وەرگرتنی سەرلەبەری بەشێکی دیاریکراوی کاری زێدەی لە ئەرزی ئاسیاییی ڕەنێوهێنانی سیستمی بەردەگی و دەرەبەگایەتی، هەر بە تەواوەتی جوێ دەکاتەوە. هەروەها تەرزی ئاسیاییی ڕەنێوهێنان و دەرەبەگایەتیش لە پاشان هەر جوێ دەکاتەوە. بە لای مارکسەوە، گوندی خۆی بەرانبەر بە خاوەن ملك، بە بەرپرس نازانێ، بەڵکو خۆی لە بەرانبەر

حوكوومەت (وەك تەبەعە) بە بەرپرس دەزانێ. لەبەر هەندێ، بەردە "مسكێن؟" Serf (قن) زەویوزاری سیستەمی دەرەبەگایەتی، یان گوندیی چكۆلە و لە گوندیی كۆمەڵی تەرزی ئاسیاییی لە بن وشاریی زێتری سیاسیدا ناچارە مل بۆ ئەم وشارە كەچ بكا. لەبەر ئەوەی كە لە تەرزی كۆمەڵی ئاسیاییدا، مولكییەتی زەویوزار نییە، تەبەعە (مكلف) خەراج بە نوێنەری دەوڵەت دەدا. واتە: ئەو سیستەمی باج و خەراجانەی كە لە تەرزی كۆمەڵی ئاسیاییدا ئەوڕۆ دەیبینین لەوە كەوتۆتەوە كە وەختێ خۆی لە كۆمەڵی سەرەتاییدا، ئینسانەكان بڕێكی یەدەك و پێویستییەكی یەدەكیان بۆ پاشەڕۆژ پاشەكەوت دەكرد. لە ئابووریی سەردەمەكانی ناویندا بەردە و خولام دەورێكی كاریگەریان دەگێڕا، چونكە كار و فرمانێكی جۆراوجۆر و جودا ـ جودایان ڕادەپەڕاند. كۆمەڵێكیان بە بۆنەی شەڕوشۆڕ و هێندێكیان لە ئەنجامی تالان و بڕۆ و چەپاو و ئەنفال و ڕاوەبنیادەمەوە وەگیر عەرەبەكان كەوتبوون و ژمارەیەكی زۆری دیكەیان لە نەتەوەكانی غەیرە سورمان بە كڕین دەكڕین. لەو سەروبەندەدا سەوداومامەڵەیەكی فرەوانیان لەسەر ئەنجام دەدرا. خرستیانەكانی لوبنان و زێتر جووەكان پێناوی ئەم جۆرە سەوداومامەڵەیە بوون. نماینانی دوو میللەتی جوو و خرستیان بۆ ئەورووپای ناوین دەچوون و لە شارەكانی پراگ، ماگدبورگ، ئێكس لاشال (ئەقش) جنێڤ، جەنەوە، كە مۆڵگای بەردان بوون، ژمارەیەكی زۆریان دەكڕێ. ئەم دەستەجاتانە پاش سەوداومامەڵە لە ڕێگای دۆڵی "ڕاینگ" و "وار"ەوە دەگەڕانەوە. لە ناوچەی وار لاوترین خولامیان بە "یەختە" دەكرد و پاشان بۆ قورتوبە و ئەسەمبۆڵ و میسر ڕەوانەدەكردن. لە ئەفریقاشەوە

ژمارەیەکی فرە خولامــی ڕەشپێست بۆ ولاتــانی جیهان دەنـێردران. وێـڕای وەی کە سورمانەکان بـە پێـی شـەرع مافی ئـەوەیان نـەبوو کـە منداڵـەکانی خۆیان بفرۆشن، قەرمەتییەکان بێ ئەوەی گوێ بەم شەرعە بدەن، جارێکیان کاروانێکی مەکەیان، پـاش ئـەوەی بـە بیابـانی عەربستاندا تێپـەڕین، ڕووت کردەوە و دوو هەزار پیاو و پێنجسەت ژنی زیندانییان فڕاندن و سەرلەبەریان فرۆشتن.

بەلام زیممییـەکان، ئەوانـەی سـورمان نـەبوون و بەسـەرانەدان پارێزگـاریی گیـانی و ماڵییـان لێ دەکـرا، نەدەفرۆشـران، بـەڵکو بـۆ هێنـدێ وردە کـاری نێومالێ، پاسەوانی، یان هەر بۆ بژیو و گوزەرانـی خۆیـان بـە نێـوی خواجـای هەرمسـەرا و ئێشـیك ئاغاسـی و لالـە و ئەتابـەگ و مـیرزا و هتـد وەوە دەکـاردەبران. هـەروەها هێندێکیـان بەکرێ دەدران، یـان لـە دەسـکەوت و داهاتیان بەهرەگری دەکرا.

بە نموونە: خولامێ کـە خـەیاتیی دەکرد، ناچار، دەبوا دوو درهـەمان لـە ڕۆژانەکـەی بـە ئاغایەکـەی بدا. خولامـانێکی ڕەشپێسـت کـە لـە زەنگبـار (قونبولە)یان دەهێنان یان دە کاری کشتوکاڵ یان بۆ کاری هـاتوچۆی شـار، سـوود لێ وەردەگرتـن. لـە خولامـانی فـەڕەنگی و ڕۆمـی و هێنـدی بـۆ کـاری هونەری و پیشەسازی و لە کەنیزانی زیرەك بـۆ کاروبـاری مـاڵ بەڕێوەبردن، کەلك وەردەگیرا، یان ناچاردەکران منداڵ بەخێوبکەن و چاوێری و دایـەنییان لێ بکـەن. خـەرابات و مەیخانـەکان، هـەموو لـەو کـەنیزە بەسـتەزمانانە سەرڕێژبوون. تەنانەت بۆ شەڕوشۆڕیش خولامانیان لە ڕیـزی پێـش پێشـەوە دادەنـان و ئەسڵەن واژەی ئانـەزگ "مورتەزیقـە"ی بـەکرێگیراوی جـەنگی

لەمەڕا کەوتوتەوە. ژمارەیەکی زۆری سپاییانی ڕۆم و عەجەم لەم نانەزگانە بوون. لە هەر شارێ بازاڕێکی تایبەتی بۆ خولام و کەنیزەك فرۆشی هەبوو و کەسانێ کە ئارەزووی خولام و کەنیزەك کڕینیان هەبا، دەچوون وەك خەیار و ترۆزیی ناسك لەوێ دەیان کڕین...لە هەر بازاڕێکیشدا نماینەیەکی ڕسمیی میری هەبوو کە کۆنترۆلی نرخ و بەهای خولام و کەنیزەکانی دەکرد. لە گەڕەکی بەردەفرۆشانی سامەڕا لە کاروانسەرایەکی گەورەدا کاری بنیادەم فرۆشی ئەنجام دەدرا.. لە کاروانسەرای پاییندا کۆلکە خولام و کەنیزەکانی پلە و پایە دووهەم، لە برپە و گۆترە گرۆ ـ گرۆ، دەفرۆشران و لە بەشی سەرەوەدا خولامان و کەنیزەکانی دانسقە و دەگمەن و گرانبایی دەفرۆشران. نرخ و بایبی خولام و کەنیز، بە پێی شەخسییەت و بەهای گشتی، عەلەلئوسوولێ هەروەك ئەوڕۆکەی خۆمان ئاسایی بەر یاسای بازارگەرمی و بازارکزیی کالآیان دەکەوت. خولامانی تورکی ئاسیای ناوین و ئیسلاوییەکان (صقالبە: بە عەرەبی کۆی "صقلبی"یە، واتە:خەڵکی (صقلبیە)یان، زێتر لە خزمەتگوزاریی سپاییدا سوود لێ وەردەگرتن.

لە ساڵی ٩٢٤دا خولامێکی حەبەشستانیی بەداروبار و پەیکەرە ڕوختە و تێکسمراویان بە ١٨ دینار و لە هەمان ساڵدا لە عومان خولامێکی ڕەشی چاکیان بە ٣٠ تا ٣٥ دینار و کەنیزێکی جوانکیلەی ڕەشی نەوبەییان لە میسر عادەتەن، بە سێسەت دینار و کەنیزێکی سپی پێستی خواسایی بێ هونەریان بە هەزار دینار و هێندێ جاریش بە زێتر دەفرۆشت. کەنیزانی جوان و لاویان زۆر بە دانسقەیی و چاوێرییەکی وردەوە دەپەروەراندن و فێرە هونەری جۆراوجۆر دەکردن و فێرە تەرزی خەندەی دلڕفێن و

ڕێوڕەسمی سەما و سترانچڕین و مووزیـک لێدانیـان دەکردن و نرخ و بـەهای ئـەم بابەتـە کەنیزانـە سـەروکاری دەگـەڵ ڕادەی جوانـی و هونەرمـەندی و لێوەشاوەییبانەوە، هـەبوو. لـە سـاڵی ۹۱۲دا نرخـی کـەنیزێکی دەنـگ و ئاوازخۆش بە سێزدە هەزار دینار و نرخی کەنیزێکی دیکـە بـە چاردە هـەزار دینار قەبڵێندرا. ئەم جۆرە کەنیزانە پلە و پایەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرچاویان لە نێو کۆمەڵدا هەبوو. بەردەفرۆشان، وەك کاڵافرۆش بە جۆرەها تەشـویق و هاندان و فرت و فێل و زمان لووسی کڕیاری ساویلکەیان لـە خشـتـە دەبـرد و وەك کـاڵای بـە نرخ و دانسقە و نایاب، "هـای"ان بـۆ دەکـردن. هـەروەك ئەمڕۆکـەی خۆمـان بـە سـەت تـەرزەیان ئارایشـت و مشـتومالْ و میکیـاج دەکـردن. لـەم سـەروبەندەدا سـەوزەڵەکان زێـتر مجـێزی چاوباشـقاڵانی دەورووژاند. ڕیش و سمێڵی کوڕانیان مووکێشکەن دەکرد و بـە پووچـالْ و تارا و هەوری و ئاوریشم و کەتانی تەنك و والاَی زەرد و سوور دەڕازاندنەوە و هەر یەکە بە پێی تەمەن و پلە و پایەی خۆیان ئارایشـت دەدان و دە بـەزەك و دۆزەکیان دەئاڵاندن، تەنانەت هێندێ لە فرۆشیارانی تەماحکار و پێ پەروا بـەرگی ژنانیـان دەبـەر کـوڕان دەکـرد و هێنـدێ جـاریش ژنانیـان بـە نێـوی کوڕانـەوە هـەراج دەکـرد، سـەبارەت بـەوە کـە کڕیـاری شـەیتان و دنیادیتـە متمانەیان بە زمان لووسیی فرۆشیاران نەبوو، پزیشکێکیان بەگەڵە خـۆ دەدا تا خولاَم و کەنیزان لە هەموو سەرێکەوە یۆخلَمە بکەن. تا ئەوڕۆکەش، لـە وڵاتی مە باوە کە خوازگێنیکەر، بۆ خوازبێنیی کێژێکی دەچـن، داکـی کـوڕە لە پێش هەموو چتێکی ماچێکی کچە دەکا و بۆنێکی زاری دەکا، بزانێ داخۆ بۆنی زاری کووە.

دەربارەی ڕەگەز و نەژادی خـولام و کـەنیزان چـەندین سـەرچاوەی وا هەبوون کـە بـە هۆی ئەوانـەوە زانیـاریی پێویسـتیان لەمـەڕ ئاکـار و خـوو و ڕەوشـتیان دەردەسـت دەکرد. خـاوەنی قابووسـنامە، بڕێکـی لـەو بابەتانـە نووسیون، بۆ نموونـە دەڵـێ: کـەنیزی هینـدی ئـارام و لەسـەرەخۆ و بـاش و نـەجیون و بـۆ زاڕۆك بـەخێوکردن زۆر لـەبارن. خولامـی هینـدی سنعەتکار و هونەرمەندی لێوەشاوەن. کەنیزی سندی بەژن و بالا شووشن و کـەزییان لـە خوار ئەژنۆیان دەخشێن و لە ئاشپەزیدا دەسـت ڕەنگینـن. پەسـندترین ژنـی دەنـگ و ئـاوازخۆش دەبـوا لـە مەدینـە کڕدرابـان. خولامـی ڕەشپێسـت کەمتەرخەم و بێباکن و هونەریان هەر لە سەما و ڕەقسـیندا بـە خـەرج داوە، بەلام بن بەغەلیشیان بێگەنە.

خولامـی حەبەشسـتانی دزن، تـورك جـوان و سـپی پێسـت و چـاوجوان و خۆش مەشرب و خۆش عـەیش و عوشـرەت و ناسـکن. پـاکیزەن و لـە کـاری ئاشپەزیدا زەبردەسـت و لــە پاشــەکەوت و مـالداریدا کـەمێکیش دەسـت قووچاون. ئەدی ئەوە نییە کورد تا ئەوڕۆکەش کە وەسفی ژنێکی بە جوانـی دەکەن، دەڵێن "هــەر دەڵێـی تورکـی تـەڕە!". ڕۆمـی زیـرەك و بەئـەدەب و فەرامۆشکارن، لـە میوانپـەزێریدا هـەر وێنـەیان نییە. خولامـی ئەرمـەنی لـە هەموو خولامانی پێست چەرمگ خراوترن، تەنبەڵ و نەکارە و دزیشن. بـەش بە حالی ڕەفتاری خاوەن خولام و کەنیزان، هیچ باسێکیان لێ نەکراوە.

بەردە لە ئیسلامەتیدا لە چاو ئایینەکانی دیکـە، حاڵوباڵیـان خـراپ نـەبوو. تەنانەت زۆریان بووگن وە خەلیفە و سوڵتان و پاتشا و هەمەکارەی دەوڵەت. ئەدی "مەمالیك"ەکانی میسری چ بوون؟ ئیمپراتۆریی عوسمانی، پلە و پایـە

گەورەكانى بە دەست كێوە بوون؟ خۆلاسە نامهەوێ زۆری لەمەڕ درێــژدادڕی بكەم، هەر ئەوەندە بەسە.

ئێمە هەموومان لە بەرەی كۆیلەكان ـ یان بە كۆیلە لەقەڵەم دراوەكانەوە هاتووین. ئەگەر كرابا، پاشەوپاش بەرەو ڕابردووی خۆ وەگــەڕابایـن، كارەكـە لەوێرا دەستی پێ دەكرد كە باپیرانمان چۆن چۆنــی كــەم تـا زۆر، بـە كۆیلـە كراون و تا چ ئەندازەیەكمان لەم كۆیلەتییە بۆ بە میراتی ماوەتــەوە. وێـڕای وەی كە كۆیلەتی بە یاسا لە ئارادا نەماوە (بە یاسا بەتاڵكردنەوەی كۆیلـەتی عەرەبستانی ســوعوودی لـە ١٩٦٢دا بەتاڵكراوەتــەوە) و مانایــەكی بــەداوێنی مەجازییانەی هەیە: لە وانەیە بەبێ ئەوەی بە خۆمان بزانین كۆیلەی چڵێســی و حیرس و تەماح و كار و پلە و پایە و خوو و خدە، یـان لەبــەر زۆر سـەوە و سۆنگە لە هەموو كەسێ زێتر كۆیلەی خانمێكی دڵڕفێن بین. دنیا هێشـتا، بـا ئاغایەكانیان نێویشیان لێ نەنرابێ، پڕە لــەو ئینسـانانە كـە سـەربەخۆییەكان كلك و گــوێ دەكــەن و هــەموو چتــێ لــە نیگــای ئــەو هــێزە ئــابووری و كۆمەڵایەتییە بابەت ئاتۆنیمە لە كۆنترۆڵ بــەدەرەوە یـان لـە ژێـر كاریگـەریی ئەو هەلومەرجانــەدا كەئابلۆوقــەی دلون یـان لـە نیگـای خـۆ و ئینسـانی ئـەو گەوجییانەوە كە پێوەیانــە، یـان چـاوچنۆكی و تــەماحیان بـە جـارێ هــەموو چتێكی ئینسانانەی پێ لە بار بردوون و بە جارێ كوێر بوونەتــەوە، تەنانــەت وەك گوناهبــارێكی دریــژەی باپــیرە گــەورە كۆیلەكــەی هێنــدەی ترووســكەیێ ئومێد پێ نەماوە؛ خــۆ دەشـكرێ لــەو گوناهانــەی كـراون ڕوو لـە پەشـیمانی بكرێ، كەچی ئینسانی بێ دەسەڵات و دە قوژبنێكدا تەنگەتاوكراو، لە بەخت ســواریی ئــەم چارەســەرە ســەرپێییانەش بــێ بەهرەیــە. عەیشــێیەكان،

فاتێیەکان و هتد   کۆیلە نین. بێ کەسن. مرۆڤەکان لە ڕابردوودا لەبەر سێ هۆکاری بنەڕەت تووشی بە کۆیلە بوون هاتن: یەکەمیان، ترس بوو. ژیان هەرچەندە پڕ لە ئێش و ئازار و ئەشکەنجە بێ، ئینسانەکان مردنیان ناوێ؛ لەبەر ئەوە، ئەوانەی کە مردنیان لە جەنگەی شەڕێدا بە گەورەترین شەرەف و شانازی دەزانی، هەرکە بە لێواری مردن دەگەیشتن، بەوە قابیل نەبوون کە لە لایەن پادشا و نەجیبزادە و میر و گزیر و گرەگری خاوەن زەبروزەنگەکانی دیکەوە کە وەک ئاژەڵی کەویکراویان تەماشادەکردن، بە چاوێکی کەمیان تەماشابکرێن. کۆیلەکان لە پێشان لە وەکو ئاژەڵ ڕەفتار دەگەڵ کردن  کڕدران و فرۆشران، کاسەسەر هەڵکۆڵین، بە داخ کردنی هەنیە و نێوچاوان نیشانە کردن، ئاڵقە لە گوێ و کەپوو  کردن، دەسبێنك و بازنی ئاسن لە مەچەک کردن، زنجیر لە مل کردن و پاوەنە لە پێ و نگ کردن و لێدان و قەیارکردن و بە نێو و ناتۆرە لێ کەم کردنەوەی وەک مەیموون، مەحزوون، ڕووسپی و زۆری لەم جۆرە بابەتانەی دیکە نێوبران کە لە سیاحەتنامەکەی ئەولیا چەلەبیدا، بیخوێنییەوە، زۆرت لێ بەرچاودەکەون ــ لەمانە هەموو نێوبران، چاوپۆشییان کرد؛ چونکە زوڵم و زۆر لێ کردن بۆ بەشێکی گەورەی مرۆڤایەتی، بە سریشتێکی ناچاریی ژیان لەقەڵەم دەدرا. لە سەروبەندی "هان"دا، لە چین و ماچین ئەو واژەیەی کە بە مانای "کۆیلە" دەکاردەبرا لە واژەی "زارۆك" یان "ژن و زارۆك" کەوتبۆوە. ئەم مۆدێلە بێ سوال و جواو مل کەچ کردن و گوێبەفەرمانییە، لە بەشێکی گەورەی دنیادا، بەسەر زوربەی چەوساوانی هاڕدراوی مرۆڤایەتیدا، کۆیلە بن، کۆیلە نەبن؛ بە ڕەسمی داسەپابوو. پێش ئەوەی ١٢ میلیۆن ئەفریقایی

بۆکۆیلەتیی دنیای نوێ، ڕاڕفێندرێن، ئەو قوربانییە سەرەکییانەی کە بۆ یەکەم جار نێوی نامبارەکی کۆیلەیان لێنرا، سلاوییەکان بوون. ئەو سلاوییانەی کە لە لایەن ڕۆمایی و مەسیحییەکان و سورمانەکان و فایکینگەکان و تەتەرەکانەوە ڕاودەکران، بۆ کون و قوژبنی سەرانسەری دنیایێ دەنێردران، بە دەم ڕۆژگارەوە، واژەی سلاو بە مانای بیانی دەستی بە دەکاربردن کرد. بەشی هەرە گەورەی ئایینەکان ڕێگەی مرۆڤ بە کۆیلە کردنی دەدا، ئیدی بەم جۆرە ئەو منداڵە بەریتانیاییانەی (کچەکانیان لەبەر وەی پوولی زێتریان دەکرد، چاتر قەڵەو دەکران) کە بە کۆیلەتی بۆ بازاڕەکانی دەرێ دەنێردران، بوون بە سلاوی. هێندێ لەو سلاوییانەی کە لە سەرویەندێکی نزیکتردا، خۆیان دەبن باندووری فەرمانفەرمایی کەشیشە کەڵەگا هەرخۆحسێوەکاندا دیتەوە و تروسکەی ئازادبوونیان لە هیچ درزو کەلێنێکەوە بەدی نەدەکرد، ئەو قەناعەتەیان دە مێشکیدا بۆ پەیدابوو، کەهەر بە خۆڕسك چتێکی تایبەتییان تێدایە، بۆیەکا بە کۆیلە دەبن. هەستی خۆ بە کەمزانین لە کوردەواریدا زۆر جاری دیکەم باس کردووە، وای کردووە کە هێندێ جار تەماح وەبەر دژمنانی بدا، لەسەر زمانی کوردەکە خۆی، قسەی وەك: "k ütten paşa söy üten maşa olmaz " یان "الكرد والجرذ والجراد" یان هتد به دوو بخەن. ڕاستیت گەرەکە ئەمە ئەنجامگرییەکی مەنتیقیی سەقەتە؛ چونکە لەو تێنواڕییەوە ئاودەخواتەوە کە ئەمانە چتهایەکن بوون بە ڕاستی و کێشەیان لەسەر نییە و وەك چارەنووسێکی لە خوایشت و ئیرادەی مرۆڤ بەدەر لەقەڵەم دراوە.

*زۆر جاران* سەیرمان بە ڕەفتاری مەیموون دێ. بۆ نموونە: مۆزێکیان لە پێش مەیموونێکی دانا، تەماشایان کرد زەحمەتە بیخوا. مەیموونەکە ئاگرێکیان لەپێش دانا، بەڵام فێریان کرد، ئاو لە بۆشکەیەکی نزیکی خۆی هەڵێنجێ و ئاگرەکەی پێ وەکوژێنێ و مۆزەکە بخوا. ئیدی بەم ئاوایە مەیموونەکە گەیشتە مۆزەکە. پاشان هەر ئەو مەیموونەیان دەهەلومەرجێکی نوێ نێخست، تەشتێکیان بەسەر ئاوی ڕووبارێکەوە دانا، مۆزێکیان تێدا دانا و لە پشت مۆزەکەوە بۆشکەکەشیان تا ڕادەیێ لە دوور دانا. هەر هەمان تاس و حەمام: دەبێ ئاگرەکە بکوژێنێتەوە، ئەوجا مۆزەکە بخورێ. خۆ مەیموونەکە دەیتوانی ئاو لە تەنیشتی خۆوە هەڵێنجێ؛ چونکە ئاوێکی زۆر لە دەوروبەری تەشتەکە هەبوو، بەڵام ئەوەی نەکرد، بەڵکو هەر هەوڵی ئەوەی دا خۆی بگەیێنێتە بۆشکەکە و ئاو لە بۆشکەکە دەربێنێ و ئاگرەکەی پێ بکوژێنێتەوە و مۆزەکە بخوا، چونکە ئەقڵی بەوەدا نەشکا کە ئاو هەر ئاوە، لە بۆشکەدا بێ یان لە هەر جێیەکی دیکەدا بێ.

ئەم نموونەیە ئەوە دەگەیەنێ کە مەیموونەکە هیچ چەمک (مفهوم)ێکی لە بارەی "ئاو"ەوە لە مێشکدا نییە و لە هیچ جۆرە سیفەت و خەسیەتێکی ئاو نازانێ، ڕاستەوخۆ بیر و هۆشی تەنیا بڕ بەو چتانەی دەوروبەری خۆی دەکا و بەس. دیارە ئەگەر ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو چتانەدا هاوسوروکار نەبێ، ناتوانێ بیربکاتەوە، ئەمە وا دەگەیەنێ کە مەیموونەکە تا چتەکانی لەبەردەمدا نەبن، بیرناکاتەوە.

بەڵام جۆری بیرکردنەوە لای مرۆڤ جودایە و مرۆڤ چتان لە بەستێنی چالاکیی بەرهەمهێنانی کردەنیی زانستانەدا دەناسێ و خەسیەتەکانی دەخوێنێتەوە. ئەو سەرنج دەدا کە ئاو لە بۆشکەدا، لە ڕووباردا، لە بیردا، لە دەریادا و هتد دا سەرلەبەر خەسیەتی هاوبەش و چونیەکیان هەن. بە نموونە: خەسیەتی ئاوکوژاندنەوە لە هەموو چتێکدا هەیە، بە مەرجێ ئەم خەسیەتەی لە ڕووی کیمیکی ـ فیزیکییەوە لە بار نەبرابێ. بەڵێ مرۆڤ بەم جۆرە چەمک (مفهوم)ی ئاو پێکدێنێ. ئاو لە هەر کوێیەک بێ، لە بۆشکەدا، لە بیردا و هتد دا هەبێ، هەر "ئاوە"، ئەمەش چەمکێکی تێکڕای ئاوە.

مرۆڤ لێرەدا گوێ بە شکلّ و شێوەی دەستنیشانکراو و بەرچاو نادا، بـەڵکو خەسیەتە گشتییەکانی دەستنیشان دەکا و جوتیان دەکاتەوە.

کاتێکی باسی "دار"، دار بە گشتی، دەکرێ مەبەستمان ئەو خەسیەتە گشتییانەن کـە هەموو دارێ نەك تەنها ئەو دارەی کە لە باخچەکەماندا ڕوواوە. لەم بـارەدا، ئێمە گوێ بەو دارانەی کە تاك ـ تاکە بەر چاومان دەکەون، نادەین، بەڵکو ئابستراکتانە لە چەمکە گشتییەکە، لە مانا ڕووت و پەتییەکەی دار بیردەکەینەوە؛ لەبەر ئـەوە چەمك (مفهوم) چەمکی پەتی پێ دەگوترێ و ئەمە نیشانەی هەرە زەق و ڕۆیـی بیرکردنـەوەی مرۆڤـە. بەلاّم ئەم جۆرە پەتی بیرکردنەوەیە، گیانداراتی دیکەی غەیری مرۆڤی لێ بێ بەهرەن.

باشە ئەوە چییە کە دەرفەتی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ نیشـانە بنەڕەتـەکانی چت، لە چتەکە خۆی داڕنین، یان دامـاڵین؟ ئـەوە واژەیە، ئاخاوتنـە. واژەی "دار" ئـەوەمێ بەدیاردێنێ کە بە گشتی [1] باسی دار دەکرێ؛ نـەك تەنـها دارێکـی دەسنیشـانکراو کە دیارە بە واژە، بە زمان نەبێ مەحالە بیرونەندێشەی ڕووت و پەتی دەربڕی.

---

(١)هەر لەمەڕ بیر و زمان لە فیلمبەردارێکی فیلمی وەرزییانە، فـێرید ئێدگـو ؛ لـە ناوچـەی "هـەکاری" سەرگەرمی فیلمبەرداری بوو و دەگەلّ خەلکێکیدا کە جگە لە تورکی بـە زمـانێکی دیکـەیان قـسەدەکرد، ڕووبەڕوو دێ. سەری سوڕدەمێنێ. پاشان بێ وچان دەبێ چاوێریی خۆی نیخستن و ویستی لە باری دەروونییـان حالّی بێ. دوای ئەوە Edg لە ڕۆمـانێکدا کـە بـە سـەردێڕی "ئـەو"دەی نووسـیوە، بڕیـاری دا دنیـای نێرەوەی کەسانێکی کە بە زمانی زگماکی خۆیان نایەیڤن، ئالۆزی و شێوایی دنیای نێرەوەیان لەبەر ناوێنـە ڕاگرێ و بەمە لە نیگای کۆمەلایەتی ـ فەرهەنگی ئینسـانەکان نواڕینەوە، بوو بـە وەرگـێڕی هەسترخوسـت و بیرونەندێشـەی گوندییـەکان.

گەلو بیرونەندێشە لە زمان جیادەکرێتەوە؟ پسپۆڕانی وەکو R. W. Langascker بـە "بـەڵێ"ی فـرە دلّ ـەبوو، یەدەرەوە دەیانهەوێ بە زۆرەملێ قەناعەت بە خۆیان بکەن گە چەمکە ڕووت (ئابسـتراکت)ەکـانی وەك داد و عەدالەت، زێدەگەورەیی (فەزیلەت) ، وێژدان، ئازادی، دیموکراسی، بەزەیی و هتد دەکـرێ بـە بـێ زمان بیری لێ بکرێتەوە. مەیلی تێکڕای زمانناسـان، بەلای ئەوەدا دەلەنگێ کە زمان بە بیرکردنەوە کـارێکی مەحالە.

زمان بایبی ئـەوەندە کە لـە ترووکەیـەکدا بـیری پـێ دوبپردرێن لـە نیگـای نێوبژەوەندەییی لایـەن و جوداوازییەکانیـەوەی تێنـۆڕی، دەبینـی خێـوی چـەندین چلۆنایـەتی و خەسـیەتی ئەفسـانەییی نوێـی

ئەوتۆیە کە تا ئەمڕۆش هێندێ لە نهێنییەکانی ئاشکرا نەبوون. وەکوڵینەکانی بیر و زمان بە دیاری خستووە کە چەند لە هاوپێوەندیی نێوان ڕەهەندە وەزیفەییەکان حاڵی بین و چەندین لە دەروونناسیدا بایەخ و گرینگیی بدەینێ، هێشتا هەر کەمە. تا لە هاوسەروکاریی نێوان بیروئەندێشە و واژە بە تەواوەتی حاڵی نەبین،، لە کاری پەروەرشت و فێرکاریدا وەک ئەوە وایە کە هیچمان نەکردبێ و بێ لەوە پاڵی بو ویدەینەوە و لەولتەیە دەرکە لە ڕووی زۆر گرفت و کێشەکان داخرێ، لەم بوارەدا ناتوانین وەلامی پرسە تایبەتییەتمەندییەکان و تەگوچەڵەمەکان، ئاوەلاکەین و هەنگین بەم کارە یەکیەتیی زانست و پێوەندییە هاوکاریگەرییەکانی دەروونناسی، زێدەنووکەین و هیچ بە هیچ نەکەین. واژەیەک مانای تاکە چتێ ناگەیەنێ، بەلکو گرێ، یان چەندین جۆرە و چت دەگەیەنێ. جا لەم ڕووەوە تاکە واژەیەک، ڕاستیت گەرەکە، گشتاندن و چەمکاندن (تعمیم و مەفهوومماندن)ە. گشتاندن کارێکی قسانەی بیرکردنەوەیە. خۆ ڕەنگدانەوەی ڕاستی، بە هەست (دیتن، بیستن، لەش پێ کەوتن، چەشتن) و بە ئەقڵ (ئیدراک)یش هەر ڕەنگدانەوەیە، بەلام فەرقی ئەم و ئەو ئاسمان و ڕێسمانە و ئەمیان چتەکان بە تاکە ـ تاکە ڕەنگ پێ دەداتەوە، کەچی گشتاندن ئیدراکی جوزئی نییە، بەلکو ئیدراکی کوللییە. بۆ نموونە: کە دەلێم "کۆتر" مەبەستم فلانە کۆتر نییە، بەلکو مەبەستم ئەو "پەرەوڵ"ەیە کە ئەو خەسیەتانەی هەن و هەموو کۆترێ دەگرێتەوە. جا لەبەر ئەمە، بیروئەندێشەگەلێ کە دەخرێنە قالبی قسەکردنەوە، هەر بە خۆیەک هاوپێوەندیی (بنیات، ئەرک و وەزیفە و پەرەساندن)ی پرۆسێسی بیرکردنەوەش و قسەکردنیشی لە ژێر سەردایە.

لە منداڵیدا دەرک و ڕاگمیاندن (دەربڕین) دەکەوێتە سەر تێگەیشتن، واتە: گشتاندن (واتە: چەمکاندن کە چت بەدیاردێنێ). بە قسەی Edward Sapir بۆ ئەوەی بتوانرێ دنیای ئەزموون و تاقیکردنەوە بە نما و نیشانە دەربڕدرێ، لە نواوە دەبێ بە تەواوەتی سادە بکرێتەوە و بگشتێندرێ. ڕاگمیاندن و دەربڕین تەنها لەم ڕێگایەوە مسۆگەر دەکرێ: چونکە ئەزموونی تاکە کەس، تەنها لە هۆشی ئەودا هەیە بە نما و ڕەمز بە یەکێکی دیکە ڕادەگەیەندرێ. بۆ لە یەکێکی ڕاگەیاندنی، یا بە ڕوونی دەربڕیش نەبردرێ، پێویستە دە قالبی کەتەگۆری "مەقوولە"یەکەوە بخرێ کە کۆمەڵ وەک نموونە ( unite= دانە) بڕیاری لەسەر داوە. ڕاگمیاندن و دەربڕین بە مانا ڕاستەقانییەکەی، لە نێو نیشانەکاندا بە گشتاندنێ سەردەگرێ کە لە بواری پەرەساندنی مانای واژەکاندا، قۆناخێکی پێشکەوتووی باشی بێ بڕیبێ. مرۆڤ کەنگێ گەیوەتە ئاستە بەرزەکانی ڕاگەیاندن و دەربڕین؟ ئەو کاتە گەیوەتە ئەو ئاستانە کە مرۆڤ توانیویەتی ڕەنگ بە ڕاستییە چەمکاندراوەکان بداتەوە و ئەو گشتاندنە بەدەنگ بێنێ. زارۆک با لە مانای هێندێ واژەش حاڵی بن، وەلێ لە هێندێ بیروئەندێشە حاڵی کردنیان کارێکی مەحاڵە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە چەمکی گشتاندراو هێشتا لە زارۆکدا بە تەواوەتی نەخەملیوە.

دەیجا با ئەم دیاردە زانستییە لە بەچکە کوردێکی زوان وە زگماک کوردی تاقی کەینەوە. خۆی چتێ هەس پێی بەژن: یاساغ، قەدەغە. لەو شوێنانەدا (مەبەستم کوردستانی تورکیایە) کە کوردیان تێدا دەژین، وە زوانی چتیان راناکەیەنەرێتێ کە بەردلیان بگرێ و هێندێ واژە لەبەر زۆر سەوەر و سۆنگە (یێ قێرگەیی، یاساغ و قەدەغە، تواندنەوە، جەزرەوەی سیاسی و هتد ) لە رێی خواسایەوە ناچەمکێندرێن، ناپەرژێنە سەر ئەوە کە کۆمەڵە چتەکان بە شێوەی گشتاندن پێناسە بکەن. لەبەر هەندێ، ئەم حالەتە نالەبار و لاترقەوچە یارا و قابیلییەتی بیرکردنەوە و ئاخاوتن و سەربەخۆیی دەربڕینی منداڵی کوردی بە جارێ لە دەوراندەور وێڵ هێناوەتەوە و بەری بە تەواوەتی تەسک کردۆتەوە و بە ئاخوتەک بێوەکاتەوە، بە ئاخوتەک قسان دەکا و بە ئاخوتەک سەربەخۆیی دەردەبڕێ و لە بواری زمان فێربوون و گشتاندن و چەمکاندنی راستیینەکاندا بەرەو ئەستێری و قسری و ئەزۆکی، بەرەو کلك و گوێ کران، بەرەو پاشکەوتەیی و کەرەواڵەیی و کۆڵەواریی دەبا.
بە بیرم دێتەوە، کە لە ساڵی ١٩٣٠دا دایکە هەناسەساردەکەم لە تاو بێ بژێوی پەنای بۆ شاری کەرکووك برد، لە پەنای برازایەکی هەژاری ئۆغاتچییدا حاوایەوە و پاشان ناچار تەحیلی حەقداری کردەوە، تا دوو ساڵانیش ، هەرچەندە لە ماڵی برایەکەم فێرە تورکی بیووم (برازەکەم تورکی بە ئەسڵ بن ئەرمەنی بوو) بەلانەکینێ ـ ماڵم قەبرە ـ ئەم دەوێرا قسەی پێ بکەم، شەرمم دەکرد، لەوە دەترسام نەبادا هەلەیەکی بکەم، منداڵە تورکمانی ئەگریسی گەرەکی موسەلالاّ و چای و چفور و بەگلەر جرتم بۆ بکێشن و لێم لە هۆیەهایێ دەن.. هەروەها کە لە ساڵی ١٩٤٧دا باروبنەم بۆ کاولە بەغدایێ پێچایەوە، خۆ حارمیی شەرگاوپانەش و ئەوەکەی قەزاتەشم دەزانی، چونکە هەر لە منداڵیرا لە دووکانی قەرەجی بیرام و هاتوچووی بەسراوە فێری بیووکم، تا مەودایەك، بە ترس و لەرزەوەدم قسە پێ دەکرد، دەمگۆ: ئەوەك هەلەیەك، فلانێکم لێ بقەومێ، کورە خۆ ئەوە وەك ئەوە وایە، ترێکم کەنبیێتەوە تەنانەت جارێکیان لە ماڵی مرقەددەم نازم قامەچیی ئامۆزام لە بەغدایێ کە یەك ـ دوو ساڵێ یاوەری مەلیك غازی بوو،، کە بە عەرەبی و تورکیی ئەستەمبوولییان قسان دەکرد، دەگەڵ مۆزەفەرەی ئامۆزازامدا بە عەرەبی قسەم دەکرد، زارم سووتا، لە جیاتیی وەی بڵێم "جاییبلە" گوتم: "جایبورلە". کچی ئایەن کە بۆ خۆی ئەستەمبۆلی بوو و عەرەبیی تەیمتولکوردیشی باش دەزانی، دایە قاقای پێکەنین، هەر لێی نەدەبڕیەوە. بەم رۆژگارە لە دووم نەدەبۆوە، بە مەرحەبا "جایبورلە" و "مایبورلە" بۆژۆی کرەبووم.. دیارە پاش ئەوەی لە بەغدا شارازابووم و خوێندکارێکی زۆرم، بە تایبەتی کوردی سلێمانیی خۆم و ئاسیار. لە وانی کە لە حوقووق و دارالمعلمینی عالییە و دار المعلمینی ئیبتیدائی و کوللیی‌ەی مەلیك فەیسەل دەیانخوێند، ناسین، هەستم کرد بەستەزمانانە زۆر بە شەرمەوە، بە عەرەبییان قسان دەکرد. خۆ عومەر قاپ رەشی دۆستم تا ماڵ ئاوایی ئەم کاولە دنیایەش کرد، قەرقکردنی نێر و مێی لە زمانی عەرەبیدا بە زەحمەت دەکرد. کاك مووسالکورباسیی نەجەفی، زۆر قسە خۆش بوو، بۆ لاسایی خوێندکارە کوردەکانی دارلموعلمینی عالییە، هەرچی فیعلی موزاریعە عەرەبییەکان هەبوو؛ هەمووی هەر بە

"ی"ی مرزارەعە دەگوتن، لە جیاتیی "آروح"، "تــروح"، تروحـین"، "نـروح" هـەر هـەمووی بـە "یـروح" دەگوتن.. خۆ جاری ئەوە "راس مال أنی" و "کتاب مال مال أنت" سەربەقوڕی پێ بە کەنیـنە دەهێنا.

مام هەژاری بەهەشتی، ئاهـەقی نـەبوو کـە دەیگـۆت: کـوڕە مـەلا، نـەمن لـەو "شـتگول" و "مـتگـول" و "هەمەاتینە" و "شەمبالەك" و "هەششکل"انە، هەرچەند دەکەم سەردەرناکەم.. کوڕە عارەبیی بەغدایی هەر ئێ بەلان ئەتۆ گوێ لە عارەبیی بەسرایییانە و موسـلاوییـانە بگرە باوەڕ بفەرموو لە "دیـای = دجـاج" و "ئەگللەك" و "من بزغ" چ حالی نابم.

هەر وا لەمەڕ زمان زانی و زمان نەزانی، فۆادمەنیی بەهەشتیی سلێمانی بـۆی گێڕامـەوە: "سـالێکیـان ڕێـم کەوتە کەربەلا. ئەمزانی کەربەلاییەکان زۆریان فارسی زانن، منیش خۆت ئەزانی لـە سـلێمانی لـە حوجـرەدم خوێندووە، ئەیشوە و حایلنامە و سولتان جومجومە و گولـستان و بۆستان و پەندنامەی عەتتار و ئەم جـۆرە کتێبانەم بە فارسی خوێندووە.. بەیانییەك چوومە چاخانەیەك، قاوەلتی بکەم، بە فارسـییەکەی خـۆم بـانگی شاگردچایچییەکەم کرد: "بیا". شاگردەکە بە دەنگمەوە هات، وتم: "صبحانە می خواهم، چە داری؟" کـابرا وەك لەبەری کردبێ، بەرپێ ناوی بڕێ خواردنی هێنا. ڕاستیت دەوێ، لە هیچیان تێ نەگەیشـتم.. چـی بکـەم، وتم: "آخرینشان را می خواهم." دیارە ئەم قـە فارسییانەم بە تەجویدێکی سێ زەردێنـە وتـن. وەڵـلا کـابرا نەیکردە نامەردی، هەر پاش چارەکـە سـەعاتێ سـینییەکی لـە بەردەما قـوت کـردەوە، نواڕیـم، قـاپێکی پڕلەنانەولاوی پاقلە و ڕۆن و پونگە بەسەراکراوی لەسەر دانراوە، بە کابرام وت:

- این چیست؟

- نون و بُقُری..

هیچی لێ حالی نەبووم، ئەخێر لێم دووپات کردەوە:

این چە می باشد؟

- نوون و بُقُری!

ئەی خوا هاوار، چیم بە خۆم کرد، وتم فۆتاد.

وەڵلا ناچار دەنکە پاقلەیەکم لە ناو قاپەکە هەلگرت، لە کابرام پرسی:

- این چیست؟

- بُقُری!

وتم:

- بگو باقلا یا "باجلە".

- باشە، وتی، حاجی آغا.

ئەخێر ئەمجارە لەتە نانەولاوێکم هەلگرت:

- این چه می باشد؟

- خون.

قوربان سەرت نەیمشێتم، لە کابرا حاڵی بووم کە "نان و باقلاء" بە فارسی بووە بە "نون و بُغُری" لە پاشان، شاگردەکە وتی: "حجی، یا آغاتی، لیش متحچی عربی، أنـت مـو عـیراقی؟" وتم: "بـەلی وەڵڵـە، نیـبتـی، شەدرینی، عمبالی اعرف فارسی، طلع، بس أعرف فارسی مال آنی "

کابرا وتی: "نعم."

بەلام لێو وەناشێرم، کوردی بادینان و کەرکووك و خانەقین و ئەم ناوچانە عەرەبییان چاتر دەزانی..

دەروونناسی زۆر مەتباری Jean Piaget ە. هەر لە سەرەبەندی ریـــەوە، بـەکارهێنانی مێتـۆدی کلینیـك (عیادة) بۆ لە بیرورتچوون و بیرونەتییشەی منداڵان وەکۆڵین، داکەوتووە. بۆ یەکەم جار لـــە دەرك و مـەنتیقی منداڵ، سیـستماتیکانە وەکۆڵین، لەسـەر دەسـتی وی هاتـەدی. Piaget لـە بەراوردکردنی مـنداڵ لەگەڵ گەورەکاندا، لە جیاتیی وەی بێ لیستێ بۆ ئەو کەموکوورییانەی کە بوونەتە هۆی ئەوەی ئەقڵی منداڵ بـڕ بـە زۆر چت نەکا، بە پێچەوانەوە ئەو هاتووە لیستی بۆ ئەو چتانەی کە لە منداڵ خۆیدا هەن، گرتۆتەوە و لەسـەر ئەم بنەمایە ئەنجامگریی کردووە.

بەلای ئەوەوە، جیاوازیی شێوەی بیرکردنەوەی منداڵ لەگەڵ جیاوازیی چۆنیەتییە، نەك چەندایەتی.

هەر لێرەدا دەتوانین دەست بە یەکەم کێلەرێ بکەین:

منداڵە کوردێ کە لە باوەشی داکیدا گەورە دەبێ و زمان فێردەبێ، کە بەرهەڵدای ناو پێگەییبوونی کۆمەڵێ زمانی زگماکی لێ قەدەغەکراوان، دەکرێ لووتی بە یەکەم دووفاقی و بانێك و دوو هەوایی ژیان و تەمەنی خۆیدا دەتەقێ.

ئەو منداڵە کاتێ لە ناچاری دوو حاڵەت: لە قۆناخی فێربوونی زمانە (زگماکە) کوردییەکەی خۆیدا، زمانی خۆی ناخوێنێ. ئەمە حاڵەتی یەکەم. کوردیـش و تورکییـش یـان فارسـییش دەزانـێ بـەلام کە دەبێ بە تورکی یان بە فارسی بخوێنێ هەنگێن بە هەردوو زمانەکە فێرە گشتاندن و چەمکاندن دەبێ، بەلام لە دوارۆژدا دەبینێ ئەوانەی کە بە کردەوە و کاری دەربڕینیان لەگەڵدا بەرێوەدەبا سەرکارییەك پەیدا دەکا تەنها بە تورکی یان بە فارسی دەدوێن، واتە: ئەم منداڵـە شێوەی بیرکردنەوەی قۆناخی کوردی (زمانی زگماك)ی فێربوونی لەگەڵ شێوەی بیرکردنەوەی ئەو گەورە خاوەن دوو پێناسـە / دوو کەسایەتییانەدا کە کوردیش و تورکیش بە پێی یاسا و رێسا لە پێشان بە تورکـی، یان بـە فارسییان قسە کردووە و بنەمای راگەیاندنیان بەو زمانانە بنیات ناوە (لە رووی فەرهەنگی و زمانییەوە) دووفاق رادەوستن و یەك لە شام و یەك لە حەڵەبە. ئەم دووفاقییـەش وەنـەبێ تەنها لـە چاو تەمەنـەوە بێ، بەلکو بە بۆنەی فاکتەرێکی کۆمەلایەتیی لووت تێوەژەن و خۆتێ هەڵقورتێن (تواندنەوە و بە زۆرەملێ

زمانی بیانی بەسەر خەڵکدا سەپاندن"ە، دووگونەشوێکردنەوە و زۆرداری و کەس بە هیچ نەزانینەوەن، ئۆمەتەکەی بە دەستەوە دەناڵێ.

بە لای Piagetەوە تەنها پێوەستێ کە سەرلەبەری چۆنایەتییە تایبەتییەکانی مەنتیقی منداڵ یەك دەخا. منەمتەر (من مەرکەزی)یی منداڵە. ئەو وەکۆڵینانەی کە لەسەر منداڵی تەمەن ٦ ـ ٧ ساڵان کراون، ئەوە بە دیاردەخەن کە تەنانەت ئاخاوتنی بە کۆمەڵایەتی بوون بە تەواوەتی لە بیروئەندێشەی منەمتەری دانەبڕندراوە. بێ لەوە، منداڵ جگە لەو بیروئەندێشانەی کە دەریان دەبڕێ، بەرێ بیروئەندێشەی وای هەن کە هێشتا دەری نەبڕیون. Piaget هێندێ لەمانەی کە منداڵ دەریان نابڕێ، لەبۆ منەمتەریی منداڵ، واتە: بۆ لە دەربڕین نەهاتنیانی دەباتەوە. بۆ لە کەسی دیکە ڕاگەیاندن و دەربڕینی ئەمانەی منداڵ، پێویستە لە کەلێنی چۆن لە دنیا نواڕینیەوە تەماشا بکەین، بزانین بۆ خۆی چۆن دەڕوانێتە دنیا.

لێرەوە، پێم وایە ئۆرەی دەستنیشانکردنی خاڵی دووەم هاتووە:

منداڵێ کە هەر بە خۆڕسك منەمنتەری بێ، تەنها هەر زمانە زگماکە کوردییەکەی خۆی فێردەبێ و لە دنیای خۆیدا دەژیێ. لە نواوە لە کوردیی بە کۆمەڵایەتی بوونەوە دەست پێ دەکا؛ لەم لاوە، لەبەر نەبوونی پێناوی پەروەرشت ـ فێربوون و بەرنامەی تایبەتیی پەروەرشت و فێرکردنی منداڵ لە تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ و فیلمی کارتۆن، ناچار دەست بە فێربوونی زمانێکی دیکە (تورکی، فارسی، عەرەبی) دەکا و هەر هەوڵ دەدا بە تورکی یان بە فارسی یان بە عەرەبی بنیاتی ڕاگەیاندن و دەربڕین دامەزرێنێ و لەوانەیە ئەو بیروئەندێشە منەمنتەرییانەی کە لەبۆ خۆی شاردوونیەوە و نایەوێ هەمووی دەربڕێ، هەڵەق و بەڵەق بن.

Piaget گوتەنی، ئەگەر منداڵ ئەم هەوڵ بۆ ئەرزی بیرکردنەوە نوێیەی بۆ ئەوە بێ لە کەسانی دیکەی ڕاگەیەنێ، ناچارە ئەو زمانە هەڵبژێرێ کە کۆمەڵەکەی بە زمانە (زگماك)ەکەی ئەو قسەناکا. ئەوجا لێرەدا گرفتێ دێتە گۆڕێ: منداڵ بۆ ئەوەی پەرە بە منەمتەریی دنیا (بیرکردنەوە و قسەکردن)ی خۆی بدا، هەست بە پێویستیی برێ چالاکی دەکا. بڵێین خۆی بۆ ڕەسم کێشان ئامادە دەکا، بەڵام قەڵەمی وای نییە کە بە ڕەنگێکی کە خۆی دەیەوێ ڕەسمی پێ بکێشێ، یان بیهەوێ ئەو زیندەوەرەی کە (بە کوردی ناوی (چەمکاندراوە) بکێشێ، بەڵام ڕەسمی شێوەشکڵ و وێنەی ئەو زیندەوەرانەی کە لە فیلمە کارتۆنەکاندا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی تورکی یان فارسی یان عارەبی، دەگەڵ ئەودا کە بە زمانی زگماکی دەرکی کردووە و چەمکاندوویە، هەر ناوەکان و ڕێسمانە و لێیان بیانییە. لەم بارەدا، منداڵ بەم دەردە چەوسێ، بەدبەختییەکە هەر لەوەدا نییە کە سەربەخۆ بەهرە و لێوەشاوەیی خۆی بەدیارنایەخێ، بگرە ڕووبەڕووی بەرێ پرسیار دەبێتەوە.

ئەتۆ بۆ خۆت دەزانی ڕەهەندی ئەو وێرانکارییەی کە ئەم کارەساتە لە دەروونی منداڵە بە ڕەگەز کوردیکدا وەك کولن هەڵ دەتۆقێنێ، لە ج ڕادەیەکدایە.. ئەوانەی زمانیان لە عیبادەتلا یاساغ کردووە، داخۆ هەست بەمە دەکەن؟ گەلۆ منداڵێ بەم تەرحە پەروەردە بکرێ، ج کەلکێکی بۆ دەوڵەت و کۆمەڵ لێ چاوەنۆڕ دەکرێ؟ منداڵ کە لە نێو دۆزەخی ئەم بانێك و دووهەوایی و دووفاقی و یەك لە شام و یەك لە حەڵەبدا پێ بگا، لەوە بەولاوە بستێ ناڕوا کە تەنها هەر دەبێ لە دڵی خۆیدا باخێوێ، بە لاقی یەکێکی دیکە دەبێ بگەڕێ، بە چاوی یەکێکی دیکە دەبێ تەماشای بەر پێی خۆی بکا، بە مێشك و ئارەزوو و ئاڵهای غەیری خۆی دەبێ دڵی بەم دنیای لێ نامۆ و بیانییەوە بە زۆری زۆردارەکی خۆش بکا و خۆ دەگەڵ کۆمەڵ گونجاندن و ڕاهاتن، دووردەکەوێتەوە یان بە لایەنی کەمەوە یاخی دەبێ. ئەدی لەبەر چی، نەتەوەی کورد بە درێژایی مێژوو لە دنیای غەیری خۆی یاخییە؟! مەبەستم ئەوەیە کە منداڵەکە دەبێ لەگەڵ منسەنتەریدا جووت و هەموار بێ.

Lev S. Vygtsky دەڵێ:

"یەکەم ئەرکی قسەکردن بەش بە حاڵی منداڵیش و گەورەش دەگەڵ یەکدیدا دەنگوباس وەگۆڕینە، ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتییە؛ لەبەر ئەوە ئاخاوتنی منداڵ هەر بە خۆڕسك لە ڕووی گەوهەرییەوە، کۆمەڵەکییە.

کەواتا، بەمە وەسەر ڕێچکەی کێلەڕێی سێیەم دەکەوین:

هەن دەڵێن، قسەکردن بۆ خۆی لە گەوهەردا مافێکی کۆمەلایەتی نییە، دەیانهەوێ وەك مافێکی تاکانە، گۆیا خەڵاتێکە و بە یەکێ دەبەخشرێ.. پەروەرشت ناسان لەسەر ئەوە سوورن کە دەبێ منداڵ ، بۆ ئەوەی دەست بە فێربوون بکا، پێویستە بە قۆناخە سروشتییەکانی خۆیدا تێ پەڕێ. ئەگەر وایە، ئەدی منداڵە کوردەی کوردستانی تورکیا و سووریا و ئێران مافی ئەمەیان هەیە کە بە زمانی زگماکی خۆیان بخوێنن و ئەم هەلومەرجی پەروەرشتەیان بۆ دابین بکرێ؟ بە پێچەوانەوە، نەك هەر بە زمانی خۆ خوێندنیان لێ "یاساغ و مەمنووع" کراوە، بەلکو دەبێ لە سیفرەوە دەست بە فێربوونی زمانێکی بیانی بکەن و تا دێ بەرەو پاش وەگەڕێن. بەرپرسان تا کەنگێ خۆ لەم ڕاستییە زەق و زۆپە نەبان دەکەن، کە تەنها چوونە فێرگە ئەوە ناگەیەنێ کە منداڵ کاری پەروەراندن و پێگەیاندنی سا بە هەر زمانێ و لە هەر کەشوهەوایەکدا بێ، وەك قورە چەورە وایە و دەتوانی بیکەی بە تورکچی، عەرەبچی، ئێرانچی، یان عێراقچی و هتد فلانی ئەم کارە ئەوەندەی کە کارێکی ویژدانییە، هەر بە هەمان ئەندازە، کارێکی زانستیشە.

سەبارەت بەوە: منداڵی تەمەن دوو ساڵان هەمبانەی واژەکانی زۆر چکۆلەیە و هێشتا توانستی ئەوەی بەسەردوە نییە ڕستەی بەگرێوگۆڵ سازکا و ژمارەی ئەو واژانەی کە دەکاریان دەبا، فرە کەمە و ئەزموونی

ڕستەدارشتنی زۆر ساکارە. بەڵام منداڵی فێرگە شێوازی هەمبانەی زمانی پێویستیش و چوارچێوەی زانستی زمانیشی بە تەواوەتی هەیە. چونکە ئەمانە دەگەڵ زمانی قسەکردندا دەگەڵ هەر گەورەییەکدا وەك یەکن، بەڵام لەگەڵ زمانی خوێندن و نووسیندا جوداوازە. منداڵ کە فێرە نووسین دەبێ خۆی لە زمانی ئاخاوتنی بەرهەست دەدزێتەوە و ناچارە لەجیێی واژەکان نما و ڕەمزەکانیان دابنێ. خولاسە فێر بوونی جەبر و موقابەلە، چەند کارێکی سەخت و دژوارە، فێربوونی سیستمی دوو جۆرە نما و ڕەمزبەکارهێنان (زمانی قسە کردن و زمانی نووسین)یش هەر بەو ئەندازەیە سەخت و دژوارە ( Vygotsky).

منداڵە کوردێکی لە تورکیا و سووریا و لە ئێران، لە پێشدا زمانی زگماکی خۆی فێردەبێ، ئەوجا با بڵێین لە کووچە و کۆڵانان بە تێکەڵبوون لەگەڵ منداڵە تورك و فارس و عەرەب و بە تەلەفیزیۆن، بابیی ئەوەندەش تورکی و فارسی و عەرەبی کە قڵتە ـ قڵتێکی پێ بکا فێردەبێ کە کاری خۆی پێ ڕایی بکا، بەڵام خاوەن هەمبانەی واژە و چوارچێوەی ڕێزمانی تورکی و فارسی و عەرەبیی نییە. منداڵە تورکێ، فارسێ، عەرەبێ، وا نین، منداڵە کوردەکە کە دەچێتە فێرگەی تورك و عەرەب و عەجەم، یەکسەر بەرەنگاری لە ناچاری فێرە سیستەم (بەردەبان)ی لە نما و ڕەمزی ئاخاوتنی تورکییەوەی بەرەو نما و ڕەمزی نووسین بەکارهێنانی زمانی تورکی، یان عەرەبی، یان فارسی دەبێ، هەر یەکسەر پاشخانی سیستەمی زمانە زگماکەکەی خۆی لێ بە دەنگ دێ.. ئەی خودای ژوور سەرا ژێرم خاکی کورد، سەرم تێلای تورك دەکەی، یان عەجەم یان عەرەب دەکەی، من دەنگ ناکەم تۆ دەنگ دەکەی؟!

لە تەمەنی ٦ ـ ٧ ساڵیمدا، لە کەرکووك پاش ئەوەی لە خزمەت مەلا ئایشە خاندا ـ غەریقی ڕەحمەت بێ ـ قورئانم خەتم کرد (تەنها جزمی عەمەم بە حینجە خوێند، ئیدی لە جزمی تەبارەکڕا تا نیوەی قورئانم بە سایە خوێند. مەلا ئایشە خان بە ویژدان بوو، فەرمووی: نیوەکەی دیکەی قورئان هەمووی بە ڕەوانی دەزانی، پێی ناوێ بە دەرزت پێ بڵێم، دایکت هەژارە، لە کوێی بوو، هەموو مانگێ پەنجاییەکم بداتێ، پێی ناوێ هەڕۆوە ماڵە خۆ. کاری ڕاست بێ. وەستا فەرەجی چەخماخسازی برام مرخی لێ خۆش کردم ـ هەقدارمە ـ بردمیە کنە خۆی. ماوەیەك، بەردەستیی دووکان و ناوبەناو، خزمەتی بەردەستیی برازنە سێلفییەی پێ دەکردم. خواوپاستان سرلوستێکانی دووکانی وەستا فەرەجی برام لە قاپیبازاڕ، بە تایبەتی وەستا ئەورەحمانی بەرگدرووی خەلکی سلێمانی، گلەییان لە وەستا فەرەجی برام کرد، کە ئەم کوڕە زۆر زیرەکە، بۆ نایخەیە قوتابخانە و لەم جۆرە حیکایەتانە. خودا هەڵناگرێ، کاکم دەگەڵ سەی ئەحمەدی سەی ئەجمەددینی شۆرجەدا بۆ قوتابخانەی قەڵای ناردم. بەڵام، هەروەك لە شوێنێکی دیکەدام نووسیوە، لە بەر بێ تەزکەرەیی نوفووس، لە قوتابخانەیان قوبووڵ نەکردم، مامۆستایەکی تورکمانیش، لەسەر ئەوە کە ناوی دەسەشۆرەکانی

قوتابخانە بەربرابوونەوە و لە ئامەق بە ملی منیاندا هێنابوو، تێر و پڕی تێ هەڵدام باش بوو نەچوومە قوتابخانە، دەنا ئەمنیش کوردییە خاوێنەکەی خۆمم لە بیر دەچۆوە و وەك ئەم عالەموولڵایە بە قوتابخانەی عارەبیان گۆشکراوانەم لێ بەسەردەهات و میرزاجی کوردەواریم وەك ئەوانەی دەڵێن: "پێی هەڵسام و پیادەی کرد و دانووسان دەکا و هتد " ئێستا هەرم لە بری کوردی جیانەدەکردەوە.

وەستا فەرەج پیاوێکی دنیادیتە بوو، لە کۆمپانیای ئابادان و مەسجید سلێمانی ئێران کاری کردبوو، فارسی و تورکی و عەرەبیی و ئینگلیسیی زۆر چاك دەزانی. بە قسەی دراوسێکانی بازلۆ و براژنە سێلڤییەی کرد لە خزمەت مەلا محەمەدی تورکمانی ـ هەزار ڕەحمەتی لێ بێ ـ لەبەر خوێندن دانام. گوتیان گۆشتەکەی ـ ڕاستیت گەرەکە گۆشت ماناشم پێوە نەبوو، هەر دەتگوت جوڕەم ـ بۆ خۆت و سوقانەکەی بۆ ئێمە.. قوریان چتان لێ وەشێرم، مەلا محەمەدی تورکمان لەسەر سێ مەوجان دەرزی بە منداڵ دەگوتەوە: تورکی، فارسی، عەرەبی. ڕاستییەکەیت گەرەکە، من بۆ خۆم لە پێشان هەر زمانە کوردییە زگماکەکەی دێی مامشەم دەزانی، تەنانەت تا مەودایەکیش، کە لە گەڕەکی ئاخوڕحوسێن دادەنیشتین، ناوینار کە لەگەڵ منداڵی گەڕەکدا قسەم دەکرد، "یەزم"، "بیوە"، "بێستە"، "وەقورحان"، وە "کۆلان قەدیم"، چوییم" و لەم جۆرە گەرمیانییانەم وەکارنەهاورد و دەمفلتاند.. منداڵی ئەگریسی چەمووش وەبەر تیز و گەمەیان دەدام. هێندێ واژەی "بێستە"کەیان گۆڕیبوو، نێویان لێ نابووم "پێستە"، هێندێکی دیکە لە جیاتیی "بیوە ـ بیبە" نێویان لێ نابووم "پیوە" و هتد..

بەدبەختییەکە لەوەڕا دەستی پێ کرد کە ڕاستە ئەمن لە براژنە سێلڤییەم تورکیی ئەستەمبۆلی تا ڕادەیەك فێر ببووم، بەڵام منداڵەکانی فێرگەکەی مەلا محەمەد بە تورکمانییەکی ئازەری ئامالیان قسەدەکرد. بۆ نموونە: ئەوان بە کتکیان دەگۆ: "پسیك" ئەمن براژنە سێلڤییەم فێری کردبووم "کەدی"م پێ دەگوت. ئەوان دەیانگۆ "باغنیش" ئەمن دەمگۆ "یاتلیش"، ئەمن دەمگۆ "یاغمور" ئەوان دەیانگۆ "یاغش".

ئەمە بەش بە حاڵی کوردی و تورکی و تورکمانی، بەش بە حاڵی عەرەبییەکە، دیارە ئەمە هەر بە خوێندن لێم بە دەنگ دەهات، چونکە کەسمان بە قسەکردن عەرەبیمان نەدەزانی، تەنانەت من کە قورئانیشم خەتم کردبوو، هەرگیز لەوە حاڵی نەدەبووم کە دەیانگۆ "وە کۆلانی قەدیم" بمبەخشن کوردیی ئەو ناوچەیەی لای ئێمە واژە زۆر دەشێوێنن، واتە: بە کەلامی قەدیم.

چتان لێوەشێرم، هەر بە جارێ سەرم لێ شێوابوو، بە داوی جالجالۆکەیەکەوە ببووم، پڕزەو بڕستی لێ بڕیبووم.. ئەتۆ وەرە فێرە سێ سیستەمی زمانی بیانی ببە، سەرباری سیستەمی زمانە زگماکەکەی

هەر لە منداڵیدا، مرۆڤ دەرك و تێگەیشتنی لە ڕێی واژەكانی زمانەوە دێتەگۆڕێ، چونكە لە سای زمانەوە بیروئەندێشەكانمان دەردەبڕین. ئەوجا بەدەم ئەم پرۆسێسەوە چتێ دێتەگۆڕێ، لە مرۆڤدا نەبێ لە گیاندارێكی دیكەدا نایەتە دی. بیروئەندێشە سەروكارێكی خەستوخۆڵی بە ئاخاوتنەوە هەیە، دەرك كردنی مرۆڤ، بیری مرۆڤ لە ئاخاوتن و قسە كردنی مرۆڤ دابڕین كارێكی مەحاڵە. كەواتا، یەكیەتییەكی زگماكی ئەوتۆ لە نێوان زمان و بیركردنەوەدا هەیە كە هەرگیز شیرازەی ناپچڕێ.

ئنگلس جەختی لەسەر ئەوە كردووە كە پەیدابوونی ئاخاوتن، كۆمەگی سەرەوەری پەرەساندن و گەشەكردنی دەماخی مرۆڤی كردووە. كەواتا، ئەو هۆكارانەی ئەمەیان لێ كەوتۆتەوە چین و كێهەن؟

ئەم نموونەیە یارمەتیی وەرامدانەوەی ڕاستی و دروستیی پرسیارەكەمان دەدا: مێژوو باسی بڕێ حاڵەتی منداڵمان كە لە نێو گەلەگورگێكدا پەروەردە بوون، بۆ دەگێڕێتەوە.. لە ساڵی ١٩٥٦دا، لە هندستان گورگێ ساوایەكی كیژۆڵەی تەمەن لە سێ ساڵە كەمتری ڕفاندبوو. كاتێكی كە منداڵەكەیان دیتەوە، تابلۆیەكە بەم ڕەنگە بوو: كیژۆڵەكە لەسەر چوارپەلان دەڕۆیشت و دەنگی گیاندارانی لاسایی دەكردەوە و نەیدەتوانی قسان بكا.

---

خۆت: لە زمانی قسەكردنی توركییەوە (ئەویش دوو مەوجی) بۆ زمانی خوێندنەوە و نووسین، ئەمە یەك. لە تەقە ـ تەقێكی عارەبی قسەكردنەوە كە لە دووكانی فەرەجی بڕام و یەك دوو جارێ چوونە بەسرلوە فێری ببووم، بۆ زمانی خوێندن و نووسینی عەرەبی، ئەمە دوو. لە بێ پاشخانی (هیچ)ەوە بۆ زمانی خوێندن و نووسینی فارسی، ئەمە سێ. بۆ ئەگبەتی لە فێربوونی هەر سێكیاندا زمانە كوردییە زگماكەی خۆم لێ بە دەنگ دەهات، وەك بڵێی هەموو چتەكانم لەوڕا تەرجەمە دەكردەوە، دەمچەمكاندن، نەك بە پێچەوانەوە.. مەبەستم ئەوەیە زمانە كوردییەكەمم بەسەردا زاڵ بوو، زمانە زگماكەكەی خۆم لە مێشكم و هەستوخوستمدا ڕیشاژۆتر بوو. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بێ، كە كوردییەكەم بە پێچەوانەی كوردیی زۆر كەسانی دیكەوەیە. مام هەژار دەیگۆ: هەتیو خۆش بەختی، كە لە فێرگەی عارەبانت نەخوێندووە ، دەنا زمانەكەی تۆش لەمێژبوو خەسابوو.

ئەمە هیچ چتێکی جێی سەرسوڕمان نییە؛ کیژۆڵەکە لە هەموو چتێکدا لاسایی گیانداری بەستەزمانی دەکردەوە، بەڵام لێرەدا سەربووریەکی خۆش لەم چیرۆکەدا هەیە. زۆریان هەوڵ دا منداڵە کێویلەکە فێرە ئاخاوتن بکەن، بەڵام بێهوودە بوو، ئیدی بەم جۆرە کیژۆڵەکە ڕەنگ و ڕووی مرۆڤانەی، واتە: بیروئەندێشەی وەدەست نەکەوتەوە، هەروەها نەشی توانی دەگەڵ هەلومەرجی ژیانە تازەکەیدا بگونجێ و درێژە بە ژیانی بدا، بەڵکو زۆری پێ نەچوو بۆ خۆی مرد و لەناوچوو.

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشێ: کیژۆڵەکە بە دەماخێکی مرۆڤانەی خواسایی خۆڕسکانەوە لە دایك ببوو، وەلێ لە کاتی فراژووبوونیدا، دەماخیشی هەر فراژوودەبوو، باشە ئەی هۆی دواکەوتنی بیرکردنەوەی و هەر وا بە کەڕ و لاڵی مانەوەی هەتا هەتایی چبوو؟

وێدەچێ مرۆڤ بۆ وەی ببێ بە خێوی بیروئەندێشە تەنێ کاری بەوە مەیسەر نابێ کە ببێ بە خاوەن دەماخێکی ڕاست و دروست، بەڵکو سەرباریش دەبێ، لە نێو کۆمەڵی مرۆڤدا گەورە ببێ و پەروەدە ببێ. کەوابوو بەبێ کۆمەڵی مرۆڤایەتی بیرکردنەوە مەحاڵە، بێ کۆمەڵگا بیروئەندێشە نییە. بیرکردنەوە لە ئاکامی بە کۆمەڵ لە نێو خەڵکدا ژیان دێتەگۆڕێ. بیرکردنەوە، بێ ئەوەی تا لە سەرێکەوە ڕەنگ بە سروشت نەداتەوە و لەسەرێکی دیکەوە تا لەگەڵ خەڵکدا لە چالاکیی بەرهەمهێناندا بە کردەوە، هاوسەروکاری پەیدا نەکا، بەدیارناکەوێ؟ کەوابوو، کار کۆمەڵی مرۆڤی دروست کردووە، هەروەها بەدەم کارەوە دەقاودەق، بەدەم چالاکیی بەرهەمهێنانەوە دەماخ و بیروهۆشی مرۆڤ تەنیویەتیەوە و گەشەی کردووە. لەبەر ئەم هۆکارە، مارکس هەر لە سەرەتاوە، ئەوەی دەستنیشان کردووە کە بیر و هۆش بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە و مادامێکی مرۆڤ جارێ هەر بەم جۆرە بمێنێتەوە، هەر بەم جۆرە دەبێ. بیروهۆش بەرهەمی بە کۆمەڵ ژیان بەسەربردنی مرۆڤە، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بیروئەندێشە لە کۆمەڵ بەدەر پێك نایە و هەر وەهاش ئاخاوتن و زمانیش بێ ژیانی کۆمەڵایەتی مەحاڵە. ئاخاوتنی ڕێکوپێك و بێ گرێوگۆڵ و زمان لە ناچاری و

بتەویّ و نەتەویّ، پێك دیّ. زمان پێناوێکە بـۆ بیرونەندێشە ئاڵشتکردن، پێناوێکە بـۆ دەگەڵ یەکدیدا هەڵسوکەوت و دەگەڵ خەڵکدا گوزەران کردن. تەنها بە واژە (بە ڕەمز و نمایەکانیش) بیرونەندێشەکان دەبن بە چتی واقیعی. بیرونەندێشە تا لە مێشکی مرۆڤدا بیّ، بە مردوو لەقەڵەم دەدریّ و خەڵکی دیکە مەحاڵە دەردەستی بکەن؛ بۆیەکا مارکس دیاردیی بۆ ئەمە کە زمـان واقیعێکی ڕاستەوخۆیە، هـەر زوو کـردووە. ئەمـەش، واتـە: بیرونەندێشە، بە بیّ بەرگی زمانیی، ماددی بوونی مەحاڵە، تەنانەت کە بە دەنگی بـەرز بیرونەندێشـەکانمان دەربـڕش نـابڕین، بـەڵکو وەك دەڵێـن هـەر لـە دڵـی خۆمـاندا بیردەکەینەوە، بیرونەندێشەکانمان دە بەرگی واژە دەگرین، دە بـەرگی زمـان دەگرین. لـە سـای زمانـەوە، نـەك هـەر بیرونەندێشـە دادەڕێـژریّ، بگـرە بـۆ خـەڵکانی دیکـەش ڕادەگوێزریّ.

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتەگۆڕیّ: گەلۆ تۆ بڵێی سیستەمی سیبێرنێتەکان، کۆمپیوتەر و هتـد جێگـەی دەمـاغ بگرنـەوە؟ نـەخێر. چونکە دەمـاخی مـرۆڤ بەرهــەمی ژیـانی کۆمەڵایەتییە.

ئێمە زمانمان بە گشتی لە نیگای مارکسیسزمەوە پێناسە کرد، بـەڵام ئایـا پێناسـەکە پربەپیست و دەقاودەق و ڕاستە؟ بەلای منەوە مادامێکی ڕاسـتی بـۆ خـۆی ـ هـەر وەك مارکسیسزم دەڵیّ ـ چتێکی ڕێژەکییە، ڕەها و موتڵەق نییە، هەر پێناسـەیەکی بـۆ هـەر چتێکی چ لـە ڕوانگـەی تـاك ڕەهەندیی بیرکردنـەوەوە و چ لـە ڕوانگـەی فرەڕەهــەندی بیکردنەوەوە، بکەی یـان کـراوە، ناتـەواوە و بـە ئیسـتیلاحی ئـەهلی مـەنتیق جـامیع و مانیع نییە و هیچ چتێکیش بە جامیعی و مانیعی تـا ئیسـتا پێناسـە نـەکراوە و نـاکریّ. بەناو ڕاستییەکان هەمیشە لە مێشك و بیری مرۆڤان بە زۆر بارکراون، یان نێژراون. ئەتۆ تەماشای ژن و پیاو بکە، لەبەر ئەوەی کە پیـاو بەدەسـەلاّت بـووە، هەمیشـە خـۆی لـە خانەی ڕاستیدا داناوە و ژنی لە خانەی هەڵە و هەرزەیی و گومان و نامتمانەییدا داناوە. ئەرستۆ پێی وا بووە کە ژن دوو ددانی لە نی پیاو کەمترە، کەچی دوو ژنیشی هێناوە و ڕۆژیّ لـە ڕۆژان بیری لـەوە نەکردۆتـەوە، تەماشـایەکی ددانـەکانیان بکـا و بیـانژمێریّ،

بزانێ بروایەکەی ڕاستە یان درۆیە.. تا ئێستاش زۆر کەس پێی وایە ژن بۆ ئەوە نابێ پشت بە ئاوەز و ئەقڵی ببەستێ، تا ئێستاش ئەستێرەی بەیان بە ئەستێرەیەکی تایبەت و ئەستێرەی ئێوارە بە ئەستێرەیەکی جیاواز دەزاندرێ، کەچی زانست ساغی کردۆتەوە کە هەردووکیان یەک ئەستێرەن، واتە: دوو ناو بۆ یەک میسداقە.. تا ئێستاش ئی وا هەیە کە هەر لەسەر ئەو بروایە ماوەتەوە کە ڕۆژ بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە و زۆر چتی دیکەش..

بەڵێ ڕاستە زانست و تەکنۆلۆجیا بە ئاستێکی زۆر پێشکەوتوو گەیشتووە، بەلام هێشتا لە گێژەنگی گوماندا دەخولێتەوە و پرسیار لە دوای وەلام دەگەڕێ و وەلامیش پرسیاری دیکەی لە پێش قوت دەبێتەوە. بە ڕای من هیچ دەسەلاتێ مافی ئەوەی نییە، مافی ئەوە لە مرۆڤ پاوان بکا کە نابێ ڕەخنە لە بیروبڕوای قالبگرتوو بگرێ و لە ڕاستی زێتر نزیک بکەوێتەوە.. بۆ پێناسەکردنی هەر چتێ لە تاکە ڕەهەندەوە نواڕین، تەنها هەر لە ڕوویەک، لە لایەنێکی ڕاستیمان نزیک دەخاتەوە، بەلام لە زۆر ڕەهەندەوە نواڕین، هەر هیچ نەبێ لە زوربەی ڕوو و لایەنەکانی ڕاستیمان نزیک دەخاتەوە. کە دەڵێم فرەڕەهەندی، مەبەستم ئەوە نییە کە هەر یەکە جودا ـ جودا هەبوون پێک دێنن، بەڵکو ڕەهەندەکان یەک لە یەکدی کاردەکەن و دەگەڵ یەکدیدا ڕایەڵێکیان دروست کردووە. بەش بە حاڵی پێوەندیی هەبوونی نەتەوایەتی بە زمانەوە، وەک ڕەهەندێکی گرینگ، بە تایبەت بۆ نەتەوەی کوردی لە یەک زمانی ستاندارتی فەرهەنگی و یەک خاک و یەک ئابووری و یەک دەوڵەت و هتد ی تا ئێستاش بێ بەش، ناتوانین بە زمانێکی نە زیندوو و نە مردوو لەقەڵەم بدەین. بەلام بۆ پێناسەکردنی، دەکارین کەڵک لە زمانناسیی زانستیی بێ لایەن وەرگرین و بۆ لە ڕاستیی ئەو زمانە نزیک بینەوە. زمان، وەک هەر ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی دیکەی نەتەوایەتی، بە نموونە: نژاد و فەرهەنگ بە تاکە ڕەهەند زانین، کە بە لای نازیزم و فاشیزمدا شکایەوە، پەرەساندنی بیروبڕوای نژادپەرستی بە تایبەتی لە نێو عەرەب و تورکدا، کە پێیان وایە هەرکەسێ بە عەرەبی یان بە تورکی بدوێ عەرەبە و تورکە، لە تورکیە بە لای ئینکارکردنی بوونی نەتەوەی

کورد و قەڵتوبڕکردنی کورد و لە عیراق، بە دەست بەعسییە فاشیستەکان بە چەکی کیمیاوی و ئەنفال و قەڵتوبڕ و لەناوبردنی کورددا شکایەوە. ڕەهەندی ئایین (سونێتی)، بوو بە هۆی جیابوونەوەی کوردستانی تورکیە لە کوردستانی ئێران و خەساندن و کزکردنی هوشیاریی نەتەوەییی کورد. شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدیللای نەهریٚ لە ١٨٨٢ دا کە زێتر خێڵەکی و ئایینی بوو، بەنووچدان کۆتاییی هات، شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران کە کوردە عەلەوییەکانی کوردستانی تورکیە لە دژی ڕاوەستان بە تێداچوون دواییی هات، هەروەها ڕەهەندەکانی هەبوون، بە تاکە ـ تاکە، هیچیان فریای ڕزگاری و سەربەخۆییی نەتەوەی کورد نەکەوتن. کەواتا: دەبێ هەبوونی نەتەوەی کورد لە هەموو ڕەهەندەکانەوە ناوڕی لیٚ بدرێتەوە.

هەر زمانێ یان هەر زارێ لە زارەکانی بگری، لە چوارچێوەی قۆناخی کۆمەڵایەتیی خۆیدا تەولو و بێ کەموکوڕییە. زمانی کوردی چ بە شێوەی سۆرانی و چ بە شێوەی کرمانجی، چ بە شێوەی لوڕی و ئێلامی و چ بە شێوەی گورانی و چ بە شێوەی زازایی، هەر یەکە لە قۆناخی ڕژێمی شوانکارەیی یان کشتوکاڵ یان پیشەگەری و بازاڕ و کاڵایی چکۆلە ـ چکۆلەی کوردەواریدا، لە ئەدەبیاتی زارگوتنی و ئەدەبیاتی خوێندەواری و سەوادا، پڕبەپێستی بیرونەندێشە و چەمکەکان و کەتەگۆرییەکان و زاراوەکانی سەردەم و قۆناخی خۆی دەوری خۆی گێڕاوە و دریغیی نەکردووە. دیارە ئەم زمانە، هەڵبەست و ئەدەبیاتی زارگوتنی: ستران و بەیت و داستان و سەربوورە و چیرۆک و ئەفسانە و پەندی پێشینان و نوکتە و مەتەڵۆک و هتد ـی پێ گوتراون و هیچ کەموکوڕییەکی پێوە دیار نییە. هەر وەها لە بواری ئەدەبیاتی خوێندەواریدا، هەر هەمان دەور و چالاکیی خۆی بە تایبەتی لە شیعری عەرووزیدا، نواندووە و هیچ عەیبی نییە. نالی، مەلای جزیری، وەفایی، مەولەوی، بێسارانی، خانای قوبادی، ئەڵماس خانی کەڵوەڕی، سەی یاقوو، ئەحمەدی خانی، لەبۆ هەر ماناییٚ، لەبۆ هەر قاڵبێکی زمانی و ڕەوانبێژی: مەعان و بەیان و بەدیع، بە زمانەکەی خۆیان، دانەماون. ئەوە ڕاست نییە کە بڵێین زمانی نالی و خانی و عوریان و مەولەوی و خانا و جزیری و هتد لەبەر

ئـەوەی کـە واژە و زاراوەی عـەرەبی و فارسـی و تورکییـان دەکـاربردووە، زمانـە کوردییەکەیان هەژارە و وڵامدەرەوەی پێداویستییە مـاددی و مەعنەوییـەکانی کۆمـەڵی سەردەمی خۆی نەبووە و نییە، یان بۆ ئەم سەردەمە دەست نادا. زمان بە پاشکەفتی و پێشکەفتی وەسف ناکرێ؛ ئـەوەی بـەو سـیفەتە وەسـف دەکـرێ، فەرهـەنگ و ڕۆشنبیرییە، ئاستی ڕۆشنبیریی ماددی و مەعنەوی چەندە پێشکەوتوو بێ، زمانیش بەو پێوەدانە پێش دەکەوێ. زمانی عەرەبی، تا فەرهەنگی عـەرەب، بـەش بـە حـاڵی خۆی، پێش نەکەوت، بەم کورەی ئەمڕۆ نەبوو. ئەمن لەو بڕوایەدام کە تەنها قورئـان و ئـایینی ئیسلام زمانی عەرەبیی پێش نەخسـت، نـەخێر، بـەڵکو زێـتر موتوربـەبوونی فەرهـەنگی عەرەب و فـارس و کـورد و تـورک و سوریانی یۆنـانی و هنـد و هتـد ئـەو زمانـەی دەوڵەمەند کرد و پێشـی ئێخست. زمـانی ئینگلیسـی زێـتر بـە گەشـەکردنی فەرهـەنگی سـەرمایەداری: پیشـەسـازی و بـازاڕ و بازرگـانی و ئیسـتیعماری وڵاتـان بـوو بـە زمـانی ستاندارتی ئەم سەردەمە.

ئەتۆ هـەر وا بڕوانـە ئـەو زاراوانـەی کـە دە زمـانی کوردیـدا لـە قۆنـاخی فراژووبوونـی پیشەکاندا هاتوونەگۆڕێ؛ بە نموونـە تەنـها هـەر ئاشـی ئـاو (ئاسـیاو) نزیکـەی ٣٠ ـ ٤٠ زاراوەی بـۆ هـەموو ئامێرەکـانی وەسـەر خـەرمانی زمـانی کـوردی خسـتوون و پێـی دەوڵەمەند بووە. جۆلایی، مسگەری، شیرگەری، تەونکاری، چەخماخسازی، زەردکاری، کارگەچێتی، ئاسنگەری و هتد هەر کێهەیان دەگـرێ، بەشـی پێداویستیی خـۆی، بـا کوردیی پەتیش نەبن، زاراوەی لەبۆ خۆی پێکەوەناوە. ئـەوڕۆ لـە دنیـای پیشەسـازی و تـەکنۆلۆجیادا، لـە هـەر بوارێکدا، زاراوەی تایبـەتی خـۆی بـۆ پـەیدابوون. بچـۆ نێـو فیترچییەکان، کارەباچییەکان، ڕادیۆچییەکان، تەلـەفیزیۆن چییـەکان، نانەواخانـەکان، لۆقنتەکان و هتد بە سەتان زارەوەیان داناوە. کەسیش گوێـی بـەوە نـەداوە، داخـۆ زاراوەکـان کوردیـی ڕەسـەن و پـەتین، یـان نـا. ڕەنگـە بفـەرمووی زمانەکـەمان بـەم بەرەڵایی و پاشاگەردانییە ڕەسەنایەتیی خۆی لەدەست بـدا.. ئـەدی تـورک و فـارس و ئازەری و عەرەب و ئینگلیس و فەرەنسی و و بـۆ دەرکـەی زمانـەکانیان لـە ڕووی

هەموو واژە بیانییەکانی دنیایێ لەسەر گازی پشت ئێخست و ڕەسانایەتیی خۆیان نەتۆراند؟! ئەمن پێم وایە: بە ناوی نەتەوایەتی پاراستنەوە سەختگیریی بێجێ چێتێکە و لە ڕووی ئەقلانییەت و پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی ژیان و سەردەمەوە هەنگاوهەڵێنان چێتێکی دیکەیە. لە حاڵەتی یەکەمدا، دەرکەی زمانەکەت دادەخەی و پێت وایە، تەنێ زمانی کوردی کە هێمان لە ٥٠٪ی زێتر خڕنەکراوەتەوە و کەمی لێ دەزانین بەشی هەموو پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانی ژیانی ئەم سەردەمە و چەندین سەردەمی دیکە (مۆدێرنیزم، مۆدێرنیتە و پۆست مۆدێرنزم) دەکا و وەك قوڕەچەورە، چۆنت ئارەزوو لێ بوو، بەو جۆرەی شکڵ و شەمایل دەدەیێ و کارەکە بەوە سەردەگرێ، کەچی ئەتۆ یەکەم: کارێکت کردووە کە بە دەرکە داخستن، زمانەکەت بە دەردی گۆماوێ بردووە کە ڕەنگ و بۆن و تامی ئەماوە و بەرەو بێچارەییت بردووە و چرووساندووتەوە. دووەم: لە ژێر ئەو سەختگیری و پرکێشییەدا، خۆت تووشی سەتان هەڵەی وەك: دانوسان، پێ هەڵسان، پیادەکردن و هتد کردووە.

لە دوای ڕێککەوتنامەکەی ١١ ئازار کە خوێندن بە کوردی کرا، بە دەیان کتێبیان بەرەوڕووی کوردینەزان کردەوە، ئەوەی لە وەرگێڕانی ئەو کتێبە دەرسییانەدا کرا با بە دەواری شڕی نەکردووە و ئێستاش منداڵە کوردی هەناسەسارد بە دەستیانەوە دەناڵێ. ڕاستە ئەو مامۆستا بەڕێزانەی کە کتێبەکانیان کرد بە کوردی، هەر کەسە لە ڕشتەی زانستەکەی خۆیدا، لێزان و چازان بوون، بەڵام سەبارەت بەوە کە بە زمانی عەرەبییان ئەو زانستانە خوێندبوو و لەبەر پەلە ـ پەل لێ کردنی کارەکە، کتێبێ بە چوار کەس دەدرا، تەرجەمەی بکەن، بۆ یەك مەبەست، جاری وا هەبوو، چوار زاراوە دادەنرا. ئەمە لە ڕووی زاراوە و واژەوە، لە ڕووی سەبك و داڕشتنی ڕستەکانەوە، هێندە عارەبی و لە مجێزی کوردەواری نامۆ و بیانی بوون: کوردی بادینانی ژەمبردەی ساڵەهای ساڵی بە کوردی نەخوێندن، هاواریان لێ هەڵستا، گوتیان ئێمە لەم زمانە حاڵی نابین.. لە بیرمە، برێ خوێندەواری ئەو ناوە چووبوونە کن سەددام، کە ئەو زمانەی کتێبەکانی پێ تەرجەمە کراون، کوردی نییە. ئەوەبوو، سەددام ئەمری کرد، فەرهەنگێکی کوردی،

عەرەبی دابندرێ، هەر واژەیەك كە بە عەرەبی هەیە و بە كوردی نییە، دەبێ عەرەبییەكەی بۆ دەكار بەرن. دەكاربردنی واژەی ئەورووپاییانەی هەر بە جارێ قەدەغە كرد. ئەمریان كرد، فەرهەنگێكی كوردی ـ عەرەبی دابندرێ، سەری نەگرت.

بەش بە حاڵی كۆڕی زانیاری كورد لە بەغدایێ، هەرچەندە خودا هەڵناگرێ چاپەمەنییەكی زۆری بڵاوكردەوە، بەڵام تەنها دوو ئەندامی لە دە ئەندامان، كوردیزان بوون، ئەویش مام هەژار و مامۆستا عەلائوددینی سەججادی بوون. دیارە ئەمە بەر ڕەهەندی ویست و ئیرادەی نەتەوەی كورد بۆ هەبوون، دەكەوێ، بەڵام تەنها ویست و شارەزوو، بێ فەرهەنگی وەڵامدەرەوەی سەردەم نابێتە ڕەهەندی لە ڕاستی نزیك بوونەوە. هەروەها لە ڕووی سیاسیشەوە ئەم ڕەهەندە پێویستیی بە فەرهەنگ هەیە.

بەش بە حاڵی سەرلەبەری ڕەهەندەكانی دیكەی پێكهێنی هەبوون (نەتەوایەتی)، دەبێ هەر بەو ڕادەیە فەرهەنگی، بە مانای وەڵامدەرەوەی پێداویستییەكانی سەردەمی گەرەكە. تەنانەت وەختە بڵێم فەرهەنگ كە بۆ خۆشی ڕەهەندێكە، بۆ قووڵ كردنەوەی مانای لە ڕاستی نزیك بوونەوە، سەردەفتەری هەموانە. لە عەقلانییەت، گومان، ئەفسانە، فۆلكلۆر، دابونەریت، مێژوو، ئازادی و سەربەخۆیی، ویست و شارەزوو، وشیاری، نوێخوازی و دیموكراسییەت، مافپەروەری و بە جیهانی بوون و هتد.. گەیشتن، بە فەرهەنگی فرەڕەهەندی جێ بە جێ دەبێ.

هەمدیس با بێینەوە سەروكاری زمانی كوردی. گەلۆ زمانی كوردی زمانێكی سەربەخۆیە؟ یان هەروەك قەڵەمە نكوولچییەكان شیدیعا دەكەن؛ "زارێكی لە چیاكان شێواوی توركییە" یان حاڵی زارێكی گۆڕاوی فارسییە" یان زارێكی میزۆپۆتامیایی عەربییە كە لە نیوچە گرداوی عەرەب قسەی پێ دەكرێ؟"

ئەسڵ و ئەستەڕی، بەرویشتی زمانی كوردی چییە؟ لە ڕووی زمانناسی و ڕیشەناسیی زمانەوە لە كۆمەڵی "زمانە مردوو"ەكان، یان "زمانە زیندوو"ەكان، لەقەڵەم دەدرێ؟

بە پێی زمانناسان بۆ ئەوەی بزانی زمانێ زیندووە یان مردووە، چەند پێوانەیێ هەن. پێش هەموو شتێ، گەشەكردن و فراژووبوونی زمان دەگەڵ گەشەكردن و فراژووبوونی

کۆمەڵ (ئەو خەڵکە یەک ڕەگەزەی کە پێی داخێون)دا هاوسەروکارن تەماشای جۆری بەسەرهاتە مێژووییەکان دەکرێ. زمانیش ، وەک چەکانی دیکە لە ڕێڤاژۆ (وەتیرە)ی مێژوویینەیدا هەمیشە دە حاڵەتی پێکهاتن (bcoming)یکدا دەبێ، لە دایک دەبێ و گەورە دەبێ، پەرەدەستێنێ و گەشەدەکا و دەتەنێتەوە و بەر جۆراوجۆری دەکەوێ، پاش دەکەوێ، لە کاردەکەوێ و دەمرێ، بەڵام ئەم گەشە کردنە، یان پاشکەوتن و مردنە وەک لەپێشترێم عەرزکردن، گوناهی زمان نییە (هەرچەندە تا ئێستاش ئەوە ساغ نەبۆتەوە کە داخۆ زمان پاشخانە یان ژێرخان یان بەشێکە لە پێناوەکان یان هێزەکانی بەرهەمهێنانە/ بڕوانە: ستالین و ڕۆزالوکسەمبورگ و زمان) بەڵکو خەتای فەرهەنگ و ڕۆشنبیرییە و وەک لە پێشترێ گوتم، سیفەتی پاشکەوتن و پێشکەوتن وەباڵ فەرهەنگ دەدرێ نەک زمان.

زانایان لەم ڕووەوە باسی بڕێ یاسا و ڕێسای گشتی دەکەن:

١ ـ بواری پشوودان و بزووتن و هەڵدان و گەشەکردنی لە پێشێ ئاوەڵا و وەکری بێ.

٢ ـ بنچینە و بنیاتی تایبەتیی ئەو زمانە، چییە و چۆنە؟

جگە لەمانەش لەمەڕ دەسەڵاتداریی ئەو خەڵکەش دەکرێ کە بەو زمانە دپەیڤن ئازادی و دەسەڵاتی سیاسییان هەبێ..

ئەوڕۆ کەس حاشا لەوە ناکا کە زمانەکان لە ڕووی گەشەکردن و پێشکەوتنەوە جودلوازن. "زمانی مردوو وەک عیبرانی بە دامەزرانی دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر بنەمای واژەکانی تەورات زیندووکرایەوە، زمانی ئاسوورییانی کە سەتان ساڵ بوو لە گیانەڵا و سەرەمەرگدابوو، ئەوڕۆ لە کوردستانی عێراق، لەم ساڵانەی دواییدا لە ئاکامی گۆڕانکاریگەلێکەوە، وەسەر پێ کەوتووە و بەم زمانە، با نژادێکی کەمیش قسەی پێ بکەن، بۆ ئەوە لەبارە کە سەرلەنوێ بێتەوەگۆڕێ و وەڵامدەرەوەی پرسیارە ماددی و مەعنەوییەکانی سەردەم بێ. زمانی سوریانی کە نزیکترین باڵی ئاسوریانییە (بە ڕەگ و ڕیشە دەچێتەوە سەر ئارامی) ئەوڕۆ تەنها زمانی کۆمەڵێکی ئایینییە و بەس. بەڵام زمانی کوردی لە زمانە مردووەکان نییە و دەبێ لە ڕیزی کەتەگۆریای زمانە

"زیندوو"ەکاندا حەشرونەشر بکرێ. ئەو ئازادییەی کە زمانی کوردیی لە زمانی مردووش و زیندووش جوێ کردۆتەوە ئەوەیە: کە زمانی کوردی وێڕای ئەوەی کە وەك زمانی ئاخاوتن فرە بەهێزە، بەڵام سەرلەبەری گۆڕەپانەکانی ژیان ناگرێتەوە، هەموو بوارەکانی ڕۆژانەی پڕنەکردۆتەوە، لە ئەرمەنستان و گورجستان بە ڕەسمی قوبووڵ کراوە، یان بە ئازادی بەرهەڵداکراوە ؛ بەڵام دەسەلاتی بەسەر ژیانی سیاسییەوە نییە، لە عێراقێ، لە هەلومەرجی باو (ستاتوکۆ)ی زمانی دووەمدا، دەتوانێ لە دامودەزگایەکانی بڵاوکردنەوەی دەوڵەتدا بەکاربهێندرێ؛ بەڵام هەر لە شەڕی کەنداو بەم لاوە، لەناچاری کشانەوەی دەسەلاتی بەغدا لە هەرسێ پارێزگای هەولێر و سلێمانی و دهۆك، دەسەلاتی کورد هاتەگۆڕێ، ئەم دەسەلاتە زمانی کوردیی کرد هەم بە پێناوی دەسەلاتی سیاسیش و هەم بە فەرمانڕەوای کۆمەڵ. لە ئێران بواری پێ ئاخاوتنی دراوەتێ و وەك پێناوی ڕاگەیاندن بەکاردەهێندرێ و تەنها وەك زمانێکی کولتووری پێی دەنووسرێ، بەڵام مافی ئەوەی نییە ببێ بە زمانی دەربڕینی هەبوونی نەتەوەیی خۆی، لە تورکییە، لە ماڵێ، لەسەر شەقام و شارێ و کووچە و کۆڵانان، کورد دەتوانن بە زمانی خۆیان باخێون، بەڵام بە ڕەسمی قوبووڵ نەکراوە و ددان بە هەبوونی نەتەوەیەك بە نێوی کورددا نانرێ. لە وڵاتی شامیش کارەکە هەر بەو جۆرەیە. کەواتا زمانی کوردی، وەك زمانێکی زیندوو، زێتر لەبەر زۆر هۆکاری سیاسی بە ڕێگای تەنینەوە و تەشەنەکردن و گەشەکردنی خۆیدا نەڕۆیشتووە و ناڕوا. هەروەهاش، ڕەنگ بەو ڕاستییەی کە "لە پێناوی مان و نەمانیدا تایبەتمەندییە هەرە دینامیکییەکانی پاراستبێ" ناداتەوە "ئەگەر ئەم زمانە بنیاتی تایبەتی و بەرگریی سەرسەختانەی نەبا، نەیدەتوانی بە درێژاییی چەرخ و چاخەکانی مێژوو لە دژی ئەو هەموو هێرش و پەلامار و گەمارۆ (مرۆڤی، کولتووری، سیاسی)یانەی لەناوبردنی، بە پێوە ڕاوەستێ".

جا لەبەر ئەم لایەنەی، دەبێ بە جیاوازی و زۆر بە وردییەوە لە زمانی کوردی وەکۆڵدرێ و شی بکرێتەوە.

لێکدابڕانی جوغرافیایی، زمانی کوردیی لە ڕێڤاژۆ (وەتیرە)ی مێژووییینەیدا دووچاری زۆر ئالۆزی و نەرێتی (منفی) کردووە. ئەم زمانە کە لە بنیاتی فرەزارەکی (polidialectic)دا فراژووبووە و تەشەنەی کردووە، هێشتا بە تەواوەتی تۆقرەی نەگرتووە و کورسی نەبەستووە و نەبووە بە زمانی ناوەندیی گەلێك، نەبووگە وە زوانێکی دەسکەلا (standard، معیاری). قسەکەم لە جێی خۆی بێ: سیاسەتی زەبروزەنگ و جەزرەوە، زمانی کوردیی بە چار کەرتەوە کردووە، کورد دەبن سیستەمەکانی سیاسیی سەخت و خەستدا گەمارۆدراون. "ئەم حاڵەتی ڕووبەڕووهاتنە، سەربووردەی زمانێکە لە وێنەی نەدیتراوە".

زمانی کوردی لەبەرچی بنیاتی تایبەتیی خۆی هەیە؟ زمانی کوردی لە نێوان زمانانی عەرەبی و تورکی و فارسیدا هەڵکەوتووە. عەرەبییەکەیان سامیتیك، تورکییەکەیان ئورال ـ ئاڵتایی، فارسییەکەیان لەبنفامیلیای ئێرانیی هیند ـ ئەورووپاییە.

ئەولیا چەلەبی، گەڕیدەی عوسمانی، لە گەشتنامە نامێیەکەیدا، زمانی کوردیی بە زمانێکی زۆر کۆن و فرە دەوڵەمەند لەقەڵەم داوە و پێی لەسەر ئەوە توند داگرتووە کە زمانی کوردی نە زمانی فارسی، نە زمانی دەری (فارسیی ئەوڕۆی ئەفغانستان) و نە زمانی عیبرانییە. هەروەها شەمسەددین سامی لە "قاموس الأعلام"ەکەیدا و زیا گۆك ئالپ ی بە ڕەچەڵەك کوردی تیۆریسیەنی ئیتتیحاد و تەرەققی و جاشی کەمالیستەکان لە کتێبی K üt Aşiretleri Hakkında SosyolojikTetkikler ەکەیدا زمانی کوردی بە زمانێکی جوداواز و سەربەخۆ و دەوڵەمەند دەزانن. کوردۆلۆگەکانی ڕۆژاوایی و ڕۆژهەلاتی لەسەر وەی کە "زمانی کوردی لە خانوادەی زمانی ئاریایی و زمانێکی سەربەخۆیە"هاوبیر و یەکبیرن. بەلام بەرانبەر بەم یەك ڕاییە، کەسانی دیکەی واش هەن کە لەبارەی زمانی کوردییەوە ڕا و بیروبۆچوونی جیاز و دووقاقیان هەن، ئەمن نامەوێ باسی ئەوانە بکەم، چونکە هەویرەکە ئاو زۆر دەکێشێ. بەڵێ حاشا لەوە ناکرێ کە زمانەکانی دنیا بە پێی لێکدی هاوسەروساختییان کاریان لە یەکدی کردووە و ئەمیان واژە و زاراوەی لەوی دیکەیان خواستۆتەوە و زمانەکان، لە کەناڵەکانی ئایین و

بازرگانی و ڕاوەڕووت و شەڕوشۆڕ و هتد      دوە سەروکاریان تا ڕادەیێ بە یەکدییەوە هەبووە. بە نموونە: نزیکەی ١٠ هەزار واژەی فەرەنسزی خزیونە نێو زمانی ئینگلیسیی ئەمڕۆوە. پاشانەکێ کە نەتەوەی کورد وەك کریستیەنسێن ، لیوەکۆلی ئێراانناسی نامێ دەلێ لە سەرویەندی ساسانییاندا ناوی "کورد" لە باو بووە، کەواتا: دەبێ زمانێکیشی هەبووبێ.

بەش بە حالی ئەلفبێتکەی زمانی کوردی، کورد لە سەرەتای دێر زەمانەوە بە زۆر ئەلفوبێیان نووسیوە، بەلام هەوەلێ ئەلفوبێیەکی کە پێیان نووسیوە، کێهە بووە؟ ئەوە تا ئێستا هێمان ساغ نەبۆتەوە. ئەوجا با بە کورتی و بەڕیز ناوی ئەو ئەلفبێکانەتان کە کورد پێیان نووسیوە، لەبۆ بنووسم:

١ ـ نووسینی مێخی: مێدەکان بە ئەلفبێتکەی مێخییەیان نووسیوە و ئەسلەکەی ٣٦ پیت بووە و پاشان ٦ ی دیکەیان لێ زێدەکردووە و بووگە وە ٤٢ پیت. دیارە لە چەپەوە بۆ ڕاست نووسراوە.

٢ ـ ئەلفبێتکەی ئاڤێستا: ئەم ئەلفابێتە بریتیە لە ٤٤ پیت و تا ٤٨ پیت هەلکشیوە و لە چەپەوە بۆ ڕاست نووسراوە.

٣ ـ ئەلفبێتکەی ئارامی: کۆنترین نووسینەکانی زمانی کوردی بەم ئەلفبێتکەیە نووسراون. بەلگەی وا بە دەستەوە هەن کە ئی سالانی ٨٨ ـ ٨٧ی پ. ز. ن.

٤ ـ ئەلفبێتکەی کۆنی پەهلەوی: کتێبێ بە نێوی "سۆراتی دینکەرد" بەم ئەلفابێتە نووسراوە و لە سەرویەندی ساسانییانەوە ماوەتەوە.

٥ ـ ئەلفبێتکەی ماسی سۆراتی: مێژوونووسی عەرەب، ئیبن وەحشییە لەو کتێبەیدا کە لە ٨٥٥ پاش. ز. دا تەواوی کردووە، دەلێ کوردان ئەلفبێتکەی ماسی سۆراتی بەکاردێنن و سێ کتێبی کە بەو پیتانە بە کوردی نووسراون دیتووە و ئەلفبێتکەکەش بریتییە لە ٣٦ پیت و کوردان بۆ خۆیان ٦ پیتی دیکەیان لێ زیاد کردووە

٦ ـ ئەلفبێتکەی یەزیدی: ئەم ئەلفبێتکەیە زۆر کۆنە و بریتییە لە ٣٦ پیت و هەردوو کتێبی پیرۆزی جیلوە و مسحەفا ڕەش بەم پیتانە نووسراون. بیستوومە تەحسین بەگی

یەزیدی هەرتکانی لە بانقێکی زۆر بە متمانەدا لە ئەورووپا، تەقەت کردووە، کاری ڕاست بێ.

٧ ـ پیتی عەرەبی: ئەوڕۆ لە کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران، زمانی کوردی بەم پیتە عەرەبییانە دەنووسرێن و بە جۆرێکیان دەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردیدا گونجاندووە، تا ڕادەیەك کاری خۆیانی پێ بە ڕێوەدەبەن، بەلام بێ کەموکوورپش نییە ها، کوردیی ئەوڕۆ، ئەگەر هەموو زارەکانی حسێب کەی، لە پیتەبزوێنەکانیدا پێویستیی بەوەندە پیتە هەیە و بە پیتی عەرەبی بۆی نالوێ، وەك: Ā، I ، و هتد

٨ ـ پیتی لاتینی: لە تورکیا و سووریا، بەم پیتانە کوردی دەنووسرێن و زۆر گرفت و کەموکووڕیی ڕێنووسی کوردیی ڕەواندۆتەوە. خۆزیا کوردی هەموو، بەو پیتانە نووسرابان.

٩ ـ پیتی کریلی: زێتر لە سۆڤێتستانی کۆندا بەو پیتانە کوردیی باکوور دەنووسرا.

لەمەڕ بیچم و سەروسەکوتی زمانی کوردی، هەر ئەوەندە لێرەدا بێتە گۆتن کە زمانی کوردی دەکەوێتە خانەی زمانە ئاوێتەیی (ترکیبی)کانەوە، واتە: بە پێشگر و پاشگر و ناوگران، ئیسمیش و فیعلیش تێك دەبەسترێن، وەك دەست + پێ + دا + گر + تن، کە بریتێن لەم چتانە: ناو + پێشگر + پێشگریش و پاشگریش + ڕەگی فیعل ... ەی چاوگ.، یان پێ +دا + هەڵ + شاخ + ان، کە بریتێن لە پێشگر + پێ... و پاشگریش + پێشگر + ڕەگی فیعل + نیشانەی چاوگ. دیارە زمانی کوردی وەك هەر زمانێکی هیند ـ ئورووپایی، هیند ـ ئێرانی و سامیتیکی لە گوێن ئینگلیسی، فەرەنسزی، ئیتالیایی، ئاڵمانی، عەرەبی، فارسی، ئۆسێتی، پشتوونی و هتد دەگەڵ زمانە یەك برگەییەکانی وەك چینی و ژاپۆنی و تیبەتی و زمانە نووسنەك (لصقی)ەکانی وەك تورکی و هتد جوداوازە. بە ڕاستی زمانی کوردی نەبێ بە قسەی من، بەڵکو بە قسەی زۆر زانای گەورە، زمانێکی زۆر چالاك و پڕ لە سیحر و چتی نهێنییە.. جوداوازیی نێوان زمانی کوردی و فارسی، بە قسەی من نا، بە قسەی زانای مەزن مینۆرسکی: "زمانی کوردیش هەر وەك زمانی فارسی، یەکێ لە زمانە ڕۆژاواییەکانی ئێرانە".

زمانانی ڕۆژاوای T. Tedesce و Andreas, Salamann, O Mann. Meillet. Lent. ئێرانیێ بە دوو گرۆوە دەکەن. هەردوو گرۆیەکان زۆریان کار دە یەکدی کردووە، بەلام وێڕای ئەم کاردەیکدیکردن و لێك وێچوونەی هەرتکان، چەندین نیشانە و چتی وایان دە نێواندا هەن کە بە تەقەی تفەنگانیش بە یەکدی ناگەن. فارسی و کوردی هەریەکە تایبەتمەندیی ئۆریجینالی خۆیان هەس. هەرچی زمانی کوردییە سەر بە پەلی ڕۆژاوای باکووریی ئێرانە". زمانی کوردی و فارسی هێندەیان سەروساخت و خزمایەتی دەگەلێ یەکدیدا بنیات ناوە هەر دەڵێی بێ یەکدی هەڵ ناکەن.

زانایانی زمان لە وردکردنەوە (تصریـف)ی ڕەگ، بە تایبەتی ڕەگی فیعلدا، گۆڕانی دەنگدار بە بنەڕەتی زمانیی ئاوێتە و چڤانۆك (تەرکیبی)ەکان دادەنێن. با بە نموونە ڕوونی کەمەوە: لە زمانی کوردیدا واژەکان بە پێی ئەو ئەرکانەی کە لە ڕستەدا دە ئەستۆی دەگرن، دەگۆڕێن و ڕستەدەکرێن. بە پێی ئەم ڕێسایە "kirin، کردن" کە چاوگە، کاتێ فیعلی موزاریعی حالی حازری بکەری یەکەمی ل سازدەکەی، دەبێ بە "di+k+im دە+ك+م". وەك بەدیاردەکەوێ، تەنها پیتێ کە لە ڕەگی فیعلەکەدا نەگۆڕا "k، ك"ـیە. فیعلی parastin، پاراستن، لە موزاریعی بکەری یەکەمی حازردا، دەبێ بە ، دە+ پارێز+ م". لێرەدا "- di" نیشانەی کاتی حازر، " ، پارێز" ڕەگی فیعل لە حالەتی ئەمردا min، من" جێناوی شەخسیی یەکەمە.

هەر هەمان ئەم فیعلە، بە پێی زەمانی ڕابردوو وردکەیەوە، دەبێ بە min parast، من پاراست". "min، من" جێناوی شەخسی یەکەم (ضمیر رفع منفصل)، هەرچی "parast، پاراست"ـە، ئەوەش ڕەگی فیعلەکەیە لە زەمانی ڕابردوودا. زاری کرمانجیی باکوور نموونەی زمانی چڤانۆکە. ئەگەر لە واژەیەکی یەکبڕگەییدا، لە دەنگێ زێتر هەبێ، دەتوانێ حالەتی واژەی لێکدراو پێك بێنێ، بە نموونە:

١ـ پێشگر + ڕەگ = واژەیەکی نوێ

٢ـ ڕەگ + پاشگر = واژەیەکی نوێ

٣ـ ناو + ناو = واژەیەکە نوێ

٤ـ ناو + ئاوەڵناو = واژەیەکی نوێ

٥ـ ئاوەڵناو + ئاوەڵناو = واژەیەکی نوێ

٦ـ ئاوەڵناو + ناو = واژەیەکی نوێ

وەك بەدیاردەکەوێ، واژە نوێییەکان نەك هەر بە کۆمەکی "رەگی فیعل"، بگرە بە "ناو" و " ئاوەڵناو"یش پێکدێ. یەکێ لە نیشانە هەرە زەق و زۆپەکانی زمانی کوردی ئەوەیە کە بۆ هەموو دەنگێکی کە لە واژە نوێییەکانی بیانیی هاوسەردەمدا بەر گوێ دەکەوێ، بە پێی یاسا و ڕێسای زمانی، لە "تەکنیك" لە هەر زانستێ کە تۆ بە بیرتدا دێ، لەبار و هەموارە. بۆ نموونە: کوردی باکوور بۆ "تحت البحر" کە هەرگیز نەیدیتووە و بۆ خۆی سازی نەکردووە، زاراوەی noq + av، نۆق + ئاو "noqav"، نۆقاو"ی داناوە. "noq" بە مانای بە بن ئاودا ڕۆیشتنە. هەروەها زاراوەکانی "balafir"، فڕۆکە، زانکۆ، چاپەز، پێلاواز، کێش (وزنی عەرووزی)، سەروا، ڕیزبەند (قافییە) و هتد ی سازکردووە. خۆلاسە زمانی کوردی بە سایی پاشگر و پێشگر و ناوگری نۆرووزەوەندەوە، وەك لاستیك و قورەچەورە، چۆنت خوایشت بێ، دەتوانی واژەی لێ ساز بکەی.

لێکدی جوداوازیی نێوان زمانی کوردی و زمانی فارسی دەکرێ وەك مینۆرسکی دەڵێ، لەم چەند خاڵانەدا دەستنیشان بکەین:

١ـ فۆنەتیکی زمانی کوردی وەك فۆنەتیکی زمانی فارسی ناچێ.

٢ـ واژەهاوبەشەکانی نێوان زمانی کوردی و زمانی فارسی فەرق و جوداوازییەکی، لە ڕووی دەنگەوە، زۆریان گۆڕانکاری بەسەر هاتووە و لێکدی تا ڕادەیەك لە یەکتر بووگن وە بێگانە.

٣ ـ لە ڕووی جێناو، وردکردنەوەی فیعل و داڕشتنی، ئامرازەکانی عائیدییەت و سەربارەکان (مکملات)ی ناو، هەردوو زمانەکە لێکدی زۆر جوداوازن.

٤ ـ لە ڕووی ڕستەسازکردن (سینتاکس)ەوە وەك یەکدی ناچن.

٥ ـ لە هەردوو زمانەکەدا جوداوازیی واژەکـان بابـەتی بـاس و پرسـە. نـەحو (syntax)ی زمـانی کـوردی بـە حـەرفی تـەعریف، واتـە: بـە ئـامرازی پێوەندییـەکان پێـك دێ. ئـەم حەرفی تەعریفانەش لە ڕووی نیشانەی دیار و نادیارەوە، بە دوو بـاژەوە دەکرێن:

أ ـ نیشانە دیارەکان

mal + a mezin = لە ناو + ئاوەڵناو + نیشانە پێك دێ.

Mast -ê we = لە ناو + جێناو + نیشانە، پێك دێ.

Keç + ên bedew = لە ناو + ئاەڵناو + نیشانەی کۆی دیار پێك دێ.

Mal - a min = لـە نـاو + نیشـانەی تـاکی نێری دیـار + جێنـاوی شـەخسـی یەکـەم (ضمیری تاکی یەکەمی مەجرووری متصل) پێك دێ

ب ـ نیشانەنادیارەکان:

mal – eke mzin = لە ناو + ئاوەڵناو نیشانەی تاکی مێی نادیار پێك دێ.

Keç - îne bedew = لە ناو + ئاوەڵناو + نیشانەی کۆی مێی نادیار پێك دێ.

ڕیزکردنی ڕستەی "Ez duh çûm Dihokê" بـەم چەشنەیە: بکـەر (فـاعیل، مبتـدأ، مسـند الیـە) + ئاوەڵکـار (زەرفـی زەمـان) + بـارکردن (حمـل، اسـناد) + بـەرکاری ناڕاستەوخۆ (مفعول بە غەیر صەریح).

بە زمانی کوردی دەتوانی لە ڕستەی سادەدا، فاعیل (موضوع، مسند الیە، ) لە پێشەوە و فیعل (محمول، مسند) لە پاشەوە دانێی، وەك ئـەز چـووم، مـن ڕۆیشـتم. دەشـتوانی "چووم من" بێژی، بەڵام ئەمەش جێـی خـۆی هەیـە و ڕەوانبێـژی بڕیـاری ئەمـە دەدا.. باسی کەرتەکانی ڕستە پاش و پێش خستن (تأخیر ما حقە التقدیم وتقدیم ما حقە التأخیر) لە زانستی "مەعان"دا زۆر گرینگە، بە داخەوە کوردی نەزان (ئەوانـەی لایـان وایـە ئـەو زمانەی کە لە دایـك و بـاوك و گەڕەکەکـە و ناوچەکـەی خۆیـن فـێری بـوون بـۆ شـیعر و ئەدەبیات نووسین، بەسە) لەم کـارە بـە داخـەوە، زۆر نائاگـا و دەسـت و پـێ سـپین و خۆشیان بە نازانم چی دەزانن

لەم ڕستانەی کرمانجیی باکوورە بنوارە:

Min nan xwar (من نانم خوارد)

Ez nên dixwim (من نان دەخۆم، من نانی دەخۆم)

هەروەها لەم ڕستانەی کرمانجی ـ زازاکییەش بنواڕە:

Min nan werd (من نانم خوارد)

Ez nên wena (من نان دەخۆم)

دەبینی بکەر لە حاڵەتی فیعلی تێپەڕی ڕابردوودا جۆرە جێناوێ (min·) و لە حاڵەتی فیعلی موزاریعی تێپەڕدا جۆرێکی دیکە (ez) دەخوازێ.

لێکەر (فیعل، مسند)یش ناوە ناوە لە پێش پێشکبەر (فاعیل، مسند الیه)ەوە دێ و دەکارێ ببێتە (لێکەر ـ پێشکبەر)، وەك:

Hûn + dê tu caran + neçin Geverê, Şivên + nanê xewe xwar.

ئەو "بکەر" (مبتدأ، مسند الیه، موضوع)ەی لە ڕستەی کوردیدا جەختی لەسەر دەکرێ بە پێی مەبەستە بلاغییەکان شوێنەکانی دەگۆڕێ، وەك:

Ez ê kevirekî bi tevşo bişkînim, Ez ê bi tevşo kevirekî bişkînim, Kevirekî bi tevşo ez ê bişkînim,Bi tevşo kevirekî ez ê bişkînim.

ئەمە بە زاری کرمانجیی باکوور.. بە زارەکانی کرمانجیی باشووریش دەبن بە: مـــن کەوڕێ وە تڕێشتە ئەشکێنم، من بە تەشوێ بەردێکی دەشکێنم، بەردێك بە تەشوێ مـن ئەیشکێنم، بـە تەشوێ تـەوەنێ من ئەیشـکێنم، بـە زاری هـەورامانی: مـن تـەوەنێ وە تڕێشتە شکەنوو:

بە ڕاستی فێربوونی زانینی بە پێی مەبەست و مەرامی قسەکەر و گوێگر ڕستە داڕشـتن، ڕاهاتن و قاڵبوونەوە، کارێکی هەروا سانا نییە. لە ڕەوانبێژیدا، بەشی "مەعان" کە هەر دەکاتەوە زانستی ڕستەداڕشتن، باسی لە کوێدا "بکـەر" یان "بـەرکاری ڕاستەوخۆ" یان "بەرکاری ناڕاستەوخۆ" یان "زەرف" و هتـد سەختترین باسێکە کە زاتێکـی وەك عەبدولقاهیری جورجـانی، لە "إعجـاز القرآن" و "نظـم الكـلام"دا کە زۆری پێـوە ماندوو بووە، بە دەگمەن ـ بە تایبەت کۆلکە نووسەر ـ ڕێی پێ دەبەن. ئـەم باسە و باسـەکانی وەك "القصـر" و "الفصـل والوصـل" لە بەلاغـەتی عـەرەبیدا، ســەرلەبەری

زانایانی دنیا به ئینسافەوە، شایەتیی پێشدەستیی زانایانی ئیسلامی تێدا بۆ دەدەن و لایان وایە کەس دەسکی لە دوو نەکردوون. بەڵێ ڕاستە ئەوڕۆکە زانایانی ئەورووپاش زۆر بە وردییەوەیان سەرنج داوتێ و لە دەقە شاکارەکانی ئــی وەك شێکسپیر و کۆرنێیی و گۆتە و شیللەر و هتد... نیشانەی ئەوەن کە چۆن هەر یەکە بە پێی سروشتی زمــان و مجێزی ڕەوانبێژیی خۆیان، ئەسپی خۆیانیان تێدا تاوداوە. ئەمە لەمەڕ لە کوێی ڕستەدا واژەی مەبەسـت دانـان و کێهـە واژە پێش دێخی و کامیـان پـاش دێخی. جگـە لەمــە زانستێکی دیکە هەس کە زانستی وە دەنگ و نەبرە و تەکیە و تەمسیل بۆ مانای واژەی "گرینگ" و "نیوچە گرینگ" و "لاوەکی" ئاوازی تایبەتی لەبۆ دەربڕین"الأداء"ی، پــێ دەگوترێ. ئەمە چ لە شانۆگێڕی چ لە خودبــەدان و شیعروەخوێندندا، بایـەخێکی زۆری دەبــێ پــێ بدرێ. تەنانـەت، هێنـدێ فەرهـەنگی زمـان هـەن کـە واژەکانیـان تێــدا بــە ترانکرپسیۆنی ترێدیسیۆنالی ڕەسەنی زمانەکە نووسراون و سترێس و نەبرەی تایبــەتیی لەســەر هــەر واژەیـەك وەك زمـانی ڕووسـی، بۆ دانـدراوە. ئەمە بـەش بـەحاڵی خــودی واژەکە، بەلاّم وەك لە ئینگلیسیدا باوە، ئەتۆ هەر هەمان ڕستەی سەرووبەم جۆرە بــە ئینگلیسی بێژی، دەڵێی (دیارە بە شایەتیی مامۆستایەکی ئینگلیسی زان): break a rock with a fax لێرەدا، واژەی مەبەسـت، لـە شیعردا نـەبێ، بــە پێشخســتن و پاشخستن، نییە، بەڵکو بە سترێس جێ بە جێ دەکرێ. ئەمە نەك هەر لــە ئینگلیسیدا، بگرە لە هەموو زمانەکاندا بەو جۆرەش و بە جۆری پاش و پێشخستنی واژەکانیش پێك دێ. بە نموونە ئەگەر دەنگم لەسەر واژەی "Ezê" لە ڕستەی سەروودا بڵنـد کـردەوە، مەبەستم ئەوەیە کە تەنـها مـن، نـەك یـەکێکی دیکـە "kevir"ەکـە دەشـکێنێ، ئەگـەر دەنگم لەسەر "kevir"ەکە بڵندکردەوە، مەبەستم ئەوەیە کە من هەر "kevir" نـەك چتێکی دی دەشـکێنم، نـەخێر ئەگـەر دەنگم لەســـەر "tevşo" بڵندکـردەوە، ئــەوە مەبەستم ئەوەیە کە تەنها بــە "tevşo" نـەك بـە چتێکی دیکـە "kevir" دەشـکێنم، ئەگەر دەنگم لەســەر "bişk înim" بڵندکـردەوە، مەبەسـتم ئەوەیـە کـە نـەك نـەقاریی دەکەم، بەڵکو دەیشکێنم و هتد... بەلاّم ئەم پێشخستن و پاشخستنە بۆ مەبەستی

(قصر) یەکێکە لە چەندین مەبەستی بەلاغیی دیکە کە لێرەدا باسەکە ئەوەندەی بە بەرەوە نییە درێژدادڕیی لەمەڕ بکەم.

مەسەلەی زمانێ کە لە زمانێکی دیکە واژە و چتی دیکە وەردەگرێ، ئەوە چتێکی خواساییە، کوردی و فارسی کە واژەیان لێکدی خواستوتەوە، ئەمە چتێکی زۆر خواساییە، چونکە هەرتك، هەر هیچ نەبێ، لە زمانە ئارياييەکانن. ئەم حاڵەتە نەك هەر کوردی و فارسی، بگرە زمانانی ئاڵمانی و ئیتالیایی و ئیسپانیایی و ئینگلیسی و بولغاری و ڕووسی و فەرەنسزییش هەر ئەمەیان لێ بەسەرهاتووە. بەڵام فەرقی هەرە گرینگ لە نێوان کوردی و فارسیدا، یەکەم: دەکاتێکدا لە زمانی کوردی (زاری کرمانجی) دا دوو جۆرە جێناوی شەخسی، یەکیان لەبۆ فیعلی تێپەڕی ڕابردوو و ئەوی دییان لەبۆ فیعلی تێنەپەڕی ڕابردوو و فیعلی موزاریعی تێپەڕ و تێنەپەڕە، کەچی لە فارسی و زارە کوردییەکانی لە فارسییەوە نزیکەوەی وەك سۆرانی و گۆرانیدا چتی وەسا نییە. دووەم: لە کوردیدا "زایەند" نێر و مێ هەن، کەچی لە فارسیدا چتی وا نییە. کەواتا: زمانی کوردی زمانێکی "ergatif"ە، واتە فیعلەکە دەگەڵ بکەر (فاعیل، مبتدأ)دا هاوسەروکارتر و هاوسەرساختترە.

بەش بە حاڵی دیرۆکی زمانی کوردی، خراب نییە کە چتهایەکتان عەرزکەم. زمان بە هۆی هێز و گوردی ڕاگەیێنییەوەی هێندێ جار، لەگەڵ لایەنی ڕەگەزی، چینایەتی، نەتەوایەتی و فەرهەنگییەوە هاوسەرکارییەکی سفتوسۆڵی هەیە. زمان تەنها هەر لە سنووری ڕەنگ بە جیهانی بەرهەستدانەوەدا نابڕێتەوە، بگرە بۆ خۆشی چەندین جیهان و ڕاستیگەلێ سازدەکا. ئەسڵەن بە بێ زمان بیرکردنەوە لە ئەدەبیات، سیاسەت، زانست، ئایین و دیاردەکانی دیکە محاڵە. لەوما، زمان سەرچاوەی دەسەڵات و توانستە. گۆڕانکاریهایەك کە لە بارودۆخی زمانێکدا ڕوودەدا، بەر لە هەموو چتێ، واتە: گۆڕانکاری لە ئەرك و وەزیفەکانی ئەو زمانەدا، واتە: سەرلەنوێ دامەزرانەوەی بارودۆخێکی تازە و نرت و نوێ، چەسپاندن و پەرە بە گەشەکردن و سەربەخۆییەکی تازەی ئەرکەکانی. دیارە زمانێ کە باری ڕەسمی وەردەگرێ (وەك لە کوردستانی

عێراقدا کە هەر لە سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی عێراقەوە بە دەستی ئینگلیزەکان، زمانی کوردیش بە پێی یاسای زمانی ناوخۆیی ژمارە ٧٤ی ساڵی ١٩٣١، بوو بە زمانێکی ڕەسمی) نەتەوەی پلە دووی خاوەن زمانەکە بیەوێ و نەیەوێ، بۆ بەرژەوەندی و ئامانجەکانی دەسەڵاتی هەر خۆی حسێو، لە هەموو بوارە بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانڕەوایی (کاروباری داوەری، سپایی، ڕاگەیاندن، چاپەمەنی، پەروەرشت و فێرکردن) تەرخان دەکرێ. جا هەر گۆڕانکارییەك لە ڕووی ڕێفاژۆیەکی مێژووییەی کۆنکرێتەوە ڕوودەدا، گەشەکردنێکی بە بەرنامە دارێژراویش و هەروا لە خۆڕاشی، بە دەمەوەدێ.

به پێی تا ڕادەیێ لە ڕاستی نزیك بوونەوە "بە بەرنامە دارشتنی بارودۆخ" (statu planing)، واتە: جێ بە جێ کردنی هاوئاهەنگی و دەس لەملانێی نێوان پراکتیك و بڕیارەکان، بە قسە و کردەوە کار ڕایی کردن. بە بێ ئەمە دەوری زمان لە کۆمەڵدا پشتگیریی لێ ناکرێ و زمان هیچ کاریگەرییەکی، یان هیچ گۆڕانکارییەکی پێوە دیار نابێ. ئەمە دیوێکی مێداڵەکە، هەرچی دیوەکەی دیکەیەتی "بنیات ڕێکخستن" (corpu splaning) ە. ئەمەش پێشنیازی بەرنامەڕێژییەکی لە هەموو سەرێکەوە: ڕێزمان، فەرهەنگ دانان، دەستنیشان کردنی بنچینەکانی واژەڕۆنان، قاڵبەکانی، ئەلفبێتکە، ڕێنووس، چۆن گۆکردنی واژە، چۆن ڕستەدارشتن، چۆن ڕەچاوکردنی ڕەوانبێژیی زمانەکە (مەعان، بەیان، بەدیع) و تەرزی قسەکردن و ئاخاوتن "intonaiton"(ئەمانە ئەمڕۆ لە ئانتۆنۆێنیدا بوون بە زانستێکی زۆر گرینگ حسێب بۆ کراو دەکا).

هەرکە باسی زمانی کەمایەتییەکان دێتەگۆڕێ، یەکسەر مەسەلەی بنیات ڕێکخستن (corpu splaning)مان، وەك مەسەلەیەکی سیاسی لە سەرووی لیستی هەر کارنامەیەکەوە لە پێشێ قوت دەبێتەوە و ئەو نەتەوەیەی کە پێی داخیوی و ئەو دەسەڵاتە سیاسییەی کە باڵادەستە، هەرتکان بە دەنگ دێنێ و هەرتکیشیان بەرانبەری، زۆر سرك و گوێ قولاغانەی ئاوڕ لێ دەدەنەوە.

ئەزموونەکانی زمانانی کەمایەتییەکان لە ئورووپـایێ، تـا ئێسـتا لـە ڕووی زۆری و کەمییەوەی ئاوڕ لێدراوەتەوە، ئاغڵەبە، تا زۆر بووبن دەنگیان دلێرتر و تا کـەم بووبـن دەنگیان کزتر بووە[٢].

## سیاسەتی دەوڵەتی عێراق

تا سەتەی ١٩یش زمانی کوردی لە کەشوهەوایەکی ئازاد و سەربەخۆی کەم تا زۆرێکدا بێ ئەوەی حوکوومەتە مەرکەزییەکان خۆیانی ڕاستەوخۆ تێ هەڵقورتێنن تا ئەندازەیێ، پەرەی ساندبوو و وەگەشەکردن کـەوتبوو. هـەردوو دەوڵـەتی ڕژێـم لـەرۆژگی (کۆمـەڵی ئوممەی عوسمانی و فارسی هێشتا پێیان دە هەلومەرجێکی وا نەهاویشتبوو کە گوێ بـە مانـای نوێیـاوی نەتەوایـەتی بدەن و سیاسـەتێکی بـەکار لەمـەڕ زمـانی کـوردی لـە کوردسـتاندا بـەکاربێنن و بـە زۆر بیسـەپێنن. نـەک هـەر ئـەوە، بگـرە وەخـت بـــوو لـە سەروبەندی دامەزراندنی سوارەی حەمیدیدا زمانی کوردی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بکرێ بە زمانێکی ڕەسمی. تەنانەت بیر لـەوەش کرایەوە کـە فێرگـەکانیش زمـانی کوردییـان تێدا بخوێندرێن. دیارە ئەمە لە پاش ڕووخـانی میرنیشـینە کوردسـتانییەکان ڕووی دا.. عەبدولحەمیدی دووەم دەیویست بەمە دوو نیشان بە تیرێ بشـکێنێ: یەکـەم، کـورد بـە ناوی ئاین و سۆزی کوردایەتییەوە لە دژی نەتەوەی ئەرمـەنی ڕاسـت کاتـەوە، دووەم، هـەر جـۆرە بزووتنەوەیـەکی خێڵەکییانـەی سـەرەک هـۆز و ئاغـا و بەگلـەر و شـێخ و مەلایەکانی کورد بۆ ئامانج و بەرژەوەندیی خۆی کەنالیزە بکا و بۆ هەتا هەتایە کورد بۆ دامەزراندنی کیانـاتێکی تەنانـەت دە شێوەی میرنیشـینی پچـڕ - پچـڕی ڕژێـم فیوداڵـی سـەروبەندی پێشـوو، یـان وەک ئەحمـەدی خـانی بـیری لێکردبـۆوە دە شـێوەی دەوڵەتێکی مەرکەزیی هەموو کوردستانیشدا بیرنەکەنـەوە.. وەلێ ئەو دەوڵەتانەی کە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی هاتنە گۆڕێ، سیاسەتێکی ئابووری و سیاسی و فەرهەنگی و زمانیی یـەکجار خەستوخۆڵی بـە ڕێوەبرد. دیـارە نەتەوایـەتی لـەم قۆناخـەدا مانـا

---

[٢] Max K.Adler. Welth and Other Languages in Europa: A. Soscıolınguistic Study, Hamburg, 1977> لە Faik Bulut/ Kurt dili Tarihe sı وەرگیراوە.

هاوچەرخەکەی ئەوروپاییی وەرگرت: یەک زمان، یەک ئابووری، یەک خاک، یەک هەستوخوست و ئاڵھا و ئاوات و یەک دواڕۆژ و هتد ... بەڵام زمان و فەرهەنگ و کەلەپوور لە هەموو ڕەهەندەکانی پێکهێنی چەمکی نەتەوایەتی بە زەق و زۆرتر پشتیان پێ بەسترا؛ چونکە ئەوەی نەتەوەکانی دەوڵەتی فارسی و عوسمانیی بە زەقی لە یەکدی جوێ دەکردەوە، زمان بوو. بەڵێ ئایینیش بۆ جوداوازی، ڕەهەندێکی گەورە بوو و ئەوەبوو، کوردستانی ئێران لەبەر ئەم هۆیە لە دەوڵەتی سەفەویی شیعە مەزەب جوێ بووە(جوێبوونەوەی پاکستان و بانگلادێش لە هندستانی هیندۆسی و داوای جوداخوازییانەی ئیرلاندییە باکوورییەکانی کاتۆلیک لە ئینگلستانی پرۆتستان و هتد ... نموونەی ئەم ڕەهەندە دەبەرچاوگرتنەیە). بەڵام دە قالبدانی کۆمەڵانی ڕۆرووزەوەندەی کەمایەتییە ڕەگەزی و ئایینی و فەرهەنگییەکان هەروەها کارێکی سانا نەبوو. دەبوا ئەمانە بە بەرنامەڕێژی، کەوی و مالی کرابان، ڕاهێندرابان، مێشکیان شۆردرابا.. حوکوومەت سیستەمی پەروەرشت و فێرکردن و ڕاگەیاندنی جەماوەریی بۆ خۆی پاوان کرد، بە هەموو جۆرێ زمانی ڕەسمیی بەسەر ئەو نەتەوانەدا داسەپاند.

**داگیرکرانی ویلایەتەکانی بەغدا و بەسرا و**

**مووسڵ لە لایەن ئینگلیسەوە، سەرووبەندی ماندا(١٩١٨ ـ ١٩٣٢)**

سیاسەتی ئینگلیس لەبارەی زمانی کوردییەوە دەگەڵ ئەوسیاسەتەی کە لە پاش شەڕی جهانیی یەکەم بەرنامەی بۆ داڕشت فرە هاوسەروکارە. ڕەچاوکردنی باری تەکنیکی و ئۆقرەگرتنی باری سیاسی، دەسەبەرکردنی پاراستنی ئەمن و ئاسایشی ناوچەکە لەو هەلومەرجەدا، لە ڕەهەندە بنەڕەتەکانی هاوتایی (معادلە)یەکەی ئەو ڕۆژگارە بوو. کاتێکی ئینگلیس هەستی بەوە کرد کە کورد خەریکە بزووتنەوەکانی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان خەست و چڕوپڕتر دەکا، کارێکی زۆر خواسایی بوو کە وەخۆ کەوێ و حسابێکی بۆ بکا. ئیدی ئەوەبوو ئینگلیسی نوو - نوو بە کەشوهەوای سیاسی کاژگۆڕ و لە سەرەتاوە دنە و ماندەی سیاسەتی پەرەبەزمانی

کوردیـدەر و پاشـانەکێ وردە ـ وردە بوارتەسـك کـەرەوە، لەسـەر دوو سیاسـەت گیرسایەوە: سیاسـەتی دنـەو هـاندانی گەشـەکردنی زمـانی کوردی دەستەڕێشـەی بـە دەست فەرمانفەرمای نامێی ئینگلیس، ئەدمۆنس دوە بوو. ئەم ئینگلیسە بە قسە لـەو بڕوایەدا بوو کە دەبێ کوردیش شان بە شانی عەرەب وەسـەر ڕێگـای نەتەوەپـەروەریی خۆی کەوێ و ئەم نەتەوە لەبیرکراوە دەبێ بە بیربێتەوە و ئەویش مـافی خـۆی دەست کەوێ. کارمەندانی ئینگلیس گەشەکردنی زمانی کوردییان لەو ناوچانەدا کە کارمەندانی تورك و فارسیان لێ بوون، بۆ دەمەزەردکردنەی هەستوخوسـتی کوردایـەتی بـە ئاشکرا هەڵپەیان دەکرد، وێڕای چەسپاندنی بەندەکانی شەڕراگرتن لە ٣ ی مانگی یەڵەی سالی ١٩١٨ دا لە نێوان تورك و ئینگلیسدا هەلومەرجە سیاسییەکە وای دەخواست کە زمـانی کوردی پەرە پێ بدرێ و بـیری کوردایـەتی نەرمەسـاو و تیـژ بکـرێ. ئـەم سیاسـەتە تـا سـالی ١٩٢٦ پچڕ پچڕ درێـژەی کێشـا، بـەلام ناوچـەی (بـۆرە)ی لێـك هەلـەنگوتن و شەڕەقۆچان لە نێوان هەردوو خەنیمی باب کوشـتەدا، ویلایـەتی مووسـڵ (هـەندێ جـار شارەزوور)ی پڕلەنەوت و ناوچەیەکی لە ٩٠٪ زێـتر کوردنشـین بـوو و تورکیـاش ئامـادە نەبوو لە هێندەی بستێکی لێ خۆشبێ. یەکێ لە مەرجەکانی پەیمانی سیڤەر کە لەسالی ١٩٢٠دا مۆرکرا، بـەندی شـەش و حـەوتی بـە ڕاشکاوی مـافی دامـەزراندنی دەوڵـەتێکی کوردیی لـە ناوچـە کوردنشـینەکان (کوردسـتان)ی دەوڵـەتی عوسمـانی دا کـە ویلایـەتی موسڵیشی بەردەکەوت دەستنیشان دەکـرێ. لـە کـاتێکدا، لـە سـەرێکەوە حوکوومـەتی ئینگلیس ئاگری کوردایەتیی لە دژی خودی ئینگلیس خۆش دەکرد، لەوەش دڵنیـا بـوو کە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کوردایەتی دەیهەوێ لە عێراق جوودا بیتەوە، عێراقێ کـە بۆ بەرژەوەندیی خۆی دایمەزراندبوو

لەبەر ئەمە، بۆ پاراستنی ئەم بەرژەوەندییـەی خـۆی لـەدژی گەشـەکردن و تەنینـەوەی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد، ڕاوەستا. لە سالی ١٩٢٣دا ئینگلیـس لـە وتووێژەکـانی لۆزانـدا لـەو بـەڵێن و ڕاسـپاردانەی کـە بـۆ دامـەزراندنی دوو دەوڵـەتی ئەرمەنسـتان

وکوردستانی دابوون پاشگەزبۆوە. لەم بەڵگەنامەیەی پایینەوە هەڵوێستی ئینگلیس بە ئاشکرا دیارە:

" دیمەنی کێشەی کورد هەر بەتەواوەتی گۆڕا. ئێستا بیروبۆچوونی خودموختاری (دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان - ش. م) بە سەر چوو و بڕایەوە، هەڵوێستەکە لە کوردستاندا بەتەولوەتی گۆڕا.. سەبارەت بەوە کە دەوڵەتێکی کوردستانیی دۆست ( لە بەرژەندیی ئینگلیس) بێ کارێکی مەحاڵە. کارەکە لە بنەڕەتەوە گۆڕانی بەسەردا هات. ئیدی بەم جۆرە کۆسپ و تەگەرە لە پێش ئینگلیس گۆڕ کران و ئەوە بوو بەشێکی کوردستان بەم عێراقە سەریەکۆبەندەوە بەسترا. بەڵام کە وتوێژەکانی لۆزان چارویارە رادەوەستا و ئینگلیس تەنگاو دەبوو، دەنگی کورد دڵێردەبۆوە ( دیارە بەهاندانی ئینگلیسەکان) و بگرە و بەردە لە سەر چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ گەرم دەبۆوە، وەلێ کۆمەڵەی نەتەوەکان(عصبة الامم) ئاخیرییەکەی بڕیاری ئەوەی دا کەویلایەتی مووسڵ، بە مەرجێ کارمەندە کوردەکان لە دامودەزگای ڕەسمیی دەوڵەتی عێراق، لە کوردستاندا، لە بەڕێوەبردنی کاروباری دادگایەکان و پەروەرشت و فێرکردن و هتد .دا بە ڕسمی دامەزرێن و مافیان وەك مافی هەر هاوولاتییەکی عێراقی یەکسان بێت و ڕێز لە داوخوازییەکانیان بگیرێ و زمانی کوردی وەك زمانێکی ڕەسمیی دووەم لەو دامودەزگایانەدا بەکاربهێندرێ . لە ئاکامی دنە بە پەرەپێدانی زمانی کوردی لە قۆناغی یەکەمدا وەك لەو یاداشتەدا کە لە لایەن ئینگلیسەوە بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان نێردراوە، هەرچییەکی لەو بوارەدا سەرویەرنراوە بەرهەمی سیاسەتی پێشووەکەیە کە ئەو کاتە ئینگلیس کاری بە کورد هەبوو، بەلام پاش ساڕێژبوونەوەی برینەکانی نێوان هەردوو لای دەوڵەتی ئینگلیس و تورك، شتێك بە نێوی پشتیوانی لە نەتەوایەتیی کورد و زمانی کورد و فەرهەنگی کورد لە گۆڕێدا نەما و تۆ خۆش . کورد سەرەڕای وەی کە چەندین جار کۆمەڵەی نەتەوەکانی لە کارەکە ئاگادار کردەوە و ڕایگەیاندێ کە ئینگلیس و حوکوومەتی عێراق لە بەڵێن و ڕاسپاردەکانیان پاشگەزبوونەتەوە و هیچ شتێك لە بارەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەریەخۆی کوردستانەوە لە گۆڕێدا نەماوە.

ئیدی ئەوە بوو کارەکە بەلای ئەوەدا شکایەوە کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان بە خودموختارەییەکی هەر وا بەناو، (لە چوارچێوەی یەك پارچەیی خاکی عێراقدا کە قەد یەك پارچە نەبووە) کلکوگوێ کرا . ئینگلیسەکان لە سەرەتاوە بۆ خۆیان هانی کوردیان بۆ مافی نەتەوایەتیی خۆیان دەدا، سەر وەزیرانی حوکوومەتی عێراق لە وەڵامی داوخوازییەکانی شەش پەرلەمانتاری کورددا *لە ١٩٢٦دا "بۆ زێدە کردنی پوولێ بۆ خوێندن بە کوردی"* ، *"دامەزراندنی قەزا و ناوچەکانی سەر بە پارێزگایەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووك و مووسڵ"* ، *"دامەزراندنی دەزگایەکی گشتیی پشکنین وەك پێناو لە نێوان حوکوومەتی بەغدا و کوردستان"دا* و *"ئاوەدانکردنەوەی کوردستان"، "کاروباری خزمەت گوزاریە گشتییەکان زێدە کردن و پتر گەشە پێدانیان"* بەڵام *ئەم داخوازییانە* بە جوداخوازی لە قەڵەم دا و کوردەکە دەست لە نازانم چی درێژتر هیچی پێ نەبڕا. دیارە ئاغای سەر وەزیران، بێ ئینگلیس ئەم فەرمایشتەی هەروا لە خۆڕا نەدرکاندبوو، چ حەددی هەبوو بێ وان دەست بە ئاوێدا بکا. حوکوومەتی عێراق هەر لەوێ ڕۆژێوە لە ئینگلیسەکانی ڕاگەیاندبوو کە خوێندن دەعارەبێنێ و بەمە چ گوێ بە بەڵێنە دڵخۆشکەرەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکانیش هەر نادا. خودا هەڵناگرێ پەرلەمانتارە کوردەکان خۆ کردیان بە هەرا و لای ئاغای ئەدمۆنس گازندیان کرد، بەڵام لەپاش چی، لەپاش ترێ خەمشەی برێ.

ڕاستە زمانی کوردی لە کوردستانی عێراق بە یاسا و ڕێسا بوو بە زمانێکی ڕەسمی لێ بەلێ لە خوێندنی سەرەتایی و ڕادیۆ و یەك دوو گۆوارۆکە و کتێبۆکە بەولاوە نەچوو. لەپاش هەرای ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ بارودۆخەکە تا ئەندازەیەك لە بەرژەوەندیی زمانی کوردی گۆڕا، بە تایبەتی لە بواری ڕادیۆ و ڕۆژنامە و چاپەمەنیدا. بە ڕواڵەت کورد لە دەربڕین و بڵاوکردنەوەدا بە زمانی کوردی ئازاد بوو. خوێندنی کوردی کەمێ بە گەشە کەوت، دەزگایەکی گشتی بۆ لە بەغدایێ دامەزرا، بەڵام قاسم ئەم شەپۆلی ئازادییە و شەخسی مەلا مستەفای بارزانی ـ هەزار ڕەحمەت لە گۆڕە سادە و ساکارەکەی بێ ـ پاش ئەوەی لە ڕووسیا گەڕایەوە و کۆمۆنیستەکانی بۆ قووت نەچوو،

قاسم بۆ خۆی ئەفسەرێکی کوڕە هەژار بوو، پیاوێکی خراپ نەبوو، بەڵام لە سیاسەتی نەدەزانی. وردە ـ وردە لە کورد و زمانی کوردی و فەرهەنگی کوردی بە کنە کەوت، نەیهێشت کۆنگرەی مامۆستایانی کورد بە ڕەسمی لە بەغدایێ بگیرێ، لە ڕێکخراوە جەماوەری و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکانی کورد بە بڕوبیانووکەوت و کۆڕەپانەکەی بۆ هێزە نەتەوەگەرییە شۆفینی و فاشی و ئاینیە کۆنەپەرستەکان ئامادە کرد، مەیدانیان داگیر کرد ئیدی ئەوە بوو کارەکە بە کودەتا شوومەکەی ٨ی ڕەشەمێی ساڵی ١٩٦٣، بە کوژرانی قاسم و کوشتارێکی زۆری کۆمۆنیستەکان و کورد و ئینسانە دیموکراتەکان کۆتایی هات.

پاش ئەم کودەتایە بەعسییەکان دەگەڵ سەرکردەکانی کورددا دەستیان بە وتووێژ کرد، مەسەلەی مافی نەتەوایەتیی کورد دەگەڵ بەعسییەکاندا بە زۆر هەوراز و نشێودا ئەمسەر و ئەوسەری کرد و زۆر یاسا و ڕێسای لەمەڕ دەرچوو. بەڵام ئاخرییەکەی بە دەرچوونی یاسای خودموختارییەکی کە ڕژێم بەك لایەنە هەر بۆ خۆی بڕیاری بەڕێوەبردنی دا، زمانی کوردی بە پێی یاسایەکانی پێشووتر و یاسای نوێی خودموختارییەکە، بوو بە زمانی ڕەسمیی "ناوچەی خودموختاری/ کوردستان" و خوێندن بە زمانی کوردی شان بەشانی زمانی عەرەبی وەك زمانی دووەم، لە فێرگە سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و ئامۆژگایەکاندا وەسەرپێخرا. زانستگای سلێمانی لە شاری سلێمانی دامەزرا، لە کوللییەی ئەدەبیات و پەروەرشت بە زمانی کوردی دەرز دەگوترایەوە، کۆڕی زانیاری کورد، وەك پێشتریش گوتم، لە بەغدایێ دامەزرا، دەزگای بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندن بە کوردی دامەزرا، بەڕێوەبەرایەتییەکی گشتی بۆ فەرهەنگ و کەلەپوور بووژاندنەوە و لە چاپدان دامەزرا و هتد.. بەڵام بەعس لە ١٩٧٤دا وردە ـ وردە، لە هەمووی (وەك نێوەڕۆك) پاشگەزبۆوە، لە ١٩٧٩دا کۆڕی زانیاری کوردی لەبەر یەك هەڵوەشاندەوە، خوێندنی کوردیی لە کەرکووك و دهۆك و ئامێدی و ئاکرێ و زاخۆ و خانەقین و کفری و ناوچە کوردنشینەکانی پارێزگای دیالە بەتاڵ کردەوە، خۆلاسە دەستی بە عارەباندنی کورد کرد و ئەوەتا کارەکە ئێستا بەم قۆناخە

گەیشتووە کە تێیداین ئەمڕۆ ئەمریکایی و ئینگلیسەکان تەنها هەر باسی عێراق دەکەن، بەڵام دەبێ ئەوەش بزاندرێ کە کورد پاش دوازدە ساڵی ئازادی و فەرمانرەوایییەکی دوو تەوەرەکی زۆر چەتری سوێندخواران ئامادەییە لەدوای گەرمی بە یەکجاری چارەنووسی خۆنووسینی خۆی بێ دەنگ بێ، ئەمن بەش بەحاڵی خۆم بەجگە لە جیابوونەوەی کوردستان لە عێراقی عەرەب بەهیچ پینە و پەڕۆیەکی دیکە قایل نیم

خوێندەی بەڕێز نامەوێ باسی بارودۆخی زمانی کوردیتان لە کوردستانی ئێران بە درێژی بۆ بکەم، بەڵام هەر ئەوەندە دەڵێم، کە زمانی کوردی لەبەر ئەوەی دەگەڵ زمانی فارسیدا دەستەخوشکن، ڕژێمی جومهووریی ئیسلامی هەر چەند ئەویش هەر وەك عارەبەکە و تورکەکە ڕەفتار دەگەڵ زمانی کوردیدا دەکا، بەڵام ئەوڕۆ، لەوە دەچێ کەمێ بەری ئاوەلاتر کرابێتەوە، ئەویش نەك بە ڕەسمی، بەڵکو هەروا بە عورفی، خوێندەوارانی کورد ناوبەناو کۆوارۆکەیێ، کتێبۆکەیێ، بە زمانی کوردی بڵاودەکەنەوە. لە ڕادیۆ و تەلەفیزیۆنەکاندا بە شێوەکانی هەورامانی و سۆرانی و سنەییانە و کرماشانیانە و کرمانجیی باکوور، باسی ئەدەباتی کورد و کەلەپووری کورد و سیاسەت و چتهایەکی کە دە چوارچێوەی سیاسەت و بەرنامەی ئیسلامیدا ڕەچاو دەکرێ، بەکاردەهێندرێ.

دیارە پەرەساندن و پێشکەوتنی زمان دەگەڵ پێشکەوتنی فەرهەنگدا هاوسەروکارییەکی زۆر سفتوسۆڵی هەیە، ئەم پێشکەوتنەش لە هەموو قۆناغێکدا پێوەندیی بە هەموو ڕەهەند و بوارەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری، فەلسەفە، زانست، هونەر و هتد ەوە هەیە. خوێندەواری کورد تا پرپەپێستی قۆناخی مێژووییەی ئەوڕۆی دونیای نەك هەر مۆدێرنیزم و مۆدێرنیتە، بگرە پۆستمۆدێرنیزمیشەوە هێشتا لە چوارچێوەی لە سەتا ڕێژەیەکی هەرە کەمیشدا زۆر لە کاروان بەجێ ماوە.

دەیجا بابزانین فەرهەنگ (ڕۆشنبیری) بۆ خۆی چ قوماشێکە؟ مرۆڤێکی سەرەتاییی سەروبەندی بەرد، کە بۆ یەکەم جار لە تاو گوشاری ناچاری بیری لە دامێنانی سەرەڕەمبێ لە دار، لە هێسك، لە بەرد کردۆتەوە، ئەو بیرکردنەوەیەی بە بەشێ لە

فەرهەنگی مەعنەوی و سەرڕەمبەکە بە بەشێ لە داهێنانی فەرهەنگی ماددی لەقەڵەم دەدرێن. دیارە بە دەم هەست بە ناچاریی دابینکردنی پێویستییەکانی ڕۆژانەی ژیانەوە مرۆڤ وا لێ دەکا کە بیر لە چارەسەری جێ بە جێ کردنی پێداویستییەکانی ژیان بکاتەوە. ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی خۆی کە پێشەکی لە چتی بەرهەست لە مێشکیدا ڕەنگی داوەتەوە و پەنگی خواردۆتەوە، ئامێرەکان دادەهێنێ. کەواتا: فەرهەنگ بەو بەها ماددی و مەعنەوییانەی کە بە درێژاییی مێژوو کۆمەڵی مرۆڤ ڕەنێوی هێناون و سوودی لێ وەگیرکەوتوون و لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەی دواڕۆژی بۆ ماونەوە ـ خەستتری بێژم، جوێ کردنەوەی فەرهەنگی ماددی (ئامێرەکان، ئەزموونگەلێ کە بە دەم ڕەنێوهێنانەوە دەردەست کراون و دەوڵەمەندییە ماددییەکانی دیکە) لە فەرهەنگی مەعنەوی (زانست، هونەر و ئەدەبیات، فەلسەفە، ئاکارناسی و پەروەرشت و هتد..) تەنها سەر چتێکی لەباوە، دەنا فەرهەنگی ماددیش و مەعنەوییش وەک دوو ڕووی مێدالێکن.

فەرهەنگ دیاردەیەکی مێژووییەیە، واتە: لە ناکاو و کوتوپڕ پەیدا نابێ بەڵکو بە درێژاییی ڕۆژگار کەڵەکە دەبێ و تا دێ جۆخینی قەبەتر و بە بارستتر دەبێ. ئەوەی پەرەی پێ دەستێنێ و وەگەشەی دێخی، سەرکەوتنە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانە. ئەوانەی بنەمای ماددیی فەرهەنگ بە ماددی نازانن و پێیان وایە ئەوە بەهرەیەکی مەعنەوییە و تەنها خەڵاتی "مەلوژێردە"یە و لە کەمایەتییەکی مێندەی پەنجەکانی دەستدا خەست دەبێتەوە، ئایدیالیستانە بیردەکەنەوە، بەڵام فەلسەفەی ماتیریالیزم بەرهەمە ماددییەکان بە بنەما و سەرچاوەی بەرهەمە مەعنەوییەکان دەزانێ و دەڵێ: فەرهەنگ بەرهەمی کاری جەماوەرە [1]. فەرهەنگی مەعنەوی لە بنەڕەتدا، وێڕای

(١) دیارە کاری جەماوەریش لە هەر هەوارگەیەکی کۆمەڵایەتیدا ئاستێکی ڕێژەکیی پرەپێستی خۆی هەیە لە ولاتێکی وەک یۆنانستانی کەنارادا کە زەویوزاری بۆ کشتوکاڵ لەباری نییە، دەبینی لە قۆناخی بەردەگیدا، زانست و هونەر و فەلسەفە گەشەی کردووە، چونکە سەرلەبەری خۆشگوزەرانیی ئەو ولاتە لە تالان و بڕۆی هتمەکانی دەوروبەری دەردەست دەکرا، کەچی لە ڕۆژهەڵاتی سیستەم تەرزی ئاسیاییی ڕەنێوهێناندا،

وەی کە لە هەلومەرجی مادیدا دێتە گۆڕێ، لەبەر گۆڕانی فەرهەنگی مادی، هەر وا ئوتوماتیکانە و لە خۆڕا ، ناگۆڕێ. ئەم بارودۆخە خەسیەتی فەرهەنگ، واتە: ئەوە پیشان دەدا کە ڕێژەیەکی سەربەخۆی هەیە، لەگەشەکردن و گۆڕاندا هەمیشە بەردەوامە و ڕاناوەستێ و لە ڕووی گەلانی دیکەدا ئاوەڵاو سەروەتاکە و هتد .. لە کۆمەڵێکی چین لەسەر چیندا، لە نیگای نێوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی و کردەنییەوە سیفەتێکی چینایەتیی زەقی پێوە دیارە. لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا سەرجەمی فەرهەنگی نەتەوەیی، دەبێ بە دوو فەرهەنگ: فەرهەنگی بۆرجوای فەرمانفەرما و دەسەڵات بە دەستی هەر خۆی حسێو و فەرهەنگی ئەو پێکهێنە دیموکراسی و سۆسیالانەی جەماوەرانێ کە لە ژێر ڕکێفی بۆرجوادا بە باری ئەم گەشەکردن، یان ئەو گەشەکردنەدا خۆیان دەنوێنن. ئەمە ئەوە پیشان دەدا کە دەبێ جودلوازی لە نێوان فەرهەنگی " کۆمەڵی بۆرجوا" و "فەرهەنگی بۆرجوا"دا بکەین. فەرهەنگی سۆسیالیزم کە دەمراستی تۆمەریی قازانجە پێشکەوتووەکانی ڕابردووە؛ چ لە ڕووی ئایدلۆژی چ لە ڕووی وەزیفەوە، لە فەرهەنگی مۆدێرنی بۆرجوازی جوێ دەبێتەوە. فەرهەنگی سۆسیالیستی بەبێ شۆڕشی سۆسیالیستی، نایەتە گۆڕێ، یەکێ لە پێکهێنەکانی شۆڕشی سۆسیالیستی، شۆڕشی فەرهەنگە. نیشانە و سیفەتەکانی فەرهەنگی سۆسیالیستی، ئەمانەن: *دەگەڵ خەلکدا پێوەندیی توند و تۆڵ دامەزراندن، بیروبارەڕی سۆسیالیستانە، جیهانبینییەکی زانستانە، مرۆڤدۆستی سۆسیالیستانە، گیانی*

---

زەویوزاری زۆروزەوەند و بەپیت هەبووە، بەڵام ئامێرەکانی کشتوکاڵ لە نزمترین ئاستی تەکنیکیدا بوون. زۆر جاران، کەسانی لە سۆسیالیزم داخ لەدڵ دەڵێن جەماوەری بەستەزمانی نەخوێندەواری پاشکەوتوو چۆن دەتوانێ دەوڵەت بەڕێوەبەرێ و فەرهەنگ و شارستانی بێنێتەگۆڕێ؟ دیارە ئەم کەسانە دەوڵەت و فەرهەنگ و شارستانییەتێکە کە لەژێر فەرمانفەرمایی چینی هەلوژێردەدا پێشنیهادی دەکەن و ئەم چینی هەلوژێردەیش لە بوونەترین حاڵدا لە ئەرستووی ڕەگەزپەرست کە پێی وابووە، خودا و خۆرسک سەرلەبەری نەتەوەکانی سەر دنیایێ لە بەر چاوی کاڵی یۆنانییان دروست کردوون، باشتر بیر ناکەنەوە. ئەرستێکم هەبووە پێی وابوو، تەنها هەلوژێردە مافی فەرمانفەرمایی هەس، ئەودوای ئومەتەکە وەك گوێدرێژ و گاوگۆتاڵ واسان و هیچیان تێدابەستە نییە و هەر بەو جۆرەش دەمێننەوە

*هەرەوەزی (کۆلیکتیفیزم)، نیشتمان پەروەریی سۆسیالیستانە، ئومەمیەت.* بەلام بەداخەوە ئەمانە زۆریان نە لە ئەزموونە حەفتا سالییەکەی سۆڤیەت و نە لە هینەکەی ئەورووپای ڕۆژهەلات و نە لە ئەوەکەی چین و کۆریا و کووبا و ڤیتنامدا وەك بەدیارکەوت سەریان نەگرت . هەڵەکە لە چدا بوو؟ لە لینین و ستالین و ماو و هتد حیزبەکانیان یان لە ناوەرۆکی فەلسەفەی مارکسییەتدا بوو؟ من پێم وایە مارکسییەت هەرچەندە، هەروەك مارکس خۆی دەڵێ، بیروبۆچوونەکەی دەبێ بە کردەوە و پراکتیس ڕاستیی خۆی ئیسپات بکا.. ئەو نەهاتووە لە سەتا سەت هەرچی دیاردە کۆمەلایەتییە ـ ئابوورییەکانی لەوەتەی دنیای مرۆڤ هاتۆتە گۆڕێ، سەرلەبەر تاوتوو بکا و هەڵیان سەنگێنێ ( چونکە ئەمە تەمەنی، وەك دەڵێن، نووحی گەرەکە)، بەڵکو تەنیا چەند دیاردەیەکی بە نموونە لێوەکۆڵیون و ئەنجامەکانی فەلسەفەکەی لێ بە (استقراء) هەڵێنجاون و (ئەمەش بێ گومان ڕەنگە بەشی هەموو چتێ نەکا و فریای هەموو بابەتێکی دوا ڕۆژی دوور و نزیك نەکەوێ) و نابێ هەرچی فەرموویەتی، بەویەڕی ڕێزەوە، نەخشی سەر بەرد بێ؛ چونکە بیروبڕوا کوڕی ڕۆژگاری خۆیەسی و چتێ نییە هەرگیز نەگۆڕێ و بێ کەڵك نەکەوێ و ژیان یەکسەر، یان بە شێنەیی فتی نەکا

توینبی و شپینگلەر، لە ناکامی گۆیا دووبارەبوونەوەی هێندێ ڕووداو و دیاردەی مێژوودا، وایان بیرکردۆتەوە کە فەرهەنگ بریتییە لە دووبارە بوونەوەی مێژوو. ئەمانە بڕوایان بە پێشکەوتن و گۆڕان و گەشەکردنی مارپێچانە(حەلەزوونی) spiral in development نییە، گۆڕانکارییەکە لەم جغزاندا دەخولێتەوە، واتە خولێ کە زۆر پێش دەکەوێ (بەلام بەکێهە پێوانە؟) دەبینی بەرابەرەکەی بە هەمان ئەندازە لە خولی دواییشدا، پاش دەکەوێ (دیسان بەکێهە پێوانە؟) و هەر وابووە و هەروادەبێ گۆیا ئیمپراتۆریی ڕۆما بە لوتکە (کام لوتکە؟) گەیشت، کەچی بەجۆرێ بەرەو هەڵدێر سەرەمەقولاتی دا، کە بە ڕیشی بابیدا ڕیا. ئیمپراتۆریی عوسمانی بە جۆرێ شاخ و باڵی کردبوو حەفتا و دوو نەتەوەی گۆیا ئالقەلەگوێی وی پێیان وابوو لە وانەیە بۆ مانگ و ئەستێرەکان هەلکشێ (ئەدی نابینی تا ئەوڕۆش مانگ و ئەستێرەکەی لە نێو گۆماوی خوێنی تالان و بڕۆ و چەپاوی نەتەوەکاندا دەچریسکێنەوە، کە

چی ئینگلیس ئەوەی بە سەری هێنا یا بەسەر دەواری شڕی نەهێنا. ئەم جۆرە فەلسەفەیە لە ناکامی قەیرانی ڕێبازێکی بەراوردکاریی مێژووییەوە‌ڕا هاتە گۆڕێ، لە بیروبۆچوونێکی ئایدیالیستی بۆ خۆ لەو قەیرانە قوربازکردنە هاتە گۆڕێ. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بیروبڕوای ڕەخنەگەری critisim و ڕەخنەگەری ڕیالیزم (Critic Realism) زۆر لەباو بوو، بەڵام بیروبڕوایەکانی هەموو بەلای فاشیزمدا شکانەوە..

بەش بەحاڵی سۆسیالیزم، پرسی هەڵچنی لە بەرنامە و پراکتیکی هەرکارێکدا لە کۆمەڵی سۆسیالیزمدا بە ڕەخنە و ڕەخنەی خۆی critic and otocritic چارەسەردەکرێ . تەنانەت سەرلەبەری پارت وڕێکخراوە سیاسییەکانی ولاتانی ژێر ڕژێمی ئیمپریالیستیش و ولاتانی بورجوازیی نیشتمانییش ئەم ڕێبازی ڕەخنە و ڕەخنەی خۆییانە بۆ هەڵەچنی بەکاردەهێنن. بەڵام ئەگەر ڕەخنە بە مانای جیاکردنەوەی ئەرێنی (ایجابی) و نەرێنی ( سلبی) بیەکان بێ باشە دەنا، نابێ ڕەخنە هەر بۆ ڕەخنە بێ، بەڵکو دەبێ ڕەخنە بۆ چارەسەری هەڵەکان بێ، کەچی کەم وابووە و کەم وایە کە ڕەخنە بەم مانایە بەکارهێنرابێ و بەکاربهێندرێ.

هیچ نەتەوەیێ نییە خاوەنی فەرهەنگێ نەبێ، بەش بەحاڵی نەتەوەی کورد وێڕای ئەوەی خێوی دەوڵەتێکی مەرکەزی نەبووە، بەڵام کە لە نموونەکانی فەرهەنگی ماددی و مەعنەویی دەکۆڵییەوە (فولکلۆری دەستکرد، فولکلۆری زارگۆتی، شیعری نووسراوی کۆن، شیعری نوێی ئەمڕۆ و هتد..) لەمبۆت بەدیاردەکەوێ کە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا تا ڕادەیەك بەشداریی خۆی کردووە .

بە لای منەوە، بە پێچەوانەی بیرمەندانی ڕەشبینی کوردەوە، هونەری بەدیعییانەی نالی، جزیری، مەحوی کە لە شیعرەکانیاندا بەکاریان هێناون لە بەهرەی هیچ شاعیرێکی فارس، یان عەرەب ئەگەر سەرووتر نەبن پایین تر نین. ئەو شاکارە گەورەیەی کە ئەحمەدی خانیی ئەمر لە داستانیمەم و زیندا ئەنجامی داوە لە شاکارەکانی گەنجەوی و شێکسپیر کەمتر نییە. کورد موزیکی تایبەتیی جۆراوجۆر و فۆلکلۆری میللیی خۆی هەیە، شیرەی مێشکی داهێنانەی وەکو ئەبوسوعوودی عیمادی، شارەزووری ، مەولانا خالید، ئیبن ئادەم و هتد بەکوردی و فارسی و عەرەبی نیشانەی ئەوەن کە کوردیش لە نێو مێژوودا diachronical ژیاوە و

نەورۆش شاعیرە نوێخوازەکانمان کەم تا زۆرێ هاوشانی مێژوو cynchronism هەنگاویان هەڵێناوە . سەماو هەڵپەرکێی جۆراوجۆری میللیی خۆی هەیە، تەز و شێوەی جلوبەرگی ژنان و پیاوانی تایبەتیی خۆی هەیە و هتد نەخێر، کورد دە نێو جەنگەی مێژووش و شان بە شانی مێژووش هەنگاوی هەڵێناوە، ئاوزەمانیشە و هاوزەمانیشە.

لەبارەی زارەکانی زمانی کوردییەوە، هەر ئەوندە دەڵێم کە توانیویە بەش بە حاڵی خۆی لە پاراستنی واژەکان (مفردات)ی خۆیدا مەردانە، زاڵ و سەرکەوتوو بێ. زۆر کەم بەر کاریگەریی عەرەبی و فارسی و تورکی کەوتووە. یەك لە نیشانەکانی زیندووبوونی ئەم زمانە، بە ڕای من و زۆر لە زانایانی دیکەش، ئەوەیە کە ئەم حەمکە زارانەی لێ کەوتوونەوە.

زمانی کوردی کاتێ لە زمانە ئێرانییەکان دابڕاوە، بە دەیان زانا و پسپۆڕی زمان شایەتیی ئەوەی بۆ دەدەن، کە ـ هەرچەندە ئازادیی سیاسیی لێ پاوان کراوە ـ وەسەر ڕێگای پەرەساندن و گەشەکردنی خۆڕسکی خۆی کەوتووە. زانایان: شەرەفخانی بتلیسی، لێرخ، ئۆسکارمان، موولڵەر، ئەدمۆنس، سۆن، گ. گیرڤینلی، ف. ڕۆدیگەر، ئا. ف. پۆت، دیتەل ئابۆڤیان، بەرزین، خاچاتور ئابۆڤیان، زیا گۆگ ئالپ، جەمال نەبەز، ئەوڕحمانی حاجی مارف، عەلائەددین سەججادی، کەمال فوئاد، ئەمیر حەسەن پوور، مەسعوود محەمەد و میهرداد ئیزەدی و هتد هەموو شایەتیی بۆ دەدەن.

*زمان لەبنەڕەتدا چۆن پەرەدەستێنێ؟ وەختێ ئامێرێکی ماددی کە بۆ خۆت دروستی دەکەی بە نموونە: ئامێرەکانی ئاشی ئاو، یەکسەر بە زمانەکەی خۆت ئێویان لێ دەنێی.. مار، دەستاڕ، تۆڵاش، زەمبوورە، بستە، تەوەرە، تۆڵیان، چەقەنە، پێ، بیژان، تۆپەوانە، پەرە و . و . دیکە سەرلەبەر کورد بۆ خۆی ناویناون. بەڵام ڕادیۆ، تەلەفیزیۆن، تومبیل، مەکینە، ئەلەکتریك، گلۆپ، ڤیدیۆ و هەزاران چتی دیکە بمانەوێ و نەمانەوێ وەك هەر چتێکی کە سەروکاری بە ژیانەوە هەیە و ناتوانی خۆتی لێ گێل و نەبان کەی، هاتۆتە نێو زمانەکەتەوە و تازە زمان بەدەرکردنیان کارێکی زۆر نابەجێیە. بە نموونە: تا ئێوارە "کەرێن" بۆ تومبیل، "لێتەوڕ" بۆ فەرانێن، "ڕاگر" بۆ*

عەمید   و   . بلێی کەس بە گوێت ناکا، چونکە جارێکی دیکەشی دووبارە دەکەمەوە، ڕەنگە بلەرزەوی ئەدی زمانەکەمان کوو پێش بخەین؟ بلێین کە تەلەفزیۆن پەیدادەبێ تۆ دەبێ ناوی لێ بنێی. جا هەر چتێکی تازە پەیدا دەبێ تۆ ناچاری ناوی لێ بنێی. مرۆڤ هەر وای کردووە، هە چتێکی دروست کردووە یا دۆزیوەتەوە، ناوێکی لێ ناوە. ئەم شتانەن کە زمان دروست دەکەن. کەوا بوو تا پێشکەوتن زیاتر بێ، ناوەکانیش زۆرتر دەبن، مانا زیاتر دەبن، کە ماناش زیاتر بوون زاراوەکان زیاتر دەبن. بەڵام ئەگەر هات و ژیان هەر لە ناوچەیەکدا قەتیس مایەوە، ئەوە چەپکێك واژەی کە هەر خۆیان دووبارە دەکەنەوە و هیچی دیکە.. واتە: شتی تازەت دەردەست نابێ بەڵام ئەگەر سنوورت بۆ خۆت دانەنا و پەل و پێت بۆ شتی دیکەش هاویشت و دەستت دایە پیشەسازی و بازرگانی، ئاقمێك شتی تازەت دەبێت کە واژە و زاراوەی تازەیان دەوێ. ئێمە ئەگەر نەتوانین ئامرازی بەرهەم هێنان بگۆڕین بەو شێوەیەی کە لە ئەورووپادا هەیە، دەبێ هەروا ڕابوەستین. ئەوەتە ئێمە چتەکانی ئەورووپا هەر بەناوەکانی ئەوانەوە پەسند دەکەین. وەك تەلەفزیۆن، ڕادیۆ، و تەلەفۆن.. بۆچی؟ چونکە ئێمە خۆمان بەو ڕادەیە پێش نەکەوتووین کە ببینە خێوی پیشەسازی و بۆ خۆمان چتێك دروست بکەین و ناوی خۆمانەی لێ بنێین. ئێستا بمانەوێ و نەمانەوێ بەرەو سەرمایەداری دەڕۆین. چەمکی نەتەوایەتی و خەستوخۆڵ بوونەوەی هوشیاریی نەتەوەیی لەوەدایە کە ئینسان وردە ـ وردە بەرەو سەرمایەداری دەڕوا، یانی لە عەشیرەتگەری دوورەدەکەوێتەوە. ئەوانە بەرە ـ بەرە بەرەو ڕووخان دەڕۆن، بازاڕ بەرەو سەنعەت و کشتوکاڵی پێشکەوتوو دەچێ. کەوابوو تۆ لەنێوان دوو چتدای، یان دەبێ ئەو هەموو واژە و زاراوانەی ئەورووپا قەبووڵ بکەی، یان دەبێ بیکەی بە کوردی. چونکە ناچاری، ئەگەر وا نەکەی زمانەکەت لە ژێر ئەو هەموو واژانەی دیتراونەوە لە نێو دەچێ. بۆ نموونە: فارسی وایە. تۆ سەیری ڕۆژنامە یا نووسراوی شاعیرەکان، یان سەیری شانامە بکە کە فیردەوسی بە فارسییەکی ڕووت و پەتیی داڕشتووە. هەر لەبەر ئەوەشە کە شانامە بووەتە قورئان و ئینجیلی زمانی فارسی. ئێمەی کورد بینایەکی فەرهەنگی و فکریمان

هەیە. جاریَ ئامرازی بەرهەمهێنانەکەمان ئەوهایە، بە زۆر ناتوانین بیگۆڕین. ئەوەش بەو مانایە نییە کە هەر دانیشین و زمانەکەمان پێش نەخەین، واژەی نویَ دروست نەکەین زاراوە دانەهێنین. نەخێر ئێمە دەستمان پیَ کردووە. هەر بیرکردنەوە لە دامەزراندنی کۆڕی زانیاریی کورد لە کوردستان، بۆ خۆی ئەوە دەردەبڕیَ کە هەست بەوە دەکەین نابیَ رابوەستین.

لەلایەکەوە نابیَ دژی واژە و زاراوە بیانییەکانی کە جێگای خۆیان لە زمانی ئێمەدا کردۆتەوە بوەستین. واتە: دەبیَ تەلەفیزیۆن و تەراکتۆر و هەموو ئامرازی تەکنەلۆژیای ئەمڕۆی ئەورووپا پەسند کەین، یانی دەبیَ ئێمە تەنیا هەر پشت بەو واژە فۆلکلۆرییانەمان نەبەستین کە لە زمانەکەماندا هەن. لە لایەکی دیکەوە دەبیَ بە زمانەکەی خۆشمان زاراوەی پڕبەباڵای چەمك و مانایەکان دابنێین. ئەدی ئەوە نییە زانکۆمان کردۆتەوە و هەموو زانستەکانی تێدا دەخوێندرێن. ئێمە ناچارین زمانی دەرمانزانی و کیمیا و میکانیك و زانستەکانی دیکەمان هەبیَ و لەگەڵیدا بڕۆین. راستە بنەما ماسییەکەمان هێشتا پێش نەکەوتووە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە دانیشین و هیچ کارێك نەکەین و واز لە زاراوەکانی ئەو زانستانە بێنین و بڵێین قەیدی نییە، با بە ئینگلیسی یان عەرەبی بن.

من پێم وایە گەشەکردنەکە بەدەستە من و تۆ نییە و چتێکی ناچارییە، بەو مانایە یاسای گەشەکردنی کۆمەڵ ناچارت دەکا. کاتیَ پێویستیت بە تەلەفیزیۆن بوو، دەبیَ ناویشت بۆ هەبیَ. بۆچی ئەوان هەیان بیَ و ئێمە نەمان بیَ، ئەدی ئێمەش میللەت نین؟ کورد بیر لەوە دەکاتەوە بۆچی زمانەکەی لاوازە، بۆیە ناچارە پەلە بکا. ئەویش وشیاریی نەتەوەییی هەیە، کوردایەتییەکەی بە جۆش هاتووە، هەست بە خۆبەکەمزانی دەکا. ئەگەر وەك ئەورووپاییەك، یان تورکێك، عەرەبێك، فارسێك زمانەکەی خۆی پێش نەئێخی. کاتیَ وشیارییە نەتەوەییەکەی زیادیکرد، ئەوسا هەست بەوەش دەکا کە دەبیَ زاراوە و واژەشی هەبن تا زمانەکەی پێش کەویَ. گەرەکمە بێژم ئەوە چی وای لیَ دەکا؟ بۆ نموونە: وەختیَ پێشمەرگەی سلێمانی و هەڵەبجە و کەرکووك و

چەمچەماڵ و کۆیێ و دهۆك و زاخۆ و هتد. لە زۆر جێگادا یەکیان دەگرت، بەیان لەوە نەدەکردەوە هەموویان فێری چ زارێ ببن، هەموویان هەر بە زاری سۆرانی دەدوان. هەروا زۆر خەڵکی سۆرانی گەرمیانیش فێری کرمانجی بوون. لەوەشدا پەیوەندییەکە ناچارت دەکا فێر ببی. بەڵام پرسیارەکە ئەوە بوو کامیان ببن بە ستاندارد؟ جارێ ئەوە سۆرانی لە هەولێر و سلێمانی و کەرکووك ستانداردە. ناوچەی بادینانیش دەیەوێ کرمانجی هەر بێ. گرفتەکە سیاسی نییە، لەرەنگییە، واتە کوردێکی دهۆکی کە زمانەکەی خۆی دەوێ، ئەوە خواستێکی سیاسی نییە. ئەویش وشیاریی نەتەوەیی هەیە، بەڵام لە کەناڵێکی دیکەوە، ئەویش خۆی بە کورد دەزانێ. چونکە وایە، ئێمە دەتوانین بەرنامەی بۆ دابنێین. جا چەند سەردەکەوین، ئەوە توانست و لێزانیی دەوێ.

لەلای هەندێ تاقم و پرۆژەی ناوخەڵکدا کارەکە زۆر روونە و خەڵکێ لەو باوەڕەدایە کەوا بەرەوپێش دەچین و توانایش هەیە. خەڵك گەشبینە، باش دەنوارێتە دواڕۆژ، تەپ و تۆزی ئەملا و ئەولا کار ناکاتە کاری کورد. جارێ وا لە بەعسی فاشیست رزگارمان بوو، دەبێ لەگەڵ ئەمریکا و ئینگلیسدا خەریك بین قەناعەتیان پێ بکەین کە ئێمە عیراقی نین، بەڵکو نەتەوەیەکی جوداوزین، ئەمڕۆ لە عەرەب و تورك و و فارس جودا نابینەوە، لە دواڕۆژدا بۆ خۆیان ناچار دەبن یارمەتیی جودابوونەوەمان بدەن کێشەکەمان پێش دەکەوێ. گۆڕان گرینگە، ئەو سەرکردایەتییەی ئێمەش کە دەبێ جڵەوی کارەکە زیرەکانە راکێشێ: ئەو توانایییە چکۆلەیەش کە هەمانە، دەبێ بزانێ چلۆن چۆنی بە رەوابوونی دە مێشکی خەڵك بێخی و وەگەڕی بێخی.

وەك لەوەوپێش ئاماژەم بۆ کرد، بنەمای زمان لەسەر دوو کۆڵەکە رادەوەستێ: واژەی فەرهەنگی و رستە. لە گەوهەر و یاسا گشتییەکانی زمانی کوردیدا دەگەڵ زارە هەرە سەرەکییەکانماندا تێکەڵ دەبنەوە. زمانیش لە رێگای تێکەڵبوونی واژە و زاراوە و رستەکانەوە دەوڵەمەند دەبێ. سەیری عەرەبی بکە، خۆ هەر تەنیا واژەگەل نییە بەڵکو رستەشە و هەموو پێکەوە کاریان تێ کردووە. پێغەمبەر زۆر جار دەریبڕینی وای لە

ڕستەدا بەکارهێناوە کە ستاندارد نییە. ئێمە دەتوانین هەر دوو زاری: باشووری و باکووری بە شێوەیەک، بە تایبەتی لە واژەدا تێکەڵ بکەین کە نە سەت لە سەت وەک سۆرانی بچێ و نە سەت لە سەتیش وەک کرمانجی بچێ. بۆ نموونە: ئەوەی کە تۆزێ زەحمەت بێ ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ، وەک لە پێشتریێ بە نموونە ئاماژەم بۆیان کرد لە کرمانجیدا کاری ڕابردووی تێپەڕیووی ڕاناوگەل وەردەگرێ کە لەگەڵ موزاریعی ڕابردوو و ڕانەبردوو و کاری ڕابردووی تێنەپەڕدا نایەنەوە. خۆ ئێمە واژە و زاراوەمان لە فارسی، عەرەبی، تورکی وەرگرتووە، ئەی بۆچی لە زارەکانی خۆمان، وەک بادینانی، گۆرانی، لوڕی، لەکی، کەلوڕی، زازایی و هتد وەرنەگرین؟ ئێمە دەڵێین: ناکرێ دەرکە لە ڕووی هیچ جتێ پێوەدەین. جیهانیش و فارسیش و تورکیش و ئینگلیسیش و هتدیش هەر وا دەڵێن. هەندێک دەڵێن "پەژمووردە"، کە لە فارسیمان وەرگرتووە. کەچی وشەی ـ "سیس" و "سیسەڵ" و "سیس هەڵاتوو" لە زمانی خۆماندا هەیە. ئەمەش مانای وایە واژە لە زمانێکی دووریشەوە دەپەڕێتە ناو زمانەکەوە نەمازا زارێکی خودی زمانەکە. ئێستاش زۆر واژە و واژەگەل لە لوڕی و کرمانجی و هاتوونە نێو سۆرانی و لە سۆرانی کەوتووتە نێو کرمانجیی باکوورەوە و هەروا بە پێچەوانەشەوە. تەنانەت لە تورکیشەوە هاتوونە نێو زمانی کوردییەوە. مەسەلەکە پێ ڕاهاتنە.

کەواتا: زەوینە بۆ تێکەڵ بوون هەیە، بەڵام بە مەرجێ ئەم لێکدابڕانە نەمێنێ. ئێمە بە لە برپە وگرێبییەوە تێکەڵی یەکدی ببین هەولێر بۆ دهۆک، بۆ سلێمانی و سنە و دیاربەکر، برۆین و بە ئازادی، کۆر و کۆبوونەوەی هاویەش بگێڕین و پڕۆژەی گەورە ـ گەورەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و هونەری بەڕێ بخەین و تێکەڵ بکرێین، بە تایبەتی لە بواری سیاسیدا حوکوومەتی کوردستان دەبێ بە بەرنامە و پرۆگرام کاریان لە سەر بکا تا خەڵکەکە وەریبگرێ، پێم وایە لەم قۆناخەی ئەمڕۆماندا کەم تا کورتێ دەکرێ ڕێگا بۆ ئەمە هەموار بکرێ. لێرەدا مەسەلە کوردایەتی کردنەکەیە کە هەموو حیزبەکان شاقەلیان بۆ لێ هەڵکردووە.. هەموومان وەک جۆگەلە و ڕووبار دەڕژێینە نێو

دەریایەکەوە کە کوردایەتییەکەیە. بەڵام ئایا ئەو سیاسەتە ـ هەرچەند فەرهەنگ و سیاسەت لێکدی جیاناکرێنەوە ـ تاچەند گرنگیی بە کاری فەرهەنگ داوە، یان دەدا؟ دەبێ بزانین کە فەرهەنگ و سیاسەت دوو ڕووی ڕاستییەکن، نەک بە دوو چتی لێکدی بێ ئاگان. کاری ڕۆشنبیری تۆ دەکاتە ئەو ئینسانە کە بزانی ڕەوتی مێژوو ڕووی لە کوێیە؟ لە چ بارێکدایە. ئەگەر میللەتێ زانیاریی کۆمەڵناسی و مێژووناسی و فەلسەفەی نەبێ، نابێتە هیچ. سەرکردەیەکی سیاسی ئەگەر زانا بێ، گەلێ سەرکەوتووتر دەبێ، قسەی زیاتر دەڕوا و کاریگەریی لە بزووتنەوەی سیاسیدا بەکارتر دەبێ. تەنیا هەر سیاسەتی ڕووتی بێ بیری دیالێکتیکی، بێ زەمینەی فەرهەنگی، ڕەنگە کورت بێنێ و پشووی کورت بێ. ئەگەر سەرکردە پێی وابێ تەنها هەر سیاسەت ـ بە مانای تەقلیدی ـ ڕێگا بۆ فەرهەنگ خۆش دەکا، ئەوە ڕەنگە دەسەڵاتێکی زیرەکیش بیر لەوە بکاتەوە کە چۆن زەمینە بۆ فەرهەنگ فەراهەم بکا، بەڵام ئەگەر هات و وەزیرێ یا سەرۆکی دەوڵەتێ بۆ خۆی ڕووناکبیر نەبوو، سیاسەت و فەرهەنگی بە دوو دیوی جەدەلیی ڕاستی نەزانی، ڕەنگە بە جۆرێکی دیکە سەیری کاری فەرهەنگ بکا.. بەڵام من کە ئەوە دەڵێم سیاسەت (حوکوومەتێکی دەسترۆ) و فەرهەنگ دوو چتی لێک جوداواز نین، ئەوانە یەک لە یەکدی کاردەکەن، بە مەرجێ گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری، شۆڕشێکی یان بۆرجوازیی نیشتمانی پێشکەوتووی (بازرگانی و پیشەسازی) لە قۆناخی یەکەمدا، یان شۆڕشێکی سۆسیالیستانە بۆ قۆناخی دوارۆژ، ڕەچاوبکرێ.

کۆڕی زانیاری کورد هەندێ کاری کردووە، ڕاستە.. بەڵام دەتوانم بڵێم کۆڕی زانیاری تورکیا یا ئێران یا ئەو وڵاتانەی کە حوکوومەتیان هەیە، ڕەنگە ئەوەندەی ئێمە کاریان بۆ زمانەکەیان نەکردبێ؟! . ئەوان کە دەوڵەتیشیان هەن، هێشتا نەیانتوانیوە لەسەتدا ڕێژەیەکی زۆرتری زمانەکەیان بکەنە ستاندارد، یا خاوێنی بکەنەوە. دەبینی ئێران ڕێژەیەکی زۆر وشەگەلی عەرەبیی بەکاردێنێ. باشە ئەوە چییە کە ئێمە زیاترمان کردووە و ئەوان کەمتر؟ ئەوان لە قۆناغی نەتەوەیی تێپەڕ بووگن، کەری خۆیان بەستۆتەوە، ئەوان دەوڵەتیان هەیە و بڕاوەتەوە. ئیدی ئەو سۆکی و نازانم چییە مەلەوزەیان نەماوە

بڵێین ئێمە دەبێ نەتەوەمان وا بێ و دەوڵەتمان وا بێ. ئەو ترس و لەرز و دوودڵییەیان لە کۆڵ بۆتەوە: دڵخۆ واژەیەك کە دزەی کردۆتە نێو زمانەکەیانەوە، فارسی، عەرەبی یان ئینگلیسییە. ئەوان سوود لەو واژانە وەردەگرن و بەخزمەتکاری زمانەکەی خۆیانی دەزانن.

کۆڕی زانیاری کورد لەم مەلومەرجەی ئێستادا کاری زۆری پێدەکرێ و دەتوانێ دەوری بەرچاوی هەبێ. ئێستا دەبێ چەندین لێژنە دابنێ، تا هەموو زاراوەکانی کوردی بەتایبەت لە حەفتاکانەوە کە خوێندن بە کوردی زێتر پەرەی ساندووە، لەناو هەرچی کتێب و گۆڤارەکاندا هەن، بەسەر بکاتەوە، کۆیان بکاتەوە و لێیان وەتوێژێ. ئەو کارەش خەرمانێکی لێ پێك دێ، دەبێ ئەو خەرمانە گێرە و شەن و کەو بکرێ.

ئەو دوو بەشە فەرهەنگەی کە لە پێشترێ دیاریمان بۆ کردن بە پێی قۆناغەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵ دەوڵەمەند دەبن. بۆ نموونە: لەسەردەمی بەردە و ئاغادا فەرهەنگ هەبووە. لە زەمانی ئەفسانەشدا هەر هەبووە، لە زەمانی جادووشدا هەر هەبووە و لە زەمانی ئینتەرنێتیشدا هەر هەیە. ئەمانە هەموویان قۆناغن.. لە هەر قۆناغەشدا فەرهەنگ بۆ خۆی شکڵێکی دیکە وەردەگرێ. ئەوجا، با بزانین فەرهەنگی ئێستامان لەگەڵ قۆناغەکەماندا جووت و پڕبەباڵایە؟ لەگەڵ خودی خۆمان و هەروەها لەگەڵ جیهانیشدا جووتە؟ ئێمە لە وڵاتی خۆماندا وەکو چتێکی خودی کورد دین، بەڵام بۆ پەیوەندیمان لەگەڵ دنیای دەرەوەدا شتێکی دیکەین. بۆ نموونە: تۆ کە بۆ ئەورووپا دەچی، هەوڵ دەدەی جلەکانت بگۆڕی، هەندێ چت هەن بیان گۆڕی. ئەوجا سەفەر دەکەی. بەڵام کە وەدەگەڕێیە هەولێر، هەموو ئەو چتانە لەبیردەکەی. ئەمە مانای وایە کە ئێمە لە حاڵەتێکی بیانێك و دوو هەواییدا دەژین. لە هەر کۆمەڵێکی چینایەتیشدا چەندین جۆرە ڕووناکبیر هەن. هی وا هەیە پێی عەیبە سەگی خۆش بوێ، یان جلی کوردی لەبەر دابێ و سەری ڕووت بێ. هی وا هەیە دەبێ هەمیشە بچێتە زیارەت و خولاسەی کەلام، بمانەوێ و نەمانەوێ ئەمڕۆ لە نێوان دوو فەرهەنگ داین: یەکێکیان مەعنەوییە و ئەوی دیکەیان ماددییە. ئەوجا دەبێ بزانین کە کێههە لەو دوو فەرهەنگە

وەڵامدەرەوەی نیازەکانی ئێمەیە، لەمەڕلەو ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە، کامیان پێشەنگە؟ ئەو فەرهەنگە کە مەسەلە زانستی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و زمانییەکان چارەسەر دەکا، ئەوە پێشەنگە. ئێمە دەبێ توانایی لێك جیاکردنەوەی فەرهەنگی خواسایمان هەبێ. بۆ نموونە: لەم ڕۆژگارەدا کوردایەتی یەکێکە لە ڕەهەندەکانی سەردەلەتەرەکەی فەرهەنگی ئەمڕۆی گەلی کورد. تیۆرلنینی زانستی، بە تایبەتی زانستی، وەك لە پەرلییەوە گوتم، ماندی هەموو شتێ بۆ سەرەتای دروستبوونی چت دەباتەوە و پێی وایە هەموو چتێك مێژوویەکی هەیە و لە خانەیەکی چکۆلەی کاتییەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە ئەو شکڵ و شێوەیەی کە ئەمڕۆ، بۆ خۆی مێژوویەکی هەیە. هەر چتێ بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕ دەبێ و لە هەر قۆناغێکیدا شکڵەکەی ڕەنگدەرەوەی ئاستی تێوەرۆکێکی کۆنکرێتە و ئەویش دەگەڵ پێناوەکانی ڕەنتیوهێنان و و پێوەندییەکانی ڕەنتیوهێنان و هێزەکانی ڕەنتیوهێناندا هاوسەروکارە. ئێمە ڕەنگە هەر بە مەزەندە و بۆچوون سەرەتایەکانی زمان ساوسە بکەین و بزانین لەکەیەوە دەستی پێ کردووە؟ ئەگەر بە پێی ئەو بیروبڕوا ماتمییە بێ، دەبێ زمان وەك زانستمەندی سۆڤیەتی، و. بووداك دەڵێ، کە وردە ـ وردە ئەزموونی ڕەنتیوهێنان خەست دەبێتەوە و کەرووە لە سای باری بەسەر بوو پێوە ڕاوەستانی مەبوونە ئاماڵ مۆرییەکان و کەم بوونەوەی بارستی کاژێری، کامل دەبێ، زمان لە ئاماژەکانی دەنگانیی ئەم ئینسانانە نێتەکۆڕێ. لەم جۆرە زمانانەدا ژمارەی واژەکان تا ئەندازەیێ کەمە، یان بە وردی بڵێم، لە ڕستەکەل یەکبڕکەیی و کتوپچر و مانا جیاجیایەکان نێتە کۆڕێ[٢]. بەڕاستی تا ئەوڕۆش هیچ بیروبۆچوونێکی بێ کێشە لە هەر ساختمانی زمانەکانی ئینسانی سەرەتاییمان بە دەستەوە نییە. ئەوەی کە لە ئەنجامی لێوەکۆڵینی وردە و زۆر

---

(٢)بە پێی تیۆریی ئەکادیمی N.YA. Marr کە لێکدانەوەیەکی هەڵەئامێزی لەمەڕ پەیدا بوونی زمان بە دەستەوەداوە و دێرزەمانێ شاباڵی بەسەر دنیای زانستی سۆڤیەتدا شۆڕکردبۆوە، دەیگوت: ئاخاوتن(وتار) لە ورتە ـ ورتی ڕەمڵ لێدەران (کاهینان)ەوە چەکەرەی کردووە. لەم ڕووەوە، هەر لە تەواوە، خەسیەتی چینایەتیی لەبەرکردووە، ئەمە زۆر هەڵەیە.

بە پشوو بۆ زانایان دەرکەوتووە زمان دیاردەیەکە لەسەرەخۆ پەیدابووە و تەمەنێکی درێژی لەمێژینەی هەیە و چتێ نییە هەر لە خۆڕا بەم شێوە پێشکەوتووە و بەربڵاوە پەیدا بووبێ. زمانی ئەمڕۆ نیشانەی پێشکەوتنی عەقڵی ئینسانە، ماقووڵ نییە ئینسان لە نێوان دە تا بیست هەزار ساڵ لەوەبەپێش، ئەوەندەی ئێستا عاقڵ و مەنتیقی بووبێ تا زمانەکەشی بەم جۆرەی ئەمڕۆ بووبێ. مادام مرۆڤ بونەوەرێکی لەمێژینەیە، زمانەکەشی هەر لەمێژینەیە. مادام سەردەمانێ ژیانی سەرەتاییی هەبووە زمانەکەشی هەر سەرەتایی بووە.

جا زمان وەکو ئامرازێکی تێگەیشتن و هۆیەکی لێک حاڵی بوون (دووبارەی دەکەمەوە) بە بێ کۆمەڵگا نابێ. ناکرێ مرۆڤێك بە تاقی تەنیا، لەهیچ قۆناغێکدا بتوانێ زمانێك دروست بکا. کە دەڵێین زمان، یانی تاکەکان لەناو کۆمەڵدا پێکەوە دەژین و سەروکاریان پێکەوە هەیە و هاوپێوەندن، ئەو پێوەندییانەش پێش هەموو چتێك پێوەندیی کار و بەرهەمهێنانە. بەرهەمهێنانیش شێوازی خۆی هەیە، لە دەنگ و پیت و واژە و ڕستەدا ڕەنگ دەداتەوە و چتێك دروست دەکا کە لەگەڵ کار و بەرهەمهێنانەکەدا ڕێك بێت و یەك بگرنەوە، ئەویش هەمان زمانە کە بەپێی ئەو قۆناغە و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و نیاز و پێوەندییەکانی دیکەی سەردەمەکە دروست دەبێ.

ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ، بەسێ قۆناغی شارستانیدا تێپەڕیوین. هەر ئەو پێوەندییانەی بەرهەمهێنان کە لە ڕۆژگارێکی زۆر دووردا لە کوردستان، کە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ئابووری و ڕاوەشکار و کۆچەری و شوانکارەیی و کشتوکاڵدا ژیاوە، سێ ڕەهەندی بنەڕەتی زمانی کوردی بۆ پێکەوەناوین. پاشان کۆمەڵگەیەکی دیکەش هەیە کە پێی دەڵێین شار (پێشمان پیشەگەری نێو قەڵایەکان، پاشان چەرچییەتی، دواتر دوکانداری و سنووری بەرتەسکی قەڵا بەزاندن و فراوان بوونەوەی شار بە دەوری قەڵادا) کە لە ڕووی سەرمایەداری و پێوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدای ناوەڵاکردووە و پیشەسازی هەیە. ئەمە هەرسێ قۆناغە شارستانییە کۆنەکان و قۆناغە نوێیەکەی ئێمەیە و زمانەکەمان دەبێ هەڵسوکەوت لەگەڵ هەموو قۆناغەکەدا

زێتر بکا. وڵتە: لەگەڵ کەلەپوور و (فۆلکلۆر)یشدا: چونکە لە ویشدا کە بوارێکی کۆنترە زمان هەیە و ئێمە پێویستیمان بەوەش هەیە، لەوەدا، دەمانەوێ خاوەنی هەموو ئاڵقەکانی مێژووی خۆمان بین، دەبێ ئاڵقەکانی ئەو زنجیرەمان بە تەواوەتی هەبن. لەبەر ئەوە پێویستیمان بە زمانی ئوستوورە و ئەفسانە و پیش هەیە. ئەوجا با هەندێک لەوانە بابەتی عەنتیکەخانە بن و بەکاری ئەمڕۆمان نەیەن، بەڵام بۆ زانینی مێژووی خۆمان هەر پێویستن.لێبەڵ بمانەوێ و نەمانەوێ زمانێکی نوێ و دەسکەلا کە لەگەڵ تەنانەت پۆستمۆدێرنیزمیشدا ـ بە مانای پێگەیشتنی چینی بەرهەمهێنی پێشکەوتوو ـ ڕەفتار بکا، هەر دێتە کۆڕێ.

کارەکە بە زۆرەملێ و کرچوکاڵی سەر ناگرێ، زمان لە خۆڕا (تلقائی) پەیدا دەبێ. زمان لە قۆناخەکانی پێشوودا لە خۆڕا هاتووەتە کۆڕێ. ناچاریی بەرهەمهێنان، کار و کۆمەڵ هێناویەتیە کۆڕێ. بەڵام وەنەبێ ئینسانەکانیش دەوریان تێدا نەگێڕابێ ـ ئەتۆ هەروا بنۆڕە منداڵێ کو زمانی زگماکی دایکی فێر دەبێ دەبینین بێ ئەوەی بەخۆ بزانێ، وردە ـ وردە فێر دەبێ. فێربوون لەو قۆناخانەدا، فێربوونی زمانی ئاخاوتن، وەک گوتم فەرایەند ( پرۆسێس)ێکی لە خۆڕایە، وەلێ زمانی خوێندن و نووسین زمانی فەرهەنگی تۆمار کراوە، چتێکی دیکەیە. ئەوەی بە نێوی زمانی دەسکەلا (ستاندارد)ی لەمەڕ دلخێون، زمانی فەرهەنگە. ئەم زمانە زمانی خوێندەوارانە. خوێندەوار لە سازکردنیدا ـ نەک لە زمانی گوفتار بەدەر ـ دەور دەگێڕێ، شاعیرەکان، هونەرمەندەکان، زانایان، فەیلەسوفان و دانایان، داستان سەرایان، ئەندازیاران، بژیشکان، تەکنیسیۆنەکان و هتد زمانی فەرهەنگی دەسکەلا ساز دەکەن. بەڵنەکینێ، یان لەنێو مێژوودا diachronic (قالبی مەییوی مێژوو) یان شان بە شانی مێژوو، هاوزەمانیدا cyncheonism (قالب شکێنی)، بە هەردوو بارەکەدا، کار دەکرێ.

هۆکارەکانی دابەشبوونی زمان، نەک هەر بەش بە حاڵی زمانی کوردی، بگرە بۆ هەموو زمانەکان، جوغرافی، ئابووری، سیاسی، دیرۆکی و هتد . چونیەکن.

. حەزدەکەم لیستێکتان بە ناوی زمانانی دنیا و قەڵەمڕەوی هەر زارێ لە زارە کوردییەکانتان لێرەدا عەرزی خزمەت کەم:

**بنەماڵەکانی زمان**

١ـ زمانە هیند ـ ئەوروپاییەکان

٢ـ زمانە ئورال ـ ئاڵتاییەکان

أ ـ ئورالی

أ.١ـ چلیفینی

فینی

مەجەری

پەرمی

أ.٢ـ چلی سۆمۆئید

سۆمۆئیدی و زمانانی سەر بە وی

ب ـ لقی ئاڵتایی

زمانە تورکییەکان

زمانی ماڵچوو ـ تونگوز

مۆنگولی

٣ـ زمانانی چینی و تبەتی

چینی

ژاپۆنی

تیبەتی

بورمایی

٤ ـ زمانە سامییەکان

عەرەبی

عیبرانی

٥ ـ زمانەکانی بانتوو

زمانەکانی ئەفریقای ناوین و ڕۆژهەڵات

سەواحیلی

زمانی زوولوو

٦ـ زمانانی ئیبەر ـ قەفقاسی

أ ـ کارتۆفیلی، گورجی

بـ ئەبخاز ـ ئەدیگەی

ئەبخازی

ئەدیگەیی

قەبەرتایی ـ چەرکەزی

جـ ـ ناخی: چەچانی، ئینگوشی

دـ داغستانی

٧ـ زمانانی ئەمڕۆی ئاسیایی: زمانانی ڕۆژهەڵاتی باشووریی ئاسیا و ئەفریقای باکووری بەربەری

٨ـ زمانانی ئاسیا ـ پاسیفیك و ئاوسترالیا

٩ـ زمانانی ئەمریکای باشووری:

زمانانی ناوخۆی ئەمەریکای ناوین و زمانانی کۆمەڵانی خەڵکی لێرەوارەکانی ئەمەزۆن

زمانەکانی هیند ـ ئەورووپایی

١ـ لقی ئاسیا (هیند ـ ئێرانی)

أـ زمانانی هیند ـ سانسکریتی

نوردوویی

زمانی ڕۆمانس

هیندی

بەنگالی

ب ـ زمانە ئێرانییەکان

ب. ١ـ زمانەکانی ئێرانیی ڕۆژهەڵات

فارسی

تاجیکی

ئەفغانی

ئاڤێستایی

پەشتوونی

ب. ٢ـ زمانانی ئێرانی ڕۆژاوایی (بە ئیسکیتییەوە)

زمانانی باکووری ئێران (لە ئیسکیتیی کۆنەوە سەریان هەڵداوە)

ئۆسیتی

تاتی

ب. ٣ـ زمانانی ڕۆژاوای باکووری (بڕوانە نەخشەی دابەشبوونەکان لە پایینەوە)

زمانیکوردی

زمانان (زارەکان)ی کوردی لە مێزۆپۆتامیا و لە ڕۆژهەڵاتی وی، لە جوغرافیایەکی پان و بەریندا

جـ ـ زمانی ئەرمەنیانی

ئەنادۆڵی (هیتیت)

تۆقاری

٢ ـ لقی ئەورووپا

أ ـ زمانی باڵتیکۆ ـ سلاڤیانی

أ ١ ـ باڵتیکی

پرۆسیایی یان کیهانی

لیتوانی

لاتفییانی

سلاڤیانی

ڕۆژهەلات

ڕووسی

بێلەڕووسی

ئۆکراینی

ڕۆژاوا

لەهیانی (پۆلۆنیایی)

سلۆڤاکیانی

چیکیانی

باشوور

سلۆڤینیانی

سربی و کرواتی (کرویشی)

بولغاری

ب - زمانە جەرمانییەکان

باکوور

ئیرلاندیانی

نۆروێجیانی

ئیسوێچیانی (سویدیانی)

دانیمارکیانی

ڕۆژاوا

ئینگلیسی

فریزی

دۆیچی

فەلەمەنگیانی

ئەفریقانی

بیدانی

ئەڵمانیایی (سەروو / ژووروو)

ڕۆژهەلات

جـ ـ زمانانی کەلتی

گزیدەلیایی ـ گزیدەلیاییی ئیرلند

بەریتانیایی

کۆرنیانی

گالیانی (غالیانی)

د ـ زمانانی ئیتالیایی (زمانە لاتینییەکان)

پۆرتەگیزیانی (پورتگیشیانی)

ئیسپانیۆلی

کەتەلۆنیانی

پرۆڤانسیانی

فەرەنسزی

ڕۆمانیایی

هـ ـ زمانانی هیلینی (گریکی)

و ـ ئەرناووتی

دابەشبوونی زمانەکان بەسەر گۆی زەویندا

زمانە سەرەکییەکان و زمانە پلەدووەمەکان بە میلیۆن

چینی 1,230

ینگلیسی 470

ئیسپانیۆلی 327

ڕووسی 288

بەنگالیانی 235

عەرەبی 235

پۆرتەکیزیانی 181

ژاپۆنیانی 128

فەرەنسزی 124

ئەڵمانیای 121

دابەشبوونی کرمانجی (کوردی)

أ- کرمانجیی باکوور (بادینانی - بۆتانی)

أ ١ ـ عەفرینی

لە مەرعەش، مەلاتیە، سەمسوور، سرووج، خەلفەتی و بیرەجگ

أ ٢ ـ ڕەوندی

لە قەرس، ئاگری، ئەرزەڕۆم، وان و باشقەڵا

أ ٣ - شکاکی

لە نێوان ورمێ ، شەمدینان و باشقەڵا

أ ٤ - هەکاری

لە هەکاری و ئیرناخ

أ ٥ - بۆتانی

لە ناوچەی جزیر - بۆتان

أ ٦ - بادینی

لە زاخۆ، ئامێدی، ئاکرێ، زێبار و دهۆك

أ ٧ - سنجاری

چیایەکانی سنجار و شێخان

أ ٨ - سلیڤی، کیکی، میللی

ڕۆژهەلاتی دیاربەکر (ئامەد) لە ئەلعەزیز، لە ڕۆژهەلاتی چۆمی فرات و ڕۆژئاوای ماردین

ب ـ کرمانجیی باشوور

ئەو شوێنانەی کە لە نێوان مەلاير، کرماشان، قەسری شیرین و کوردستانی باشووردا دەمێننەوە

أ ۱ ـ سلێمانیانی (بابانی)

سلێمانی، کەرکووك، کفری، قەرەتەپە، تووز شوان و لە چەند شوێنێکی لای خانەقین

ب ۲ـ موکریانی

لە شنۆ، نەغەدە، میاندواو، شاهیندژ، سەقز، بۆکان، بانە و سەردەشت

ب ۳ـ سنەییانە

سنە، بیجار، کەنگاوەر و ڕەوانسەر و دەوروبەری

ب ٤ ـ ئەردەلانی

ناوچەی ئەردەلان

ب ٥ ـ گەرمیانی

جـ ـ بن زارەکانی کرمانجی

خانەقین

لوڕی (فەیلی)

ئێلامی

کرماشانی

لەکی

کەلهوڕی

کولگایەیی (کولیایی)

فەرەوەندی (زاری دیکەش)

دابەشبوونی سۆرانی

هەولێر و دەوروبەری

دابەشبوونی گۆرانی

لەو بەشەی کە دەکەوێتە باکووری دەشتی بەغدا - کرماشان؛ ڕۆژهەلآت و ڕۆژاوای چیایەکانی هەورامان: ڕۆژهەلآت و ڕۆژاوای مووسلّ و لە پاوە و کەندوولە

أ- هەورامانی

لە ناوچەی هەورامان؛ لە بەشی سەرووی بەستەکەی شیروان

ب - باجەلآنی

لە ناو زەنگنە و شەبەك، ڕۆژهەلآتی مووسلّ

و- گەهوارەیی

دابەشبوونی زازایی (دملی)

أ- زازاییی باکوور

أ ١- ڕۆژهەلآتی باکووری

لە سەرەوە؛ لە ڕۆژهەلآتی ئەرزەڕۆمەوە تا باکووری مووش، لە دەڤەری خۆراسان و ڤارتۆ

لە خوارەوە؛ لە قۆزلۆق، ساسۆن و موتکی (زازاییی موتکی)

أ ٢- زازاییی ڕۆژاوای باکووری

لە بەشی ڕۆژاوای ئەرزەڕۆم

أ ٣- زازاییی دێرسیم - سۆبی

أ ٤ - زازاییی باکووری

ب - زازاییی باشووری

ب ١ - زازاییی بینگۆل

لە خەرپووت، چەپاخچوور، چەولگ، لیجە و قولّپ

ب ٢- زازاییی مەرداس

لە پالّوو، ئێگیل، باکوری دیجلە و ئەرغەنی

ب٣- زازاییی سیوەرەك

له سیوه‌ره‌ك، چه‌رمگ، گه‌رگه‌ر، ئالدووش و شانگووش و هێندێ ناوچه‌ی ئاییه‌مان و مه‌لاتیه

هه‌ر وا به‌ده‌م باسی پێوه‌ندیی ده‌وڵه‌مه‌ندكردنی زمانی كوردی به‌ ده‌وڵه‌مه‌ندكردنی فه‌رهه‌نگه‌وه‌، قسه‌كه‌مان به‌لای زاراوه‌ڕانانه‌وه‌ ده‌شكێته‌وه‌: زانایانی به‌ ڕه‌گه‌ز و بنه‌چه‌كه‌ كورد و تورك و فارس و سوریانی و ئارامی و هیندی و هتد.. ده‌ بواری زاراوه‌ڕۆناندا، گاڵه‌یان كردووه‌. ئه‌وانه‌ هه‌روا نه‌هاتوون له‌ خۆڕا مل له‌و كاره‌ بنێن، به‌ڵكو له‌ ده‌ستوور و یاسا و ڕێسای به‌ریتانی خۆیان نواڕییه‌ و چه‌ندین ڕێسای سه‌ر به‌ زمانی عه‌ره‌بییان پشكنییوه‌ و ئه‌وی له‌ باربووه‌، هه‌ڵیان هێنجاوه‌ و له‌ سه‌ر ئه‌و ڕێسا و یاسا خۆماڵییانه‌ زاراوه‌یان ڕۆناوه‌ و داڕشتووه‌. فه‌رموو ئێمه‌، كوردی هه‌ژار چه‌ندمان زاراوه‌ بۆ ئه‌م لێشاوه‌ زانستانه‌ ده‌سته‌به‌ر كردووه‌، كه‌ ژماره‌یان له‌ ١٤٤ زانست زێتر تێ په‌ڕیوه‌.

زاراوه‌ڕانان، هه‌ر وه‌كو له‌ به‌راییه‌وه‌ گوتم، به‌وه‌ ده‌گوترێ كه‌ ده‌سته‌یێ، تاخمێ، برێ، گرۆیێ، تیره‌یه‌كی تایبه‌ت بێن له‌سه‌ر دانان و به‌كارهێنانی واژه‌یه‌ك ڕێك كه‌ون (أقرب الموارد) ، یا به‌ عورف، به‌ به‌ندوباو له‌سه‌ر شتێ بۆ دیاری كردنی مانا و واژه‌یێ، غه‌یری ئه‌و مانایه‌ی كه‌ ده‌ بنیچه‌دا بۆی داندراوه‌، ڕێك كه‌ون (مؤيد الفضلاء)، یا واژه‌یێ كه‌ كۆمه‌ڵێ بۆ خۆی مانایه‌كی، غه‌یری مانای ئه‌سڵی و مانای بۆ داندراوی وی، دای نابێ (ناظم الأطبّاء)، یا واژه‌یێ كه‌ له‌ نێوان تیره‌یێ له‌ نه‌ته‌وه‌یه‌ك، مانایه‌كی بڕیارله‌سه‌ردراوی، ببه‌خشێ، یا به‌ره‌یێ بێ له‌ زانستێك، هونه‌رێكدا له‌ دانانی واژه‌یێ بۆ مانایه‌كی تایبه‌ت به‌و زانسته‌ یا هونه‌ره‌، ده‌گه‌ڵ یه‌كدیدا ڕێك كه‌ون، كه‌ ئه‌و واژه‌یه‌، ده‌ زماندا مانایه‌كه‌ی ئه‌وه‌یه‌ و ده‌و زانسته‌دا شتێكی دیكه‌یه‌. خاوه‌نی كه‌ششاف ده‌فه‌رموێ: عورفی تایبه‌ت ئه‌وه‌یه‌ كه‌ خه‌ڵكێ بێن ناوێ، پاش ڕاگوێزتنی له‌ مانا كۆنه‌كه‌یه‌وه‌، بۆ مانایه‌كی نرت و نوێ به‌كاربێنن، یا پێوه‌ندیی دوو شتان، چ له‌ گشت و تایبه‌ت و چ له‌ هاوبه‌شی و چ له‌ وێكچووندا، دووه‌میان به‌ مانایه‌كی تایبه‌تی یه‌كه‌میان به‌كاربه‌رێ (تعريفات)، ئه‌مه‌ش هه‌ر مه‌جازی خواستنه‌وه‌ و مه‌جازی ئه‌قڵی ده‌گرێته‌وه‌:

ئەگەر پیاو سەروساختی خزمایەتیی واژەکان لە دەلالەت کردندا بناسێتەوە، وەك پێوەندیی "سەبەب و موسەببەب"، "مەکان و مەکین" رابردوو و ئاییندە"، "جوزئییەت و کوللییەت"، لازمییەت و مەلزوومییەت، ئالییەت، گشت و تایبەت، رابردوو و ئاییندە، رەگەز، بری و پەی ئامەد، خوێشاوەندی، سیفەت و مەوسووف، موزاف و موزاف ئیلەیهی، رێزلێنان، دراوسێتی، دووفاقی، غالبییەت و وێکچوون، یا جۆری کینایەت (مێتافۆرە) ەکان، ئیدیۆمەکان بە وردی دەرك بکا، بۆ زاراوە سازی دانامێنێ.، بەلام کاتێ خوێندەواری زمانێ لە زمانەکان وە بن لێشاو و گوتاوەرێی زوانێکی دیکەوە دکەوێ و مچێز و سەلیقەی دەشێوێ، یان دەژاکێ، دیارە زەینی زمانە خۆرسکەکەی خۆی کوێر دەبێ و دەستەپاچە و مچرۆ و موزمەحیل دادەنیشێ و وەك کوردی دەسخەرۆی لە هەردوو جێژنەکەی لی بەسەر دێ. زاراوەدانان کاری هەر کەسێ نییە و دەبێ لەو زانستانەدا کە زاراوەیان بۆ دادەنێ مەلەوانی چا بێ.. خۆ کارەکە بەوەندە پێك نایە کە هەر بابایەك هات گوتی ـ هەر لەبەر هێندێ سمێلی سوورە ـ هەمزاغایە. ئەبو تاهیری مەجدی فەیرووزابادی کە بە رەگەز ئێرانی نەژادە، جارێکیان لە جەنگەی هەڵپە و لە دووی واژەی عەرەبی گەڕاندا، بە عارەبە زنێ، لە جیاتیی وەی، "أطفئي السِّراج" بێژێ دەفەرموێ : "اقتلي السِّراج.. " ئەمە چ دەگەیەنێ، کەسی مامی؟ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەوەی زاراوە لە زمانێکدا دادەنێ، ئەگەر بە زگماك زمانەکە زمانی خۆی بێ، چتێکە و ئەگەر نی خۆی نەبێ چتێکی دیکەیە.. فەیرووزابادی وێڕای ئەو هەموو لێزانی و ئاشقەزمانی عەرەبییەی، کەچی هەر زمانی زگماکی مادەرزادی بە سەر زاریدا زالّ بوو. جارێکیان ئەم پرسیارەم لە مامۆستای بەهەشتیم مامۆستا مستەفا جەوادی بە رەگەز کوردی خەڵکی لای خالس، کە لە کوللییەی شەریعەت مامۆستای مێژوومان بوو، پرسی: فەرمووی فەیرووزابادی، رەگەزی دیار نییە، فارس بە ئی خۆیانی دەزانن. چونکە، زێتر کوردی و هێندێ و فارسیزوانی لە کوردزوانەوە تزیك دەڵێن: "چراغ را بکش"، هەروەها فەرهەنگە فارسییەکانیش (فەرهەنگی د. م. معین "کشتن" ی بە مانای کوژاندنەوە نووسیوە.

بۆ پێناسەکردنی زاراوە، زۆری بە باریکان و بە قەویان لەسەر ڕێسراوە: خواجا نەسیروددینی تووسی - کە زۆری ڕك لە کورد دەبۆوە - دە پاشکۆی ناوەلێکچووەکاندا، پوختەی فەرمایشتەکانی ئەوەیە کە واژە دە مانای ئەسڵی خۆدا و هاوچوونیەکیدا بەکار ببرێ باشە. بەڵام بە ڕەچاوکردنی مانا ئەسڵییەکەی، بە مەرجێ ئەو ویکچوون و هاوخزمایەتییەی کە دە ئەسڵەکەدا هەن، لە کاتی گوتن و نووسیندا ڕەچاو نەکرێ، ئەمەش بە دوو بەشەوە دەکرێ: یەکەمیان ئەوەیە کە لێچوو لە دەربڕیندا، دەگەڵ پێچوو (ئەسڵ)ەکەدا یەکسان بێ و بەمە دەگوترێ "نێوی ڕاگوێزتە"، وەك بەکاربردنی واژەی "مانگ" هەر لە سەرەتارا و بە ئەسڵ، بە مانای تۆپەڵ (جیرم)ی ئاسمانی و بە ڕاگوێزتن و ئەریەتی، بە مانای مەودایەکی تایەن داندراوە. هەروەها بە مانای هاوێنەش بەکاردەبرێ. هەروەها واژەی (عدل) ی عەرەبی بە مانای داد، کە ناوی مانایە و بە مانای دادگەر (عادل)، کە سیفەتی کاراییە بۆ موبالەغە، بەکار دەبرێ. هەروەها "ئاوڕشێن" لە کوردیدا، بۆ دوو سیفەتی لێك دووفاق: سیفەتی بەرکاری و سیفەتی کارایی، بەکاردەبرێ، بەو ئامێرەی کە ئاوپرژێنی پێ دەکرێ (ئاوپرژ = آب پاش) و بەو شوێنەش کە ئاوڕشێن دەکرێ، هەر ئاوڕشێن دەگوترێ. هەروەها بە مانای مەسدەرییەتیش دەکاریەستراوە، واتە: ئاوڕشێن کردن دیارە لە مانای دووەمدا، لەگەڵ فیعلی "کردن"دا، دەبێ بە "ئاوڕشێن کراو"، کەچی کورد هەر بۆ خۆی بۆ ئەو چتەی کە دەی ڕێژێ، لە قسەیەکی نەستەقدا، "ئاوڕێژ" ی گوتووە، نەك ئاوڕشێن. "نە کورت و نە درێژ کۆڵەمست و ئاوڕێژ".. واژەی "باوەشێن" و "تێلاترێن" یش هەر لەو بابەتەن.. دووەمیان ئەوەیە، کە لێچوو پتر بەسەر پێچوودا زاڵ بێ و کە گوتت و درکاندت، پێچووت بە درەنگەوە بە بیر بێتەوە. ئەمەش دوو جۆرە: یەکەمیان بەکارهێنانی لە ڕوانگەی زۆرینەوە، بەمە دەگوترێ (باو - عورف)، وەك: دەست بە ئاوگەیاندن دە ئەسڵدا بە مانای بۆ داندراوی خۆی کە دەست بە ئاو شوشتنە و بە عورفی مەجاز بە مانای پیسایی کردن و تارات گرتن و خۆ پاکژ کرنەوەیە. دووەمیان ئەوەیە کە بەکارهێنانەکە لە لایەن تاخمێکی تایبەکاری زانستێ، هونەرێکەوە بێتە

گۆڕێ. بەمە دەگوترێ زاراوە (مصطلح). موستەلەح واتە: مەردمەکە لەسەر ئەوە ڕێك بکەفن کە واژەیەك لە مانایەکەوە وەگوێزێ لەبۆ مانایەکی دیکە و ئەو واژەیە بۆ ئەو مانایە وە خاس (صالح) بزانێ، مانای (اصطلح علیە) دە بنیچەدا، واتە: بە چاك زانین. وەك: بەکارهێنانی واژەی (قدیم) ی عەرەبی، بە مانای کۆنە دە بنیچەدا و بە مانای ئەوە کە هەر لە سەرەتاڕا هەبووە، بە زاراوەی فەلسەفە و کەلام. ئێوە لێچووەکان دەبن بە سێ پاژەوە: یەکیان ئەوەیە کە ئەسڵەکە لە دریرپیندا زووتر و گورجتر بە بیردا دێ و دە زەینداا زێتر خۆش باوە و ئەمەش مەجاز و خواستنەوەیە. دووەم ئەوەیە کە لێچوو زووتر و خێراتر بە بیردا دێ و ئەویان دە زەیندا زاڵترە. بەمەش دەگوترێ "لەباوی گشت و زاراوە = عورفی عام و مصطلح". سێیەم ئەوەهێیە کە ئەسڵ و فەرع دە بیرهاتنەوەدا، هەرتك یەکسان بن و بەمەش ڕاگوێزتنی پووت و پەتی دەگوترێ.

بە ڕاستی، زاراوە ناسی، ئەو زانستەیە کە دەپەرژێتە زاراوەکان و لێوەکۆڵین و وردکردنەوە. گاتفرێد شووتز، پرۆفیسۆری زمانی ئەڵمانیایی (١٧٤٧ - ١٨٣٢) یەکەم کەسێ بوو کە ئەم زاراوەیەی بەکاربرد. زاراوەکە پاش مەودایێ ڕێی کەوتە نێو زمانی ئینگلیسییەوە و بە مانای (پێڕستی نێوان) بەکاربرا. پاشان دەڵێیە نێو زمانی فەرەنسزییەوە و پاشترێ، جلکی بەکارهێنانێکی جیهانیی دەبەر کرد. لە فەرهەنگە هەمە جۆرەکاندا، پێناسەی زۆر و زەوەند بۆ تێرمینۆلۆژی (زاراوە ناسی و زاراوە) دەردەست کراون. تەنانەت وەختە بکارم بێژم، هێند زۆرن لە ژماردن بەدەرن.: "کۆمەڵە زاراوەگەلی هونەری سەر بە یەك زانست، یا هونەر و چەمکەکانی سەر بەوی" (فەرهەنگی زانستان، زاراوەگەلی ئەدەبیات و هونەری ڕەنگ کاری، یا واژەیەك کە دە زانستەکان، هونەرەکان) دا بەکار دەبرێن. (فەرهەنگی وێبستەر)،١. کۆمەڵە واژە گەلی هونەریی سەر بە یەك زانست ، لێوەکۆڵین، یا گرزیەك لە لێوەکۆڵان . ٢. لێوەکۆڵینی سیستەمی زاراوە، یا واژە و ناوێتەگەلی تایبەت، کە لەبۆ نێو لە چەمکی تایبەتینان بەکاردەبرێن و هەروەها لە بنەما هەمووانەکییەکانی سەر بەم لێوەکۆڵین و لێوەتۆژینە، بەکاردەبرێن. (فەرهەنگۆکی ڕوویێر)، بە ڕەچاوکردنی پێناسەگەلێك کە فەرهەنگە

جۆراوجۆرەکانی زاراوەسازی بە دەستەوەیان داوین و بەم ڕوونکردنەوەیە کە بە پێناسەی ئەم زانستە لە قەڵەم دراوە، یەکجار هەموانەکی بەرچاو دەکەوێ، دەتواندرێ پێناسەیەکی ورد و گردەبڕ لەمەڕ زاراوەناسی دەردەست کرێ: لە نێونانی چەمکەکانی سەر بە ڕشتەکانی پسپۆرەکیدا، هەڵبەتە برێ واژە و ئاوێتەگەل کە گرۆیێ لە خەڵك، یا تەنانەت تاکە کەسێکیش بە کاری دەبەن، هەر زاراوە دەگوترێ. جا، بەم پێناسەیە، دەبێ زاراوە بە هاوواتا vocobulary لە قەڵەم بدرێ، بەڵاتەکینێ ئەوەمێت لە بیرنەچێت، کە کاژێکی تەنکی وەك تارای وەوی ها لە مەعبەینیاندا.. بە بیروبۆچوونی زانایانی ئایدیالیست و نیوە ماتریالیست ونیوە ئایدیالیست ڕەنگە ـ هەرچەندە بە تێکەڵ و پێکەڵیش بێ ـ شتهایەکیان لەم ڕووەوە ئەنگاوتبێ، بەڵام ماتریالیستی دیالێکتیك ـ هەرچەندە لە سەرەتاوە زۆر بە ئانی ئەم باسەدا چوون ـ کێشەکەی یەکلا کردووەتەوە و دەڵێ: ـ مرۆ لە زیندەوەری دیکە بە وشیاری (ئاوەن) جوێ دەبێتەوە، واتە زیندەوەری بێ ئاوەز هەرگیز ناتوانێ وێنەی شتان، سەرەبەخۆ بە بیردا بێنێتەوە. تەنها هەر مرۆیە، کە بەهرە و یارای ڕووت کردنەوە = تجرید ـ ی هەس. شتان بێ ئەوەی لەبەر چاوی زەق بێتەوە، دەبەر زاری، یا دەبەر گوێی، یا دەبەر دەستی، یا دەبەر لووتیدا بن، ناڕاستەوخۆ هەست پێ دەکا، بەڵام زیندەوەری بێ ئاوەز و بەستەزمان بەو جۆرە نییە.. ئەو شتان تەنێ ڕاستەوخۆ هەست پێ دەکا. هەروەها وەك پافلۆف دەفەرموێ، بە ڕامێنانیش بە پێی تیئۆریی جەمسەربوونی مەرجەکی (نظرية الاقتران الشرطي) یش چتی بەبیردێنێتەوە. بێ لەوەش مرۆ خەسیەتە گشتەکانی شتان یەکسەر دەقۆزێتەوە و یارا و بەهرەی تایبەتی ئاوەز، شتان بەو خەسیەتە گشتانە دەناسێتەوە. کە دەڵێین"دار" تەنێ دارێکی لە مێشکدا نییە، بەڵکو خەسیەتەکانی سەرلەبەری دارانی دە مێشکدایە و بە هۆی ئەو خەسیەتە هەموانەکییەوە، تاکان دەرك دەکا. کەواسا، هەموو بوونەوەرێ تاك (تایبەت) دە بوونێکی هەموانەکی (عام) دا دەرك دەکا. ئەوجا تاکیش بێ کۆمەڵ بە بیردا نایە، واتە، دە کات و شوێن و ناوی خەڵکانی دیکەدای بە بیردا دێ. دیارە مرۆ، بەم پێیە ڕشتەی بوونەوەرێکی کۆمەڵەکیی بە ئاوەزە. بێ کۆمەڵ

نازێ.. بێ کۆمەڵ ـ با مێشکێشی بە زگماك تەواو بێ ـ هیچ فێر نابێ؛ زمان، فەرهەنگ، شارستانیەت، ژیاری و هتد.. فێر نابێ. دە جەنگەی ئەرك بە خەرجدان و کار و کۆششتدا فێری شتان دەبێ. ژیاری و شارستانییەت، بە کار و ئەرك بە خەرجدان دێنە گۆڕێ.

ئینجا، زمان قاڵبی هەموو ئەزموونەکانی مرۆیە. بە درێژایی تەمەنی لە مێژوویینەی وی، زمان نەبا، مرۆ وەك هەموو بەستەزمانێکی لێ بەسەر دەهات. وەلێ چۆن چۆنی ڕەفتار دەگەڵ زمان دەکا؟ دیارە، مرۆ شتان بە پچڕ پچڕی و پەرت و بڵاوی و بێ بەندوباری و بێ سەروکاری نابینێ و بیریان لێناکاتەوە. شتان بە پێی یاسا و ڕێسای هۆکار و ئاکام و ناچارەکی و ڕێکەوت و ئازادی؛ بیر لێ دەکاتەوە. بەڵام هەمیشە بە ئامادە بوونی یاسا و ڕێسایەکانی ئاوەز؛ چ بە مەنتیقی فۆرمالیستانە (ڕواڵەت)، چ بە مەنتیقی دیالێکتیکانە، لە مێشکیدا، کە بە ئەزموون دەردەستی کردوون، ڕەفتار دەکا.
هەر لەبەر وەشە، کە چەندین شێواز و ڕێبازی بۆ نێولێنانی مانا و ئەزموونی نرت و نوێباو دەدۆزێتەوە و بۆ هەموو ڕشتەکانی زانست و هونەر و فەلسەفە، زاراوەی لەبار و لەشان سووك و خۆشباو دادەنێ. دیارە ئەم هونەرەشی لە ئاکامی بەرەوپێش چوونی ئامێرە مایەکییەکاندا وەدەست هێناوە. هەر ئەمەشە، کە جوداوازیی لە نێوان کۆمەڵگەیەکی، کە بە سەر هەموو پێداویستەکانی خۆیدا ڕادەگا و کۆمەڵگەیەکی دیکەی پاشکەفتی، وەك کۆمەڵگەی کوردی لە کاروان بە جێ مای؛ کە بە سەر زۆر شتاندا ڕاناگا، دەسنیشان کردووە. گەلۆ، ئەوڕۆ کورد چەند زاراوەی ـ وەك لە پێشتریم باس کرد ـ لەو هەموو بواری جۆراوجۆری زانستەکانی دنیاییدا، داناوە و ژیانی شارستانیی ئەوڕۆی خۆی پێیان دەستەبەر کردووە؟

بەڵام نەتەوەی کورد ـ پیاو هەق بێژێ ـ سەرەڕای ئەو هەموو کۆت و زنجیری زمان و فەرهەنگی تورکی و عەرەبی و فارسییە، کە بە درێژاییی دە ـ دوازدە سەدە، سەرومڕ لە دەست و پێ و بیر و هۆشی ئاڵاون ـ ماڵم قەبرە ـ لە پاراستنی بەندوباوی نەتەوەکیی خۆی، بە تایبەت زمان و ئەدەبیاتی زارگۆتیی دەوڵەمەند و زەنگینی پشتاوپشت لە

بیرنەکردوویدا دریغی نەکردووە. دژمن ئەگەر توانیبێتی سەرلەبەری هەموو شتێکی کورد و کوردستان چەپاوکا و بە تالآن و برۆی بەرێ، وەلێ هەرگیز نەیتوانیوە بیری نەتەوەکی و نەتەوەکەی و فۆلکلۆرەکەی بە تالآن و برۆ بەرێ. خۆشبەختانە، ئەگەر دەستی بڕوا، هێندەی کەلەپوور هەیە، کە دەتوانم بڵێم لە هی تورکیش و عەرەبیش و فارسیش دەوڵەمەندترە. هەر ئەوەشە کە یەکێکی وەك خانیی تەمر ئەم هەست وخوستی نەتەوەکییەی لە شاکاری مەم و زینەکەیدا، بەوپەڕی گەرموگوڕییەوە دەربڕیوە و خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد، چ وەك مەلا و فەقێ، کە خاوەنی کەشفوزنوون، حاجی خەلیفەی تورك، دەڵێ، ئەو خوێندەوارە کوردانە نەبان، هیچ ئاسەوارێکی ڕۆشنبیری لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانییاندا نەدەما ـ دەڵێ "لونلر طفره صتان اولدیلر.. "و چ شێخ، چ ئەفەندیی فێست بەسەر و سیدارە لەسەر، کاسکێت لەسەر و قاڵپاخ لەسەر و هتد.. بە هەڵبەست هۆنینەوەی کوردی و کۆڕ و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری دامەزراندن و ڕۆژنامە و گۆوار دەرکردن، دە مەیدانی ڕۆشنبیریدا، دریغییان نەکردووە. بیریان لەوە کردووەتەوە، کە دەبێ منداڵی کورد فێرگەی بە کوردی خوێندنی بۆ بکرێتەوە.. کتێبی بە زمانی زگماکی خۆی هەبێ. ئەوەندی بە بیرم دێ، عەبدوڕەحمانی شەرەفکەندی، مام هەژاری ئەمر و عەبدوڕەحمانی زەبیحی، کاك حەسەنی قزڵجی و محەمەدەمین شێخولئیسلام، هێمنی موکریانی، وەك بۆیان وەگێڕام، قازیی ئەمر دە سەروبەندی کۆماری ساوای مەهابادێ، بیری لەوە دەکردەوە فەرهەنگستانی کوردی دامەزرێنێ. تەنانەت بۆیان وەگێڕام، کە چۆن زاراوەی "پێشمەرگە" ڕانراوە؟ حیکابەتەکەی مەشهوورە..

به ڕاستی، زاراوەدانان، هەر وەکو لە پێشتریێ گوتم، وێڕای سەلیقەی زمانزانی و لە یاسا و ڕێسای واژە تەرەکێن زۆر باخەوەر بوون، ئەوێ، لە مێژووی کورد، لە جوغرافیای کورد، لە کۆمەڵناسیی وی، لە ئابووریی وی، لە ئەفسانەکانی، لە سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کەونارای، لە ئایینەکانی، و تاد.. فرە وەسەلیقە وێ.

دەبێ بە لانی کەم لەم قاڵبانەی زمانی کوردی شارەزا و پسپۆڕ بی و لە جیاتی "کارەکەی کرد" نەیەژێ "بەکارەکە هەڵسا":

١ـ نیشانەکانی سیفەتی کارایی:

ـ "ا": *زانا، توانا، بینا، بالا*.

ـ "گار" : *سازگار، کرنگار، پەروەردگار*.

ـ "کار": *ستەمکار، بەدکار، نوێکار، تازەکار*.

ـ "ان": *ڕەوان، شادان، خەرامان، نالان*.

ـ "ندە": *کوشندە، برندە، فرندە، عەفراندە*.

ـ "گەر": *جادووگەر، دادگەر، شانۆگەر*.

ـ ئەوەت لە بیر نەچێ، کە سیفەتی کارایی ئەگەر"ندە" ی لە پاشەوە پێوە بلکێ، زێتر بە مانای فیعل و سیفەتی ڕەفتەنی و کاتەکیدا بە کار دەبرێ، وە نموونە: شایی *ڕۆیندە*، کە لە گەرمیان باوە، بەڵام هێندێ کاویش بە مانای هەمیشە بە کاردێ، تیرێکی *کوشندەی* تێ گرتم. سیفەتکەلێ کە بە "ان" دواییان دێ ، زێتر مانای *حاڵ* دەبەخشێ، واتە سیفەتەکە بەردەوام نییە، بە نموونە: کاورا زگی *ڕەوانە*، ڕەوانییەکە هەر چند سەعاتێکە، یا: بە *هەڵەداوان* هات، واژەی دلوان بە فارسییەکەی *دوان ـ ە*، لە *دویدن ـ* دوە هاتگە، واتە هەڕاکردن و دەودەوانێ و قۆشمە. ئەگەر سیفەتەکە بە "ا" دوایی بێ، ئەوە دەلالەت لە هەمیشەگی دەکا، وەك *زانا، دانا*. ئەگەر وە "کار" کۆتایی هات، ئەوە، مانای فرەپێوەنان و موبالەغە دەبەخشێ، وەك: *ستەمکار*، واتە: فرە ستەم. لەوەش وریا بە، کە فەرقی "گار" و "کار" ئەوەیە کە گار وە واچەگەلێکەوە دونووسێ، کە لە فیعل تەرەکیابن، یان هەر خۆیان سەربەخۆی هەبن، وەك: پەروەردگار، ئافەریدگار، ڕۆژگار، شەوگار. هەرچی "کار" ە، وە ناوی مانا و سیفەت و واژە نەتەرەکییەکانەوە دەلکێ، وەك: ستەمکار، بەدکار و شەکار.

**موتوربەی سیفەتی کارایی:**

١ ـ حاڵەتی وەباڵدان (ئیزافە)، کە سیفەت وەباڵ پاشەخۆ دەدرێ، وەك: بڕندەی پۆلا، کوشندەی دژمن.

٢ ـ دواخستنی سیفەت و تێ بردنی نیشانەی "ندە"، وەك: سەرفراز، لە سەرئەفرازندە ـ وەوە و سەربڕ لە سەربڕندە ـ وە هاتگن. دیارە ئەمانە وەك فارسییان ڕەفتار دەگەڵدا کراوە.

٣ ـ کاتێ سیفەتی کارایی دەگەڵ بەرکار یا یەکێ لە قەیدەکان (ئاوەڵکارەکان) ی، وەك: زۆر، کەم و تاد.. دا هات هەنگێن نیشانەی سیفەت تێ دەبرێ، وەك: زۆرویژ، کەمدوو.

**نیشانەکانی سیفەتی بەرکاری:**

١ ـ سیفەت پێش دەکەوێ: پەروەردەی ناز، ئالوودەی داوێن پیسی.

٢ ـ سیفەت پێش دەکەوێ و نیشانەی وەباڵدان تێ دەبرێ، وەك: ئالوودە ناموس.

٣ ـ سیفەت پاش دەخرێ و چ گۆڕان نائێتە گۆڕێ، وەك: خەوئالوودە (خەواڵوو).

٤ ـ سیفەت پاش دەخرێ و "دە" تێ دەبرێ، وەك: نیعمەت پەروەر، نیشتمان پەروەر،

٥ ـ سیفەت پاش دەخرێ و "دە" دەمێنێ، وەك: ژەمبردە، سەرمابردە، بابردە.

**نیشانەکانی سیفەتی نیسبەت:**

١ ـ "ی" بە دوای واژەوە دەنووسێ، وەك: ئاسمانی، خاکی، کوردی.

٢ ـ بزوێنی "ە" بە دوای واژەوە دەنووسێ، وەك: یەکشەوە، دووساڵە، چلە، هەرتە.

٣ ـ "ین" لە دوای واژەوە بێ، وەك: جۆبین، بەفرین (بۆ جۆر و ڕەنگی هەڵماتی بەرد).

**نیشانەی سیفەتی لێکدراگ:**

١ ـ لێکدانی وێکچوونەکی، وەك: سەنگدڵ، کەوانبرۆ، پۆڵادەست.

٢ ـ لێکدانی دوو ناو، وەك: ئازارپیشە، خیانەتپیشە، جاسووسی پیشە.

٣ ـ لێکدانی دوو ناو بە ئامراز، وەك: خەنجەر بەدەست، سەربەکڵاوە (بۆ شەستەباران).

٤ ـ لێکدانی ناو بە ئامرازی جۆراوجۆر، بابەتی زۆرن:

أ ـ بە "ب" ، وەک: *بەغیرەت، بە حەیا*. (هێندێ جار ئەم "ب" بە ئەوێ وە "و")

ب ـ بە "هاو"، وەک: *هاورێ، هاودەم، هاودەنگ*.

ج ـ بە "نا" و "نە"، وەک: *نامراد، نەمر*.

د ـ بە "بێ"، وەک: *بێ ئاوەز، بێ هۆش*.

و ـ بە "مەند"، وەک: *هونەرمەند، زەرەرمەند*.

ز ـ "وەر"، وەک: *داوەر، جانەوەر، دەمەوەر*.

ح ـ بە "ناک"، پتر مانای دەرد و ناساغی دەبەخشێ، وەک: *نمناک، دەردناک، ترسناک، خەمناک*.

**سیفەتی بیستەنی و قیاسی:**

١ ـ ناو مانای وەسفیی هەوێ و موشتەق نەوێ، وەک: *گران، تەنگ، دزێو*.

٢ ـ واژەیێ دەلالەت لە ڕەنگ بکا، وەک: *سپی، سوور، زەرد*.

٣ ـ سیفەتی بیستەنی زێتر لە لێکداندا، دوادەکەوێ، وەک: *ڕووسوور، ڕووزەرد، ئێسک گران*. هێندێ جار پێش دەکەوێ، وەک: *سیامالّ، مردەمالّ، زندەمالّ*.

ڕاستیت گەرەکە، ناکرێ لێرەدا من هەرچی دەستەلاتی زمانی کوردی هەس، گشتی لێرەدا وەسەر کەمەوە؛ دیارە مەرامم لە وەبیرهاوردنەوەی ئەی قالّب و میسالەیلە، ئەوەیە، کە کەسێ خۆی ئەڕای زاراوە داڕژتن خرپەلّ دلوێ، تەنیا زمان زانی بەش کارەکە نێکا، ئەوێ، وەک وتم، فرە لە دیرۆکی کورد، لە جوغرافیای کوردستان و لە ئابووریی کورد، لە کۆمەلّناسیی کورد و خۆلاسە لە گشت چتێکدا زۆرزان وێ.. بێیتە سەر ڕاستی، ئەوەی من دیاردیم بۆ کردن، ڕەنگە تنۆکێ وێ لە دەریای زوان کوردیی خاوەن پێنج شێوەی فرە زەنگین و دەولەمەند.. جا ماگەسەوە ئەوەیچتانە عەرز خزمەت کەم، کە ئاخۆ بواری قیاس کردن لەسەر ئەم قالّبانە چەندە و قەلەمڕەوی تا کوێ بردەکا؟ ئەمە زێتر دەکەوێتە سەر سەلیقە و زەوق و شارەزایی و کوردی زانین و بە زوانی بیانییەوە ئالوودە نەبوون و کەمێ جورئەتیش و گوێ ڕایەلّیی زەوقی

خەلکەکەیش ناویّ لە بیر بوەینەوە. دیارە ئەمن لە کوردێکی گوێچکە بە تەنیّ بە کوردییەکی بەرتەسکی شاریّ، ناوچەییّ و شێوەییّ ڕاهاتبیّ، یا زێتر بە زمانێکی غەیرە کوردیی خوێندبیّ و دەگەلّ ژیانی کوردەواریدا، سەروکاری کەم بوبیّ، ئەوە عوزری خۆی بە دەستەوەیە و لێی ڕانابەرمووم، شێرم بە گویّ بۆ بگریّ.. من پێم وایە هەر کەسیّ لە مەمانان دەرکی هەمبانەی خۆ وەکا، ڕەنگە لە هەر چتە شەمەیەك بکا.. خۆ نەتەوەکانی دیکەش لە سەرەتاوە کۆلّیان لە کۆلی مە زۆر ڕەنگینتر نەبووە، بەلاّم لێل ئەوەشا، ئەم شاکارییە، مەردی مەیدانی خۆی هەبووگە و تا ئەو مەردمەیلە خامە وەدەس بووگن، هەر ئەوانەیلە سەردەفتەر و دەمڕاست و جێی متمانە بووگن.. خولاّیە، یەکدوو کەلّە زوان زانێکی دیکەی وەك مام هەژار و ئەحمەدی خانی و نالی و تاد.. مان بۆ بڕەخسێنی.

لەمەڕ قیاس وەکاربردن، ئەملاو ئەولای بۆ نییە، هەر وەك زانایانی زاراوەشناسی یەژن، ئەم بزنە ڕێیانەش دەبیّ پیا بڕۆین:

١ ـ دەبیّ لە زانستی بنەواشەکانی واژەڕانان "علم الوضع" باخەبەر بین. ئەهلی ئوسوولّ لەم هونەرەدا، لەمێژە فەرموویانە: "یصطلح علی المعنی لأدنی ملابسة"، بە کوردییەکەی واتە: مەرج نییە زاراوەییّ کە بۆ مانایەك دادەنریّ، لە سەتا سەت پڕاوپڕی یەکدی بن، دەکریّ بە بۆرە خزمایەتییەك شاوشوکور بنەوە، ئەوجا خزمایەتییەکە بە درێژاییی ڕۆژگار، دەچەسپیّ و کارەکە دەبڕێتەوە.. کیّ بە خەیالّیدا دیّ، واژەی "مسرح" یان "مرسح" کە ئەوڕۆ بە شانۆ دەگوتریّ، بە زمانی عارەبی بە مانای چێرەگە و لەوەڕگە بووە؟! کیّ بیری بۆ ئەوە دەچیّ کە "الفن" و "المفن" کە ئەمیستاکە وە سنعەتکار و هوونەرمەند، دەبێژریّ، وە زوان ئارەوی، بە مانای "چارەویّ" ی فرە ڕەوتخۆش و لەنجە و لار بووە؟!..

خۆلاسە، زارلوەداڕێژ دەبیّ جگە لە قالّبەکانی زمان، لەم قالّبە مەنتیقییانەیش وریا بیّ: گشت ـ تایبەت،وەك: *زیندەوەر ـ کەروێشك*، یەکسان، وەك: *ئاسك ـ ئاسك*، نووفاق،

وەك: *پیاو ـ ناپیاو*، هاودژ، وەك: *مردن ـ ژین*، بـانێك و دووهـەوایی، وەك: *ڕەش و سپی.*

دیاره لـەم قاڵبانـەدا، سـەرلەبەری چوارچێوەی هاوپێوەندییـەکانی چەندایـەتی ـ چۆنایەتیی بزاڤتی دنیای ماتریالّ کە قاوغی شکڵیی ماددەن ڕەچاودەکرێن و بۆ ئەمـەش ئـەمڕۆ سوود لـە زانسـتی ماتماتیکا لـە هـەموو پراکتیزەکـانیدا وەردەگیرێ و ئـامێر و دەزگای زۆر وردیش بـۆ پێوانـەی وردترین ڕێژەیـەك لـە مـاددە بـە خـێراییی دەنـگ و ڕووناکی، هاتوونەگۆڕێ و خێراییی خەستکەرەوە (معجِّل) ی وا پەیدا بووە، وێنەگرێ کە بتوانێ بە خۆ و کامێراکەیەوە بچێتە نێو پرۆتۆنێکەوە و وێنەی زۆر بە ئاب و تابیشی لێ هەلّ گرێ..

٢ ـ بەسەرکردنەوە (استقراو) ی دەنکە ـ دەنکەی واژەکانی زوان هەر یەکـە لـە نیگای لە ڕستەدا، چ بە پێی بنیاتگەرایی، یا بە پێی بردنەوە سەر ماك (تـأویل)، بەکاربردندا، لـە ڕووی ئێتیمۆلۆژییـەوە، ڕەچـاوکردن.. وە نموونـە: ئەگـەر لـە ناوەکـانی ئەسـباب و ئامێرەکانی ئاسیاوێکی کوردەواری بۆ هێندێ زاراوەی ماشێنی سوود وەرگرین، ڕەنگە تا نزیکەی ٤٠ زاراوەمان وەچەنگ کەون.

٣ ـ گردوکۆیـەکی وردی هـەرچی زاراوەکـانی سـەرلەبەری پیشـەکانی نـاو کـوردەواری هەس، بکەین. ڕەنگە لە هەر پیشەیەك چەندین زاراوەیەکمان لێ وەچەنگ کەوێ، کە بـۆ ئەوڕۆی دنیای سنعەت و تەکنۆلۆجیا، زۆرمان پێویست پێ دەبێ..

٤ ـ سـەرلەبەری واژەکـانی زمـانی کـوردی، بـە هـەموو شـێوەزارەکانیەوە، ئـەوەی کـە نەهاتووەتە سەر کاغەز، گردوکۆکرێنەوە. ئەمە لەمەڕ دەستووری زاراوەڕانان.

بەش بە حاڵی ئەوەی کە کوردەکە لەم مەیدانـەدا، تـا ئێسـتا چیـی بـە چـی کـردووە، هێندەی بە بیرم بێتەوە، بزاوتی کورد، بە تایبـەت لـە کوردسـتانی عـێراقدا، دە هـەموو داخـوازە ڕۆشـنبیرییەکانی کـورددا دەزگایـەکی لـە گوێـن "کۆمەڵـەی زانسـتی" کـە ئینگلیسەکان لە سلێمانی دلیان مەزراندووە، هەر نووسیارێ واژەیەکی کوردیی پـەتیی، لە بریی تورکی و عەرەبی و فارسی نووسیبا، فەرمانڕەوای ئینگلیسی ئەو سەرویەندەی

شاری سلێمانی، ڕوپیەیەکی خەڵات کردووە.. مەلا و وەسەوادی کورد، زۆریان بیر لە داهێنانی واژەی تازە، ڕستەی نوێباو، نەخوازا بۆ زمانی شیعر، کردووەتەوە.. بەڵام بە داخەوە، سەبارەت بەوە، کە زمانی کوردی نەبیوو بە زمانی خوێندنی تەواو و زمانی فەلسەفە و زانست و هونەر، وەك زمانی عەرەبی و زمانانی خاوەن دەستەڵاتی سیاسی، دیارە هەر لە قاوغ و قەپێلکی زمانێکی هەواری شوان و گاوانی و گوندنشینی و کشتوکاڵ و چەند وردە پیشەیەکی سەر بە شابووریی هەریەشخۆی کز و بێ هێز و بنیەستدا گینگڵەی خواردووە.. بە ڵێ، ڕاستە ئەدبیاتێکی لە گوێن ئەدەبیاتی "دیوانی" ی فارس و عوسمانی، لە سەر دەستی نالی و سالم و کوێی و تاد.. هاتە گۆڕێ، بەڵام زێتر لە بەر سێبەری ئەدەبیاتی فارسی و تورکیدا چەکەرەی کردبوو. زمان خۆت دەزانی هەر شیعر نییە، پەخشانیشە، ئەم پەخشانەیش کاتێ تەشەنە دەکا، کە زوانەکە بوێتە زمانی زانست و فەلسەفە و هونەر و دەوڵەت و قودرەت و تاد.. ئێ ناشکوری نەبێ ئەمەیش تا ئێستا سەری نەگرتووە. بە ڵێ ڕاستە زمانی کوردی زمانەکەی سەردەمی کۆمەڵەی زانستی نییە و ئەوڕۆ تا دوا پلەی خوێندنی لیسە و ڕشتەی ئەدەبیات و پەروەرشت بە کوردی دەخوێندرێن، وەلێ هێمان فرەمان ماگە..

دیارە پەیدابوونی زمان بۆ خۆی قۆناغێکی زۆر گرنگە لە ژیانی مرۆڤدا. هێندێ پێیان وایە چۆن مرۆڤ بۆ ئاسمان چوو، بۆ مانگ چوو، پەیدابوونی زمان فێربوون و نووسینیش، لەو پایە گرنگەدایە. بە ڕاستی پیاو ناتوانێ لە هەموو سەرێکەوە بپەرژێتە سەر هەموو سەرەودەرێکی زمان و لێی بکۆڵێتەوە و بگاتە ئەنجامی بێ چەند و چوون و بێ سێ و دوو، بەڵام دەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ سەرەودەرێکی هەر لێ دەربکەین و هێندێ چتی هەر لێ بزانین. بە نموونە ئینسان پێش ئەوەی کە فێرە (ئەلفبێتکە) بێ، پێش ئەوەی فێرە ڕێنووس بێ، پێش ئەوەی چی و چیی دیکە فێر بێ، دیارە لە پێشدا خەریکی نیگار کێشان بووە. ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە لە هێندێ ئەشکەوت و کون و کەلێنی چیایەکاندا نیگار و وێنە و چتی وا بیندرلونەوە کە نیشانەی ڕۆژگارێکن مرۆڤ لە قۆناخێکی زۆر کۆندا کە هێشتا خەریکی ڕاووشکار بووە، بە نموونە لە ئەشکەوتدا

ژیاوه، وێنەی کەڵەکێویی کێشاوە ـ تیرێکی هاویشتووەتێ و سەرمەقولاتی پێ داوە، ئەمە قۆناخی جادووە بووە و پێی وا بووە بەو کارەی کە دەیکا، لەسەتا سەت سەردەکەوێ و لەوەش لە چوارچێوەی مێژووبینەی خۆیدا چتێکی ڕاستە کە ئینسان بە قەناعەت بەخۆکردن "ئیحا" جاری وا هەیە بۆ خۆی کاری وا دەکا کە بە لێبڕان، لە کاری خۆیدا سەرکەوێ. قەناعەت بەخۆکردن دەورێکی گەورەی هەیە. ئەتۆ لەبیری خۆتدا وات نییەت لێ هێناوە، سبەینێ دەتوانی ئەو کارە بکەی، دەچیە ڕاوێ، دەچیە شوێنێکی زۆر سەخت پێیدا هەڵدازنێی شارەهەنگێکت لێ بەدی کردووە هەنگوینی لێ دەرێنی، دەتوانی سبەینێ دەرزەکەت ڕەوان کەی، سبەینێ دەتوانی ئەمە بکەی، ئەوە بکەی ئەوجا ئەو مەسەلەی جادووە بۆ خۆی "ئیحا"یە. کە وابوو ئینسان پێش ئەوەی فێرە نووسین بێ، فێرە ڕەسم کردن بووە، چونکە دەگەڵ هەموو چتێکی مردوو و زیندووی خۆڕسکدا هەڵسوکەوتی کردووە، لەگەڵ جرۆجانەوەر و بوونەوراندا کە پێویستی پێ هەبوون سەروساختی پەیدا کردووە. ڕاوی گیانلەبەرێکی کردووە، گۆشتەکەی خواردووە، کەوڵەکەی دەبەرکردووە و چی و چیی دیکەی کردووە. ئەمە هەموو نیشانەی ئەوەیە کە پێش ئەوەی (ئەلفبێتکە) دابێنی (پێش ئەوەی بچتە نێو مێژووەوە)، لەسەر دیواری ئەشکەوتان دە پێشدا ڕەسمی گیانەورێکی کێشاوە. زۆرمان لەو ڕەسمانە بە ئاسەوار بۆ ماونەوە.. ئەوە یەک، دووەمیش لە قۆناخی تۆتەمییەتدا (هێزی پێوار دە شکڵی جرۆجانەوەردا لە مێشکدا نەخش بەستن) مرۆڤ پەنای بۆ ڕسم کێشان، یا پەیکەرتاشین بردووە، چاوی عاجباتبی بۆ وێنەی جانەوەرێ، داڵاشێ کردووە، دەم و ددانی بۆ کردوە، لووتی پان کردووە، سەری زل کردووە. ئینسان لەو هەوارگەیەدا دیارە بیری لەوە کردۆتەوە کە ئەو چتانەی لە مێشکیدا نەخشیان بەستووە بە هێلکێشان، بە ڕەنگڕشتن، بە ڕەهەندە ئەندازەییەکان، بە لایەنی چەندیەتی و چۆنیەتیی ماتریالان بەدەنگ بێنێ، ئەمەش بۆ خۆت دەزانی قۆناغێکە لە قۆناغی چت بەرجەستەکردن "تەجسید" پێشکەوتووترە. واتە: شاقاوێکی بەرەو خۆ لە دیتنی ڕاستەوخۆی ماددەی ڕووتی بەرهەست دزینەوە، هەڵگرتووە. ئینسان لەم

قۆناخەدا فێرە ڕەمز و نما بەکارهێنان بووە، واتە: هەر هەمان چتــە ماددییەکــە لــە دوو قۆناغدا: لە قۆناخی بەرهەست، لە چوارچێوەی دەرەوەی مێشکیدا و لە قۆنـاخی دەرك کردنی چتەکە لە نێو مێشکیدا، دەناسێتەوە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە چتەکە بە دوو چت دەزانێ، بەڵکو هەر بە هــەمان چت (عەینییــەت) دەزانــێ و بــە هــەموو جۆرێ دەیەوێ هیچ فەرق و جیاوازییەك لە نێوان دەرك کردنی خودی چتەکەدا نەکا، ئەگــەر وا نەبێ یاسای هەرخۆیی (عەینییەت) هیچی تێدا بەستە نەدەبوو.

ئەوجا لێرەدا هێزی خــەیاڵ و بۆچــوون دەوری خــۆی دەگێڕێ ــ خــەیاڵ تــا بــە پێـی یاسـای عەینییەت دەگەڵ ماتریاڵــەکاندا ڕەفتــار بکـا، بــەو ئەندازەیــە لــە ڕاسـتیی ماتریاڵەکە، لە مەوزووعییەت نزیك دەکەوێتەوە، تـا بـە گوێـی یاسـای عەینییەت ـ جا لەبەر هەر هۆیەك بێ ــ نـەکا، لـە ڕاسـتیی خـودی چتەکـە دووردەکەوێتـەوە و تووشـی خەیاڵ ئاڵۆزی،گومان، مەزەنە، وەهم و قەرەنتوو دەبێ (سپیۆنازە، سپنسەر).

ئەتۆ هەر وا بیر لە داهاتنی ئەلفبێتکەی وێنەکی و هیرۆگلیفی بکەوە، بە نموونە: پیتــی A لـە سـەر و شـاخی Alpha بـە زمـانی فینیقـی "گـا" داڕێـدراوە. هـەروەها پیتـــەکانی دیکەش. ئیدی نووسینی هیرۆگلیفی بەم جۆرە پەیدا بووە [1]

وڵاتی فارس ماوەیەکی دوورودرێژ بـە ئەلفبێتکـەی ئارامییـان نووسـیوە. تەنانـەت بـە ئەلفبێتکەی یۆنانیشمان کە هەر لە ئەلفبێتکە فینیقییەکە کەوتۆتــەوە، نووسـیوە. دوور نییە لە[1] سەردەمانی پێش ئیسلامەتیدا کوردێکی خوێندەوار، ئەگــەر هــەبوویێ، واتــە:

(١)خەت هونەری چەسپاندنی چتەکانی زەینی مرۆڤ بە نیشانەگەلی ئاشــنای چـاوە. پێویســتیی مـرۆڤ بـە حیفزکردنی بیرەوەرییەکانی ڕابردووی بوو بە هۆی پەیدابوونی خەت لە نێوان نەتەوەکاندا. جـا مـرۆڤ بۆچـی حەز لە ڕابردووی خۆی دەکا، بۆ ئەو چتانەی کە دایاندەهێنێ دەکـا بـە مێـژوو، بۆچـی لـە موزەخانانیـاندا دەیـارێزێ، بۆچی شـانازیـان پێوەدەکـا؟ ئەمــە ڕەگ و ڕیشـەی لـە پێوەندیـی خێڵــەکی و خێزانەکییــەوە ئاوەخواتەوە، یان هەڵپەیەکە کە چینە دەسەڵاتدارەکان مافی جوداوازی (امتیـاز)ی خۆیـان لەســر بنـەمای ماف بە میراتی بۆ مانەوە، دامەزراندووە (تاریخ اجتماعی هنر/ آرنولد هاوزر/ ترجمە ابراهیـم یونسـی، ب. ٨، ل. ١٤، ١٣٧٥).

لە ئاتەشکەدەکاندا، یان بە هەر ڕەنگێ بووبێ، چتێکی هەر زانیبێ. خۆت دەزانی خوێندن و فێربوون لە سەردەمانی کۆندا چتێکی هێندە سانا نەبووە، ئەوە کاری کەسانێکی هێندەی پەنجەکانی دەست بوون. کامینێ، موویەدێ، شامانێ، ئەوانی خزمەتی پەرستگا و ئاتەشکەدەکانیان کردووە بەسەر ئەو کارە ڕاگەیشتوون. هەموو کەسێ نەیتوانیوە فێرە خوێندن ببێ، یان ئەسڵەن فێربوون هەر قەدەغە بووە. خۆ حیکایەتەکەی "پرۆمیتۆس"ی یۆنانی مەشهوورە کە ئاوری لە چیای ئاگری دزی و خەڵکی فێرە ڕووناکی کرد، زیۆس کوڕی سزا دا و لەسەر کێوی قافی بە زنجیر بەستەوە و داڵاشی تێ بەردا، جەرگ و دڵی بخۆن، دوایە ئەوەبوو، تکاکار شەفاعەتیان لەبۆ خواست، لە گوناهی خۆش بوو. خۆت دەزانی هەموو چینێکی فەرمانفەرمای خۆپەرست لە ڕووناکی و وشیاربوونەی ڕەعیەت زەندەقیان دەچێ، چونکە پێیان وایە جێگەیان پێ لەق دەکەن. کەواتا، زمان فێربوون کاری هەموولێ نەبووە. دەگێڕنەوە، جارێکیان فەیلەسووفێکی ئیلیادا، بە ئاشپەزەکەی گوت، میوانی دێن، دەبێ خورخۆراکێکی شایێشتەیان لەبۆ سازکا. ئاشپەز بیست تەرزە خۆراکی لە زمانی ئاژەڵان سازکرد. کاتێکی میوان لەسەر سفرە و خوان دانیشتن، تەماشایان کرد هەرچی خواردنێکی کە بۆیان دانراوە، سەرلەبەر لە زمان، سازکراوە.. فەیلەسووف پرسی: ئەوە چ حیکمەتێکی تێدایە؟ ئاشپەز لە وەڵامدا گوتی: قوربان، ئەدی هەرچی قسەی خۆش و داستان و سەربوورەی مرۆڤایەتی هەن، بە زمانی ئینسان ناگوترێ و نانووسرێ؟ فەیلەسووف بە قسەکەی قەناعەتی هێنا و ئافەرینی لێ کرد. جارێکی دیکە فەیلەسووف هەمدیس میوانی هات. فەیلەسووف ئاشپەزی ڕاسپارد، خۆراکێکی شایێستەیان لەبۆ سازکا. وەختێکی میوان هاتن و لەسەر سفرە و خوان دانیشتن، فەیلەسووف نواڕی هەر هەمان تاس و حەمام، خواردنەکان هەموو دیسان لە زمانی ئاژەڵان سازکراون. پرسی: ئاشپەز، ئەوجارەت لەچی؟ ئاشپەزی زیرەک لە وەڵامدا فەرمووی: قوربان، ئەدی هەرچی قسەی خراپ و فیتنەیی و ئاژاوەگێڕیی دنیایێ هەن، هەر بە زمان ناکرێن؟! فەیلەسووف، دیسانەوە فەرمایشتەکەی پەسن کرد و بترەژمی لێ کرد.

ئەوجا با بێینەوە سەروکاری ئەوە، بزانین کورد لە سەرویەندی هەر هیچ نەبێت دوور نەڕۆین ساسانییاندا چتێکیان لەمەڕ خوێندن و نووسین زانیوە؟ خۆ ئاشکرایە بە قسە ئەلفبێتکەی ئاوێستا لەباو بووە. بەلام چەند کەس لە ئاڤێستا و خوێندنەوەی ئاڤێستا حالی بووە، ئەوە مەگەر هەر پان ئیرانیزمەکان بۆ خۆیان بزانن دەڵێن پاش ئیسلامەتی تا ٢٠٠ تا ٣٠٠ ساڵی ڕەبەق فارسیش و کوردیش و هتد کڕوکپ کەس ورتەی لێوە نەهاتووە.. گویا وەک دەڵێن، دەبوا هەموو موسڵمانێ نوێژ بکا و بە فەرمایشتەکانی قورئان و سەرکردەکانی ئایینی نوێیاوی ئیسلامەتیی کردبا، یاخود ئەگەر موسڵمانیش نەدەبوو، دەبوا سەرانەی دابا، تا لە گەزەنی تالان و بڕۆ بپارێزێ ئەمن پێم وایە ئەم قسانە زۆریان پێوەنراوە. چونکە عەرەبی ئیسلام تا چەنانێکی دووریش لە باروبۆخێکی وادا نەبوون، یان هەر سەلیقەی ئەوەیان نەبووە، یەکجار بەو جۆرە تەنگ بە خەڵکی نوێ سوورمان و ناسوورمان هەڵچنن و زمانی زگماکیان لێ قەدەغە بکەن. ئەمە بەش بە حالی تەنێ قسەکردنی خواسایی ڕۆژانەی خەڵکەکە. بەش بە حالی خوێندن و نووسینیش، هەروەک لە پێشترێ گوتم، چەند کەس سەرگەرمی خوێندن و فێربوون بووگن؟ خۆ ئیسلامەتی کاری بەسەر ڕەگەز و نەژادەوە نەبووە و ئێستاکانێیش موسڵمانی ڕاستەقانی بڕوای بە ڕەگەز و ڕەگ و ڕەگەما و بن و بنچینەی ئادەمزادەوە نییە و دروشمی "إنَّ أكرمكم عندالله أتقاكم"ی هەڵگرتووە. بەڵێ لە پاشان لە سەردەمی کوڕانی ئومەیەدا جوداوازی لە نێوان عەرەب و عەجەمان هاتۆتە گۆڕێ و زاراوەی (شعوبیه) وە سەر زاری خوێندەوارانی عەجەم و عەرەب کەوتووە، بەلام ـ مالم قەبرە ـ ئەمە زیاتر لەلایەن فارسی تەخت و تاجی کیسرەوی تاراج کراوەوە دەستی پێ کردووە، چونکە ئەوان هەر لە کۆنەوە حەزیان لە چارەی (تازی)ی چڵکەڕ و "سووسمە مار خۆر" نەکردووە و ئەوەتا لە دوای چەند سەتەیەک، فیردەوسی ئەو حەز لە چارەی عەرەب نەکردنەی لە شانامەدا بەم جۆرە دەربڕیوە:

ز شیر شتر و خوردن سوســمار

عرب را به جایی رسیده است کار

که تــاج کیـــان را کنـــد آرزوی

تفو بر تو ای چـرخ گـــردون تفو

ئـەمن تـا ڕادەیـەك، پشـتیوانی لـە بیروبۆچوونـەكانی ئـاصر پورپـیرار لەمـەڕ " دو قـرن سكوت"ی نەتـەوەی ئێرانی كە لە كتێبی " پلی بر گذشتە" كەیدا بە سـەردێری "دو قـرن سـكوت رجزخوانی عوامانە" دەكەم. ئەمنیش دەنگی خۆم بـە گـەڵ دەنگـی وی دەدەم و ئـەو گوتەنی گەرد و تەپ و تۆزی درۆ و دەلەسـەی جوولەكە لەبۆ شێواندنی گەوهەری پێوەندییەكانی عـەرەب و عـەجەم و نەتەوەكانی دیكـەی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین، خـاوێن دەكەمـەوە و لـە ئالقـە درەخشـانەكانی بیروئەندێشـەی هاوبەشی نەتەوەكانی، بە تایـەتی پـاش ئیســلام لـە ملـهوڕیی خێلەكیی نیوە دایك سالاری و نیوە باوك ســالاری بـەدەرەوە، تێهـەڵدەچم. ئـەمنیش دەڵێـم: "جوولەكە پاش سەرلەنوێ خوێندنەوەی بەڵگە و بەردەنووسەكانی هەخامەنشی و دۆزینـــەوەی كورش و داریووش و بانگ هێشتن لە مانـا لێكدانـەوەی دیرۆكنووسـانی نەتـەوەی خۆیـان و، نەخوازە سەر دەفتەری هەموویان، گیرشەن بۆ پەرژانە سەر نووســینەوەی مێـژووی ئـێران لـە سەرەتای ئیسلامەوە، بەشی یەكەمی پیلان و وێرانكاریی دەسكەوتی مێژوویینـەی ئێرانیـانی دەست پێ كرد.

جووەكان ویسـتیان پێش هاتنی هەخامەنشیان، كە ئێوێنكی حاجیاتی و تەمومژاویی ئاریایـــان لەخۆنا[2] نیشتەنیی ئێوخۆی ئەو وڵاتانە بە ڕووت و ڕەجاڵ لە هەرچی جۆرە ژیانێكی سیاسی،

---

(٢)زاراوەی "ئاریایی"، "سامی"، "یافتی" و هتد له بنەرەتدا بۆ جیاكردنەوەی جۆری مـرۆڤ، لـە ڕووی بایۆلۆجی: gene و sex chromosomes ـ یـەوە، هاتنـە ئـاراوە، بـەڵام بـە پێـی "نەژادپەرسـتی = rasime " بەكارهێنانێكی جیاوازی بە مانای ئایدیۆلۆژیی هەبووە. پاشانەكێ بەلای بـەوربرواى نابەرابـەریی نەژادیدا كە لە ساڵی ١٨٥٠دا تا ١٩٤٥ بە بابەتێكی زۆر گرینگ لە بیروئەندێشەی ڕۆژاوادا لەقەڵـەم دراوە، شكارەتەوە، باوجوو نرخێكی ئەوتۆشی نەبووە، زانایانیش لە ئـاوە پشـتیوانییان لـەم بیروئەندێشـەیە كـرد و كۆمەگێكی بە پێزی لە ئیمپریالیزم و لە ئەورووپا بە هـەرەمێن ئێخسـتنی شـەڕەجوولەكە كـرد. لـە زەوینــەی زۆرەملی‌گەری "determinisme"ی نەژادیدا دەكرێ ئێوی دوو نووسێن بێنین: یەكەمیان وتارەكـــەی ئـا. دو گۆبینۆ، بە سەرناوی "وتارێ لەمەڕ نابەرابەریی نەژادەكانی مرۆڤ (٥ ـ ١٨٥٣) و دووەمیان بە سەرناوی بن تەمەڵەكانی ســەتەی ١٩م (١٨٩٩) لـە نووسـنتی چەمبـەرلێن. بـەوربرواى نازیــەت چلەپۆپـەی ئـەم جـۆرە

ئابووری و فەرهەنگی هەیە، لەقەڵەم بدەن، بە دێو و پەست و ناڵچاخ و هیچ و پووچ و هەرچی و پەرچی و بێ فەرهەنگ و بێ پێناسەی نەتەوەییان نیشان بدەن [3]، هەخامەنشییان بە بەردی بناخەدانەری شارستانیی ئێران بزانرێ و لە حەزرەتی "کورش" شەخسییەتێکی دەگمەنی ئەوتۆ داتاشن کە موو بە موو دەگەڵ ناوونیشان و شکڵ و شەمایلێکی کە تەورات فەرموونی (دیارە تەوراتێ کە بە پێی قورئان تەحریف کراوە) [4] دەقاودەق جووت و پڕاوپڕی یەکدی بن.

لێرەدا ناچارم باسێکی ئەلفبێتکەی کوردی بکەم. هەروەك لە پێشەوە گوتم، ئێمە لە کوردستانی عێراق بە پیتی فینیقی ـ ئارامی ـ عەرەبی دەنووسین. هەرچەندە چەند کۆنسۆنانت و بزوێنێکمان بۆ زمانەکەمان گونجاندووە، بەڵام تا ئێستا بە بەراورد دەگەڵ ئەلفبێتکەی لاتینید ا( نیوەژێر ـ I ـ وەك کردن kirdin، (Ü) وەك: چویم ، (Ö) وەك: گوێز و (ذ)ی فارسیی کۆن وەك "آمذ= آمد) و دەنگێ کە لە نێوان پشتەوەی زمان و پشتەوەی مەلاشووەوە دەردێ، وەك بنزاری سلێمانی کە بۆ "ت" و "گ" و "د"ی کلۆریان بەکاردێنن، وەك "ئەتبینم" و "بەگزادە" و "یامێ = دامێ" و هتد      ئەم پیتە بزوێن و کۆنسنانتانە بە پیتی عەرەبی نین. واتە: ئەگەر ئەلفبێتکەیەکی پڕ بە پێستی هەموو دەنگەکانی زمانی کوردی، بە سەرلەبەری زار و بنزارەکانیەوەمان هەبێ، دەبێ ئەم کۆنسنانت و بزوێنانەمان هەبن:

---

بەوبەڕوایمیە. بەڵام تا ئەمڕۆ کە ژێناسیش، لە زەوینەی پڕوپووچیی بەوبەڕوای ئەسڵی ئەم بەندوباوەی لە زەوینەی پاکژیی ناکار و ئێکەلیرێکملیدا بە چرووك و بێ سایە و مایە، نیشان داوە، کەچی هێشان لە تەرزی بیرکردنەوەی خەڵکدا، ڕەگ و ڕیشەیەکی ئەستووری هەر ماوەتەوە.

(٣)مێژووی "تەبەری"، مێژووی "گزیدە" و "یاقوت الحموي" و هتد    ئەتەوەی کوردیان جارێ بە بەچکەی شەیتان و کاوێ بە بیژییەکانی شەیتان و جارێ بە دێو و درنج و لەم جۆرەبابەتانە لەقەڵەمداوە.

(٤) "یحرّفون الکلم عن مواضعه/ النساء ٤٦"، "یحرّفون الکلم من بعد مواضعه/ المائدة ٤١"، "وقد کان فریق منهم یسمعون کلام الله ثمّ یحرّفونه من بعد ما عقلوه/ البقرة ٥٧"، ئیشتاهلەنە لێرەکۆلی ناڵ ئەمانی و هتد    لە تەورات بەگومانن.

"a, â, e, ê, o, ŏ, u, ü, i, î, t,( d, g) سلێمانیانی mîna: berd, nêr, ard, bor,
gurg, s r, sur, k r, kirdin, atbnim, dam, bedkar, Ez nwe :bi ya

(بەزازایی) و هتد

سەرەتای ئەلفبێتکە کە لە پاشان، بەرە ـ بەرە لەو وێنانەی کە لە بەڕنی کێلەبەرد (میسەللە)، بلێندەکەی میسریێ نەخش کراون، گۆیا کەوتۆتەوە و پێشکەوتووە و ئەلفبێتکەکانی فینیقی و ئارامی و عەرەبی و میللەتانی ئەناتۆلی و هتد یان لێ کەوتوونەوە.

ولاتی فارس ماوەیەکی دوور و درێژ بە خەتی ئارامییان نووسیوە هەتا دەڵێن بە خەتی یۆنانیشیان نوسیووە مەسەلەن پاش ئەوەی سلوقی و ملوقییان پاش ئەسکەندەر، واتە: ئەو ئەلفوبێتکانەی کۆن لە ولاتی ئێراندا بەکارهاتووە، بلێین دوور نییە لە سەردەمانێکدا پێش ئیسلام کوردێکی خوێندەوار ئەگەر هەبووبێ لە یەکێ لە ئاتەشکەدەکان یا بە هەر ڕەنگێك شتێکی زانیبێ، چتێکی نووسیبێ. خۆت دەزانی، وەك لە پێشەوە گوتم، خوێندن و فێربوون لەسەردەمانی کۆندا چتێکی ئەوەندە ئاسان نەبووە.

پێش ئیسلام هەر ئەوەندە دەزانین کە گۆیا زمانی ئاڤێستا، بە زمانی پەهلەوی هەبووە، بەلاَم ڕێی تێ ناچێ کە تەنێ هەر ئەو زمانە هەبووبێ. ئەوە زمانێکی ستاندارتی ئەدەبی ڕەسمیی کاهین و موویەدەکان بووە، بەلاَم ئەمە مانای ئەوە نییە خەڵکی دیکەش زمانی خۆیان نەبووە: فۆلکلۆریان نەبووە، داستانیان نەبووە شیعریان نەبووە. ئەوانەش هەبوون، بەلاَم تۆمارنەکراون. هەر ئەوە تۆماردەکرێ کە بە زمانی ڕەسمیی دەوڵەت و بتخانە و ئاتەشکەدە و کەنیسەکان بووە. ئەوجا من تەنها ئەم پرسیارەم هەیە: ئەوە چۆن وەك زەڕین کوپ دەڵێ، لە پاش دووسەت ساڵ، یان سێ سەد ساڵ بێدەنگی، زمانی فارسیی (ڕوودەکی) بەو سەبك و شێوازە ڕوون و زمانە شیوایەی شیعری فارسی ئاوهای شیعر گوتووە! ئەمە مانای وایە لەو (٢٠٠) ساڵەدا کەس دەمی بە قوتەوە نەگرتووە و هەر وا قروقپ دانەنیشتووە. ئەگەر (ڕوودەکی) بە

لانی کەم پەنجا ساڵێ خەریك نەبووبێ و ئاشقەزمانەکەی خۆی نەبووبێ، چۆن فێری ئەو زمانە جوانە بووە و چۆن ئەو شیعرە جوانانەی نووسیوە؟! لە ڕاستیدا ئەوە مانای ئەوەیە نەختێر لە ئەدەبیات و فەرهەنگی دەرباریەدەر، خەڵکێك هەبووە. ئەو خەڵکەی مووسڵمان بووگن، مانای وانییە وازیان لە زمانی خۆیان هێناوە و بە کونفەیەکوونێ هەموو فێری عەرەبی بووگن.. ڕەنگە چەند کەسێ، چەند مەلایێ، فێری عەرەبی بووبن، بەڵام خەڵکەکانی دیکە بە زمانی خۆیان ئاخاوتوون و هەموو هەستوخوستێکی خۆیان دەربڕیوە..

زمان، خەڵك لە پێشدا بە سەلیقە فێری دەبێ، نەك بە مەنتیق بەڵام پاش ماوەیەك کە ژیانی شارستانی دەوڵەمەندتر دەبێ، هەنگێن زمانی خوێندن و فەرهەنگ دێتەگۆڕێ، ئیدی ئەتۆ ناچاری بە مەنتیق فێری زمان ببی. هەر بۆیەکا، دوو فێرگەی زمانی نحو و سەرفی "کوفی" و "بەسری" لە گەشەکردنی فەرهەنگی عەرەبیدا هاتنەگۆڕێ: یەکیان لەسەر بنەمای سەلیقە و ئەوی دیکەیان لەسەر مەنتیقی یۆنانییان. ئەصمەعی و فەراهیدی و موتنەببی و هتد لە سەرینچاوەی بێ خەوش و ڕەسەنی چۆلستانی عەرەب فێری زمانی عەرەبی دەبوون، هەتا پێغەمبەریش کە منداڵ بووە ناردوویانەتە ناو عەرەبی زمان پاراو و ڕەسەنی "بادیە"، فێری عەرەبیی پوخت بێ، وا دیارە سەلیقە بۆ زمان سەرەتای ڕەوانی و زمانپاراوییە.چەند سەلیقەی زیاتر تێدا بە خەرج بدرێ، واتە چەندە ڕەسەنایەتیی خۆی زیاتر بپارێزێ، زمانەکەت لەباوخۆشترە، چەندە لەو سەلیقەیە دوورکەوییەوە، ئەو ڕەسەنایەتییەی دەدۆڕێ. جا لەبەر هەندێ، عەرەب و عەجەم و تورك و هتد.. گراماتیك، بەلاغەت (مەعان و بەیان و بەدیع)ی زمانەکەیان بۆ ئەوە سەرویەرناوە تا ئەو سەلیقەیە خەوشی لێ نەنیشێ و وەکو خۆی بگوترێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا عەرەبێکی بەغدایی کە ڕەنگە کەس نەزانێ باپیرە گەورەی داخۆ خەڵکی سەماوەیە، کوێیە، ئەوە تووشی بانێك و دوو هەولیی بووە، عامیەکەش دەزانێ و ئەگەر خوێندەوار بێ زمانێکی فەسیحیش دەزانێ. ڕەنگە کوردێ، فارسێ کە فێرە

زمانی عەرەبی دەبیّ (دیارە بە خوێندن) تووشی ئەو بانێك و دووهەواییە نابیّ، باشتری فێر دەبیّ؛ چونکە دوو زەمینەی زمانیی نییە.

" لەبەر ئەوە، ئەوی بە خۆڕسك و زگماك فێری بووە زێتر بە گوێی سەلیقەکەی، باکگراوندە ڕەسەنەکەی دەکا. بۆ نموونە: خوێندکار کە بە عەرەبی ئینشا دەنووسیّ، عەرەبەکە چونکە بە عامی قسان دەکا و بیردەکاتەوە سەپك و ڕشتی ڕستەکانی زێتر بەلای زمانە ڕۆژانەکەیدا دەلەنگێنیّ. کوردەکەش هەر وا دەکا، بەلاّم کابرایەکی زمانپارلوی دەشتەکی کە زمانەکەی خۆی پاراستووە زمانەکەی ڕەوانترە. خولاسەی قسە، کوردیش وردە ـ وردە کەبۆتە خوێندەوار مەلای لیّ پەیدابووە و دیارە فارسی و تورکی و عەرەبیی خوێندوە و ڕەفتاری لەگەلّ ئەو پیتە عەرەبییە ئیسلامییانەدا کە زمانی فارسی و تورکی و عەرەبیش و ئیدیکەشی پیّ دەنووسرێنەوە کردووە، ئەویش بۆ خۆی وردە ـ وردە بیری لیّ کردۆتەوە کە بە کوردیش بنووسیّ (ئیبن ئادەمی کورد، یەك لەو کەسانە بووە)، بەلاّم کوردی نووسین دیارە لە چوار چێوەی شیعر گوتنیّ یا کاغەز نووسینیّ لە نێوان دوو مەلادا، دوو ئینسانی خوێندەواردا، یا مەولوودنامەی پێغەمبەر، یا دوعایەك، یا سەربووردەییّ، یا داستانیّ بەولاوە نەترازاوە...لە کوردستان چەند کەس خوێندەوار بووە؟ لە بیرمە لە ولاّتی قەرەحەسەن ئەگەر کەسیّ ـ ئەویش زۆر بە دەگمەن ـ کاغەزێکی بۆ یەکیّ نووسیبا، تا کۆلکە مەلاییّ، کۆلکە میرزایەکیان دەدیتەوە، چاویان سپی دەبوو.. ئەسلّەن لە شەش حەوت گونددا مەلایەك وەگیرنەدەکەوت.

بەش بە حالّی ڕێنووسی کوردی، دیارە پاش دروست بوونی حوکوومەتی عێراق، سیاسەتی تەشویق و پەرە بە زمانی کوردی، وەك لە پێشتریش باسم کرد، پاشەکشێی پیّ کرا. دوای ئەوەی ئینگلیز حوکوومەتی عێراقی وەکو خۆی ویستی، دامەزراند و مەلیك فەیسەلّی هێنا، کوردی بە ئاغای ولات، ئەوە بوو کوردیشی وەبەرکەوت و شێخی گەورەیشیان کز و کەنەفت کرد و نەیان هێشت ئێمەش بۆ خۆمان ، هەرچەند بە ڕەسمیش ئەو مافەمان درابوویێ، حوکوومەتێکی سەربەخۆ هەر هیچ نەبیّ لە بەشە

کوردستانەکەی عێراقد، دامەزرێنین. بەڵام دیسانەوە کورد چتێکی هەر بە چتیّ کرد.. وازی لە زمانەکەی نەهێنا. ئێستا ئەوەی کە ئەورۆ پێی دەخوێنین و پێی دەنووسین، بەرۆبووی تێکۆشانی خوێندەواری سیاسی و ڕۆشنبیران و حیزب و کۆمەڵە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکان، پێشڕەوانی نەتەوەکەمان جێگایان بەهەشت بێ، کاری باشیان کرد، نەحو و سەرفیان نووسی، چیان نووسی، ئەمەیان کرد، ئەوەیان دروست کرد، هەموو دەڕژێتە نێو گۆماوی ئەوەندە دەسەڵاتەوە کە ئەورۆ لە سێبەری بەهەشتی مەلا مستەفای بارزانی و پارتەکەی و کوڕ و نەوە و نەویرانی نەجیبی کۆڵنەدەر و سەرلەبەری شۆڕشگێرانی نەتەوەکەماندا دەسەبەرکراوە.

ڕێنووسی کوردی کاری زۆر چاکی لەسەر کراوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە کەموکوڕی تێدا نییە. جاریّ حەرفی عەرەبی هەر بە خۆڕسک کێشەیەکی بۆ خوێندن و نووسینی کوردی سازکردووە؛ چونکە وەکو ئەوە وایە تۆ کڵاوی هەباسی لە سەری هەیاسی نێی، یان عەبای حەمەدی لەبەر عەلۆی کەی، ئەدی وە نییە.. ئەی تۆ چاکەتی کابرایەکی پان و پلۆر و چوزانم وزگن لەبەر کابرایەکی ڕیوەڵە و باریك و بنێس بکەی، دیارە، قۆڵەکەی ئەوعێکە و شانی ئەوعێکە و بە بەژن و باڵای ناکا، بەڵیّ ئەوە سەربووردەی حەرفی عەرەبی و زمانی کوردییە..

ئەوجا ئەتۆ ئێستا لە دووڕیانێکدای: یا دەبیّ چارەسەری خۆ بکەی، جا نەك هەر حەرفەکان، کوڕە! سیاسەت، دەوڵەت، هەر هەمووی، بیر لیّ کەیەوە .ئەم قۆناخە دەبیّ قۆناغێکی چارەی خۆنووسین بیّ، دەبیّ ئەو هەلە لە کیسی خۆ نەدەین، دیسان لە مازی تێدا نەچین و بە سیچکان تێی نەهێنینەوە. دەبیّ شەرعی خۆت دەگەڵ دۆستی ڕاستەقانی و دۆستی درۆزن (ئای کە چەند زۆرن!) دەگەڵ دژمنی سەرسەختی خۆتدا بکەی، دەبیّ خۆت ساغ کەیەوە. خۆ لە هەولێر دەگەڵ برادەرانی یەکیەتیی نووسەران: خەڵکی دڵسۆز وردە - وردە باسی ئەوەمان کرد، یا ئەوە بکەین، ئەمە بکەین، ئیدی ئەوە بوو، سیّ و چوار ڕۆژان لەگەڵ خوێندەوارانی کەرکووك و سلێمانی و هەولێر و دهۆکدا دانیشتن و کۆڕمان گەرم کرد، چتهایەکمان گەڵاڵە کرد و بە ناکامی

باش گەیشتین. ئەمن ڕام لەسەر ئەوە بوو کە با جارێ لەسەر ئەوە ڕێك بکەوین کە "ڕێك بکەوین" ئەگەر لەسەر هێندێ چت بە هەڵەش ڕێك کەوتین و وەك دەڵێن، عەیب لە کیژی قازییش دەگیرێ، هەڵە دەکرێ پاشان خۆمانی لێ قورتارکەین، بەڵام هەر لەسەر هیچ ڕێك نەکەوتن، ئەوە کارێکی لە بنیابەدەرە.

گوتمان هێندێ چت بەدەستە خۆمانە، دەکرێ ئەوە چارەسەر بکەین، بەڵام هێندێ چت دەسەڵاتی من و تۆی تێدا نییە، خۆ سواری گای هار نابین

پاشان هەموو چتێ بە زۆرەملێ سەرناگرێ. هەموو چتێ لە سەرەتاوە، تۆ دەبێ خەڵکی لە سەر ڕابێنی، ڕاهێنان مانای چییە؟ واتە: ئاکار و ڕەوشتە کۆنەکەت بگۆڕی، ڕەوشت و ڕەفتارێکی تازە، مەهارەتێکی تازە فێر بی، ئەتۆ بەیانیان کە دێیە دەرێ سواری تومبیل دەبی، ئەگەر هاتو خواسابییانە چرای ترافیکەکە ڕەنگی سوور بوو و ڕاوەستای ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەتۆ عادەتە کۆنەکەت لە بیرچۆتەوە و عادەتێکی تازە فێر بووی، یا منداڵێك کە هەموو ڕۆژێ دەچێتە فێرگە، وەك چۆن بە بێ چاشت نایەتە دەرێ، ئەوهاش دەبێ بۆ ئەو ڕۆژە چیی لە ئامۆژگارییەکانی مامۆستای جێ بە جێ کردووە، هەمووی ئامادە بکا و ئەم کارە وەك خۆراك و یاری و نووستنی لێ ببێ بە عادەت دیارە ئەمەش زۆری دەوێ تاکو تۆ عادەتە چەوتەکانی پێ لە بیر دەکەی. دەبێ تێی بگەیەنی لە حوجرەی خوێندنێ، ئاوها دانیشێ، ئەوها ڕوو لەمامۆستای کا؟ ئاگای لە فەرمایشتەکانی مامۆستاکەی بێ، ئەوە هەموو جۆرە ڕاهاتنێکن کە زۆر بە ئاسانی چارەسەر ناکرێ و زۆری دەوێ. بەڵێ ئێمە ئەو چتانەی کە خۆمان پێوە سەرگەرم کرد، هەموو بڕیارمان لەسەر دان، بڕیارەکان بە کتێب بڵاوکرانەوە. هەموو کەسێ دەتوانێ ئەو کتێبەی هەبێ و وەکو ڕێبەرێ، بە دەستیەوە بێ و بۆ خۆی ئەگەر بیەوێ و سەلیقەی ئەوەی هەبێ عاشقی کارەکەی خۆی بێ و بیەوێ زمانەکەی خۆی خزمەت بکا، بیەوێ لەگەڵ خەڵکدا یەك دەنگ و یەك ڕەنگ و یەك زمان و یەك ئاواز بێ، دەبێ شاقەلی مەردانەی لێ هەڵکا. ئەوانەی لەو کۆڕ و کۆبوونەوانەدا هاوبەش بوون، هەڵبژاردەی خوێندەوارانی نەتەوەکامان بوون ، سەرچڵی خوێندەوارانی کورد بوون،

دڵسۆز و ئینسانی بەرێز و خوێندەوار بوون.. بەڵام ئەوە مانای ئەوە نەبوو کە هەر ئێمە ئالاهەڵگری پێش لەشکر بووین، رەنگە خەڵکی دیکەی لەمە زۆر خوێندەوارتر هەبووبن، بەڵام هەر بەوەندە ڕاگەیشتین..

بەڵام ئەو کارە و زۆر کاری دیکەی لەم جۆرە بابەتانە، بە داخەوە هەر پاش چەند ڕۆژێ، پشتگوێ خران و کەسمان بە دەنگەوە نەهات. بەڵێ هەر دەڵێی، جاری کوردەکە وەك تیلماسکە "تەنەکە"ی تەنك واسا. زوو گەرم دەبێ زوو سارد دەبێتەوە

زۆر جار قسە لە زمانی ستاندارت دەکرێ، ئەمن پێم وایە هیچ چتێ لە خۆڕا نابێ بە ستاندارت، تا لە ئەزموونگەی پێداویستییەکانی مرۆڤدا سەرنەکەوێ. مەبەست لە زمانی ستاندارت، واتە: زمانی فەرهەنگ. نەك زمانی بازاڕی هەولێر و خانەقین و کەرکووك و سلێمانی و نەوٚك و هتد. ئەم ستاندارتەئەفەنییەش کاتێ دروست دەبێ کە هێندەی نان و ئاو و پۆشاك و تومبیل و نووستن و لەم جۆرە باباتانە، مرۆڤ پێویستیی پێ هەبێ. کاتێ تەرازووی خوێندەوارەکەت خۆی لە سەتا بە لانی کەمەوە، هەشتادا دەلەنگێ، هەنگێ، تۆ بلێی و نەڵێی، ئەو ستاندارتەئەفەنییە بۆ خۆی دێتە گۆڕێ. زارە کوردییەکان کە هەر یەکە لە چوارچێوەی پێداویستیی مێژووییەنەی خۆیدا هاتە گۆڕێ، نە بڕیاری من و نە بڕیاری تۆ و نە بە بڕیاری دەسەڵات، بەمانە نەهاتە گۆڕێ، پێداویستیی ژیان ئێلکەم و بیلکەمی لێ کرد، بێ ئەوەی تۆ بە خۆت بزانی، هاتە گۆڕێ.. بەڵێ دەکرێ دەستی بە باڵەوە بگرین و دارەدارەی پێ بکەین، بەڵام نابێ خۆمانی لێ بکەین ئاغای تێلابەدەست..

بەش بە حاڵی خواستنەوەی زاراوەیێ لە زمانێکی دیکەوە، بە نموونە: لە بری ئەوەی لە سۆرانیدا پەنا بۆ وشەیەکی عەرەبی بەرین، با بگەڕێین نەك هەر لە کرمانیجی باکوور، بگرە لە لوڕی، زازایی، هەورامی لە چی وچی، لە هەر زارێکی کوردیی دیکەدا هەبێ، ئەوە وەخوازین و بەکار بێنین. بە نموونە: کۆواری (مەتین)م دەخوێندەوە، برادەرێك باسی سوریالیزم دەکا، مەکتەبی سوریالی، ئەمن لەمێژە لە واژەی "ڕەمز" دەگەڕام، دەمگوت تۆ بلێی کورد واژەی ڕەمزی نەبووبێ؟ ئاشکرایە کە ئێمە "نیشانە" دەڵێین.

چەنانێ من پێم وا بوو واژەی "پێوار" (غەیب) بۆ "ڕەمز" ڕەنگە خراپ نەبێ، بەلاّم بۆم بەدیارکەوت کە تەواو نییە، وازم لێهێنا، پەنام بۆ "نما" برد، کە لە "قیبلەنما"ی کوردی و فارسیدا بەکارهێندراوە و بە مانای قیبلەنوێن دێ. بەلاّم نواڕیم ئەو برادەرە کرمانجی باکوورە "جەڤەنگ" یان "جەڤن" یان "چەڤەنگ"ی بەکارهێناوە.. بەڕاستی من ئەم "جەڤەنگ"ەم پێ زۆر جوان و پەرۆز و ئێسك سووك و باشە، بەلاّم ئەمن "جەڤەنگ"م بە مانای "گاڵتە و فشە" بیستووە ئەوجا، با هەر واژەیەکی کە لە نووسینی یەکدیدامان بەرچاو دەکەوێ یان گوێ لێ دەبێ، هی هەر زاریکی بێ، یەکسەر بەکاری بێنین.. من لە نووسینەکانمدا هەمووی بەکاردێنم، باوەڕ بفەرموو کە داستانەکانی (یەشار کەمال)م تەرجەمە دەکرد، ناچاری دەکردم لە واژەی کوردیی وا بگەڕێم کە بەرامبەر بە واژە تورکییەکان پڕ بە باڵای یەکدیی بن. ئەمن بەم کارە هێندەی بۆم کراوە ژمارەیەکی زۆری واژەی وەسەر کاغەزنەکەوتووی زمانی کوردیم زیندوو کردۆتەوە.

مایەوە، چت بە یاسا و ڕێسا داسەپاندن.. من پێم وایە ئەگەر خەڵکی کوردستانیش وەکو ئاخوندێ ئێرانییێ کە بۆ حەسەن و حسێن شین و شەپۆڕ دەگێڕن، بە تەنگ کەلەپووری کورد و زمانی کوردییەوە بێن، شین بۆ کەلەپور و زمانی کوردیی دەبن سمی شۆڤێنیستانی دژمنی کورددا پێخوستکراودا بگێڕن، هێشتا هەر کەمە بەلاّم من ئەوەشم پێ خۆشە کە ئەگەر بۆ نموونە: لە زمانی فارسیدا، لە جیاتیی "پرۆسێس" "فەرایەند"، یان هەر زاراوەیەکی دیکەی لەبار و لە گوێ سووك و خۆش بەکاربێنین، خراپیی چییە؟ ئاشکرایە چتی لەم جۆرە بابەتانە بە فەرمان و تۆبزی ڕەنگە زۆر جاران سەرپێچیی لێ بکرێ و خەڵك بە گوێی ڕەسمییاتیان نەکەن، وەلێ یاسا و ڕێسا لە کۆمەڵێکی شارستانیدا، ئەگەر بە باب و برایانە بەڕێوەبچی و خەڵکەکەی وەك منداڵی ساوا بە دارداره پێ ڕابهێندرێ، ڕەنگە ئاکامەکانی بێ گێرە و کێشە بکەوێتەوە..

جارێ لە کورستاندا هێشتا کەرتی تایبەتی لە زۆرینەی چتەکاندا وەسەرپێ نەخراوە، ئەمازا لە گۆرەپانی ڕۆشنبیریدا، بوارەکان هەمووی بە دەستی حوکوومەتی

کوردستانەوە بەرێوە دەچێ. بەڵام ناشکرێ ئیلکەم و بیلکەم لە نووسەران بکا کە هەرکەسێ بە گوێی نەکا بڵێ گوێی دەبڕم.

بەش بە حاڵی بە ئیستیلاح ئەو بانێك و دوو هەوایی و پاشاگەردانییەی کە ئەمڕۆ لە بواری ڕۆشنبیریدا هەیە، ئەوە لە سەرێکەوە دیاردەیەکی پێشکەوتنی دیموکراسییەتە، لە سەرێکی دیکەوە، مادامێکی ئێمە هێشتا لەسەرەتای کارداین و فرەش ژەمبردەین، بواری ئۆخەی ئۆخەی هەرکەس بۆ خۆی، جارێ بەری هەروا پان و بەرین دەبێ. لێبەڵێ ئەوە کەفوکوڵێکە و پاش لافاونیشتنەوە، ئەوی بە هێزوپێزەکە خۆی دەسەپێنێ و ئاومالك و وەسەر ئاوکەوتووەکە تەمەنی زۆر کورتە و زوو لەناودەچێ.. وە تا لافاوەکە بە لای ڕۆشنبیریی دەوڵەمەندتر و بە دەنگی بەرسڤدانەوەی پێداویستییە زەروورەکاندا بشکێتەوە، لە زۆر ڕەفتار و ئاکاری پزێو و لەبارچووی پاشماوەی خێڵەکی و ناوچەگەریی زەمانە، دووردەکەوینەوە..

ئەمن لەو زاراوانەی کە ئەمڕۆ بە زاری کرمانجیی باکوور، لەسەر بنەمای هاوبەشی نێوان هەردوو زارەکە: کرمانجی باکوور و کرمانجیی باشوور دادەندرێن، هیچ مەترسییەك نابینم. قوربان ئەگەر کتێبەکەی مامۆستای بە هەشتی جگەرخوێن - هەزار ڕەحمەتی لێ بێ - بە سەرناوی - هەڵەم نەکردبێ - "ئاوا و دەستوورا زمانێ کوردی" وەخوێنێ بە قەناعەتێکی دەگەی کە ئەسڵەن چتی هێندە سەرەکی و هێندە گەورە لەو دوو زارەدا کە لێکمان جیا کاتەوە یان لیکمان دووربخاتەوە، نییە. بە ڕاستی ئەگەر بمانەوێ تۆزێك دڵمان گەورە بێ و لێك نزیکتر کەوینەوە، گیروگرفتەکە زۆر بە ساناییی دەڕەوێتەوە. دوور مەڕۆ، دهۆکییەك کە دەڵی "فەکرن" بە مانای "کردنەوە"، ئەوە بۆ نموونە: لە موکریانیشدا هەر (وەکرن)ە.. یان کە بە شێوەی لای کەرکووك کوردێکی مامشەیی لە قەرەحەسەن دەڵێ "زەردەوە بی" و کوردێکی لای سلێمانی دەڵێ "زەردبۆوە" دهۆکییەکیش هەر دەڵێ "زەربووفە، پەشیمان بووڤە"، یان کە کوردێکی قەلادزەیی، هەولێری، ڕەوانسەزی، مەنگوڕی، مامەشی، بلباسی، باڵەکایەتی، خۆشناوەتی و هتد دەڵێن "لەکەرکووکەوە دێم" یان "لە کەرکووکێرا دێم" خۆ

دمۆکییەکیش هەر دەڵێ "ئەز ژی دمۆکێ فە دمێم" ئەوە مانای ئەوە نییە کە ئەگەر ئێمە لە قووڵاییی زارە کوردییەکانەوە لەو وردە فەرق و سوودانە بڕوانین و لێیزانی دروست بێن، ئەو جوداوازییانەی نێوان هەردوو زارە کرمانجییە ڕەسەنەکەی کوردەواری زۆر لەوە لە یەکدی نزیکترن، کە ئێمە بە چاوی سەرپێیانە و ناشییانەیان دەنۆڕینێ. قسە لەوەیە ئێمە چەندی لێ دەزانین. ئەمن دەڵێم ئەتۆ سەرلەبەری زارەکان بە وردی فێر بە، دەتوانی وەک ئەمانە وەک واژە و ڕستی هاوواتا، لە نووسیندا بەکاربهێنی.

ئێمە دەبێ دوو جت لە یەکدی جوێ کەینەوە: زمانی مەرکەزیی خوێندن و نووسین و چەندین زار و بنزاری جۆراوجۆر، کە نەک هەر کورد، بگرە هەموو نەتەوەکانی سەر زەوین، بەم ئاوایەن. کە دەڵێم زمانی مەرکەزیی خوێندن و نووسین، واتە: ئەو زمانەی کە هەمیشە لە بزووتندایە، بزووتنیش لە بارێکەوە بۆ بارێکی چەندیەتی و چۆنیەتیی گۆڕان، هەر گۆڕانێکیش بڕێ هۆکاری ماددی و مەعنەوی کە پێداویستییەکانی ژیانی ئەو مرۆڤانەی کە پێی داخێون، دێتەگۆڕێ. ئەم گۆڕانکارییەش، وەک لە پێشتریێ گوتم، لە دوو قەڵەمڕەوی گرینگدا کە فێردیناند سۆسۆر لە زمانناسیدای قوبووڵ کردوون، پەیوەدا: زمانناسی نێوزەمان (مێژوو)یی و زمانناسیی هاوزەمان (وەسف)ی کە یەکەمیان لە گۆڕانکاریی ڕەوتی زمان وەدەکۆڵێ و دووەمیان دەپەرژێتە سەر متالای زمان لە برگەیەکی تایبەتیی زماندا. ئەم لکە زمانناسییە کە لە پێناوی چەسپاندنی یاسا و ڕێسا هەرە گشتییەکانی سەرلەبەری زمانانی دنیایێ و دەستنیشانکردنی تایبەتمەندییەکانی زمانی مرۆڤ بە هەموو جۆرەکانیەوە وەک یەک دیاردە بۆ کەوتۆتە هەڵپە و ئەمسەروئەوسەر کردنەوە، بە زمانناسیی هەموانیی نێودەرکردووە. دە بارێکدا کە ئەتۆ ئەم هەڵپە و تەقەلایانەت بۆ دەستنیشانکردنی هەموو واقیعییاتی سیستەمی یەک زمان خەست کردۆتەوە، ئەمە وەک گوتم، زمانناسیی وەسفیی پێ دەگوترێ.بەڵام دە بارێکدا کە ئامانجی زمانناسی بۆ توێژینەوەی فەرق و سوو و جوداوازییەکانی نێوان زمانەکان، چڕوپڕکرێتەوە، نەخوازا بۆ فێرکردنی زمان، هەنگێن لکی زمانناسیی بەراوردکاری دێتەگۆڕێ. ئەم لکە زمانناسییە، کە ئامانجی ئەسڵیی دەستنیشانکردنی

تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی زمانـانی سـەر دنیایـە، دەگـەڵ بنەماڵـەکانی زمانـانی جۆراوجۆردا، بـە زمانناسـیی تـەتبیقی comparative liguisticsی نێودەبـرێ. کـاتێ زماننـاسی خۆی بە لێوەکۆڵینی مێژووی زمانەوە سەرقاڵ دەکا، مێژووناسـیی تـەتبیقی comparative philologyی پێ دەگوترێ. بەڕاستی تێ هەڵکیشبوونی زمانناسی دەگەڵ سەرلەبەری زانستەکاندا بـەلای ئـەوەدا، کـە دەچێتـە نێـو قەڵـەمڕەوی چـەندین ڕشتەی نوێیاوی وەك مرۆناسیی زمان anthropogiacal ;iguistics ەوە، شکاوەتەوە..

لێشاوی بەتەنگەوە هاتنی لەسەر "یەك زمانی مەرکـەزیی نەتـەوەیی" و "یـەك زمـانی فەرهەنگیی هاوەبەش" ڕێك کەوتن و بە نەتەوەیی کردن و بە پۆست مۆدێرنیست کـردن (بە وەلامدەرەوەی نوێباوترین نیازەکانی مرۆ کردن)، زێتر لە جغزی هەوڵ و خەمخۆریی دەسـەلاتدار و ڕۆشـنبیراندا دەخولێتـەوە، نـەك جـەماوەری لـە دنیـا بـێ خەبـەری ڕەمەکی..دەکاتێکدا کە پلەی پەژارە و هەراسانیی ئەو دەستەلاتدار و ڕۆشنبیرانە لەمەڕ ئەم کارە، بە ٦٠ پلەی سەرووی سیفر دەگا، خەڵکە لە دنیا بێ خەبەرەکـە لـە دووڕای تەماشادەکەن. بەش بە حاڵی ئەوەش کە ڕۆشنبیرانێ بە پەرۆشـەوە هەڵپـەی ئەوەیانـە کە زاراوە بۆ مانا نوێباوەکان دابنێن، ئەمە لـە چـارچێوی ئـەو ئامانجانـەی کـە دەگـەڵ ژیانی خەڵکەکەدا هاوسەروکارن، یان زۆر لە پێش کاروانەکەوە سەڵەف سەڵەفێنە دەکا، یـان زۆر لـە دواوەی لۆقـە دەکـا.. ڕاسـتیت گـەرەکـە، کـاتێ دەبینـی لێشـاوێ زاراوەی پڕبەپێستی یاسا و ڕێسای زمان و پڕبەباڵای مانا و چەمکی پێویستی فەرهەنگیی لـەباو و لێشاوێکی دیکەی سەقەت و سوقووتی واژە و زاراوەی یەك لـە شـام یـەك لـە حەڵـەب وەك هەر ئامێرێکی پێویستی ژیـان وەسـەر زاری خوێنـدەوار و نـەخوێندەوار دەکـەون، ئەمـە لـە ئاکـامی کاردانەوەیـەکی پشـووکورت و بـێ سـەروبەرەوە سـەرهەڵ دەدا. کاردانەوەش، بۆ خۆت دەزانی هەر کـەفوکوڵێکی کاتییە و وەك تـڕی بـن گـۆم دەڕاو و دەبڕێتەوە. ئەوجا لێرەدا حەزدەکـەم لەمـەڕ ئـەم تێکـەڵی و پێکەڵی و پاشـاگەردانی و کلك و گوێ کردن "deformation" و واژە و زاراوە لە جێی خۆدا بەکارنەهێنان و ڕێ بۆ چەواشەیی و بانێك دوو هەوایی خۆشکردنە، دەدوێم:

زمان له جەنگەی زارە ڕۆژوزەوندەکانی زماندا، دەگەڵ دنیادا لە شەڕ و هەڵاویگردا، جارێ وەک کیسەڵ دە خۆ لە قەپێلکدا وەشارتن و جارێ وەک هەرێز لە فراژووبوون و گەشەکردندایە. هەرچی بنزارەکانن، دە جفزی داخراوی خۆدا، خۆ خاو دەکەنەوە و کێشمانی باڵی خۆیان دەدەن و بە بێ هیچ سەرسوڕمانێکەوە بە شان و باهووی خۆیاندا هەڵدەڵێن. لافاوی دنیا لە زمانەوە هەڵناسێ. لێرەدا لە گوێ گادا نووستن و بێ جووڵەییەک هەیە. بەڵام زمانی دەسەڵاتدار و ڕۆشنبیر کە هەمیشە لە هەڵپەی ئەوەدایە کە نێو بۆ ڕاستییەکانی دنیای بیانی کە زمانێکی هەیە بە خێرایی وەک لافاو لە هەڵستاندایە دابنێ ناچارە ئەزمیان کا، ناچاری فرەوان بوونەوە و بزووتنەوەیە. کاتێ کە لە خۆڕا بۆ وەرچەرخانێکی ڕیشازۆی ئەوتۆ کە بتوانێ بێ جووڵەیی و جووڵە تێک بپەستێ و دە ڕێڤاژۆ (وتیرە)یەکی هاوبەشیان بپەستێ، لە گۆڕێدا نییە، سەنتەرزمانی کە خۆی خرمەڵداوە دەگەڵ زار و بنزارەکان (سەرچاوەی یەکماڵی و یەکبوون و لێکدی هاڵی بوون)دا زمانی هاوبەش پێکەوە بنێ، ناتوانێ پێوەندی دەسەبەرکا. ئاشقەبیانیەتی، لەخۆبەدەری، لێکدی دابڕان، هەروا درێژەی هەیە و دەتەنێتەوە. ویڕای لێکدڕدۆنگی لە نێوخۆدا دەگەڵ یەکدیدا ڕێک کەوتنیش، لەو ڕووەوە کە هەر یەکە بەرەو زمانێکی سەربەخۆی سەنەتەرزمانی هەنگاوهەڵ دەگرێ، زمانی خوێندن و نووسینی کوردی بە هەردوو زارە سەرەکییەکەوەی دەگەڵ زمانی تورکی لەلایەکەوە و زمانی فارسی لە لایەکی دیکەوە و زمانی عەرەبی لە لایەکی سێیەمەوە، دە کێشە و ململانێدا بە هەمان ئەندازە، لە هەڵوێستێکی چوونیەکدایە. جارێ خۆ بەش بەحاڵی پێوەندیی زمانی کوردی بە زمانی فارسییەوە، گۆیا ـ کە وا نییە ـ یەک زمانن، لە چەواشەکردنێکی ئەنقەست بەولاوە چیدیکە نییە. منداڵە کوردێ، یان هەر ڕۆشنبیرێکی کورد لە ئێران مادام ناچارە بە غەیری زمانەکەی خۆی، بە زمانی ڕەسمیی فارسی هەموو چتێ بخوێنێ و بخوێنێتەوە، ئاشکرایە کە زمانیشی و مێشکیشی بە زمانێکی غەیری زمانی خۆی ڕادێ، بە زمانەکەی خۆی، یا جاروبارێ کۆڤارۆکەیێ، کتێبۆکەیەکی قاچاخ یان نیوەقاچاخیش بخوێنێتەوە، ئەوە هەرگیز جێی زمانە ڕەسمییەکە ناگرێتەوە. ئەگەر

زمانی فارسیی گۆیا هاونەژادی زمانی کوردی، بە تایبەتی لە بواری زاراوە فەرهەنگییەکاندا، کوردیی بە دەردی با و دواری شڕ بردووە، خۆ زمانی تورکی و عەرەبیی یەکجار لە زمانی کوردی بیانی، ئەوە نەك هەر لە بواری واژە و زاراوەدا، بگرە لە بواری ڕستەڕێژی (نحو)یی قالبی خۆمالیشدا ـ تەشپیات نەویٚ ـ بە دەردی کورتانەکەی خەری جەجالٚ و مێرووله بردووە. باشە ئەم دیاردە کۆمەلآیەتییە لە کوێ ئاودەخواتەوە؟ ئەمە بە شێوەیەکی ناخۆڕسکانە دەگەلٚ مرۆڤدا ڕەفتارکردن، بە ڕواڵەت خۆ لە نەتەوەیەکی دیکە بە نێوی یەك نەژادیی زمان، یان یەك ئایینی، و خۆ بە هەقدار و براگەورەی نەتەوەیەکی دیکە دانان، لەلایەکەوە و لە گەوهەردا تواندنەوە و سەرومالی ڕەهەندەکانی هەبوونی ساف لە ساف بە تاراج و تالآن و برۆ بردن، لە لایەکی دیکەوە، ئاودەخواتەوە..هەڵەی سەنتەرزمانی لە چی کەوتۆتەوە؟ لەو دووفاقی (تناقض) یە کەوتۆتەوە کە لە لایەکەوە دەیهەوێ زمانی فەرهەنگی هاوبەشی نەتەوەیی دەسەبەر بکا و لە لایەکی دیکەوە وا فەرزی مەحالٚ دەکا کە زمانێکی لێك شاق و جووت و ڕەفتەنیی میللیی بە شێوەیەکی بەرچاو و زەق و زۆپ، هەیە.(بڕوای بە نیوەچڵی حالی بوون بەوە کە گۆیا ئەو زمانەی دەیهەوێ بیهێنێتە گۆڕێ، بۆ خۆی هەیە، هەڵەیەکی بەڕەگ و ڕەگەما ئایدیۆلۆجییە و دەرگا بۆ ئەو حاڵەتە، بۆ ئەو ئیدیمایە دەکاتەوە کە چتێکی تۆ دەتهەوێ ئیسپاتی بکەی وەك ئیسپاتکراوەکە، بەکاربێنی (استخدام المدّعی استخدام عمليّة الاستدلال). ئێمە لەو هەموو هەڵپە و تەقەلایانەدا لەو نیگایەوە لە زار و بنزارەکانی دەوروبەر ناڕوانین کە ئەمانە هەریەکە خاوەنی بتوونیی خۆیەتی و هەریەکە بە سەنگ و تەرازووی خۆی خاوەن سیستەم و بنیاتێکی خۆیەتی و هەریەکە دەتوانێ بەش بە حالی خۆی بەریەرەکانێ و سەرپێچیی خۆی بە چالاکییەوە بنوێنێ، نەخێر لەو نیگایەوەیان دەتۆڕینێ کە بە کامێرایەکی زۆر سرکەوە لە نێو موعەجچیل (accelerator)ێکی هاوزەمانی و ناوزەمانیدا، بچینە نێو هەموو تۆولۆ و سەرەتا و بنەتا و یاسا و ڕێسایەکانی گەشەکردنی زار و بنزارە کوردییەکانەوە و چۆن ـ چۆنی ڕژانە نێو دەریای گەورەی سەنتەرزمانییەوە. ڕوونتری بێژم، ئێمە بۆ ئەم زار و بنزارانەی زمانی

کوردی لە چەمکی زۆر فرەوان و ئەنجا لێرەوە، ڕووت "تجرید"کردنی زمانی کوردییەوە، وەك بوونەوەرێکی ڕووت (abstract)، واتە: وەك ئەندێشەیەکی وەدی نەهاتگ هەنگاوی لێوە هەلگرین، وای بۆ دەچین هەر واژەیەك کە بە ڕەگ و ڕەگەما کوردییە، یان لە بنزارێکی زۆر لاچەپدا بەکاردەهێندرێ، بێ ئەوەی تووشی هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك بێ، بە ئاسانی بلاّودەبێتەوە و بێ گرفت و کێشە بە ئامانجی خۆی دەگا.

واتە: لە لایەکەوە، کە ئەوە دەیان ساڵە ساغ بوونەوەیەکی تادێ قوولّ دەبێتەوە ـ ی و ئەو هەموو بۆ ڕەخساوییەی سۆرانی (بە پشتیوانیی ئەو زەخیرەنهێنی (potential)یە بە هێزوپێزەی کە تا ئێستا بە لایەکیدا یەکچاو کردۆتەوە، واتە: بە لە ئاوا و دەستوورە تایبەت بە زار و بنزارەکانی دەورووبەری خۆی کەلك وەرگرتن) ئاسرێ و لە لایەکی دیکەوە بە جۆرێ هەلّسوکەوت دەگەلّ زار و بنزارەکاندا دەکرێ، وەك هەر لە هیچ ململانێیەکدا نەبن و وەك ماستی مەییویان لێ هاتبێ   کەچی زار و بنزارەکان نەك هەر دەگەلّ سەتەرزمانیدا، بگرە تەنانەت دەگەلّ یەکدیشدا لە ململانێ و گوێپچڕ ـ گوێپچڕدان.

زمانی کوردی ئەوڕۆ دەبەرابەر چار تەرح (تێز)ی تێهەلکێشی بە گرێوگۆلّدا بە گیرماوە: ١) زۆرینە بەرابەر بە کەمینە، ٢)کەمینە بەرابەر بە زۆرینە، ٣) کەمینە بەرابەر بە کەمینە، ٤) چارەی خۆ نووسین بەرابەر بە سیاسەتی نامرۆڤانەی شۆڤێنیزمی پانئێرانیزم و پان تورکیزم و پان عەرەبیزم. بۆ لەم خەبات و کێشە گەورەی چارەنووس سازەدا، زمانی کوردی ناچارە کەلك لە هەموو ڕەهەندەکانی هەبوونی وەربگرێ. لە زەخیرە نهێنییەکەی خۆی، لە ئیرادە و ویستی خۆی، لە یەکپارچەیی potesialی خاکەکەی، لە ڕەوتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی نەتەوەی کورد، لە یەکپارچەیی ئابوورییەکی قاچاخی هەزار ساڵەی خۆی، لە مێژووی خۆی، لە ئەفسانەکانی خۆی، لە گومان لە هەرچی دژمن و دۆستی بەرژەوندچی و درۆزنی خۆی و

هتد

ئەمەش بە مەنتیقی دیالێکتیکی حاشاهەڵنەگری ڕەوتی گەشەکردن و گۆڕانکارییەکانی ژیان، لە ڕووی مێژوویی ـ مەنتیقییەوە، کە هەردووکیان وەک وێنەیەکی ڕەش و سپی، یەک ڕاستی دەردەبڕن.

**وەکو** دیاردەیەک، ئاگاییی نەتەوەییی کورد کزبووە، یان کزە، ئەوە هەرچەندە کە باسی پێوەندیی زمان بە هەموو ڕەهەندەکانی هەبوونی نەتەوەییەوە، زۆر لـە پێشـترێم عەرز کردن، بۆ خۆی لە بنەڕەتدا و بەش بە حاڵی نەتەوە ئاسیایی و ئەفریقاییەکان، بە گوێرەی شیکردنەوەکانی مارکس لە سەرەتای ساڵی ١٨٥٣دا لەمەڕ چـەمکی پێکهاتنی شێوەی ڕەنێوهێنانی ئاسیایی، هەشت وتار لـە ڕۆژنامەی نیویـۆرک دەیلـی تریبـوون دا دەربارەی هندستان بڵاوکراونەوە. مارکس لەم نووسینانەیدا لـەو بـارەوە کـە لـە ئاسـیا پێوەندییەکانی خاوەنیەتی (مالکییەت) زۆر لەمێژە بەر گۆڕانکاری نەکـەوتووە، زۆر بـە تایبەتیی وەکۆڵیوە. دە نامەیەکیدا کە لە ٨ ی جۆزەردانی سـاڵی ١٨٥٣دا بـۆ ئێنگلسـی نووسیوە دەڵێ:

"بـەش بـە حـاڵی پـەیدابوونی شـاران لـە ڕۆژهـەڵاتدا، دەڵـێ: لـەو زانیارییانـە زێـتر سەرنجبزوێن و زەق و زێپانەی کە لە گەشتەکەی بێرنیر دا لەمەڕ ئیمـپراتۆریی مۆنگۆڵ نووسراون، باشتر وەگێرناکەوەێ بێرنیر، کە هەقیەتی، ئەو دیاردە بنەماییانەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا (مەبەستی تورکیا و ئێران و هندستان)ە بەرچاودەکـەون، لـە نـەبوونی مالکییـەتی تایبـەتی زەویـدا دەبینـێ کلیلـی ڕاسـتەقانیی بەهەشـتی ڕۆژهـەڵات لێرەدایە."

ئێنگلس لـە وەڵامـی نامەکـەی مارکسـدا، ڕای مـارکس بـە ڕاسـت دەزانـێ و نـەبوونی مالکییەتی زەوین لە چاو نەبوونی هەلومەرجی لەباری هەرێم و زەوین دەزانێ. ئێنگلس لـەو ڕوون کردنەوانـەیدا، دەڵـێ: بـە تایبـەتی دەشـت و پێدەشـتی زۆرووزەوەنـدەی زەوییزاری بوورە و گەچۆڕ و بێ بڕشت لـە چـاو نـەبوونی مـالکییـەتی زەویـندا، دەور دەوردەگێڕێ. لە ڕۆژهەڵاتدا ئاودێریی کشتوکاڵ بە مەرجی یەکەم دەزانـێ و دەڵـێ ئـەم کارەش یان پارێزگایەکان، یان ویلایەتەکان، یان دەسەڵاتی مەڵبەند (مەرکەزی) جێ بە جێ دەکـەن. بـە پێـی ڕای ئێنگلـس دەوڵـەتانی ڕۆژهـەڵات تـەنیا سـێ جـۆرە شـێوەی سەرەکیی سامان دەردەست کردنی هەیە: ١) بـاج (تـاڵانیی نێوخـۆ) ٢) شـەڕ (تـاڵانیی

نێوخۆیی و دەرەکی) ٣) کاری بێگار و سوخرەکێشی کە لە دڵەڕاوکێی دووبارەبوونەی ڕەنێوهێنان دەکەوێتەوە.

بەڵام مارکس ئەم جۆرە تەفسیر و لێکدانەوە جوغرافییەیەی کە ئنگڵس بۆ دیاردەکەی کردبوو و پلیخانۆفیش سەلماندبووی بە لێکدانەوەیەکی پڕبەپێست و پڕبەباڵای نەزانیبوو. مارکس لەو نامەیەدا کە بۆ ئنگڵسی لە ١٤ی جۆزەردانی ساڵی ١٨٥٣دا نووسیوە، دەڵێ: ئەگەران و چەقینی ژیانی کۆمەڵایەتیی هندستان هۆی ئەوە بوو حوکوومەت و کۆمەڵانی گوندی (چەند شارێ نەبن) لە نێو ئۆرگانیزاسیۆنێکی دنیایەکی چکۆلەی تەواو جوداوازی سەرداخراودا، بەرهەمیان بە بێگار و سوخرەکێشی ڕەنێودەهێنا. لە بەشێ لەم زەویوزارانەی گوندییاندا کشتوکاڵ بە هاوبەشی و هەرەوەزی دەکێڵدران، بگرە لە زۆربەشیاندا گوندی هەر زەویوزاری خۆی دەکێڵا. مایەوە زەویوزارێ کە نەدەکێڵدران، ئەوانەش وەک لەوەڕگە و زۆزان، بەکاردەهێندران. ژنان تەشییان دەڕست، تەون و تەونکارییان دەکرد "لە ڕوویەکەوە، وا بەدیاردەکەوێ لە ئاسیا سەرلەبەری موسڵمانان قات و قڕی و نەبوونی مالکییەتی زەوینیان کردبوو بە سەرەتا (مبدأ)یەک و وەک هەر بوونی بوون ئاساییشی نەبێ وای بەسەر هاتبوو."

مارکس بۆ خۆی دەیزانی کە قەتیسمان و چەقینی کۆمەڵایەتی لە ڕۆژهەڵاتدا بە تەنها هۆکارە جوغرافیاییەکان لێک نادرێنەوە. واتە: ئەو، لێکدانەوەی دیاردەی چەقین و قەتیسماویی ژیانی کۆمەڵایەتیی ڕۆژهەڵاتی بە هۆکاری جوغرافی و لە ڕووی چەندین دیاردەی مێژووییینەوە گونجانیانی، بە بیروبۆچوونێکی هەر وا بە ئاسان لەقەڵەم نەدەدا، بە پێچەوانەوە، دەیگوت: لە جیاتیی ئەوەی ئەم چەقین و ڕاوەستاوییە، دەکرا لە ڕووی دیاردە مێژووییینەکانەوە بە خراپی و نالەباریی هەلومەرجی جوغرافیی ڕۆژهەلات لێک نەدرێتەوە، بەڵکو دەتواندرا بە ڕەخسانی دەرفەت و بواری زۆر لەوە گەورەتر ئەم دیاردەیە لێک بدرایەتەوە. بە نموونە: گەشەکردنی یۆنانستان بە پێچەوانەوە، بە خراپی و نالەباریی هەلومەرجی جوغرافی لێک دەدرێتەوە. جا بە ڕاستی گەشەکردنی شارەکان و پیشەسازییەکان لە یۆنستانی کۆندا، بەوە کە زەویوزاری بە

برشت و لەباری بۆ کشتوکاڵ نەبوو، لێك دەدرێتەوە. ئیدی لەبەر ئەمە وەکە ڕێغرانی کاری بیگاری و سوخرەکێشی لە لایەن دەسەڵاتێکی مەرکەزییەوە، بە هەلومەرجی جوغرافی، لێك نادرێتەوە. دەبووو هەر هیچ نەبا، داوودەستوورگەلێ کە لە سەرەتاوە ژیانی خێڵەکی هێنابوونیە گۆڕێ و لە پاشترێ کاریگەریی سیستەمێکی ، لە ڕووی ئابوورییەکی هەریەشخۆ (self - sufficciency)وە دەبا لەبەر چاو گیرابا. هەروەك لە نیگای تەنها جوغرافییەوە بۆ گرفتەکە چوون، دەبوو بە هۆی ئەوە کە بابەتەکە لە نیگای تەکنیکێکی بەرتەسکەوە تەماشا بکرێ. لەبەر ئەوەی کە ویتفاگا ، شاگردی پلیخانۆف کە لەبارەی تەرزی ئاسیایی ڕەنتوهێنانەوەی وەکۆڵیوە، لەبەر ئەوەی کە گرفتەکەی تەنها بە گرفتێکی تەکنیکی زانیوە، تەرزی ڕەنتوهێنانی هەر بە جارێ بەولاوە ناوە و بە چەمکی "کۆمەڵێکی هایدرۆلیکی" گەیشتبوو و هەروەك خۆی لە هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەکان نەبان کردووە، هەروەها گەشەکردنی مێژووشی بە هیچ لەقەڵەم داوە و تووشی ئەو هەڵەیە ببوو کە تەرزە لێك تاق و جووت و دووفاقەکانی ڕەنتوهێنانی لە چارچێوەی ئەم چەمکەدا کۆکردبوونەوە.

هەر وەك لەو ڕوونکردنەوانەی سەرەوەدا بە دیارکەوت،، مارکس مەبەستی لە دەستەواژەی (base)ە. واتە: "دەسەڵاتی ناوین" لە نیگای مارکسەوە دامەزراوێکی سەرخانە. مارکس جوداوازیی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا، نەك لە جوداوازیی جوغرافیدا، بەڵکو لە "زۆر پەست و نزمیی ئاستی شارستانیی ڕۆژهەڵات و فرەوانیی زەویوزار"دا، دەدیت. ئەمەش هەلومەرجی مێژووییە، نەك هەلومەرجی جوغرافییە. واتە ئەوەی کە لێرەدا گرینگە بگوترێ، پەست و نزمیی ئاستی شارستانی و دەگەڵ زەویوزارێکی زۆر فرەواندا ڕووبەڕووبوونەوەیە. ئەگەر پێویست بە ڕوونکردنەوەی زێتر هەبێ، مەسەلەکە لە نیگای مارکسەوە، لە بەردەوامیی نەگۆڕانی باری کۆمەڵایەتیی ڕۆژهەڵات، لە بەردەوامیی مالکییەتی زەویوزار (زەویوزاری خێڵەکی)ی بە شەراکەت و نەگۆڕانی کاردابەشکردنی کۆمەڵایەتیی بە خوابشتی خۆی، کەوتۆتەوە. لەمەڕ بەردەوامیی مالکییەتی (مالکییەتی خێڵەکی) لە ڕۆژهەڵات، مارکس بە کورتی دەیگوت:

"مالیکییەتی هاوبەش (مالیکییەتی خێڵەکی) ی هاوبەش، وەك لە ئاسیا بەرچاودەکەوێ شێوەی مالیکییەتێکی سەرەتاییە و خۆڕسك بەخشیویە. بەڵام ئەورووپای لێ بترازێ، لەسەرلەبەری دنیایێدا، کۆمەڵانی گوند و سیستەمی دەسهاتەکانی دەوڵەت (سیستەمی باج و خەراج) لەسەر بنەمای مالیکییەتی زەویوزاری هاوبەش، ئەوەندی بواری بۆ ڕەخسابێ، بە شێوەیەکی خۆڕسکانە و بە بێ ئەوەی فاکتەرە مێژووییەکان دەستیان لە کارەکەدا هەبووبێ، پێکهاتوون. لەبەر ئەمە گەشەکردنی یۆنانستانی کەونارا کە دەتوانین لە مێژوودا بە "یەکەم" گەشەکردنی زەوین دەزانێ، بە هۆی تاخمێ فاکتەری تایبەتییەوە هاتوتەگۆڕێ و بەدیارکەوتووە. واتە: دە کاتێکدا کە بۆ یەکەم جار لە یۆنانستانی کەونارادا هاتنەگۆڕێی مالیکییەتی تایبەتی، بە شێوەیەکی ناخۆڕسکانە ڕووی داوە، کەچی لە کۆمەڵانی ڕۆژهەڵاتدا، بەردەوامیی مالیکییەتی هاوبەش، هەر لە خۆڕا و خۆڕسکانە بووە. بەڵام ئەو فاکتەرە تایبەتییانەی کە بۆ یۆنانستانی کەونارامان ئاماژە پێ کردن، واتە: ئەو داوە نێرکە تاکەی کە بە کۆمەڵەوەی گرێ داوە، بڕیوە، کەچی ئەم بڕین و لێك دابڕینە چتێکی سروشتی و خۆڕسکانە نییە.

بەش بە حاڵی جوداوازیی نێوان شێوەی ئاسیایی ڕەنتوهێنان و بەردەگی و دەرەبەگایەتی، مارکس دەڵێ: "سیستەمی بەردەگی کە بە تەواوی بەشێکی کۆنکرێتی بەرهەمی کاری زێدەی تێدا لە دەست بەردە دەستێندرێ، هەر بە تەواوەتی دەگەڵ شێوەی ئاسیایی ڕەنتوهێناندا کە لە دژی دەرەبەگایەتییە و تەواوی هەلومەرجەکانی ڕەنتوهێنانی بە دەستەوەن، نەك دە بەرابەر خاوەن مولکی تایبەتی، بەڵکو دە بەرابەر دەوڵەت کە مالیکییەتی هاوبەشی زەویوزار بەڕێوە دەبا و پارێزگاریی لێ دەکا، ڕووبەڕوو بۆتەوە. سەبارەت بەمە، دەوڵەت بۆ ئەوەی سود (فائدە)ی زەویوزار وەرگرێ، پەنا بۆ زۆرەملێ نابا و گوندی وەك پەیڕەو (أتباع، رەعیەت) هەست بە بەرنەرکی (موکەللەفییەت)ی خۆیان دەکەن. هەر بۆیەکا، بەردەی زەویوزار (أقنان)، یان گوندی چکۆلەی سیستەمی دەرەبەگایەتی، لە گوندیی کۆمەڵی تەرزی ئاسیایی زێتر لە ژێر وشاری سیاسیدایە و ناچارە مل بۆ ئەم وشارە بدا. سەبارەت بەوە کە دە

کۆمەڵی تەرزی ئاسیاییدا مالیکییەتی تایبەتیی زەویوزار نییە، ڕەعیەت واتە: بەرنەرك، باج و خەراج بە کەسێ کە، بە دیسپۆت (مستبد)ێ، واتە: نمایینەی "کۆمەڵی بالا"، ئەوەی کە مالیکییەتی هاوبەشی بەڕێوەدەبرد و پارێزگاریی لێ دەکرد و سەردەمانێ دەنگی دلێر بوو و دەیخوڕی، دەدا. واتە: "سیستەمی باج و خەراجی دەوڵەت کە دە کۆمەڵی تەرزی ئاسیاییدای دەبینین، لە ناخی کۆمەڵە سەرەتاییەکان، لە دابودەستووری تەمەن هەزاران ساڵی پاشەکەوتکاری لە خۆراك بۆ ڕۆژی ڕەش بە یەدەك پاشەکەوتکردن و پۆسات و پێداویست بۆ دواڕۆژ دەسەبەرکردن لە بنیاتی ئەو کۆمەڵە ڕا هاتۆتەگۆڕێ و گوندییەکان دەرکیان بە گۆڕانی ژیان، یان لە دژی وان گۆڕانی دامودەزگایە گشتییەکان (وەك جاران کارنەکردنیان) زۆر بە درەنگەوە، کردووە. لە پێشان دە کۆمەڵە سەرەتاییەکەی خۆیاندا، بە خوایشتی خۆ، بەرهەمێکی کە لێیان زێدە بوو، بۆ ڕۆژی تەنگانە بە شەراکەت پاشەکەوت دەکرد، بەلام ئەم هەلومەرجە بە دەم ڕۆژگارەوە گۆڕانی بەسەردا هات، کۆمەڵی سەرەتایی (کۆمۆنە) بەسەرچوو، یەکسانی و بەرابەری باوی نەما نایەکسانی و نابەرابەری، بەردە، مسکێن، کرێکار، ئاغا، شێخ، دەرەبەگ، سەرەك هۆز و میر جێی وانی گرتەوە، کردەی زۆرینە و بردەی کەمینە بوو. ئیدی پاشەکەوتەکە بە هاوبەشی نەدەکرا، دەسەلاتدار دەیکرد کە دەشی کرد، ئەوە تەنها بۆ بژیو و بەرژەوەندیی خۆ و چینی پارێزگاری خۆی دەیکرد. ڕەعیەتی بێ دەسەلات لە تەنگانە و ڕۆژی ڕەشدا لە برسان دەمردن. مەبەستم ئەوەیە، کە لە کۆمەڵی سەرەتاییدا بە خوایشتی خۆ و بە بەرابەری پاشەکەوتیان دەکرد، وەلێ ئەگەر پاشەکەوت کردنەکە هەر بە خوایشتی خۆیان هەڵوەشاباوە و گۆڕانکارییەکان بە خوایشتی هەمووان ڕوویان دابا و بی ئەوەی کەس زۆر لە کەسێکی دیکە بکا، کارەکە زۆر خواسایی و خۆڕسکانە دەبوو، بەلام بەو جۆرە نەکەوتەوە.

دەربارەی دابەشبوونی کۆمەلایەتی (چین – چین بوونەوەی کۆمەل) و بنیاتی چین لە بیچمی تەرزی ئاسیاییی ڕەنێوهێنانیدا، گوتیشمان کە لە کۆمەڵدا، مالیکییەت، مالیکییەتی خێلەکییە، هاوبەشییە. بەلام ئەمە بە مانای ئەوە نایە کە لە چارچێوەی

تەرزی ئاسیاییی ڕەنێوهێنانی کۆمەڵی سەرەتایی بێ چینی ڕۆژهەڵاتدا، وەك یەکدی دەچن. مارکس و ئنگڵس کوتوویانە: کاری خێزان (ڕەنجدان)، پشت بە مالیکییەتی هاوبەشی خێڵەکی و هەر لەسەر ئەم مالیکییەتە گەیشتۆتە (گۆڕاوە) حاڵەتی کاردابەشبوونی کۆمەڵایەتی (بەڵام کاردبەشبوونی ڕاستەقینە نییە) و بنیاتی کۆمەڵایەتیی خێزان (بەڵام بنیاتی چینایەیەتیی ڕاستەقینە نییە). مارکس و ئنگڵس بەم بنیاتە کۆمەڵایەتییەیان کە بنیاتی خێزانیی لەسەر بنەمای تەرزی ئاسیاییی ڕەنێوهێنان لەسەر دامەزراوە، *سیستەمی کاست* (جۆرە چینایەتی"یەك کە لە هندستان هەیە) نێوبرنووە. ئەوجا ئەم سیستەمی کاستی تەرزی ئاسیاییە، دەگەڵ کۆمەڵانی چین ـ چینی ڕۆژاوادا، یەك بابەتن، یان یەك بابەت نین، ئەمە بۆ دەمەتەقێ دەشێ. دەتوانین بڵێین دە حاڵاتی دیار و کۆنکرێتدا، کاستەکان و چینەکان هەر هەمان چت نین. ئەگەر لە سەرێکەوە، کاستەکان دە چارچێوەی بنیاتێکی کۆمەڵایەتیی کۆنکرێتدا، هەر بە ڕاستی وەك چینەکانی ڕۆژاوایی بچن، ئەوسا دەبێ ئەوە دەسنیشان بکرێ کە ئەم وەك یەکدی چوونە، بە چ کێش و تەرازوویەك پێوانە دەکرێ؟ وێڕای ئەم هەموو بابەتە دەمەتەقێ هەڵگرانە، ئەگەر چتێکی بێ چەند و چوونمان دە هەگبەیدا هەبێ، هەر ئەوەیە کە بڵێین، مارکس سیستەمی کۆمەڵانی بابەتی شێوە ئاسیایی، بە کۆمەڵێکی بێ چین نابینێ. مارکس سیستەمی کاستی زێتر بە جۆرە پێوەندییەکی چینایەتیی چەوسێنەر ـ چەوسێندراو لەقەڵەم دەدا. جا بە ڕاستی هێندێ جار کاستەکان بە تەنها وەشارتنی ئەنتیگۆنیزم (ناهاوئاهەنگ)ی چینایەتییەکان داناکەون، بەڵکو ئەم ئەنتیگۆنیزم (دووفاقی و ناتەبایسی)یانە دە گێژاوی شلوێدا نقوم دەکەن و پەردەپۆشیان دەکەن. بە ڕاستی ئەم پێوەندییە چیانایەتییە تەموژاوییەی نێو بنیاتی ئەم سیسەتەمە، لە پێوەندییەکانی بەردە و بەردەدار، کەمتری گۆڕانکاری تێدا هاتبووە گۆڕێ. بەڵام لەبەر سەرەتایەتیی بنەمای مسکێن (serf) ئەم پێوەندییە کە لە ڕووی گەشەکردنەوە لێك دەدەینەوە دەبینین لە پێوەندیی سیستەمی چینایەتیی بەردەیی پرمەترسیتر و پیوەندییەکی غەددارترە. چونکە گەشەکردنی کۆمەڵ لە سەرویەند

(قۆناخ)ی کشتوکاڵدا تەنها و تەنها بە ڕووخانی مالیکییەتی هاوبەشی باوک سالاری، نابێ سەرناگرێ.

هێندێ زانای سۆسیۆلۆگی گەشەکردن و گۆڕانکاری، دیاردەکە وە بەرێ هۆکاری مێژوویینە و جوغرافییانە و کۆمەڵەگی ـ ئابوورییانە لێك دەدەنەوە: بەلام یەکەم، کورد هەمیشە بە تەواوەتی هەبوونی وەك یەك خاك و یەك کۆمەڵ و یەك ئابووری و یەك زمان، بە ڕەسمی دە سای یەك دەوڵەتی مەرکەزیدا نەبووە، بەلام دەتوانم بڵێم، لە هاوپێوەندیی ئابووریی قاچاخدا هەرگیز نوانەکەوتووە (ئیسماعیل بێشیکچی/ ڕژێمی ئەنەدۆلی ڕۆژهەلات). شەرفخانی بتلیسی ئەم هەبوونی نەتەوەی کوردەی دە شێوەی سیاسیدا: دەسەلاتی تەواو لە چوارچێوەکانی ڕژێمی مالکییەتی زەوین (سەرۆك هۆزلیەتی)ی سەربەخۆ، ڕژێمی نیوە مالکییەتی زەوین و بازرگانیی چەرچییەتیی نیوەسەربەخۆ، ڕژێمی مالکییەتی زەوین و بازرگانیی وردە شارۆکە ناسەربەخۆ (میرنشینەکان)ی کوردەواریدا دەستنیشان کردووە. ئەمە لە چوارچێوەی یەکەمدا، هەر ڕژێمەکە بۆ خۆی لە دژی لە شەو چوارچێوە دەرچوونە بووە. لە چوارچێوەی دووەمدا ڕژێمەکە، ویستبێتیشی لەو چوارچێوەیە بەدەربێ، دەوڵەتی هاوپێوەند تا ڕادەیەك ڕێگەی لێ گرتووە، لە چوارچێوەی سێیەمدا، هەر بە تەواوەتی بواری هیچی پێ نەدراوە. چونکە ڕژێمی دەوڵەتە هاوپێوەندەکە بۆ خۆی لە چوارچێوەی هەمان ڕژێمی مالیکییەتی زەویندا مۆڵی خواردووە. بەڵی حەزرەتی ئەحمەدی خانی کە بیری لە یەك چوارچێوەی دەسەلات بۆ کوردەواری کردۆتەوە، ئەویش هەر لە هەمان چوارچێوەدا پێشنیازی یەك هەبوونی بۆ نەتەوەی کورد کردووە. ئەمەش بە پێی قۆناخەکە، تەرزەبیرکردنەوە و پێشنیازێکی زۆر خۆڕسك بووە. پێشنیازکردنی یەك دەوڵەت و یەك "پادشا" و تەواوی نەتەوەکانی دیکەی هاوپێوندی ئاغا و بەدەسەلاتی ئەو ڕۆژگارە بە خزمەتکاربوونی ئەو دەوڵەتە کوردی و پادشا کوردە، هیچ جوداوازییەکی دەگەڵ هەر دەسەلاتێکی کە ئەو ویستوویە لە چنگوڕکی قوتار بێ، نییە. جا بەڕاستی تورکیش و فارسیش و عەرەبیش، هەمیشە لە غایلەی ئەوەدا بوون، کە ئەو کوردە ئەگەر

دەسەڵاتی بە دەست کەوێ، هەر هەمان دەوری ئاغایەتی کە خۆیان گێڕاویانە، دەگێڕێ. تا ئەوڕۆش کە ئەمانە گۆیا لە چارچێوەی ڕژێمی دەرەبەگایەتی ڕزگاریان بووە، نابینی هەر کات و ناکاتێ، لەم نیوچە دەسەڵاتەی هەرێمی کوردستانی عێراقە چەند هەراسان و بە پەژارەن؟! واتە: لە سەرویەندی دەرەبەگایەتیش و سەرویەندی دەوڵەتی نەتەوەییی بۆرجوازییانیشدا، هەر هەمان ترس و هەراسانییان بەردەوامە. هەیە دەڵێ، ئەگەر ئەم نەتەوانە زێتر بەرەو دیموکراسیەت هەڵکشێن و هەستی ددان بە مافی مرۆڤدا نانیان بەرەژوورتر هەڵکشێ، لەوانەیە ئەم ترس و هەراسانییە کەمتربێتەوە و بەرەو ئەوە بچن کە هێدی ـ هێدی دە چوارچێوەی شێوەیەك لە شێوەکانی هاوژیانیی سیاسیی مۆدێرندا، ئەم گرێکوێرەیە خاوبێتەوە. بەڵام بە باوەڕی من، تەرزی بیروبۆچونی ـ مارکس گوتەنی ـ ئاسیاییە دیسپۆتییانەی ئەم دەسەڵاتدارانەی کە چارەنووسی کوردی لێ مارەبڕاوانە، ناکرێ وەك تەرزی بیرکردنەوەی ئەورووپاییانە لەقەڵەم بدرێ.. ئەوەتا هەر لەم ڕۆژانەدا کەنعان مەککییەی بە ناو دیموکراتی بە بووشی سەرکۆماری ئامریکا دەفەرموێ: "هیچ گومان لە عەرەبایەتیی عێراق لە گۆڕێدا نییە، چتەکانی دیکە هەموو سەرەمقەستن (والبقیّة تفاصیل). بە بیرم دێتەوە، لە شێستەکاندا بە خاوەن دوکتۆرایەکی زۆر دیموکراتی قەتمەری مارکسیم گوت حوکوومەتی کەریم قاسم بە ئیمزاخرکردنەوە لە دژی کوردکوشتن، ج باکی پێ نییە، ئێوە نافەرموون، بە سەتان کادری ئەسکەریتان لە ڕیزەکانی سپای عێراقدا هەن، بۆ داوایان لێ ناکەن، لە کوردکوشتن مان بگرن و وەگەڕێنە ماڵە خۆ؟! زۆر بە تووڕەییەوە، گوتی: "هاوڕێ، ئەم قسەیەی تۆ بۆ یەکپارچەییی سپای عێراق (ئەو سپایەی کە ئینگلیز بناخەکەی دامەزراندووە ـ ش. م.) ئێکجار پڕمەترسییە."

بۆ زێدە ڕوونکردنەوەی هۆی مۆڵخواردنی کۆمەڵی کوردەواری بە درێژاییی مێژوو لە جغزی سیستەمی ئابووریی شوانکارەیی و دەرەبەگایەتیدا، حەزدەکەم تابلۆی تەرزەکانی مالیکییەتی زەوین و جۆرەکانیان و شێوەکانی خەرج و باج، کە زۆر جاران ج لە سەرویەندی قەرەقۆیونلوو و ج لە سەرویەندی ئاق قۆیونلوو و ج لە سەرویەندی

سەفەوی و چ لە سەرویەندی کورانی وەسماندا، کە لە ۳۲ جۆرە خەرج و باج تێپەڕیوە کەمێ ڕوون کەمەوە. ئەمن زێتر ئێرانی سەفەویی سەتەی حەڤدەهەم بە نموونە دێنمەوە، کورد گوتەنی لاگوێلێ نموونەی خەروارێکە.

ژمارەی ساو (تەخمین)ی نیشتەنیبانی ئێرانی سەتەی حەڤدەهەم، کارێکی ئاسان نییە. ساوەکان (تەخمین)ی سەرلەبەری کۆمەڵ لە نێوان ٥ و ٦ تا ١٠ میلیۆن سەر کەسە، واتە: کۆمەڵی ولاتی ئێران لە سالی ١٩٠٠ز. دا ٦ تا ١٠ میلیۆن لەقەلەم دراوە. ئەم ٦ تا ١٠ میلیۆن سەر کەسە، لە سێ بەشی پێکەوە تێهەلکێشی ئابووری، واتە: شوانکارە، گوندی، پیشەوەرانی شارنشیندا، بەرچاودەکەون. ساوی هەر کۆمەلێکیش هەر وا سووک و سانا نییە. هێندێ ساوی کۆمەلی خێلەکیی ولاتی ئێران لە نێوان یەک چارێک، تا نیوەی سەرلەبەری کۆمەڵ لەقەلەم دراوە (ئاگات لەوە بێ کە کورد دێهاتییەکی یەکجێنشین بوون، نەک شوانکارە). بە کورتی دەکرێ بلێین، ۳۲ تا ٤٠٪، لە ٨ میلیۆن ئێرانی، لە هۆز و تیرەکان پێک هاتبو، واتە: لە سەتەی حەڤدەهەمدا ۳ میلیۆن ئێرانی بریتی بوون لە هۆز و تیرەکان (هێندێ جار بە لانی کەمەوە بە ١/٥ میلیۆن کەس، بە لانی زۆرەوە بە ٥ میلیۆن کەس لەقەلەم دراوە).

هەر لە دەوروبەری سالی١٠٠٠ەوە، ئێران بەرەوڕووی شێوازی هاوگوزەرانی و کێشمەکێشی بەتۆرە دوو جۆرە ئابووریی سیاسی بۆتەوە. یەکیان ئابووریی گوندی و شارنشینی یەکجێنشین و ئەوی دیکەیان شوانکارە و بیابانگەڕی تورک (ئوستاجلوو، شاملوو، تەککەلوو، ڕووملوو، زولقەدەر، ئەفشار و قاجار) و لە ئاسیای ناوینەوە بێ وچان کۆچکردنیان [1] شوانکارەییی بنیاتی ئابووریی ژیانی خێلەکیی خێوەتنشینی پێک دەهێنا. ئابووریی شوانکارەیی، وەک هەر ئابوورییەکی خۆڕسک، بریتی بوو لە

---

[1] بە قسەی ملفگات، هۆزە شوانکارەکانی ئێران لە سەتەی هەڤدەهەمدا: تورکمان، ئێرانی، کورد، عەرەب و بلووچ بوون و ئەمانە لە دووسەت یەکانەی خێلەکیی لێک جودلواز، لە پێنج گرێی نەتەوەیی گشتدا، پێک هاتبوون. ئەمانە لە ڕووی سەربازییەوە دورێکی بالایان لە چارچێوەی دەولەتی سەفەویدا گێراوە.

دەسەبەرکردنی پێداویستیی بنەڕەت بە سایەی مێگەل چەراندن و پەرژانەسەر هێندێ وردە پیشەی دەستکرد و لە بوارێکی بەرتەسکدا ناویەناو کشتوکاڵ کردن. لەوەڕگا و زۆزان، بە سنوورکێشانێکی تایبەتی دەستنیشان دەکران و ملکی وان نەبوون، هەر ساڵە، سەرکۆماری خێڵ، مافی سوود لێوەرگرتنیان بەرەورووی تیرەیێ لە خێڵەکان دەکردەوە.گەلە و ڕان ملکی بنەماڵە گەورەکان بوون و داهاتی ئاژاڵ و شمەکی ژیانی شوانکارەیی لەگەڵ بەرهەمی ئابووریی کشتوکاڵ و پیشەی دەستکرددا ئاڵشت دەکران.

"پێوەندیی بەرابەر"ی خێڵەکان دەگەڵ یەکجێنشینیاندا بۆ هاوژیانیی شێوە جیاوازەکانی ڕەنێوهێنان نموونەیەکی باشە. ئاشکرایە، کە بواری ئەم سەودلومامەڵەیەش لە سۆنگەی بەرتەسکیی ئابووریی خۆڕسکانەی شوانکارەیی و هەروەها بەرتەسکیی عەمارکردن و پێویستیی لەبەر بزووتنەوەی بوارتەسکی بوو.

ئەمەش لەسەر بنەمایەکی زنجیرەی پلە بە پلە دامەزرابوو. سەرەک قزڵباشەکان بەسەر لوتکەی ڕژێمی خێڵەکییەوە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کەمیاندا بەشێ لە گەورەترین حەشەمداران بوون. پاژی گەورەی کرێکارانی هاوپێوەندار لە بنەوەی قووچەکی کۆمەڵدا کاریان دەکرد. ئەمانە بە ناوی شوان، یان گوندی، چەندین جۆرە داهاتی خۆراکی، پۆشاکی، و خانوویەرەیان بۆ ئاغایەکانیان دابین دەکرد. لە سەرووترین ئاستەکانی کۆمەڵدا لاگوێلێ کەسانی دەسەڵاتدار کە لە پێناوی وەدەست هێنانی پلە و پایەی باڵا و والییەتیدا، سەر بە ڕژێمێکی ئابووریی غەیری شوانکارەیی بوون، فەرمانفەرما و بکوژ و بڕ بوون. حەشەمدارانێکی سەربەخۆی زۆری دیکەش کە تۆوی مەرکەزیی ئابووریی خێڵەکییان پێک دەهێنا، هەبوون. ئەم سەرۆک ئاستە پایینانە لەگەڵ ڕدێن سپییەکاندا کە لە نێوان باڵاترین ئاستەکانی قووچەکی کۆمەڵ و پلەکانی پایینیدا هەبوون، بەرپرسیاریی کاروباری لە گرێن دەستنیشان کردنی لەوەڕگا و زۆزان بۆ هەر تیرەیێ لە نێوان گەرمیان و کوێستان (ئێلاخ و قشلاخ) کردندا، لە ئەستۆ بوو. پلەی پایینترینی ئەم ڕدێن سپییانە، ئەو ئەندامانەی خێڵەکان بوون کە، یان کەم و زۆرێ حەشاماتیان هەبوون و یان ژێ و بەڕێوەچوونیان لەوەڕا دابین دەبوو، یان بێ

حاڵوباڵ و بێ حەشامات بوون و تەنها بە حەشاماتەوانیی غەیری خۆیان، بە پێی بڕیاردەیێ، ژیانیان بەسەردەبرد. بە قسەی ئێکی دی، تەخشەکانی ئابووریی کلیل، دە ستۆی ژنان بوون. ژنەخێڵەکیش، وەك ژنەوەرزێران، بێ پووپۆش، لە پێش پیاوانەوە، بە کاری جۆراوجۆر رادەگەیشتن: بە خووری ڕێسی، تەونکاری و جۆلایی، ئاشپەزی و نانەوایی، کشتوکاڵ و ئاژاڵ بەخێوکردنەوە سەرگەرم بوون. بەڵام خەلکەکە وێڕای وەش هەر ئەمر و ئەژی و بە نانێ تێر بە دوو نان برسی، ژیاون. بەش بەحاڵی باج ئەستێنی، باج باجی حەشاماتی بووە و لە حەوتیەکەوە تا سێیەك چووە. بە بەراوورد دەگەڵ گوندییانی یەکجێنشینیندا، عەشایەری چەکدار کەمتریان بە سەرۆکەکانیان، یان بە دەوڵەت داوە و بە قسەی بانۆسانی، خراپتر لە حاڵی ژیانی خێوەتنشینان، ژیانی هەژارترین یەکجێنشینیی هۆز و هەلومەرجی ژیانی گوندیی یەکجێنشینی بووە. سەرەك هۆزەکانیش هەر بە تەولوەتی لە دنیایەکی زۆر جیاوازدا دەژیان. پلەوپایەی باڵا، والیگەرییان بە دەستەوە بوو، کەمێ پاشە وان چەکدارانی خێڵ و عەشرەت دەهاتن. کاتێ شا سەرەك هۆزەکانی بە والی، یان بە هەمەکارەیێ دادەنا، جگە لە قەلەمڕەوی خۆی، سەریار دەسەڵاتێکی دیکەی باج ئەستێنی و دەسەڵاتێکی ڕەوای سەربازیی قەلەمڕەوی ئەیالەتیشی دەردەست دەکرد. بەڵام ئەم جۆرە دەسەڵاتانە لە سەروبەندی شا هەباسدا زۆریان لێ کەمکرایەوە.

ئابووریی سیاسیی سەتەی حەقدەهەمی ئێران لە ڕاستیدا ببوو بە مەیدانی ناکۆکی و ململانێی بەرابەریخوازی لەباو لەگەڵ چینبەندیی نوێدا لە ئاستی جیاواز- جیاوازدا. لە ژێرخانی ئابووریدا، ئەندامانی هۆز لەگەڵ یەکدیدا، یان لەگەڵ سەرۆکەکانی خۆیاندا، بە ئەنگێزەی خۆپەسەندی و "دیموکراسییەتێکی کرچ و کاڵ"[*]ی ژیانی شوانکارەییەوە شەتەك دەدران. دوور نییە خڕکردنەوەی باج و خەراج تەنها هەر بە زۆرەملێ نەبوویێ، ژنانی خێڵەکان کە لە ژیانی ئابووریدا بەشداریی تەواویان دەکرد، شان بە شانی پیاوان تا ئەندازەییەکی زۆر نزیك، چونیەك بوون، دە کاتێکدا ئەم چونیەکییەی ژنان و پیاوانە لە سەرانسەری شوێنەکانی ئێراندا نەبووە. بێ گومان ئەم تایبەتمەندییە کۆمەڵەکی و

دەشتەکییانەیە قەڵشێکی گەورەی کە لە نێوان سەرۆکە پلە یەکەمینەکانی عەشیرەتی و جەماوەری ئەندامانی خواساییدا زاری داپچڕیبوو، پەردەپۆش دەکرد، قەڵشێکی ئەوتۆ کە لە سەرانسەری کوالیسیۆن (ائتلاف)ێکی پان و بەرینی بنەمای کۆمەڵدا بەرچاودەکەوت، کوالیسیۆنێ کە لەسەرێکیەوە لاگوێلێ هەلوژێردە و والی و هەمەکارەی بکوژ و ببڕی ویلایەتەکان و لە سەرێکی دیکەوەی جەماوەرێ لە ئەندامانی کۆمەڵی عەشایەر کە ڕەنێوهێنی ئەسلی، ئەوان بوون و ژیانێکی نەمرونەژی دەژیان، هەبوون. هەروەها لە ژێرخانیشدا لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵی شوانکارە و یەکانەکانی سوارەی سەربازیی سەفەوی ـ کە لە ڕیزەکانی عێل و عەشایەر هەڵدەبژێردران ـ قەڵشێکی دیکەش هەبوو. خوڵاسە نایەرابەرییەکی زەق و زۆپ لە نێوان سەرۆك و ئەندامەکاندا هەبوو، بەڵام لە سەرێکی دیکەوە هەروا بە ناوی سەروساختی خواساییەوە، بە ئاسانی دەکرا بە شێکی دیکە لەوەی لە پێویستی بە زیاد بوو، لە شوانکاران ساندرابا و هەر بە ناوی پێوەندیی ئەمەکداریی خێڵەکییەوە، هێزەکانی خێڵەکی ئامراز و ئامێرێکی پشتیوانە بوون کە بە کۆمەگ و یارمەتیی وان، ئەوی کە زیادبوو، زۆر بە زیاترەوە لە وەرزێرانی یەکجێنشین وەردەگیرا.

بەش بە حاڵی کۆمەڵی گوندیی ئێران ئەمیش هەر بە مەزەنە و ساو لێك دەدرێتەوە. ئەگەر بە ساوی پێشین کۆمەڵی شوانکارە ٣٥ تا ٤٠٪ و کۆمەڵی شارنشین ١٠ تا ١٥٪، سەرلەبەری کۆمەڵی ئێرانی سەردەمی سەفەوی، پەسەندکەین، دەبێ گوندنشینانی ئێران لەو سەروبەندەدا لە نێوان ٤٥ تا ٥٥٪ی سەرلەبەری کۆمەڵ بووبێ، واتە: بەشی هەرە گەورەی کۆمەڵیان پێك هێناوە. ئیدی بەم جۆرە دەبینین کۆمەڵێکی ٦ تا ١٠ میلیۆنی نەفەر نزیکەی ٢٧٠٠٠٠ تا ٥ میلیۆنی گوندی بوون. یەکانەی دەسەڵات (ستاندارد)ی کشتوکاڵ گوند بووە. بە پێی وەکۆڵینەکان بە هەزاران گوندی دوور و نزیك لە وڵاتدا هەبوون و هەموویشیان دە شێوەی کۆمۆنە (دەستجەمعی)دا بوون. بەڵام زۆری نەخایاندووە، هەر گوندێ یا زێتر ئاغا و دەرەبەگ خۆیان لێ کردوون بە کەڵەگا. مینۆرسکی و خانم لمبتۆن و شاردنیش هەر لەسەر ئەو بڕوایەن کە لە سەروبەندی

سەفەویدا چوار جۆرە زەویوزار هەبوون: زەویوزاری پاتشا، زەویوزاری دەوڵەت، زەویوزاری وەقف و زەویوزاری تایبەتی خەڵك. لەمەڕ مانای شا بە ناوی خاوەنی ڕەسمیی هەموو زەویوزاری سەر بە شا، لە سەروبەندی سەفەویدا، هەر وەك دەورانی پێشوو، بەکردەوە لە یەکیاردا نەبووە، جاریٚ کەم و جاریٚ زیادی کردووە. بە نموونە: باشترین و بە برشتترینی زەویوزارەکانی دەوروبەری ئەسفەهان بەشیٚ لە ملکی سەڵتەنەتی بووە، واتە: ناوچەکانی کرمی ئاوریشم بە خێوکردن لە نێوان ساڵانی ١٥٩٥ ـ ١٥٩٦دا سەرلەبەر بووگن وە ملکی شا هەباس. ملکەکانی دیوانی، یان (ممالك) ئەوانیش هەر ملکی دەوڵەت بوون و دەرامەت و خەرج و باجی ئەمانە دەڕژانە نێو هەزێنەی دەوڵەتەوە، نەك هەزێنەی شەخسیی شا(هەرچەندە زۆر جاران سنووری نێوانی ئەم دوو هەزێنەیە دیارنەبووە و لێکدی جودا نەکراونەوە). کەمیی پوولٚ لە ئابووریی بە عومدە خۆرسکدا، هەموو وەجاخەکانی حوکوومەتی عەبباسییانی هەر لەپاش سەتەی ز. ناچاردەکرد کە بۆ پڕکردنەوەی هەزێنەکانی دیوانی و سەربازی، لە زەویوزارەکانی دەوڵەتی سوود وەرگرن. شێوەی بنەڕەتی زەویزاری دەوڵەتی لە سەروبەندی سەفەویدا "تیول" بوو. تیوول بۆ خۆی بە مانای نەزەری بە میراتی نەدەگیرا. بەڵیٚ، بە کردەوە لە بابەوە بۆ کوڕ دەمایەوە، بەڵام دەبوا ڕەزامەندیی شای لەسەر با. بە قسەی شاردن زەویوزاری دەوڵەتی گەورەترین بەشی قەڵەمڕەوی پاتشایەتیی سەفەویی پێك هێناوە.

زەویوازی وەقف سێیەمین دەستەی گەورەی ملکی ئێران لە سەروبەندی سەفەویدا بووە و لە پاش ملکی سەڵتەنەتی و دەوڵەتییەوە دەهات. ئەم ملکی وەقفە نەدەفرۆترا، بەر خەرج و باجی دەوڵەتی نەدەکەوت؛ هەر لەبەر هەندیٚ شا عەباس ملکەکانی خۆی بە وەقف دەگێڕینەوە تا لە خەرج و باج خۆی بدزێتەوە و بەر یاسای میراتی نەکەوێ و دەستیان بەسەردا نەگیرێ و خزم و کەسوکار و نزیکانی خۆی بە ناوی موتەوەللی و بەرپرسی ملکی وەقف لەسەر دادەنان. ئاغڵەبە ڕۆحانییەکان بە موتەوەللی دەکران، تا بەم حیلەشەرعە قووچەکی دەسەڵاتی ڕۆحانییان لە گوندان پایەدار و بەهێز بیٚ.

خۆلاسەی قسە، ئەم جۆرە كارانەی وەقف و وەقفكارییانە بەرەو ئەوە شكایەوە كە لە دوادوای سەڵتەنەتی شا عەباس ملكی وەقف زۆر بوو و لە ڕووی فرەوانییەوە، لە دوای ملكی (تیول)ەوە دەهات.

هەرچی ملكی تایبەتی سەتەی حەڤدەهەمی سەروبەندی سەفەوی بوو، ئاغڵەبە خاوەنەكانیان وەقفیان دەكرد، بە مەرجێ مافی سەرپشكایەتی (اختیار) و دەخالەت و تەسەڕوفیان دە ملكی خۆیاندا مسۆگەربێ. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە كە خاوەن زەویوزار هەستیان بە ئامتمانەیی دەكرد، هەر بۆیەكا دەبینین ملكی تایبەتی بە درێژایی مێژووی زنجیرەی فەرمانڕەواییی ئێران، سەبارەت بە مافی سرپشكایەتیی زەویوزاری دەوڵەتی، دە قەبەڵ كەسان و بنەماڵان كردن بەرە ـ بەرە تەشەنەی كردووە و تەنیوەتەوە. بە قسەی بەنانی: ملكایەتیی تایبەتی لەسەردەمی سەفەویدا جارێكی دیكە ڕووی لە فرەوان بوونەوە كردووە. وەك بە دیاردەكەوێ؛ لە پاش سەروبەندی سەفەوی ئەم جۆرە ملكایەتیی تایبەتییەی زەویوزار ئەوەندە پێشكەوتووە كە ملكایەتیی تایبەتی بەرەوبڕیی لە ملكایەتیی (تیول) كردووە. لە قسەكانی بەنانی دوو ئاكامی هەموانی (كلی) وەگیردەكەوین: سنووری نێوان مافی سوودوەرگرتن (بە درێژاییی ژیانی خاوەن ملك و وەقفی (مالك الرقبە) usufruct و بە هی خۆكردن (تملك) possession بە تەواوەتی دیار و ئاشكرا نەبووە و لە ئاخروئۆخری سەتەی حەڤدەهەمدا كە كۆنترۆڵی مەركەزیی شا عەباس وردە ـ وردە ڕووی لە كزی كرد مەیل بە لای ئەسڕینەوەی ئەم هێڵە سنوورییەدا بە دیاركەوتن و بەهێزبوونەدا، زێتر لەنگیوە. بە كورتی جۆری زەویندارای لە ١٦٢٠دا لە سەروبەندی سەفەوییاندا، بەڕیز: زەویوزاری دەوڵەتی (تیول)، ملكی تایبەتیی سەڵتەنەتی، زەویوزاری وەقفی و مالیكییەتی تایبەتیی زەویوزار، بوون. مایەوە ئەرخان كردنی لەمانە بە زیاد، زۆربەی زەوینەكان، بە هی سەڵتەنەتی و وەقفی و تایبەتییەوە، بە كرێ بە گوندییان دەدران. بنەمای بە كرێ دانیش جۆرێ لە دابەش كردنی داهات بووە. بەڵام ئەوەی بە ئەختینە بە كرێ دەدرا،، تەنها زەویوزاری دەورویەری شار بوو و زۆریش نەبوو. كرێیەكەشی لە

سەرانسەری وڵاتدا وەکو یەك بوو. بە قسەی شاردن حاڵوباڵی گوندییان لە سەدەی حەڤدەھەمدا لە حاڵوباڵی گوندیی ئەورووپاییان خۆشتر بووە. شاردن دەڵێ: ژنانی گوندی پۆشتە و پەرداخ بوون، ملوانکە و خرخاڵی زێڕ و زیوییان دە گەردن و پێدا هەبوون، نێومالیان پۆشتە بوو. بەڵام دەشڵێ: هەر ئەو گوندییانە، لەسەر باج و خەراج گیرەگیرکردن، زۆر جار بەر جنێوباران و تێلاترێنێی و فەلاقەکردن بە دەست شا و وەزیران دەکەوتن.. دیارە ئەم ڕەفتارە تەنێ دەگەڵ پیاواندا، نەك دەگەڵ ژناندا بەڕێوە چووە. ژنان ڕێزیان لێ دەگیرا و کەس مافی دەستدرێژی لێ کرشیانی نەبوو.وەلێ وێڕای ئەم هەموو قسانەی شاردن و کەسانی دیکە کە زۆریان فوو لە خۆشگوزەرانیی گوندیی ئێرانی کردووە، بێ گومان ژیانی گوندیی ئێرانی، نەمرونەژی بووە. بەش بە حاڵی شارنشینانی ئێرانی سەدەی حەڤدەھەم هەر وەك کۆمەڵی خێڵەکی و گوندنشین هەر وا بە مەزەنەیەکی دەڵەمە دەسنیشان کراوە. بە قسەی میتۆرسکی کە لە نووسینی سێر تۆماس هێربێرتەوە دەگێڕێتەوە نزیکەی ٩٠ شاری بە بورج و باروو و ٤٠ هەزار گوند لە ئێران هەبوون. بە ساو و مەزەنەی ئەورووپاییانی ئەو سەروبەندە ژمارەی شارنشینانی ئێران خۆی لە یەك میلیۆن کەس داوە. نزیکەی چارەکێ تا نیوەی خەڵکەکە نیشتەنیی ئەسفەهان بوون و ئەوانی دیکە لە شار و شارۆکەکانی دیکەی ئێران ژیاون. بەم پێیە دەکرێ بڵێین بە لای کەمەوە لە ١٥٪ی ئەم ژمارەیەی خەڵکی ئێران لە سەدەی حەڤدەھەمدا سەرجەمی کۆمەڵی وڵاتەکە بووە.

تەوەرەی سەرەتایی و سەرەکیی شابووریی سەدەی حەڤدەھەمی ئێران بازاڕی: پیشەوەران بوون. لە ڕووی ژمارەوە، پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و سامان، فەرق و جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەم پیشەوەرانەدا هەبووە، بەڵام لە چارچێوەی کۆنترۆڵی سەختی شارەکاندا لە جۆرە خۆسامانی Self admistrationیەك بەرخوردار بووگن. مەسەلەی نرخاندنی خەرج و باج لە نێوان سەرەك پیشەوەران و هەمەکارانی دەوڵەتدا، هەڵ دەسەنگێندرا. سەرۆکی هەر تاخمێ بەشە خەرج و باجی هەر یەکێ لە ئەندامەکانی بە پێی کەسب و کاری وی دەشکاندەوە و دابەش دەکرد. هێندێ پیشەوەر کاریان بە

خۆراپی بۆ دەربار ئەنجام دەدا. بە گشتی کێشەی ململانێ و ناتەبایی لە نێوان دەوڵەتی زۆر بەدەسەڵاتی مەرکەزی لە سەرێکەوە و پیشەوەران لە سەرێکی دیکەوە، ئەمە تابلۆی ڕاستەقینەی هاوپێوەندیی نێوان هەردوولا بەدیاری دەخست. دە نێو هەر تاخمێکدا سێ جۆرە ڕەنێوهێن هەبوون: شاگرد (پادەو - پاکار)، خەلفە (هاوکار) Journeyman و وەستا. دیارە هەر وەستایێ هەتا بۆی کرابا، منداڵی خۆی بە شاگرد ڕادەگرت. پیشەکەش هەر بە کارێکی بنەماڵەیی دەمایەوە. وەستای زبردەست و لێزانی واش هەبوون کە تەنها بۆ کەسانی دەوڵەمەند بۆ پارێزگاریی خۆیان کاریان دەکرد. بەش بە حاڵی خەلفە، ئەوە خاوەنی ئەوزار و ئامێر و کارخانە نەبوون. ئەگەر بۆ خۆشیان سەربەخۆ کاریان کردبا، ئەوە بەرهەمەکانیان هەر بە پیشەوەر و کاسبکارانی موغازەچی دەفرۆشتەوە. لە دوای ئەمانەوە کرێکاری ماهیر و ناماهیر و گەڕۆك هەبوون و لە شێوەی چین و دەستەی هەژارتری شاران و گوندانی دەراوسێدا خزمەتیان پێشکێش دەکرد. شاگردەکان بە ئومێدی ئەوەوە بوون کە وەك وەستایەکانیان مەهارەت و دەسڕەنگینییەك دەردەست کەن و دەسمایەیێ بۆخۆیان پێکەوە بنێن.

گرینگترین کاڵایێ کە لە سەروبەندی سەفەویدا ڕەنێودەهێندرا، پارچە بوو. وەك بە دیاردەکەوێ بازرگانان و پیشەوەرانی شارنشین و شاش بۆ خۆی لە ڕەنێوهێنان و فرۆتنی زۆر لەم بەرهەمە پارچەییانەدا، بەشیان هەبووە. ئەون و جۆڵایی ئەوەرەی پیشەسازیی ئێرانی سەتەی حەڤدەهەم بوو. وێڕای دەسدرێژیی بازرگانان و شاهان، زۆر وێدەچێ تەونکار و جۆڵای پارچە بەهێزترینی بازاڕیانی سەردەمی سەفەوی بووبن و تەنانەت هێندەیان پەرەساندبوو کە بەش بە حاڵی تەرازووی باج و خەراج زۆر جاران، دەنگی نارەزاییی خۆیان لە دژی دەوڵەت بڵینددەکرد. زوریەی بەرهەمی ئەم سەروبەندە: چینی و کاشی، ئەسپاب و ئامێری دانسقە، چەرم و چەرمکاری، مینا، جەواهێرات، ڕەنگ، کاغەز، سابوون زۆر لە هەرمێن و برەودا بوون. ئەم بەرهەمانە تەنانەت لە بازاڕەکانی هەندەراندا، زۆر بە ڕەونەق بوون.

بەشی دووەمی سەرەکیی شار، چالاکییەکانی ڕەنێومێنی لە کارگایەکانی دەوڵەتیدا بەڕێوە دەچوو. نزیکەی لە ٥٠٠ هەزار کرێکار زێتر لە شانەی بەربلاوی کاروباری کۆشک و تالارپۆنان و ئاشپەزخانەیی سەڵتەنەتییەوە بگرە تا دەگاتە کاروباری پیشەوەری، کاریان دەکرد. بودجەی سەرلەبەری ئەم کارگایانە خۆی لە ٤ تا ٥ میلیۆن لیرە (liebra لاتینی)ی فەرەنسی (زێتر لە ١٠٠٠ تمەنی سەردەمی سەفەوی) واتە: حەوتیەکی سەرلەبەری هەزێنەکانی حوکوومەتی، دەدا. پیشەوەر و هونەرمەندان دەسمز و کرێی چاکیان وەردەگرت.

بە پێی سەرچاوەکان بارستی ئاڵوێر لە ئێران زۆر قەبە نەبوو. ئابووری تا ڕادەیێ غەیرەپووڵی، کاریگەریی گەورەی بە کشتوکاڵ، گیروگرفتی بارکردن و ڕاگوێزتن، سیاسەتی ئابووریی شاهانە و فاکتەرێلی دیکە بە هۆکارەکانی بەرتەسکیی سنووری بازرگانی دەزاندرێن. وا دیارە بازرگانانی وەک پیشەورانی شار، خاوەن ڕێکخراو نەبوون، بەڵکو لە گرۆی چکۆلە ـ چکۆلەتر و لەسەر هیمی بناوانەی شاری، نەتەوەیی، ئایینی، یان ڕشتەی بازرگانی لە جۆریێ گرۆبەندیی کز و سستدا جموجووڵیان دەکرد. بازرگانانی ئێرانی هەر بە تەواوەتی بەسەر بازاڕدا زاڵ بوون، بەڵام لە بواری بازرگانیی دەرەکیدا، دەستێکی ئەوتۆیان نەبوو. ئاڵقە پێناو و کلیلییەکانی بازرگانیی نێوخۆیی و دەرەکیی ئێرانی سەرووبەندی سەفەوی، ئەو بازرگانە ئەرمەنییانە بوون کە شا عەباس لە ساڵی ١٦٠٤دا و لە شەڕەکانی قەفقاسدا بە زۆر بۆ نێو وڵاتی ئێرانی کۆچ پێ کردن و لە ئەسفەهانی هەواریەندکردن. بەڵام بازرگان وێڕای سامانێکی زۆر، بە گشتی لە سەرمایەدانانداا بە پێچەوانەی بازرگانانی ئەورووپاییەوە، نەیانتوانیوە بە ناوی چینێکەوە، بێنە کایەوە، ناچار دەبوو لەگەڵ ئابووریی دەوڵەتدا پێ بە پێ هەنگاو هەڵێنێ و هەرکە سامانیان لە ئەندازەیێ سەرڕێژیی دەکرد، لە جیاتیی ئاڵوێری بازرگانیی زۆر و سەرمایەی پیشەسازی دانان، پووڵەکانیان پاشەکەوت دەکرد، یان زەویوزاریان پێ دەکڕین. خۆلاسە ئێرانی ئەو سەرووبەندە دە ئاستی سەرمایەداریی ڕاستەقینەدا، هێشتا پێی نەهاویشتبووە قۆناخی کاری مزگێرییەوە

دەتوانین، جگە لەمانە، ڕۆحانی و چینەکانی شارنشینی پایین، ژنان و کەمایەتییە ئایینییەکانیش دە ڕیزی خەڵکی شاردا جێ بکەینەوە. بێ گومان دەوری ڕۆحانییەت (علەما) دەگەڵ ڕۆحانییەتی ئورووپادا جودلواز بوو. علەما، هەرچەند بەم ناوەوە ناوبردنیان هەڵەیە، کار و ئەرکی جودا ـ جودایان لە ئەستۆ بوو. ئەم علەمایانە، هەرچەندە لە سەرویەندی سەفەویدا جۆراوجۆر بوون، بەڵام پاش ئەوەی کە پلەوپایەی مەرجەعییەت (موجتەهید)ی بوو بە باو، ئیدی ئەمانە پایەدۆستیان پێ کرا. جگە لەمانە سادات و دەروێشانیش هەر بە خەڵکی شار لەقەڵەم دەدران. هەروەها لات و لەوارەی شار The Scums of the town ، لە دەرەوزەکەری مەیخانەکان و قاوەخانەکان و چایخانەکان و زوانگە حەشارگەکانی شاعیر و مێژوونووسان و قومارخانەکان و تریاکیخانەکان و رووسپیخانەکان و کەسێکی دیکەی پایینی هەژارانی شارستانییان پێک دەهێنان. ئەسکەندەر بەگی مونشی و ڕۆستەمولحوکمای کوردیش لە کتێبەکانی عالەم ئارای عەباسی و ڕۆستەمولتتەواریخدا ، ئاماژەیان بۆ ئەم توێژاڵانە کردووە.

بەش بەحاڵی ژنانی هەموو توێژاڵ و هەموو چینەکان وەختە بڵێم، چتێکی زیادیان نەگوتووە. بەڵام ئەوەی کێشەی لەسەر نییە ئەوەیە کە زۆربەی ژنان لە کاروباری ڕەنێوهێنانی کاڵای ماڵی ـ ئاشپەزی، پاکژراگری، منداڵداری و جۆڵایەتی و دروونی بەرگ و پۆشاکدا بەشدارییان کردووە. دیارە ژنانی چینی باڵا تەمبەڵ و تەوەزەلانە هەر خۆیان دەلستەوە و کاریان نەدەکرد، ژنانی شاری بە حیجاب بوون و لە هەموو کۆمەڵ جودلوازبوون.

دواچینی گرۆی شارنشینی بابەتی باسەکەمان، کە سنوورێکی دیاریان نەبووە، کەمایەتییە ئایینیەکانی ئێران بوو. ئەمانە ئەرمەنی و جوولەکەیان هەبوون. ژنەکانیان لە ڕەنێوهێنانی کاڵای ڕەنگرێژی، زێرنگەری، خشڵ و جواهیرات سازی، دەرمانسازی، شەرابسازی و شەرابفرۆشی و پێناوی و دەلاڵی، فرۆتنی کاڵای نیوداشت و کارناوی، گۆرانیبێژی، ڕەقاسی و سەما، سازندەییدا دەوریان بەرچاو بووە. هەر لە کاروباری ماماتی و ژنانە، بۆ نموونە: پێناویشدا کە ناسەیان لە ژنانی سورمانی حەرەمسەرارە بۆ

دەرێ دەبرد و ماجوومی جـادوویی عەشقیان ساز دەکرد بـۆ دەرێ دەبرد. هـەروەها داستانویژانی زۆریان هـەبوون، بـەلاّم ویـڕای وەی، بـە قسـەی ئیمـەر سـۆن، ئاغڵەبـەی کەمایەتییـەکان هـەژار بـوون، یـان خۆیـان بـە هـەژار نیشـان دەدا. بـەش بـە حـاڵی زەردەشتییەکان کە بە زۆری لـە کرمـان و یـەزد دادەنیشـتن نزیکـەی ٨٠ هـەزار کەسێ هەبوون. ئەمانە پتر بـە کـاری کشتوکاڵ و تەونکارییـەوە خـەریك بـوون و زۆر کـەمیان خۆیان بە خوێندن و نووسینەوە خەریك دەکرد.

بەش بەحاڵی پێوەندییـە ئـابووری، فەرهـەنگی ، سـەربازی، دیپلۆماتیکییـەکان لەگـەڵ ڕۆژئاوادا بازاڕەکان لە سەدەی ١٢هەمەوە زێتر لەگـەڵ دەوڵـەتی شـارەکانی جەنـەوا و ئیتاڵیادا دەسـتی پێکرد. لـە سـەتەی ١٤ و١٥ دا لــە ڕێـی شـاری بورســەوە لەگـەڵ ئارمووشکڕانی ئەوروپاییدا تەواو سەروکاریان پەیدا کرد.

دیارە دامەزراندنی دەوڵەتی شیعەی سەفەوی لە ئێران، هاوتاییەکەی بە جـارێك گـۆڕی؛ چونکە کۆمەڵێ دژمنکاریی لە نێوان ئێران و عوسمانیدا لێ کەوتنەوە و بوو بەهۆی کـزی و سیستیی بازرگانی.

خوێندەی بەڕێز، پێم وایە تابلۆکە بۆ سەرەوبەندی پێش قۆنـاخی سـەرمایەداریی ئـێران، بەسە.

بنیاتی کۆمەڵایەتیی ئێرانی پێش قۆناخی سەرمایەداری

مێژوڕسکی ڕژێمی سـەرەتاییی سـەفەویی بـە "فیودالیزمی خێڵـەکی" و پاتشـاییی شـا هەباسی بە "دیسپۆتیزمی باب سالاری" نێونـاون و بـە "کۆڕانێکـی گـەورە"ی لەقەڵـەم داوە. بەلاّم مێژوونووسانی مارکسیستی زۆر بە سـادەیی ئـێرانی پێـش سـەرمایەدارییان جـارێ بـە "فیودالـیزم" و جـارێ بـە "فیودالـیزمی تایبـەتیی ئـێران" و کـاوێ بـە "فیودالیزمی ئاسیایی" یان بە "وێنەیـەندیی فیودالـی ـ شوانکارەیی" نێونـاوە. دیـارە ئـەم ڕوانگەیـە لـە ڕەچـاوکردنی بەشـی خێڵـەکی و ڕەنێوهێنـانی دەسـکردی شـارییەوە ئاودەخواتەوە. خۆلاسە، ئەمە بەلای جان فۆرانەوە ڕاست نییە.

بە ڕاستی هەم شێوەی ڕەنێوهێنانی شوانکارەیی خێوەتنشینی و هەم شێوەی ڕەنێوهێنانی وردە کاڵایی لە نووسینەکانی مارکسیش و هاوبیرانیشیدا باسیان لێ کراوە، بەلام شێوەی ڕەنێوهێنانی "گوندیی هاوبەشەکی"چێتێکی تازەیە کە بە نێوی هەڵوەژێردەی فیودالیزم لە بەشی کشتوکاڵی ئابووریدا بەکاردەبرێ. بە شێوەیێ کە لە شیکاریی ئەزموونیدا بەدیاردەکەوێ، سەرڕێژی بەشی کشتوکاڵ بە تەرزی بەشێ لە داهاتی بەرهەمهاتگ لە لایەن گوندییەوە بە (مالیك) دەدرا. لە بری ئەوە ئەم قەرەبووکردنەوەیە لەبۆ گوندییان کە زەوین بە دەستی وانەوە دەمایەوە، هەبوو. ئەمە مالیکییەتی ئەفراد، هەرچی ملکی خۆشیان بوو، ئەوە شا، بەش بە حاڵی ملکی سەڵتەنەتیی تیولدارانیش و بەش بە حاڵی ملکی دەوڵەتیش کە لە دەسنێژانی شا، یان لە موتەوەللیانی وەقف بوون، بە ڕاست دەگەڕێ. هەروەها دەبێ گرێ ژمارەکەمترەکانی گوندیی کەمزەوین و گچکەچاپ و توێژاڵێکی تا ئەندازەیێ خۆشگوزەرانتری موغازەدارانی بەشێ لە گوندییان و ئاشەوانان و ئەم جۆرە بابەتانە بە بیرەخۆ بێنینەوە. هەروەها لە بابەتی گوندی، هێندێ پیشەوەرانی گوندیی لەگوێن ئاسنگەر و مسگەر و قاڵیچن هەبوون و لە هەرە پایینترەوە، گوندیی بێ زەویوزاری خۆشگوزەرانیش هەبوون کە حەماچێتی، دەلاکی و سەپانییان بۆ گوندی ئەنجام دەدان. جا لەبەر ئەوەی گوندی فەرایەند (پرۆسێس)ی کاری خۆی کۆنترۆڵ دەکرد و لە هەمان حاڵدا سەرڕێژکەی بەرهەمیان بە نێوی بەشێ لە داهات بە (مالیك) دەدا، لێرەدا کەلك لە زاراوەی "هاوبەشیی گوندی" وەرگیراوە. چینی دەسەلاتدار لە سەردەمی شا هەباسدا بە سێ شێوەی جیاوازی ڕەنێوهێنان دابەشکراوە و لە شەبەنگی ناپەکپاژیی مالانی هۆز، والیی حوکمڕان، خاوەن زەوین و تیوولداران، ڕۆحانییانی ڕەسمی و بگرە بەشێ لە بازرگانانی گەورە و سەرباریش شا و بنەماڵەی سەڵتەنەتی، پێك دەهات. شا، نەك تەنها لە فرەپاژیی ئابووری، جوغرافیایی، فرەنەتەوەییی ڕەقیبانی وەشارتی (potentpal = بالقوە )ی خۆی بەشی وەردەگرت، بەلکو بۆ خۆشی لە شێوەکانی ڕەنێوهێنانداا ، بە نێوی فەرماندەی سپای بەردەوام و عەشیرەتی، خاوەنی ملکی

سەڵتەنەتی و سەرپشکی تیوول دابەشکردن، خاوەن کارگایەکانی سەڵتەنەتی، خرکەرەوەی خەرج و باجی بازاڕی (پیشەوەری) و ڕەسمی گومرگی لە بازاڕەکان و خاوەن پاوانی بازرگانیی سوودی ئاوریشمی کاڵ و یەك دوو کاڵای دیکەدا، دەستی هەبوو. هیچ گرۆیەکی دیکە لە هەڵوژێردان لە باروودۆخێکی وادا نەبوو بە ئەندازەی شا بەشێکی گەورە لە سەرلەبەری سەرڕێژی ئێران بۆ خۆی هەڵگرێ؛ چونکە هەر گرۆیێ تەنها لە یەك شێوەی ڕەنێوهێناندا دەستی دەڕۆیشت و دەگەڵ بەشێکدا کە دەگەڵ ڕەنێوهێنانی نێوبراودا هاوسەروکار بوو، دەبوا بەسەر هەموو ئەندامانی گرۆیەکەدا دابەش کرابا، کەڕی شاهانی سەفەوی لە هەموو شێوەکان بەشێکیان بۆ خۆیان هەڵ دەگرت. دیارە، ئەم دەسەلاتە لە پشتیوانەی ئایدیۆلۆژیکیش بەرخوردا بوو و تەنها هەر ئەو بە ناوی گرۆی خودان سەلاتی بە قسە ڕەوا مەرز و سنوورەکانی شێوەگەلی ڕنێوهێنانی دەبەزاند و لە هەموویاندا تەشریفی حازر بوو، و هەر ئەمەش شاهانی سەفەویی بە ناوی پاتشا و ڕۆحانی و زانایانی ئیسلامەوە بەسەر ورگی خەڵکەوە کردبوو بە گەنەی مێمل.. بەڵام وێڕای ئەمانەش هەموو سەفەوییەکان نەیانتوانیوە بە تەواوەتی و سەرومڕ لاف و گەزافی خۆیان بەسەر کۆمەڵدا بسەپێنن.

ئەتۆ کە بیر لە هەبوونی خۆت دەکەیەوە دەبینی ـ وێڕای چەند شێوە و زار ـ زمانێکی هاوبەشت هەیە، پێوەندییەکی ئابووریی ـ هەرچەندە زۆر سنوورداریشە ـ هاوبەشت هەیە، دابونەریت و فۆلکلۆر و پێکهاتەیەکی دەروونیی هاوبەشت هەیە، هەست بەوە دەکەی کە تۆ مێژوویەکی هاوبەشت هەیە.. ئەمانە بە تەواوەتی لە مێشکتدا ڕوون و بێ خەوش و بێ گرێوگۆڵ هەموو ڕەهەندەکانی هەبوونت تێك دەبەستن. ئەوجا ئەتۆ بەمە دەگەیتە هەوارگەیێ کە دەبێ پاشماوەکانی سیستەمی فیودالیزم بسڕییەوە؛ چونکە ئەم سنووورە خەیاڵییانەی کە بەرژەوەندییەکانی بیانی بۆیان کێشاوی بە ناڕەوا و کارێکی لە مافی مرۆڤ بەدەر دەزانی و دەکەوییە هەڵپەی ئەوەوە کە چۆن بە هەر شێوەیێ بێ ـ بە خەباتی بێ پشوو بێ، بە مەنتیق و شارستانیانەی سەردەمی دیموکراسی ـ بەرەو جێ بە جێ کردنی ئامانجەکانت هەنگاو هەڵێنی. ئەگەر کورد دە

ژێر ڕژێمی دەرەبەگایەتیی تورك و عەرەب و عەجەم نەبوایە و وەکو میللەتەکانی دیکە دەکرا لە مێژەوە بۆ خۆی سیستەمی فیودالیزم بروخێنێ.. بەلام ڕەنگە بلێی کوردی لە تورك و عەرەب و عەجەم پاشکەوتووتر چۆن دەیتوانی ئەو قۆناخە ببڕێ؟ بەلێ ئەمە ڕاستە، بەلام نموونەی وامان بە دەستەوە هەیە، کە ئەم ڕاستییە ئیسپات دەکا. عەرەبی سووریا و لوبنان و میسر و جەزائیر و مەغریب و لیبیا و یەمەن و هتد کە لە دەولەتی عوسمانی جودابوونەوە ـ هەرچەندە دەولەتەکانیان دەستنێژی ئیمپریالیزم بوون، بەلام خۆ ئامێکیان هەر بە بەردا هاتەوە و بیری نەتەوایەتییان بەو جودابوونەوەیە بە گەشەکەوت. ئەدی نەتەوەکانی ئاسیای ناوین دوای دەسەلاتی سۆڤیەتی، بە گەورە و گچکەوە چۆن هەموو ـ هەرچەند بۆ ئامانجی دەولەتی سۆڤیەتی لە جیاتیی وەی یەك دەولەتی تورك زمانیان بۆ سازکردبان، ئەو هەموو دەولەتانەیان بۆ پێکەوەنان ـ گەشەیان کرد و بوون بە کۆمار و نیوە کۆمار و هتد ؟ یان ئەو هەموو عەرەبی یەك زمان و یەك ئایین و یەك خاك و یەك ئابوورییە، بە گەورە و گچکەوە ـ هەرچەند بۆ ئامانجی ئیمپریالیزم دامەزران ـ چۆن هەریەکە بوون بە دەولەتێکی نەتەوەییی سەربەخۆ؟! بە قسەی ئیسماعیل بێشیکچی، دۆستی گەورەی نەتەوەی کورد، یان بە قسەی د. محەمەد شەمسیی ئازەری، دەولەتی عوسمانیشی و دەولەتی سەفەویش، ئەگەر بە دەستی ئەنقەست کوردیان دە چارچێوەی ئابووریی شوانکارەیی و فیودالیزمی عەشیرەتیدا نەچەقاندبایە و هەبوونی نەتەوەییان دەبن لێوەوە نەکردبا، بۆچی وەکو ئەوان گەشەی نەدەکرد؟ کورد چیی لەوان کەتر بوو؟ ئەوەی ئەولیا چەلەبی لەمەڕ پێشکەوتوویی میرنشینی بتلیس دەیگێڕێتەوە، خۆ دەولەتەکەی قەرەقۆیۆنلوو و ئاق قیۆنلوو سەفەوی و عوسمانیش خۆ لەو پێشکەوتووتر نەبوون. ئەگەر دەفەرمووی کوردەکە بۆ خۆی دە قۆناخێکی ئەوتۆدا نەبووە، بیر لە چەند دەولەتێ یا دەولەتێکی مەرکەزی بکاتەوە، ئەوەتا ئەحمەدی خانی هاوار دەکا و دەلێ ئەو هەموو میرنشین و دەرەبەگ و ئاغا و بەزم و ڕەزمە با ببڕێتەوە و بەسە. دەفەرموێ با ئێمەش یەك پاتشامان هەبێ، یەك دەولەتمان هەبێ لە ڕاستیدا ئەو یەك

دەوڵەتە، یا ئەوەی کە ئەحمەدی خانی پێشنیاری کردووە مانای ئەوە نییە کە لە هەوارگەی شوانکارەیی و دەرەبەگایەتییەوە بۆ هەوارگەی سەرمایەداری بڕوا، نەخێر ئەو پێشنیاری ئەوەی نەکردووە؛ چونکە ئەو کاتە ئەوە کارێکی لەکردبەدەر بوو. بەڵکو پێشنیاری یەك دەوڵەتی مەرکەزیی بۆ کورد بە لای ئەحمەدی خانییەوە پێشنیاری پاتشانشینێکی لە گوێن پاتشانشینەکانی تورك و عەجەم و عەرەب بوو.. خۆ ئەگەر تورك و عەرەب زوربەی زۆریان شوانکارە و خێوەت نشین بوون، خۆ کوردەکە، هەر وەکو کرستێن سن ئارسن و مینۆرسکی دەفەرموون، هەر لە سەردەمی میدییەکان و هەخامنشییەکان و ساسانییەکانەوە هەموو هەر شوانکارە نەبوون، بەڵکو دێهاتنشیش بوون و ئەوەتا ئاسەوارەکانی لوڕستان و کەڵوڕستان و هیتیتستان و خۆزیساتان و زامۆا و ئۆرارتوو و سێرتستان و هتد گەورەترین شایەتی کەونارایی نەتەوەیەکی تەمەن درێژی هەزاران ساڵەن کە نەتەوەی کوردە..

ئـایین دامـەزراوێکی سـەرخانە. بـە پێـی بنیـاتێکی کۆمەڵایـەتی ـ ئـابووری و پێوەندیگەلێکی بەرهەمهێنان کە بیچم و ڕەنگ و ڕوو بەم دامەزراوە دەبەخشـن، بـارێکی فۆنکسیۆنێل (وەزیفی) وەردەگرێ. لەم ڕووەوە کە تۆ دێی لـە پێوەندییـەکانی ئـایین و کۆمەڵ دەگەڵ یەکدیدا وەدەکۆڵـیَ، دەبیَ لـە گۆڕانکارییگـەلی کۆمەڵایـەتی کـە لـە نێـو کۆمـەڵدا ڕوودەدەن، وردببیـەوە. واتـە: هـەر گۆڕانـێ لـە پێوەندییـەکانی بەرهەمهێنـاندا ڕوویدا، کار و ئەرکی سەرشانی ئایینیش بەو پێیە بەر گۆڕانکاری دەکەوێ. ئەتۆ لە هەر تەرزە تۆڕینێکی ئایین وردبییەوە، دەبینی بریتییـە لـە ئـەنجامی قۆناخێکی کۆنکرێتـی ئابووری. بۆ نموونـە: تۆتـەمیزم ئـایینی شـێوەی هـەرە سـەرەتاییی بەرهەمهێنـانی وەك کۆکردنەوە، ماسیگری و ڕاووشکار، ئانیمیزم، ئایینی شێوەی بەرهەمهێنـانی کشتوکاڵی سەرەتاییە (دیارە لەم سەروبەندانەدا جادوو و سیحر فەرهەنگی کۆمەڵە سـەرەتاییەکان بوو، کـە هیـچ پێوەندییەکی بـە ئایینـەوە نـەبوو، بـەڵکو تەنها پێوەندیی بـە تـەرزی بەرهەمهێنانی ئابووریی سەرەتایی و کارەوە هەبوو. چونکە هـەروەك هـاوزەر لـە کتێبـی مێـژووی کۆمەڵایـەتیی هونـەریدا نووسیویە، ئـایین لـەو سـەروبەندەدا هێشـتا چـاوی نەپشکوتوو بوو. ئایین بەرهەمی گەشەکردنێکی زۆر پاشتریی مێشکی مرۆڤە). بەش بـە حـاڵی ئایینـەکانی یـەك خوداپەرسـتی و هەرەمـەی وەك ئیسـلامەتی و مەسـیحییەت فۆنکسیۆنایەتی (وەزیفەداری)ییەکی قۆناخە ئایینییەکانی دواترن. لە سەرێکی دیکەوە، کاتیَ کۆمەڵ لە قۆنـاخی فیودالیزم (مالیکییـەتی زەویـوزار)یـەوە پـیَ داوێتـە قۆنـاخی کاپیتـالیزم (سـەرمایەداری)، لـە بنیاتـەکانی ئـایینی ئیسـلامەتیش و مەسیحییەتیشـدا هێندیَ گۆڕانکاریی ئـەوتۆ کـە دەگـەڵ پێوەندییە تازەکـانی بەرهەمهێنـاندا دەگونجێن، ڕوویان داوە. ئەتۆ بۆ خۆت دەبینی بزاوتەکانی بە لاییك (عیلمانی) بوون کـە ئـەوڕۆ زۆر بە لەز و خێرایی تەشەنەدەکەن، لێشاوێکی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵانی پیشەسازیی سەر بە تەرزی بەرهەمهێنانی جەماوەری و دەسەجەمعییەکانە. جا بەدیهاتنی ئەم بە لاییك بوونە کە بە هۆی پیشەسازی بوونەوە، کۆمەڵ لە قۆناخی شێوەی کشتوکاڵی کۆنـەوە پێـی هاویشتۆتە قۆناخی کۆمەڵی پیشەسازیی نویَ، واتـە: لەگـەڵ گەشـەکردنی کۆمـەڵدا بـە

گۆڕانکارگەلێ کە لە بنەڕەتڕا دەستی پێ کردووە، بەڕێوەدەچێ. ئایین هەرچەند وەك وزیفەی شێوەکانی مالیکییەت و پەنێوەمێنانی کۆنکرێت قوت بێتەوە، دەزگا (ئۆرگان)یەکی ئەوتۆیە کە هەموو دەزگایەکانی سەرخانی کۆمەڵ، بۆ ڕاگرتنی ستاتووکۆ (سیستەمی باو) یان بۆ پارێزگاری لێ کردنی، زێتر ئامادە و بەهەڵپەیە. واتە: بە هیچ جۆرێ حەز لە گۆڕانکاری ناکا. ئەو فاکتەرەی کە سەروفەسالێ بە بنیاتی کۆمەڵ دەبەخشێ چییە؟ دەزگایە ژێرخانەکان (مؤسسات البنى التحتية)، واتە: پێوەندییەکانی مالیکییەت و پەنێوەمێنانە. بەلام دەزگایە ژێرخانەکان دەگەڵ دەزگایە سەرخانەکاندا وە نەبێ لێکدی جودلواز و سەربەخۆبن. دەزگایە ژێرخان و دەزگایە سەرخانەکان هەمیشە لە جەنگەی ململانێیەکی دیالێکتیکیدا، دە حالەتی کار ـ کاردانەوەیەکی سەرومڕدان. جا، ئایین لە ڕێڤاژۆ (وەتیرە)ی ئەم کار ـ کاردلنەوەیەدا، وەك دەزگایەکی سەرخانی بنیاتی کۆمەڵ، هەمیشە پێوەندییەکانی پەنێوەمێنان، واتە: ستاتووکۆ پتر دەپارێزێ و لە هەر گۆڕانکارییەك بە دەنگ دێ و زەق دەبێتەوە. ئەمە سەتان ساڵە کارەکە بەو جۆرە درێژەی هەیە.

ویڕای وەش، ئایینەکان، لە دژی جودلوازیی ڕەگەزی و نەژادییە و کاتێ دەڕوانییە هەڵپە و هەوڵ و دەولێکی کە لە پێناوی دامەزراندنی دەولەتێکی جیهانی بە ئێوی (ئوممە)ی ئیسلامی، وەك حەسەنولبەننا و سەیید قوتب بە خەرجیان دەدا و ئێستاش هەولی بۆ دەدرێ، دەبینین لە جەوهەردا مایە و پایەی پێشکەتخوازانەی هەیە. ئەم تایبەتمەندییە پێشکەوتخوازانەیە، لە ناخی فەلسەفەکانی ئایینەکان، یان لە ناخی دامەزرێنەرەکانیانەوە هەڵ ناقولێ، بەلکو ڕاستەوخۆ لەو پێوەندییانەوە کە ئایینەکان بە جەماوەرانی خەلکەوە گرێ دەدەن، هەڵ دەقولێ. بەلام ئەم تایبەتمەندییە لە سەر دەستی ئایینمەدارەکان لەبەر ئەوەی پێوەندییان هەر لە زووەوە بە خەلکەوە پساوە و بووە بە دەسکەلایەکی تایبەتی بۆ پاساودلنی ئایدیۆلۆجیای چینە حوکمڕانەکان، کاریگەرییەکی ئەوتۆی بە بەرەوە نەماوە. بە کورتی ئێستا کارەکە بە لای ئەوەدا شکاوەتەوە کە تەولوی هەرچی تایبەتمەندیی بزووتنەوە ئیسلامییەکان هەیە، کە چینە

حوکمڕانەکان بۆ خۆیان دەستیان لە پەرەپێدانیاندا هەبوو؛ بە تێرۆریست و پیاوکوژ و دواکەوتوو لەقەڵەم دەدرێ. ئەمن پێم وایە خاڵە هاوبەشە گەشەکانی نێوان ئایینەکان و عیلمانییەکان، ئەگەر لە بزووتنەوەی دیالێکتیکیی مێژوو تێ بگەن، یەکجار زۆرن کە دە بەرەیەکی یەکگرتوودا لە دژی دژمنی ڕاستەقینە خەبات بکەن، بەڵام بە مەرجێ پشتی جەماوەر بەر نەدەن، واتە: لە نیگای خوایشت و ئامانجەکانی خەڵکانی چەوساوەوە لە دواڕۆژ بنواڕن.

لەمەڕ مەزەب و تەریقەت، هەر ئەوەندە دەڵێم کە مەزەبەکانی ئایینی ئیسلامی لە نێوکرۆکی ئەرزی بیرکردنەوەی ئایدیالیستانەدا، هیچ جوداوازییەکیان لە نێواندا نییە. بەڵام ئەوەندە هەیە، کە هێندێکیان بۆ پاساودانی بیروبۆچوونی سروشتی چینایەتیی خۆیان بە ئەقلّ و هێندێکیان دیسان هەر لە نیگای هەمان بەرژەوەندەوە بە نەقلّ (سرووش) لە چتە ناسەرەکییەکاندا، جواداوزییەکی فۆرمالیستانەیان هەیە. بەڵام ئەمە زۆر کەم پێوەندیی بە بەرژەوەندە چینەکییەکانی جەماوەرەوە هەیە. بە نموونە: لە دەستنوێژشتندا سورمانێ پێی بشوا، یان مەسحی بکا، یان پیاو و ژن دەسنوێژیان لە یەکدی بشکێ یان نەشکێ: هەرچەندە ئەمانە سووک کردنەوەیەکی ئەرکی سەرشانی سورمانی تێدایە، بەڵام چ کاریگەرییەکی لە ژیان و گوزەران و لە تاریکستانی نەزانی ڕزگاربوونی سورمانەکەدا، هەیە؟ نموونەیەکی دیکەتان نەك لە ڕێوڕەسمی خوداپەرستیدا، بەڵکو بە زاراوەی شەریعەتی ئیسلامی لە مامەڵە و ڕەفتاری کۆمەڵی - ئابووری (معاملات)دا، با بۆ بێنمەوە: کێشەی ئیمامەت و خیلافەت کە کێشەیەکی زۆر گرنگە، بە هیچ پاوساوێکی نوسراو لە کۆرێدا نییە، ئەوەی کە هەیە، تەنها بیروبۆچوونی لایەنە سیاسییەکانی مەزهەبییە کە لە بەرژەوەندی نەك سەرلەبەری سورمانان، بەڵکو لە بەرژەوەندی پێوەندییە خێڵەکییەکان ئاو دەخواتەوە.

هەروەها لەبارەی ئایینەوە، پاش بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی ڕێزێ گارودی بە سەرناوی "سۆسیالیزم و ئیسلامەتی" کە ڕێی لەبۆ وتووێژێکی گەرم و بەپێز لە ڕۆژنامە و گۆوارەکانی جیهاندا خۆش کرد، ڕوونکردنەوەکانی بە تایبەت بەڕێزان نیازی

بێرکەو ئێ . توفەکچی و سەلاحەددین ئیلاف ی کوڕی ئەرشەدی بەهەشتی، محەممەدی میهریی مفتی زادەی خەڵکی شارە دێرینەکەی سنەی خۆشەویست کە لە ساڵی ١٩٥٦دا لە ئەستەمبوڵ بە خزمەتی گەیشتم و هەنگێن بە کاری ئەوقاتییەوە خەریك بوو و بە خەتێکی کۆنی عوسمانییانە لە ژوور سەریەوە، بە دیوارەوەی "برنجی دعوی وکیللرندن محمد مهری"ی نووسیبوو، زۆرم سوود لێ وەرگرت.

ئەم ئەفەندییە، هیلاو، وێڕای بیروبڕوای ماتریالیستانەی، بە شێوەیەکی زانستانە لە ئایین گەیشتووە. ئەمن پێم وایە هەروەك ڕۆژێ گاروودی پێی وایە ڕستەی "ئایین ئەفیوونی گەلانە" کە لە تۆولۆی قسەکانی کارڵ مارکسدا دەخوێندرێتەوە، لە چارچێوەی خۆی بە بێ ڕەگوڕیشە لە گوێن "ولا تقربوا الصلاة" ڕیشەکێش کراوە. ڕاستیت گەرەکە، ئایین لە هەلومەرجەکانی مێژوویینە و کۆمەلایەتییانەی خۆی بەدەر بە چییەتی (ماهییەت) و جەوهەرێکی ڕووت و پەتی (ئابستراکتانە) تەماشاکردن، لە مێتۆدی مارکسیستانە بەدەرە و مارکسیش و ئنگلسیش لە وەکوڵینی ڕاستیی ئایینا نەیان گوتووە: ئایین لە هەموو شوێنێك و لە هەموو سەروبەند و زەمانێکدا، هەر هەمان کاریگەریی خۆی دەنوێنێ. مارکس لە ١٨٤٢دا لە لێوەکوڵینێکیدا نووسیویە: لە هەلومەرجەیلێکی کۆنکرێت و بە دەستی چینێکی فەرمانفەرمای دیاریکراودا، وەك پێناو و ئامێر بەکار دەهێندرێ، بەلام وەها وانێکێکیش نییە کە وەزیفە و ئەرکی سەرشانی هەرگیز نەگۆڕێ.. هەروەها فەرموویانە: ئایدیۆلۆجیایەکی سەر بە ژێرخانی کۆمەڵە و دەگەڵ ئەم بنیاتە ماددییەدا هاوپێوەند و هاوسەروکارە [٢] گاروودیش لەو وتاری (ڕەخنەی هیگل لەمەڕ فەلسەفەی حوقووق)دا باسی کردووە کە مارکس نووسیویە: ئایین لە هەمان کاتدا لە دژی هەلومەرجێکی بەسەر دەبرێ، سەرهەڵدان و دەگژڕاچوون و دەنگی ئیعتیراز و پرۆتێستۆیەکە:

" لە ناچاری خۆ بە ئایینەوە هەلاواسین لە سەرێکەوە، بەدەنگهاتنی ئەو ناچارییەیە کە لە ڕاستی (حەقیقەت)دا هەیە و لە سەرێکی دیکەوە لە دژی ناچارییەکی کە لە

---

[٢] سەروتار بۆ Gazette de Cologne ، ل: ١٧٩.

ڕاستیدا هەیە، ئیعتیراز و ناڕەزاییدەربڕینە. ئایین دڵدانەوە و جەخت لەسەر سەبووری و بوردەباریی مرۆی داڕزێندراو و ڕۆحی دنیایەکی دڵڕەق و هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆیە کە تێیدا ناحاوێتەوە. ئایین کە گۆیا "ئەفیوونی گەلان"ە. ئەوەی لەم ڕستەیەدا دەخوێندرێتەوە زێتر باسی ئاڵمان و ڕژێمی مرۆچەوسێن دەکا تا میتافیزیکانە ناساندنی جەوهەری ئایین. مارکس گرفتی ئایینی لە ئایدیۆلۆجیای ئاڵماندا بە ڕاشکاوی، لە کەلێنی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی ئاڵمانڕا باس کردووە. هەر لە هەمان کتێبدا دەڵێ: ئایین بە پێوەندیی دەگەڵ هەلومەرجی ماددی (ئابووری) دا دەگۆڕێ و گۆیا لە ئارادا نامێنێ و ئاشبەتاڵی لێ دەکرێ؟!.

"ئەم بیروبۆچوونە تیئۆرییانە (بیروبۆچوونی ئایینی)ش لە نیگای خەڵکەوە، واتە پرۆلیتاریاوەش مەبەست نییە و نابێ بە بابەتی باس. ئەگەر جەماوەری خەڵك بیروبۆچوونێکی وەك بیروبۆچوونی ئایینیی هەشبووبێ، ئەمە سەبارەت بە هەلومەرج، لەمێژبوو بە سەرچووبوو و لە ئارادا نەمابوو [٣]. مارکس کە نەگۆڕانی ئایین وەك جەوهەر (دیارە پێش تۆمارکرانی ئایدیۆلۆجیای ئاڵمان) پەسەند نییە. ئەمە لە تێزە (صفرا مەنتیقییە)کانی لەمەڕ فیۆرباخەوە تێ دەگەین. فیۆرباخ نە تێزی شەشەمدا، لەسەر ئەوە کە ناچار بووە "لێئشاوی مێژووییەوە ڕووت (ئابستراکت) کاتەوە و هەستوخوستی ئایینی بەرەو حاڵەتی چێ ڕادا کە لە گۆڕان نایە، بەر تەشەر و توانجی ڕەخنە دەکەوێ. "سەبارەت بەمە فیۆرباخ هەستوخوستی ئایینی بە بەرهەمێکی کۆمەڵایەتی نازانێ" (تێزی ٧).

لەبەر وەی کە ئایین تاکە جەوهەرێکی وای نییە، لەبۆ هەموو چەرخ و چاخەکان لەبار بێ. لەوانەیە لە چەرخ و چاخە جۆراوجۆرەکاندا و لە چوارچێوەی هەلومەرجە جۆراوجۆرەکاندا دەوری لە یەکدی جوداواز، بگرە دژ بە یەکدی بگێڕێ (؟!) ئایین بۆ خۆی لە کەلێنی بنیاتی بنەڕەتەوەی لە مێشکی مرۆدا ئایدیۆلۆجیایەکە، واتە بە

---

[٣] K. Marx – F. Engels, Sur La Religion, s. 80, Editions Sociales.

شێوەیەکی شوان هەڵخەڵەتێن و ڕەمەکیفریو، ڕەنگدانەوەی ئەو هەلومەرجە مادییانەیە کە مرۆڤەکانیان دەبن کاریگەرییاندا مەحکوومن.

وەلێ ئەم بەرداشت و بیروبۆچوونە کە لە ماددەیڕا چەکەرەدەکا، هەروەك شکڵ و شێوازە ئایدیۆلۆجیکییەکانی دیکە (مافەکان، سیاسەت، هونەر و دابودەستوور و بەندوباو) تەنیا ڕەنگدانەوەی نەکارە و نەستێور (passive) نییە. ئەم ڕەنگدانەوەیە کەرەکتەرێکی بەرچاو و کاریگەریی دیالێکتیکیانەی هەس و بە پێوانەیەکی کۆنکرێت خێوی وەها هێزوگورێکە کە کار لەو هەلومەرج و باروێۆخە مادییانەی لێیان کەوتۆتەوە، دەکا. جا لەبەر هەندێ، دەبێ ئێمە ڕاستیی ئایین لە چارچێوەی ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و چینایەتییانەدا کە هانیویانەگۆڕێ وەخوێنین. ئەمە، هەروەك تەواوی شکڵ و شێوازە ئایدیۆلۆجییەکانی دیکە، ئەوەمان لەبۆ ئاشکرا دەکا کە ئایین لە نیگای چینە فەرمانفەرما و چینە داڕزێندراوەکانڕا لە حەقیقەتی ئایین دەنۆڕێن، بەدیاردەکەوێ کە ئایین بەجێهێنانی وەزیفە و ئەرکی سەرشانی لێکدی جیا ـ جیای هەیە. هەر بە دەم ئەمەشەوە، با ئەوەشتان عەرزی خزمەت بێ: کە مارکس لە نوای گشت چشتێکەوە، سەبارەت بەوە کە سیستەمی سەرمایەداریی وەبەر توانج و تەشەری ڕەخنە داگە، ئایینی لە نیگای چینە فەرمانفەرمایەکانەوە خوێندۆتەوە و هەر لەبەر ئەوەیشە بە پێناو (وسیلە) ێکی مرۆچەوسێن و مرۆهەڵخەڵەتێنی لەقەڵەم داوە ؟!.

بەش بە حاڵی لە فرەسەرەوە لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەکانی ئەنگلس دەربارەی ئایین، ئەوەمێی دەسنیشان کردووە کە چۆن ئەم دیاردەیە دەبێ وەك چتێکی کۆنکرێت لە نیگای مێتۆدۆلۆژیی مارکسیزمەوە، وردکرێتەوە. دە تێککێران و دەگۆڕیەکدی ڕاچوونێکی ئابووریدا ، ئایدیۆلۆجیای ئایین دەتوانێ کەرەکتەر (سیفەت)ێکی شۆڕشگێڕانە بنوێنێ.

"لە دەریەگایەتی هەڵکردن و بەگژداچوونێك، ناچار دەبوا ببێ بە ئیعتیرازێ لە کڵێسە هەڵکردن و بەگژکڵێسەداچوون. سەرپاکی تیئۆریی (doctrines) شۆڕگێڕ و کۆمەڵەکی و سیاسییەکانیش، لە نوای چشتێکەوە، ناچاربوون هەر یەکە بۆ خۆیان ببن

به ڕافزییەتێك، واتە: لە ڕێی ئایین دەرچوونێ" [4] ـ ئایین لە هەمان کۆمەڵدا، بەلام لە نیگای چینی جۆیَ ـ جۆرێوە مانا و وەزیفەگەلێکی جیا ـ جیای دەگەیاند:

"لێرە، هەروەك لە فەرەنسا كوو بوو، لە ئنگلستانێ و بۆهیمیاییش زوربەی نەجیوزادانی چکۆلە ـ چکۆلە لە نێو جەنگەی کێشمەکێش و ڕافزییەتیکی کە دەسەوبەرۆکی پاپازەکان بیوونەوە، دەگەلێ ئەوانەی لە شارەکاندا بوون، یەکیان گرت. ئەو ڕووداوە، بەوە لێکدەدرێتەوە کە نەجیوزادە چکۆلەکان ناچاربوون بە نیشتەنییانی شارەکان پشت ئەستوور بن و بەرژەوەندیی خۆیان لەوەدا دیت کە لە دژی میر و بەگلەر و گەورەپیاوانی ئایینیدا دەگەلێ ئەوانەی کە لە شارەکاندا دادەنیشتن، یەك بگرن. واتە: مەسەلەکە بەرژەوەندییە و هیچی تر نییە.

"تایبەتمەندییەك کە لە ڕافزییەتدا هەبووە، ئەوە بووە کە یەکراست پێداویستی و خواستەکانی گوندی و ڕەشوڕووتی خەڵکی بە دەنگ دەهێنا و هەمیشە کەولسووری بەرلەشکری یاخی بوونێ، هەرایێ بووگە، تایبەتمەندییەکی هەر بە تەواوەتی جیاوازیوو. ئەم ڕافزییەتە، خواستەکانی ڕافزییەتی بۆرجوای وە خۆوە گرتبوو، بەلام هەر وەك نوخشەی خرستیانەتی داوای ئەوەی دەکرد کە هەلومەرجەکانی چونیەکی لە نێو کۆمەڵی ئایینیدا دابمەزرێ، هەروەها داوای ئەوەشی دەکرد کە ئەو چونیەکییە وەك ڕێسایەکی کۆمەڵی سیڤیل (مەدەنی) دەبێ بسەلمێندرێ و پەسند بکرێ [5]. کەواسا ئایین وەك ئایدیۆلۆجیای جەماوەری خەڵك لە چوارچێوەی هەلومەرجە کۆنکرێتەکاندا تایبەتمەندێتیی شۆڕشگێڕانەی دەردەست کردووە و لە سەرەتا (مبدأ)ی "چونیەکیی مرۆڤەکان لای خوداوەند"ڕا بەرەو داواکاریی سەرەتای یەکسانیی مافەکان و تەنانەت ئابووریی پەلهاویشتووە.

ئنگلس لە وردکردنەوەی پەرەساندنی خرستیانەتیدا دەڵێ: لەسەرەتای پەیدابوونی ئەم ئایینەدا "مرۆڤ کاتێ لە ڕزگاربوونی ماددی نائومێد بووگن، ڕزگاریی خۆیان لە نێو

---

[4] K. M. - F. E. Sur La Religion, s. 101, 2,3,4,5, Ed. Socialse.

[5] هەر هەمان کتێب، ل: ٢-١٠.

ئەم بڕوا نوێیەدا بەدی کردووە" و هەروەها ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کە چۆن سەرلەبەری ئەو ئینسانانەی کە لە دژی "دەسەلاتە زاڵەکان" ڕاپەڕیون لە چارچێوەی ئەم ئایینەدا یەکیان گرتووە و چۆن چۆنی لە نێوان یەکەم کۆمەلانی خرستیان و سۆسیالیزمی هاوچەرخدا وێکچوونێ هەیە [٦].

ئایدیۆلۆجیایەکی ئایینی کە خواستی چونیەکیی لە یزداندا گوورابێ لە تەنینەوە و گۆڕانکارییەکانی دواییدا تووشی لەبەریەك هەڵوەشانەوە هاتووە و لە ئەنجامی هەرا و بگری چەندین چین و توێژاڵی بەرژەوەندی لێکدی جوداوازەوە بووگە وە چێشتی مجێور و بە دەیان شاخ و گوێ و ڕێباز و تۆل و نیوچە ڕێباز و بێچووە تۆل و مەزەبی لێ ڕوولوە و بە قەولی شاعیری فەیلەسووفی عەرەب، ئەبولعەلای مەعەڕی کە فەرموویە:

في اللاذقيّة ضجّة ما بين أحمدَ والمسـيح

هذا بناقوس يدقُّ وذاك بمئذنة يصـيح

كلٌّ يصيح لدينه ياليت شعري ماالصّحيح

یا وەك حافزی شیرازی فەرموویە:

جنگ هفتاد و دو ملت همەرا عذر بنە

چون نديدند حقيقت رە افسانە زدند

یا وەك پێغەمبەری ئیسلام فەرموویە:

"ستفترق أمّتي إلى اثنتين وقيل سبع واثنتين فرقة كلّهم في النار إلاّ الفرقة الناجيـة" داری وەسەر بەرنیەوە نەماگە و دە جەنگەی ململانێ و شیروتیر لێکدی سوینی کاتۆلیك و ئەرتەدۆکس و پرۆتستانت و مۆرمۆن و نەستووری و سەبتی و هتد .دا بەش بە حاڵی خرستیانەتی و هەروا بۆ نموونە: موعتەزیلە و ئەشاعیرە و ماتوریدییە و مورجیئە و کەیسانییە و دەیان تۆل و مەزەبی ئەهلی کەلام (فەلسەفەی لاهووت) و حەنەفییە و شافیعییە و مالیکییە و حەنبەلییە و دوازدە ئیمامی و زەیدییە و ئیسماعیلییە و

---

[٦] ئەم وێکچوونە لە کۆمەڵی سەرەتای ئیسلامەتیشدا، لە بیربڕوای سۆسیالیستانی ئەبو زەڕی غەفاری و هەوالانیشیدا دەخوێندرێتەوە.

فاتیمییه و ئەهلی هەق و هتد ی ئەهلی شەرع و سیاسەت و ئیمامەت و هتد دا، کێشەی چینایەتی زۆر ئاشکرا و بە ڕاشکاوی بە دەمی خۆی هاوار دەکا.

"ئایین لە پاش چاوپشکووتنی، دەبینین هەمیشە نێوەرۆکێکی باوی دە هەگبەدا بووگە. ئەمە هەر لە ئایین نەقەومیاگە برا، ئەدی نابینی باو (تقلید، رسم) دە تەواوی بواره ئایدیۆلۆجیکییەکانی دیکەشدا وەك هێزێکی وەپارێز (موحافەزەکار) قوت دەبێتەوە؟ وەلێ جودلوازیگەلێ کە دە نێو ئەم نێوەرۆکەدا قوت دەبنەوە، لە پێوەندییە چینایەتییەکانەوە ئاودەخۆنەوە. واتە: لەو پێوەندییە ئابوورییانەی کە ئەم جۆرە جودلوازی و گۆڕانکارییانەیان لە نێوان ئینسانەکاندا هێناوەتە گۆڕێ، ئاودەخواتەوە"

کەواسا، ئایین وێڕای وەی لێل پێوەندییە ئابوورییەکانا هاوسەروکارەنی، دە هەر کۆمەڵێ، دە هەر هەلومەرجێکدا و لە نیگای هەر چینێکەوە، هەر هەمان مانا نابەخشێ، هەر هەمان کارێگەری نانوێنێ و ڕێگا بۆ وەدی هاتنی ئاکامگەلێکی بەکردەوەی جودا ـ جودا و تەنانەت دووفاق و لێکدی تاق و جووت خۆش و هەموار دەکا. ئایین هەروەك، خودانەخواستە، دەتوانێ ببێ بە ئامێری مرۆهەڵخەڵەتێن، هەر بە هەمان ئەندازە دەشتوانێ ببێ بە فاکتەرێکی مەعنەوی بۆ مرۆ بەرەو بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە هاندان و وەجۆشی بێرێ.

لەو قسانەی سەرەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە بزووتنەوە میللییەکاندا ئایین هەموو جارێ و لە هەموو کاتێکدا هەر هەمان دەور ناگێڕێ. لە وڵاتەیلێ کە لە دژ چەوسیانەوە و ئیمپریالیزم خەبات دەکەن ، لە چارچێوەی بڕێ هەلومەرجی دیار و ئاشکرادا، ئایین بۆی هەیە تەنانەت بتوانێ دەورێکی "هاودەسەبەری" دەسەبەرساز بگێڕێ. بە نموونە هەر وەك ئنگلس دەڵێ، خرستیانەتی لەسەرەتاوە لە خەباتی دژ بە چەوساندنەوەدا دەوری خۆی گێڕاوە. هەروەها تەواوی یاخیبوونەکانی سەرەبەندی ئیسلام لەسەرەتاوە لە کێشە و هەرای ئابووریی نێوان دەشتەکی و شارییەکانەوە ئاو دەخۆنەوە و ئەم یاخی بوونانە لە پێشان خۆیان دە بەرگی ئایینی پێچاوە و هەمیشە دووپارە و چلپارە بوونەتەوە و هەر بۆ هەمان سەنگەر کە لێوەڕا تێ هەڵچووگن،

سەرلەنوێ، جووووووووڕڕڕڕ، گەڕاونەوە.. پیاو ئەگەر بیر لە قسەکانی ئەنگلس دەکاتەوە کە دەڵێ: "ئیسلامییەت هەر دەڵێی بە بەژنی ڕۆژهەلاتییان براوە"، "ئەم هەموو سەرهەڵدان و یاخیبوونانە بێ وەی هەلومەرجەکانی ئابووری بگۆڕن، ئاشبەتاڵیان کردووە" دەکاتەوە وا پێدەچێ ئەنگلس، بنیاتی ئەشلەقاو و وەستاوی بێ ڕەنگ و بێ تام و بێ بینی کۆمەڵگایەکانی ڕۆژهەلات و ناراستەوخۆیانە، تەرزی ڕەنیوهێنانی ئاسیایی ڕەچاوکردووە. ئەنگلس بە دەم قسە لەسەر بزووتنەوە خۆبەرگی ئایینەوە پێچاوەکانی دژ بە چەوساندنەوەکانەوە، هەڵویستی محەممەد ئەحمەدی سوودانیی بە نموونە هێناوەتەوە کە چۆن سەرکردایەتیی گوندی و ڕەوەندانی لە دژ ئینگلیسە ئیمپریالیستەکان کردووە و دەبەرابەر ئیمپریالیستاندا سەرکەوتووە.ڕاستیت گەرەکە ئەگەر بمانەوێ بزانین دەوری دیاردەی ئایین لە بارودۆخێکی مێژوویینەی کۆنکرێتدا وەك فەلسەفەی مارکسیزم بە شێوەیەکی زانستانەی ئۆرپوەتێ ـ بزانین چبووە و چییە، نابێ ئایین بە ناوی پێشکەتخوازییەوە وەك "سەفسەتە" یانیش تەنیا وەك "وشکەسۆفیتی" (تعصُّب)ی تێ بگەین. ئەگەر ئایین وەك ڕاستییەکی کۆمەڵایەتی دە ئەزەر نەگرین و تەنێ هەر بە ڕووتی (تجریدی = ئابستراکتانە)ی ڕەتکەینەوە، ناتوانین کار لە ئایدیۆلۆجیایەکی، کە ڕەگوڕیشەکانی لە دنیای ماددی ڕۆچووە، بکەین.

هەروەك توفەکچی زۆر جوانی بەیان فەرمووە، "بمانەوێ و نەمانەوێ، کۆمەڵگایە ئایینییەکان دە قۆناخی پەرەساندن و گەشەکردنی دیاریکراویاندا، ڕاستییەکن. ئێمە، سۆسیالیستەکان هەروەك دە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراو دەیکەین دەتوانین دە بواری ئایدیۆلۆجیشدا ئەو هەنگاوە بەرەوپێشەوانەی کە گەشەکردنی کۆمەڵ هەموار دەکەن بەو کۆمەڵە هەڵبگرین. لە ئایین بە چتێکی "پڕوپووچ" ئۆڕینت، واتە: بەچتێکی دە بنەڕەتدا بێ ڕەگوڕیشەماددی و "بێروبڕوایەکی هەڵە" و "هەر لەبەر بە ڕووتی جاڕدانی هەڵەبوونی نەمان و لەناوچوونی" کارێکی زۆر لە تەنکاودا سۆبایی کردن و نەزانییە. ئەم تەورە، هەر وەك ئاغای تێ توفەکچی ڕوونی

هەر وەك ئاغای ئێ توفەکچی ڕوونی کردۆسەوە بیروبۆچوونێکی لیبرالیستانەی (ئەمە دە بناخەی ڕادیکالیزمیشدا بەرچاو دەکەوێ) میکانیستی پێش هیگڵە و کەرەکتەرێکی دژ بە دیالێکتێکی هەس. کارێ کە ئەوێ بکرێ، ئەوەسا کە بتوانرێ دەوری ئاین لەو ڕووەوە کە ئایدیۆلۆجیایەکە، دەستنیشان بکرێ و بچەسپێندرێ و لایەن و بەندوباوە دووفاق و یەك لە شام و یەك لەحەڵەبەکانی یەکلاکرێنەوە و شەن و کەو بکرێن و بە پێی ئەو ڕاستییانەی کە ئاوها لە زانستە ساغڵەمەکانڕا هەڵێنجراون، واتە: دە بواری کارەکردەنییەکاندا، وەسەر ڕێگای کاریگەر و دروستەکان کەوتنە.

بەش بە حاڵی وتوویژ و لێوەکۆڵین و بیروبۆچوونی نەزەرییانەی ڕۆژوەزەوەندی ئەم ساڵانەی دواییێ لە هەردوو سەنگەری ئایینی و لاییکی (عیلمانی)ڕا لە کوردستانی نیوچە ئازاددا، دە بنەڕەتدا پێوەندییان بە قووڵی لێل سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی چالاکییە کردەنی و شۆڕشگێڕەکاندا هەس. ئێمە بێژن و نەیەژین، تا ئەندازەیەکی بەردلگر پاشماوەی ڕژێمی ئابووری ــ کۆمەڵەکیی ئیمپراتۆریی عوسمانین و هەروەك هەرچییەکمان وەك پاشماوە لە سوننێتی و شافیعێتی و عەلەوەێتی و یەزیدیەتی و کاکەیەتی و دوازدە ئیمامی و بەهانییەتی و هەقەیەتی و هتد    بۆ ماگەسەوە تا ئێستا لە ڕووی بنیاتی کۆمەڵایەتی ــ ئابوورییەوە لە مانای نەگەیشتووین و هەر وەو ئەندازەیەش، لە هەڕ ئەو هەڵوێستە دووفاق و تاقوجووتانەی کە لە چەندین تێڕوانینی جودا ـ جودا و جۆراوجۆر کەوتوونەوە، بایبی پێویستیان فڕ سەر لێ سەر دەرناکەین. ئێستا لە کوردستان هەلومەرجێکی وا هاتۆتەگۆڕێ تا ڕادەیەك هەموو حیزبێکی ئیسلامی چ بێ منەت چ بە منەت بە قسە و نووسین و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و چالاکی نواندن، ـ ماڵم قەبرە ـ هەموو هەر دەڵێن دەبێ کار بۆ کوردایەتی بکەین.. بەڵام بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن یان نایانگەرەگە دکانی پێدا بنێن، کوردایەتییەکەش هەر وەك ئیسلامەتییەکە بووگە وە باڵاگەردانی بەرژەوەندیی کۆمەڵەکی ـ ئابووریی چینایەتی، بەرژەوەندیی ئەم بەرەو ئەو بەرە.

کورد لەم سەروبەندەدا دەیەوێ خێوی ئابووریی کوردستان بێ و لە کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی بیانیی ڕزگار بێ، بەڵام دەبێ ئۆرگانیزاسیۆنەکانی کورد لە چوارچێوەی بەرژەوەندیی گشتدا لەم قۆناخەیدا هەر هیچ نەبێ بیر لەوە بکەنەوە گەلۆ لە پای چی نزیکەی لە ٧٠٪ی لاوانی کورد زێتر پروردەکەنە مزگەوتەکان نەك ئەو ئۆرگانیزاسیۆنانە؟ لەبەر چی لاوان بەرەو هەندەران سواری گای هار دەبن و خۆ بە دەم دەیان مەترسی و دووبەختییەوە دەدەن؟ ئەمە لە ئاکامی لە خۆو لە هەموو چتێکی ئەم وڵاتە بیانیبوون نییە؟!

دەی جا، با چتێکیش لەمەڕ مانا و چەمکی لەخۆبیانیبوونی مرۆ بێژین. لەخۆبیانیبوون، بە درێژاودرێژیی مێژوو لە ماکی فەلسەفە و ئیۆلۆجیی جۆراوجۆردا دەورێکی گرینگی گێڕاوە. دە سیستەمە میتافیزییەکاندا، قسە لەسەر ئەوە دەکرێ کە "حەقیقەت"، "موتڵەق"، واتە: خوداوەند لە بوونی خودی خۆی دوورکەوتۆتەوە و بە شێوەیەکی بەخۆ بیانی و ناجۆر و ناقۆلا هاتۆتەگۆڕێ.. واژەگەلی وەك "بەچۆکداهاتن"، "کڕنووش بردن" و "لەسەرزگی پووت بەسەر زەویندا بەرەو پیریی شێخ و پیرانی تەریقەتەوە چوون" و هتد واژەگەلێکن کە بۆ مانای لەخۆبیانیبوون وەزوان هاوردن، وەکار بریاگن. هەروسا، هەمان مانا و چەمکەکانمان، لە تەسەووفی ئیسلام و بە گشتی تەسەووفدا، بە ڕۆنیکی ئایینی و میستیکییەوە تووش دێ. چەمکی لەخۆبیانیبوون، بە دەم ڕۆژگارەوە لە ماناتایینییەکەی و میستیکییەکەی دارندراوە و بە تایبەتی لە فەلسەفەی هیگلدا مانایەکی ئەقلی (rational)ی لێبارکریاگە. وەك دەزانین، هیگل لەو بروایەدایە کە کۆسمۆ (گەردوون) لە ئاکامی لەخۆبیانیبوون و پاشانەکی بۆخۆگەڕانەوەی سەرەتایەکی مەعنەوی و سەرووخۆرسك کە هیگل بە idea (نموونە - میسال)ی نیوناوە، هاتۆتەگۆڕێ. ئەوجا لە پاشان، فیورباخ بە پەیڕەوی کردن لە هیگل، مانای لەخۆبیانیبوونی لە نیگای ئایینەوە، وا لێکداوەتەوە کە مرۆڤ ئایین و ژیانی ئایینی و هیزوگوردەکانی خۆی وەك چتهایەکی لەخۆبیانی و نامۆ دەبینێ. بەڵی وەلای ئەوەوە لەخۆبیانیبوون، لەمەڕا هاتۆتەگۆڕێ. واتە: وەلای فیورباخ موە

ئادەمیزاد بەوەی کە لێوەشاوەیی و هێزەکانی خۆی بە لێوەشاوەیی و هێزی غەیری خۆی دیتووە، خودا و ئایینی (بە مەزەنەی خۆی و لە مێشکی خۆیدا. ش. م.) گووراندووە. هەرچی م. مۆسێس هێس.ی باڵی چەپی فەلسەفەی هیگڵە، لەخۆبیانیبوون، واتە مرۆ ئەو چتانەی کە خۆی دەیانخوڵقێنی و وەبەرهەمیان دێنێ وەك چتهایەکی بیانییان کە ئی خۆی نەبن و ملکی یەکێکی دیکە بن دیتن، بە ڕاستییە ئابوورییەکانەوە گرێداوە. بە پێی تێڕوانینی م.هێس ملکەچکردنی مرۆڤ بۆ خودا، لە بەدەنگهاتنی ملکەچکردنی مرۆڤ بۆ کالاّ و پوولّ لە مەیدانی ئایدیۆلۆجیدا بەولاوە چیدیکە نییە (تکایە بیر لە فەرمایشتی ئیبنولعەرەبی کە گوتوویە "دینکم دنانیرکم تحت قدميَّ هاتین" بفەرموون - ش. م).

کەواتە: چەمکی لەخۆبیانیبوون تێکڕا بەم جۆرە دەناسێندرێ:

"لەخۆبیانیبوون، بە مانای لەباو و تەقلیدی واتە: هەر بوونەوەرێ ئەوەی دە باریدایە لە خۆیەدەری کا. بەلاّم بەلای لاهووتییەکانەوە خوداوەند، بە لەخۆبیانیبوون (لەخۆیەدەرکردن دنیای خوڵقاندووە"[٦].

لەسەرێ ڕوونمان کردەوە کە لەخۆبیانیبوون لە لایەن فیورباخ و هێس ەوە لە چەمکی خوداگەری (تیۆلۆجیك) قوتارکراوە. هەرچی کارل مارکسە چەمکەکەیان پتر بەرچاو (مشخص)تر کردووە و لە شێوەی گریمانە (فرچیە)یەکی ژیانی مرۆڤیدای بەکارهێناوە.

بە لای مارکس ەوە لەخۆبیانیبوون ئەوەیە کە چتێکی مرۆڤ بە بەرهەمی دێنێ لە دەستی هەڵێ و قوتاری بێ و بچتە حاڵەتێکەوە کە دەبەرابەر ئەو مرۆڤەدا وەك بیانی و دژمنی لێ بێ. جا ئەمە، هەر وەك لە ژیانی ئابووریدا دەیبینین، لە ژیانی سیاسیشدا، لە بواری مێژووشدا و لەفام و دەرك (ئەندێشە و هەستوخوستی)ی مرۆڤەکانیشدا، دێتەگۆڕێ. بە ڕاستی مارکس مەبەستی لە مانای لەخۆبیانیبوون پتر لەخۆبیانیبوونێکە کە حاڵەتێکی تایبەتیی لەخۆبیانیبوونی ئابوورییە. بە لای ئەوەوە ئەم دیاردەیە تەنها هەر ملکییەتی تایبەتی نایخوڵقێنێ، بەڵکو کاردابەشکردن، ئەوەندەی دیکەی خەست

---

[٦] La Theorie Materialiste de la Connaissace, s. 320, P. Universitaires .

دەکاتەوە. ئەمە لە بەشی چارەمی بەرگی یەکەمی کتێبی سەرمایەدا، بە نێوی "فیتیشیزمی کالآ و نهێنیی وی"یەوە ڕوون کراوەتەوە. (مەبەست لە فیتشیزمی کالآ، مرۆ بەرە ـ بەرە کە پاش وەی بازاڕ پەیدابووە، پێی وابووە کە نرخی کالآ چ لە ڕووی بەکارهێنان و چ لە ڕووی مەسرەف (استهلاك)ەوە، چتێکە لەسەرووی توانستی مرۆوەیە و بەرهەمی کری وی نییە و بەمە پوولیشی لێ بووگە وە خودا و پەرستوویەتی و لە خەزێنانی دەپارێزێ و بانبانك و تەلەسمانی لەسەر دادەنێ) ئەو مرۆیەی کە بە کاری کردەنیی خۆی بەرهەمانی ڕەنێودەهێنا، هەم لەدەستدەرچوونی بەرهەمەکانی بە چاوە خۆ دەدیت و هەم بە حالەتێ دەگەیشت کە ئیدی ئەو کروکۆششتەی بەرهەمی پێ وەبەرهەم دەهێنا، جارێکی دیکەی بۆ قەرەبوو نەدەکرایەوە و لەگەلّ ڕەنج و کروکۆششتەکەی خۆیدا دەبوو بە بێگانە و نامۆ. واتە ئەوەی کە لە خۆیدا هەبوو، لەخۆبەدەری دەکرد و جارێکی دیکەی وەکە خۆ بۆ نەدەگەڕایەوە. بە نموونە: کرێکارێ بۆ ئەوەی بتوانێ ٨ سەعات کار بکا، پێویستیی بەوەندە توانست (وزە)یە کە ئەو ٨ سەعات کارەی پێ دەسەبەر بکا، هەیە. گریمان ئەو کرێکارە بە پێوانەی ستاندارت بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو وزەیە، ڕۆژانە پێویستیی بە ١٠٠ دینار هەیە، باشە ئەدی ئەگەر هات ڕۆژانەکەی لە ٣٠ دینار زێتر نەبوو، کرو ئەو وزەیە بۆ ڕۆژی پاشێ قەرەبوو بکاتەوە؟! ئەم حالەتە وای لە مرۆڤ دەکرد کە دەبوو لە ناچاری و بە زۆرەملێ کار بکا و لە قەپێلکی ئینسانەتیی خۆی دەرچێ و خۆلاسە ببێ بە پارچەیەکی بێ گیانی مەکینە، (فیلمەکەی چارلی چاپلن وەبیرە خۆ بێنەوە)..بە لای مارکس ەوە، لەخۆبیانیبوونی ئابووری، دە کۆمەلّی سەرمایەداریدا بەوپەڕی چلەپۆپەی گەیشتووە و مرۆی کردووە بە "وانێك"، بە "پێنساو"ێك و لە ئینسانەتیی خودی خۆی بێ بەهرە کردووە. ئینسانەکان، ئەو وانێکانەی کە بە ڕەتجی شانی خۆیانیان وەبەرهەم دەهێنا، وەکە چتهایەکی لەخۆبەدەر و سەربەخۆ و هەروەك فریان بەوانەوە نەبێ دەدیت و پێیان وابوو لە نێوان ئەو بەرهەمانەدا کە پێوەندییەکانی نێوان خۆیان وەبەرهەمیان

دەهێنا، پێوەندی (ڕیگ)یەکی سەربەخۆ هەیە.هێنری لیفێر، تیئۆریی لەخۆبیانیبوونی ئابووری، واتە: (فیتیشیزم) بەم جۆرە ڕوون دەکاتەوە:

"فیتیشیزمی سەرەتایی و جادوو، زاڵبوونی خۆڕسکی بەسەر ئادەمزاددا و هێزوگوردی خەیاڵچنانەی ئادەمزادی بەسەر خۆڕسکدا بە دەنگ دەهێنا. هەرچی فیتیشیزمی ئابوورییە (واتە: وانێکێکی کە مارکس فیتیشیزمی ئابووریی پێگوتووە - زاڵبوونی ئەو بەرهەمانەی کە مرۆ بۆ خۆی ڕەنێوی دەهێنان، بەسەر هەر هەمان ئەو مرۆیانەدا، هەروەها ئەو هێزوگورد (فەرمانفەرما)ە خەیاڵییانەی کە بەسەر ئۆرگانیزاسیۆنی خودی ئەم مرۆیانەدا و بەرهەمەکانیاندا زاڵ بووە، بە دەنگ دێنێ".

مارکس ئەوەی ڕوون کردۆتەوە، کە مرۆ لەو بەرهەمانەی خۆی ڕەنێوی هێناون، هەر یەکەی بووگە وە فیتیشێك و "وانێك"ێك و لێیان دابڕاوە و ئەم دابڕانە بەرە - بەرە هێندەی دیکە جیڕتر و خەستوخۆڵتر و سەختتر بووگەسەوە. ئەم "بەوانێکبوون" (Fr. Réificatios, Al. Verdinglichung)ە، کە بە قۆناخەکانی کالا - پوولّ - سەرمایەدا تێدەپەڕێ، بەرە - بەرە هێندەی دیکە جیڕتر و خەستر و سەختر دەبێتەوە. لە بارێکدا کە پوولّ وانێکیکە مرۆ بۆ خۆی دایهێناوە، جێی پێوەندییەکان و ژیان (هەستوخوست و ئەندێشەکان)ی مرۆڤەکانی گرتۆتەوە. "بە جوانی و زیرەکی دیتنی مرۆی پوولّدار" و "کاتێ دەبن بە دزێو و ناشیرن و بوودەڵە" هەر سەبارەت بەمە سەری هەڵداوە. کاتێ کە کەسانێ جێگەیەلێکی لە ڕووی گرینگیی کۆمەڵایەتییەوە داگیردەکەن و لە قوماشە ئەسڵییەکەی خۆیان بە ئابوتابتر و بە جۆرێکی دیکە دەبیندرێن؛ هەروەها هونەرمەندان و توانست و لێوەشاوەیی و داهێنانەکانیان بە چێتێکی زۆر لە مرۆڤایەتی جوداواز و هەڵاوێردە و هتد " بە دەنگ دێنن، نموونەگەلی "بەوانێکبوون"ن. هەروەها توانست و لێوەشاوەیی و هێزوگوردی بێ سەرحەد و سنوور (بۆمبای ئاتۆم)ی مرۆڤەکان، کە دەبنە بەلای سەریان، ئەمەیشە هەمدیس نموونەی زەقوزۆپی لەخۆبیانیبوونە.

کەواتا، مارکس چەمکی لەخۆبیانیبوونی بە جۆرێکی گریمانەی وا بیر لێ کردۆتەوە کە لە دواڕۆژدا لە بواری جۆراوجۆردا بۆ لێوەکۆڵینە زانستییەکان ببێ بە چتێکی بە کەڵک و بە تایبەتی بە پێی لەسەر لەخۆبەبیانیبوتی ئابووری داگرتن وەك بنەما، کتێبەکەی نووسیوە. هەر لەبەر هەندێ، لەخۆبیانیبوون، لە لێکدانەوە ڕەسمییەکانی بیروئەندێشە بەدەرەکانی مارکسدا لەم ساڵانەی دواییدا لەگەڵ سەرلەنوێ وەك چەمکێکی لەنوێژەنەوە هاتنەکایەوەی، دە ئەسلدا، لە نێوان سەرەتا بنەڕەتییەکانی مارکسیسزمدا، جێی خۆی گرتۆتەوە. گەورە مارکسیستەکانی وەکوو گیۆرگ لۆکاچ و ئاگوست کۆنت و هنری لیفێر و هتد لەم چەمکە هەمیشە سوودیان وەدەست هێناوە. نەخوازەللا بەرلەوەی لۆکاچ نووسینەکانی سەرووبەندی لاوێنیی مارکس متالا بکا، شاکارێکی کە لە بەرگی چارەمی سەرمایەی مارکسەوەی تێ هەڵچووە، نووسیوە و وا زانراوە کە چەمکی "بەوانێکبوون"ی دە پلانی یەکەمدا ڕەچاوکردووە. ئنگلس، هەر هەمان چەمکی هەرچەندی بە پارێزەوە دەست بۆ بردووە، پەیدەرپەی بەسەرکردۆتەوە. کەواتا، چەمکی لەخۆبیانیبوون لە نیگای ڕەگوریشەوە، وێڕای وەی کە چەمکێکی تیۆلۆجی و میتافیزیکییە، لە پاشان لە جەرومەنگەنەی گۆرانکارییەکی چلۆنیەتی دراوە و لەسەر دەستی کەڵەزانایانی بیروئەندێشەی سۆسیالیزم، وەك چەمکێکی بنەڕەت ڕەچاوکراوە.

بەش بە حاڵی سەروکاری جادوو بە ئایینەوە، کە فری بەسەریەوە نییە، جادوو Magic یەکێ لە ئایینە سەرەتاییەکان و بڕێ ڕێوڕەسم و ئایینبازییە کە بە نیازی بەسەر زیندەوران و ئەروای خەیاڵیدا زاڵبوون، دەکاردەبرێن. ڕەگوریشەی جادوو لە بڕوا بە پێوەندییەکی جۆرێ لەنێوان مرۆڤ و دەوروبەریدا، ئاوەدەخواتەوە. لەدژ فەلاکەت و بەلای ناگەهان، نەخۆشین، خراپە و بەدکاری و هتد جادوو دەکار براوە و دەبرێ. بڕوا بە جادوو کە تاوەکو نیوەی دووەمی سەتەکانی ناوین لە هەرمێن و بڕەودا بوو، ئەڕۆ دە شێوەی لێشاوی زانستی نهێنی Occultism دا سەرلەنوێ هاتۆتەکایەوە. لە ئایینە جیهانییەکانی مەسیحی و ئیسلامیدا تۆخمەکانی لە گوێن کەشف و کەرامات،

نوشتەکردن و کشتەك برین، تف لە زاری نەخۆش و دارکاری کردنی شێت و شوور، بخورسووتاندن و زاواکردنەوە و کوڵەنانیەتی و بەختگرتنەوە، زەرگ و شیر لەخۆدان، ئاسنی داخکراو بە زمان لستنەوە، حاڵ لێ هاتن، نواندنی موقناتیسی، مردوو مەسح کردن، هەوتوو و چلە و پرسە بۆ مردوو گرتن، چوونە سەر قستی شەخس و شێخ و مەشایەخ، پروپاگانتە و پرۆپاگاندە و بانگەشە (دعایە)ی بازرگانی و سیاسی و ئاهەنگ و شایی و جێژن و سەرلەبەری چالاکییەکانی ئەم زەمانە کە بۆ ئیجا و کار لە ئەنجامی چتهایەکی کە ئینسان دەیهەوێ ناراستەوخۆ بەسەریاندا زاڵ بێ و بۆی مەیسەر بن، بەرچاودەکەون.

جادوو ئەمڕۆ دەگەڵ شەعبەدە و فرتوفێلکاری و چاوبەست و بەدەسوبرد و مەهارەتی دەست و چتی نهێنی و ئەسرارامێز ئەنجامدان بە نێوی سیحربازییەوە زۆر لەباون و لە هەموو دنیادا ماونەوە و Occultism (زانستی پەنامەکی) لەوەوە ئاودەخواتەوە کە کەسانی لە خواسایی بەدەری ئەوتۆ هەن کە گۆیا پێوەندییان بە هێزە ئەسرارامێزەکانەوە هەیە و ئەوەی ئەوان پێیان دەکرێ، کەسانی خواسایی پێیان هەڵناسوورێ، ئەم جۆرە کەسانە بە تایبەتی لە کۆمەڵی هێشتا نیوەسەرەتایی ئەم زەمانەدا زۆرن، تەنانەت دەسەڵاتداران بۆ ئامانجی سیاسیی خۆیان بەکاریان دەهێنن. بە ڕاستی ئەم دیاردە ئەسرارامێزانە هەرچەندە لەگەڵ زانستی پشت بە ئەزموون ئەستووردا ڕێك ناکەون و بە پروپووچ دەزاندرێن، بەڵام بەش بە حاڵی پاراسایکۆلۆجی، زانست تا ڕادەیێ ئاوڕی لێ داوەتەوە و سیاسییەکان سوودی لێ وەردەگرن. ئەمەش سەروکاری دەگەڵ هێندێ خەسیەتی بیۆلۆژیکی ـ کیمیکی ـ فیزیکیی مرۆڤدا هەیە کە ڕەنگە لە هێندێ کەسدا خەستوخۆڵتر پەنگی خواردبێتەوە. ئەم Occultismە لە دەرکەیەکی زۆر گەورەوە هاتۆتە نێو Mistısism سۆفیگەرییەوە و دە شێوەی دەروێشی و سۆفیەتیدا، دە شێوەی وەلیاتی و کەشف وکەراماتداریدا ئاشکرا دیارە. هەروەها هێندێ دیاردەی پەرجووی پێغەمبەرانیش هەر بۆ ئەم زانستی پەنامەکییە دەبرێتەوە.

سێر جێمز، ئەرواپەرستی (ئانیمیزم کە گۆیا سەرچاوەی سەرهەڵدانی ئایینە) بە بابی شیعر و جادووگەری لە ڕێی خەیاڵکردنەوە و ئیحاوە بە بابی دراما و لە ڕێی مەیل بەلای زاڵبوون بەسەر ئەرواداَ بە بابی زانست دەزانێ. ئەگەر جادووگەری سوودێکی لێ نەکەوتاباوە، جادووگەر دووچاری زەرەر و زیان دەهات، بەڵام خەڵک سەرکەوتنێکی وییان لە دەیان شکستخواردنی وی زێتر لە بیری خۆیاندا نەخش دەکرد و ئەمەش بە سوودی جادووگەرەکە دەگەڕا کە بە پەرژانەسەر پەیجووکردنی هۆکار و ئاکامەکانی و لەبۆ نیازوخوازە پێویستەکان بکەوێتە هەڵپەی دابینکردنی پێناوە (وسیلە) خۆرسکانەکانی وی. جادووگەر بە هۆی بەکارهێنانی ئەم پێناوانەوە و لە هەمان کاتدا بە خوێندنەوەی ویرد و دوعا و ئەفسوونەوە دەیتوانی سەرکەوتنەکانی خۆی لە چاو جادووگەری بزانێ و بە نێوی کارسازی خودایانەوە ناووبانگ دەربکا. بەو جۆرە لە جادووگەر و تەردەست و ڕەمڵێدەر (کاهین) و پزیشکی جادووگەر و پزیشکی ڕاستەقانی، ستێرژمێر و کیمیاگەر پەیدابوون. زانستمەندانی ئەوڕۆی نێمە هەریەکە لە بوارەکانی لێوەکۆڵینی میراتگری ڕاستەوخۆی ئەو جادووگەرانەن و لە سەرێکەوە (بە لای ویل دیورانتەوە) لە هەمان سەرچاوە هەم ئایین و هەم زانست و هەم فەلسەفەی میتافیزیك و پزیشکی پەیدابوون: دوو ئاوازی جودلواز کە لە سەرتاسەری ئاوازەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا بە چەندین جۆرە گەروو و ئامێر چڕدران و ژەندران.

جگە لەمانە، Theosophy (عیرفان = خوداناسی)یش وەکو دیاردەیەکی بەرچاو دووبارە لەگەڵ جادوو و سۆفیگەریدا وەك دوو ڕووی مێداڵەکەن. Theosophy، واتە: بڕوا بەوە کە مرۆڤ دەتوانێ لە ڕێی پێوەندیی خوداوەند بە دنیاوە دەرك کردن، بە لەشی ماددیی خۆ لەناوبردن، لە گوناهەکانی پاك بێتەوە و لە هەبوونی بنیادەمانە (ناسووتی) ڕزگاری بێ و دەگەڵ هەبوونی خودایانە (لاهووتی)دا تێکەڵ بێتەوە و جۆش بخوا. ئەم Theospphyیە کە لەسەر بنەڕەتی بوودایی و براهمایی و فەلسەفەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی دامەزراوە، لەو بڕوایەدایە کە ڕۆحی مرۆڤ لە ئەنجامدا سەرهەد و سنووری گوناهان دەبەزێنێ و دەگەڵ خوداوەندا تێکەڵ دەبێتەوە و جۆش دەخوا،

چەندین جار لە هەبوونەوە بۆ نەبوون (لە مانەوە بۆ نەمان) و لە نەبوونەوە بۆ هەبوون گەشتوگوزار دەکا (تناسخ). لە دواوای سەتەی ١٩ەوە لە ئەمەریکا و ئینگلستان و ولاتانی سەرمایەداریی دیکەدا، کۆمەڵە و دەستەی Theosophyیانە زۆر دامەزراون.

بەش بە حاڵی Mistisism سۆفیگەری، ئەمە جیهانبینییەکی ئاینیی ـ ئایدیالیستانەیە کە ڕەگوڕیشەی لەو ڕێوڕەسمە نهێنییانەی کە کۆمەڵانی کەونارای ڕۆژهەلات و کۆمەڵانی کەونارای ڕۆژاوا بەڕێوەیان دەبرد، ئاودەخواتەوە. گۆیا پێوەندی لە نێوان مرۆڤ و خوداوەند، یان هەر بوونەوەرێکی ئەسرارامێزی دیکەدا دامەزران و بڕوا بە هێزێکی سەرووی خۆڕسک بەردی بناخەی ئەم ڕێوڕەسمانەی پێك دەهێنا. پێوەندی دەگەڵ خوداوەندا گۆیا لە ڕێی ئالهام (وجد) یان سرووش (وحی)ەوە دادەمەزرا. لە زۆر دۆکتۆرینەکانی فەلسەفە ـ ئاینییەکان (بۆ نموونە: کۆنفۆشیۆسی، براهمانی، ئۆرفیۆسی، فیساگۆری و پلاتۆنیی ـ نوێ ـ دا توخمەکانی Mistisism بەرچاو دەکەون. فەلسەفەی Mistisism لە سەتەکانی ناویندا لە سەر دەستی بێرارد(١٩٠١ ـ ١٨٥٣) ئێکهارت (١٢٦٠ ـ ١٣٢٧) و تولێر (١٣٠٠ ـ ١٣٦١) و هتد ی، گەشەی کردووە. فەلسەفەی Mistisism دەگەڵ تەسەووفیشدا سەروکاری هەبووە. لە ڕیزی میستیکەکانی دواییدا هی وەکو بۆحوم و سویدێنبێرگ یش بەرچاو دەکەون. دەتوانم بڵێم ماك و ئامیانی هەرچی فەلسەفەی ئایدیالیستانەی چەرخ و چاخە مۆدێرنەکان، لە گوێن: Pers onalism و وجوودییەت و هتد ) هەن، کەموزۆر ئەم Mistisism ەیە. لە ڕووسیا فەلسەفەی ئاینیی ـ Mistisism لەسەر دەستی سلاڤییەکان وسۆلۆڤیێن و ئەوانی دیکەی وەك بێردایێف و ترۆبێتسکۆ ی سەر بە وان گەشەی کردووە. فەیلەسووفە میستیکەکان سرووش (وحی) کە جۆرە سۆسەیەکی میستیکانەیە، بە شێوەی هەرە ترۆپکی زانستی دەزانن. لێرەدا هەبوون (وجود) بە شێوەیەکی یەکڕاست و بێ پێناو لە لایەن Sujet (العلّة الغائیة = )ەوە دەرك دەکرێ. جا ئاویەناو وێرای وەی کە بیروباوەڕە پێشکەوتخوازەکان (بۆ نموونە: بیروباوەڕەکانی Eckart، یان ئۆپۆزیسیۆنە شۆڕشگێڕەکان دە شکڵ و شێوەی

Mistisismدا بەدیاردەکەون، Mistisism وەك بنکە (قاعدە) لە لایەن ئایدیۆلۆجیای چینی کۆنەپەرستەوە دەھۆڵ و زوڕنای بۆ لێ دەدرێ و لەوێڕا بە پەند و وەعزنامە دەخوێندرێتەوە. دوور مەڕۆ، لە مێژووی ئێرانی سەروبەندی تەیموورییاندا بزووتنەوەی حورووفییەت بە رەھبەری فەزلوللای نەعیمی و سەیید عیمادەدینی نەسیمی و مەحموودی پسیخانی کە دە بەرگی Mistisismدا و ھەر بە مەنتیقی وی و ھەرچی شەریعەتی ئیسلام ھەبوو، رەفزدەکردەوە، ئەوەبوو وەك ئیبن شەحنە دەیگێڕێتەوە عیمادەددینی نەسیمی (١٣٦٩ ـ ١٤١٧ ) بە فەتوای مەلای دوازدە عیلمی سێ زەردێنە و فەرمانی یەکێ لە سوڵتانانی میسر بە "کافر" لەقەڵەم دراوە و پێستیان گرووە. ئارامگایەکەی لە قەڵای حەڵەبە. دوو جارانم زیارەت کردووە.

یۆنسکۆ لە ١٩٧٣دا بە بۆنەی ٦٠٠ ساڵ بەسەر لە دایك بوونیدا تێپەڕبوون لە مۆسکۆ یۆبیلەی بە ھەیتووھووتی بۆ گێڕاوە. بەشی زۆری ئەو وتارانەی لە یۆبیلەکەیدا خوێندرلونەوە، بە ئازەربایجانیم ھەن. دیارە لە ھەموو زەمانێکدا دەسەڵاتی لە تاج و تەخت لە دەستدان زەندەقچووی وەك دەسەڵاتەکەی مەھدیی عەبباسی و مەسیحییەکانی ئیسپانیا، کە ئەویان، بۆ پشکنینی بیروبڕوای دژ دەسەڵاتی لەرزۆکی، پسپۆڕی بە نێوی "عریف"ەوە و ئەمیان کەشیشی سەختگیر و بێ بەزەیان ھەبوون و لە قەفەی مرۆڤی بیروباوەڕئازادیان کێشاوە.

خۆ ئەگەر بزووتنەوەی "سربداران" و شێخ سەفیی زنجانی و بەھائوڵلا و شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدیللای نەھریێ و شێخ مەحموودی نەمر و شێخ سەعیدی پیران و شێخ عەبدوسسەلامی بارزانی بەش بە حاڵی کورد کە دەگەڵ بیروبڕوای کوردایەتیدا تێکەڵ بوون و شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە و ھتد بخەینە خانەی بزووتنەوەی سۆفی و دەروێشییەوە، ئەوە بەو قەناعەتە دەگەین کە بزووتنەوەی میستیسیزمی شۆڕگێڕیش ھەبووە.

بەڵام با بزانین تەسەووفی ئیسلامی لە کوێوە سەری ھەڵداوە؟ لە بنەڕتڕا، کێشەی حیزبایەتی لە نێوان ئاشقەفەرمانڕەوایەتیدا بۆ نێو دەستە و کۆمەڵانی ئایینی

تەنیوەتــەوە و پروپاگەندەچییانیش لــە ئاورخۆشــکردنیدا ـ مــاڵم قــەیرە ـ درێغییـــان نــەکردووە. کارەکــە دە بنیچــەدا بــە کێشــەی شــیعە و ســوننییەوە نەوەســتا، بگــرە حەنبەلییــە ســەختگرەکانیش تــا دەیــانتوانی ئــاوری کێشــەی نێــوان دەســتە و دایــەرە سوننییەکانیان خۆشتر دەکرد. موسـڵمانی خـاوەن دەروونـی بـێ خـەوش و گـەرد و بـە سادەگی لە ئیسلامەتی نۆر، هەر هێندەیان پێ دەکرا لە تاو هـەرا و کێشـەی سیاسـی ـ ئایینی و مەزهەبی هەڵێن و ڕوو لە "دڵنیایی، ئارامی ـ سەیروتەماشا" بکەن. ئەم تەرزە گرایشت و ئاڵهایە هەر لە سەروبەندی ئومەوییەکانەوە گۆیا لە عیراق چەکەرەی کردووە و حەسـەنی بەسـری (٧٢٨) لـە بەسـرە و جابـیری کـوڕی حـەییانی کیمیاگـەری شـیعە مەزەب و ئەبو عەتاهییەی شاعیر لە کووفە لەم بوارەدا کاریان کردووە. کاتێ بەغدا بوو بە پێتەختی ئیمپراتۆریی ئیسلام، ئەوانەی کە ڕوویـان کردبوویـێ، لـە دڵـی خۆیـاندا بـە بیرکردنەوەی ڕووت (التأمل الباطني) دەستە ـ دەستە و ئاڵقە ـ ئاڵقە کۆدەبوونەوە و لە نێو مزگـەوت و کـۆڕ و کۆمـەڵاندا دەرزیـان دەگوتـەوە و لـە هـەموو ئاشـێکیان دەکرد. ئامانجیشیان لەمە ئەوە بووە کە هەستوخوستی سۆفیەتی لـە دڵـی خـەڵکدا بـە دەنـگ بێنن و دڵ و دەروونیان بە گوێ لە موزیك گرتــن مشـتومالْ و پـەرداخ کـەن. نـەك هـەر ئەمە، بگرە وەك ڕەبەندە مەسیحییەکان جوببەی سپیی خورییان دەبەر دەکـرد و هـەر لەبەر ئەوەش بە سۆفی نێونراون. هەروەها ئاسەواری مەسیحییەت دە شێوەی ڕیازەتی سەیر و تەماشادا، بە ڕوونی دە سۆفیەتیدا دیارە، بەڵام بزاوتەکە لە بنیچەدا عـەرەبی ـ ئیسلامیەکی ساف و بێ گەردە. ئامانجی سۆفییەکان لە خودبەکانی حەسەنی بەسری و پاشان لە وەسیەتنامەکانی موحاسیبیدا (لە ساڵی ٧٨١ لە بەسرە لە دایك بووە و هەر لە منداڵیڕا چۆتە بەغدایێ و لە ساڵی ٨٣٧دا لەوێ مردووە) ئاشکرا دیـارن. موحاسـیبی کاتێ نواڕی ئیسلام لەو سەروبەندەدا کەرت ـ کەرت دەبێ و دەبێ بە حیزب و دەستە و گرۆی جیاواز ـ جیاواز، هەر لە نواوە ویستی سەرۆکێ بۆ ئوممـەتی ئیسـلام بدۆزێتـەوە، بەڵام سەرنەکەوت. پاشـان بـەو قەناعەتـە گەیشـت کـە، هـەروەکو پێغەمبـەری ئیسـلام دەستی پێ کرد، کە ئینسان لە چارچێوەی کۆمەڵەی دەورووبەری بەدەر نەبێ، ئـاتوانێ

دڵ و دەروونی خۆی بپارێزێ و تەنها بە قووڵی لە قورئان وەکۆڵین دەتوانێ ڕێگای ڕاست بە خەڵك پیشان بدا و بەرەو لای خوداوەندی ڕێبەدێیی بکا. هەروەها بەو قەناعەتەش گەیشت کە ئەگەر موسڵمان خۆی بە فەرمایشتەکانی خودا و پێغەمبەر بە تەواوی ببەستێتەوە و هێندەی مووێ لێیان لانەدا بە ئامانج دەگا. هەر وەها هەستی بەوە کرد کە بە پەیڕەویی زۆر ورد لە فەرمانەکانی خوداوەند و ڕەزای خودا دەسەبەر دەکا، هەنگێ ئەم هەستوخوستە دڵ و دەروونی لە شوکرانەبژێری سەرڕێژ دەکا و ئەشقی خوداوەندی دە دڵیدا ڕیشاژۆ دەبێ و بە دەم ڕێوە لە ئەحواڵ و مەقاماتێ کە هەر پێغەمبەر بۆ خۆی پێیاندا تێ پەڕیوە، بە تۆبەکردن و شەکیبایی و بوردەباری بەرەو سۆسەکردنی خوداوەند وەڕێ دەکەوێ و پاشان بە دیداری شاد و شوکور دەبێ.
دیارە ئەم شێوە بە خوداوەند گەیشتنە کە پشتیوانەیەکی بە دەقی نووسراو لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا نییە، بێ ڕەخنە و پلار و توانج هەر وا بە ئاسانی وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرنەدەچوو، وێڕای وەی کە موحاسیبی کوتوویە، بە ڕاشکاوی و ئاشکرا بە کفر نەزاندراوە، کەچی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەم جۆرە بیروبۆچوونانەی بۆ خانەی بیروبڕوا ئەقلانییەکانی موعتەزیلە دەبردەوە. وەلێ پاشان تەسەووف لە سەر دەستی جونەید، بە شێوەیەکی نوێ تەشەنەی کرد. جونەید لە پێشان شاگردی سەریی سەقەتیی خاڵی بوو و لە سەر دەستی وی بیروبڕوایەکانی مەعرووفی کەرخیی وەرگرت. لێ جونەید بەم بیروبڕوا ساویلکانە وا دیارە، دڵی زۆر خۆش نەبووە و نەك هەر ئەوە، بگرە گرایشت و ئاڵهای پیرەکەی سڕییەوە و لە واژە و زاراوەی مەلابانەدای داڕشتنەوە. خاڵی ناوچەقی دنیای بیروئەندێشەی جونەید، لە ڕاستیدا، جۆرە ئەشقێکی خودایی ئەوتۆ بوو کە گۆیا بە شێوەیەکی سەروەر بە سەر دڵ و دەروونی مرۆڤدا زاڵ دەبێ و ئیدی خۆی لە بیردەکا و دەگەڵ زاتی باڵادا تێکەڵ دەبێتەوە. لە پاشان حسەینی کوڕی مەنسووری هەلاج، شاگردی جونەید پەیدا بوو و ئەم بیروبڕوایەی زۆر بە سەختی و پابەندییەوە کە لە پاشان بوو بە تۆوی هەموو بزاوتەکانی سۆفیانە، تەشەنە پێ کرد. هەلاج لە خۆراسان، لە ساڵی ٨٥٨ لە بابێکی زەرتوشتی، لە تەستەر لە دایك بووە.

ئـــەم پیـــاوە بیرمـــەندێکی ئـــازاد بـــوو، بـــیروبڕوای موحاســـیبیی دە پزشـــاکێکی وشکەسۆفییەتی و زوهد و لە دنیا و مافیها دەسبەرداری، پەرە پێ دا و بوو بە چتێکی لەباو.. هەلاج دەیگوت: خەرمانەیێ لە نوور (بە شێوەیەکی نهێنیی پێـش هـەبوون، کـە دە بنیچـەدا دەگەڕێتـەوە بـۆ خۆرپەرستیی مێترایی) بـە دەوری ئـەروای ســـەرلەبەری ئیماندارانـەوە دەگـەرێ و مـاقی ئـەوەیان پـێ دەبەخشـێ کـەوا هەست بکـەن دەگـەڵ خوداوەندا بووگن وە یەك ڕاستی. دیارە ئەمەش لە شیعەگەرییەوە دەڵیوەتە نێو ئـەم تەرزە بیرکردنەوەیە. ئیدی زۆری نەخایاند دەبدەبە و هـەیتوهووتی پێتـەخت، هـەلاجی کەمەندکێش کرد و وەدووی جونەید کەوت و نزیکەی شەش ساڵێکی دە خزمـەتدا بـوو. بەڵام سەهل، بەوەی کە بە حاڵێ گەیشتووە، دەگەڵ خودادا بە یەك چـت بـوون، دنـەی داوە کە لە جونەید جودابێتەوە. دیارە هەلاجیش هەر ئەمەی لە جونەیدی پیری خـۆی دەویست. هەلاج بوو بە جاڕدەر و دەستی بـە گەشتوگەڕان کـرد. بـۆ هندسـتان چـوو، خەڵکێکی زۆری دیت. لەم گەشتانەیدا بە خزمەتی ئیمامی ڕازی، نامێترین پزیشکی ئـەو سـەروبەندە، گەیشـت. فەلسـەفەی یۆنـانیی دە خزمـەتیدا خۆنـد. بـڕێ لابـان وایـە کـە سـەروکاری دەگـــەڵ ســـەرۆکەکانی قەرمەتییانیشـدا هـەبووە. پـاش سـێیەمین جـار حەجکردنی، سەرلەنوێ لە ساڵی ۹۰۸دا وەگەڕا بەغدایێ. نـەخێر ئـەوجا لـە هـەموو لاڕا فەقێ و شـاگردی بـۆ دەهـاتن و گوێیـان بـۆ شـەتەحاتەکانی ڕادەدێـرا، خۆلاسـە جـاڕی ئەوەی ڕاداشت کە دەگەڵ ئیرادەی خوداوەندا، لە ڕێی لەش ئازاردان و خۆبرسی کـردن و دەڵ و دەروون زەلیل کردن و نەفس کوشتنەوە، بە ڕۆحی خوداوەنـدی گەیشـتووە و بەمە مانی ئەوەی هەیە کە خودا ببینێ و خۆی لە تـای ئـەرازووی ویدا دابنـێ و گۆیـا هیچ جوداوازییەکی دەگەڵ ویدا نییە. لە پاشـان هـەرچی ئەرکێکی ئاییینیی سەرشـانی هەیە، لەسەر لادەچن و دەبڕێتەوە. بە ڕاستی هەلاج بەم تەرزە بیروبڕوا و چالاکییانەی، ورده ـ ورده بوو بە مەترسییەکی گەورە بۆ ڕژێمی کۆمەڵیەتیی لەرزۆك؛ لەبـەر هـەندێ، مەلا و ڕۆحانی بە خۆ کەوتن و دڵێ فەرمانڕەوەیانیان لێ کرمێ کرد و یەکڕاست دە کونی زیندانیان هاویشت و هەشت ساڵی ڕەبـەقی لـە کونـی زیندانێدا بەسـەربرد و بە جـارێ

کرووساوه و چرووسایەوه و ڕەنگ و ڕووی بزرکا. هەرچەندە ئەسر و داکی موقتەدیر زۆریان هەوڵ بۆ دا ڕزگاری بکەن، بێهوودە بوو. ئەمە بۆی بوو بە مایەی مەینەتی و هێندەی دیکە بەر شاڵاوی ڕك و کینەی وەزیر، حامیدی کوڕی عەباسی کەوت. پاش حەفت مانگان دادگایی و بگرەوبەردە، قازییەکانی هەموو مەزەبەکان بڕیاری کوشتنیان دا و لە ڕۆژی ٢٦ی ئاداری ساڵی ٩٢٢، لە گۆرەپانی پێش زیندانی نوێی بەغدایێ لە سێدارە درا. دوایی، سەریان لە کەلەشی جوداکردەوە و کەلەشیان سووتاند. شەهید بوونی (؟) هەلاج بوو بە ئاورگ و سەرچاوەی وەکو ئاور و پووشوو بڵاوبوونەوەی بیروبڕواکەی و پەیڕەوانی، هەموو بۆ خۆراسان هەلاتن و ئەم ڕووداوە بەبڕشتترین زەوینەیەکی لەبۆ چاترین بەری فەرهەنگی ئیسلامی وەبەرهەم هێنا، لە شیعری سۆفییانە لە ئەدەبیاتی فارس و کورد و ئازەری و تورك و هتد دا.

بەڵام تەسەووف ـ عیرفانی ئێرانی، جگە لە بنەمایە ئیسلامییەکەی، لە سەتەی شەشەم و حەوتەمی ك. یەوە، شکڵ و شێوازێکی زۆر فرەوانتری بە بەرەوە گرت و بوو بە ماجوومێکی سەیر لە فێرگە جۆراوجۆرەکانی فەلسەفەی جیهان. لە عیرفانی ئێرانیدا، ڕەگوڕیشەی زەق و زۆپی بیروبڕوای برەهمەنی، بودایی، ڕیواقی، نەستووری، میهری، ئەفلاتوونیی نوێباو و تەنانەت زەرتوشتییەتیش، بەرچاو دەکەون.

تابلۆی ئەم عیرفانی ئێرانی ـ ئیسلامییە، تا بڵێی بە گرێوگۆڵە و لە بواری چەند لاپەڕەیەکدا نییە ئەمن لێرەدا سۆبایی تێدا بکەم. وەلێ بە کورتی ئەمە بنمایەکانیەتی: وەحدەتی وجوود (جیهان هەموو یەکپارچەیە) کەشف و شوهوود (دڵ و دەروون بە ڕیازەت وەك بلووریی بێ گەرد لێ هاتن و ئاشکرابوونی خوداوەند لە نەفسی زاهیددا)، زانستی مەعنەوی و قۆناخەکانی پەروەرشتی مەعنەوی.

قۆناخەکانی پەروەرشتی مەعنەوی، ئەمانەن:

شەریعەت، تەریقەت، مەعریفەت، حەقیقەت.

لەمەڕ جۆر و بابەتی سۆفی و پەیڕەوانی سۆفیگەری، وەك موزاهیری نووسیویە: لە پیاوی زۆر لەخوداترس و مرۆڤدۆست و شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەر و نەتەوەپەروەر و

دژ بە زوڵم و زۆرەوە بگرە تا دەگەیە نـاخودا و مولحید و دژ بـە مرۆ و کۆنەپەرست و چاپلووس و گوێ لەمستی فەرمانفەرما و پیاوی زۆردار و دژ بە نیشتمانپەروەری و هتد   یان، تێدا هەبووگن. خوداوەند پاداشتی باشەکانیان بداتەوە و لە گوناهی خراپەکانیان خۆش نەبێ..

بەش بە حاڵی عیرفان ـ تەسەووف لە کۆمەڵی کوردەواریدا، نزیکەی تا بیست جۆر هەبووە و ئێستاکانێ، تەریقەتی قادری و نەقشی لە هەموویان لەباوترن. ئەم تەریقەت و سۆفیگەرییانەی کوردستان، کە لە بنەڕەتی چینەکییانەوە دەنوارین، هەمیشە لە سۆنگەی بەرژەوەندی خێڵەکی و بنەماڵە و سیاسییەوە، زۆریان لک و شاخە لێ کەوتوونەوە و دە بنیاتی کۆمەڵی ـ ئابووریدا، زاوزێیان کردووە. بزووتنەوەی نەتەوەی ڕزگاریخوازیی کورد، سوودی لە تەریقەتی نەقشی زۆر وەرگرتووە. بزووتنەوەی هاوچەرخی کورد، بە سەرۆکایەتیی شێخ عەبدوسسەلامی بارزانییەوە، نموونەی ئەمەیە کە مەشخەڵانی تا ئێستاش هەر بە گڕە و بە سەرۆکایەتیی کوڕ و نەوە و نەویرانی مەلا مستەفای بارزانیی نەمرەوە، پێشمەرگەکانی کوردستان تا ئازادیی تەواوی کورد و کوردستان لە خەباتی بێ پشوودان.

چینی حوکمڕان لەسەر پیتکە بوون و بۆ هەموو خوایشتێکی وان ناڕاستەوخۆ دەسەمۆ و بەیدەست بوون. پیاو کە سەرروبەندی تەیمووری لەنگ دەخوێنێتەوە، هەنگێ تێ دەگا کە داموودەزگای تەسەووف تا چ ئەندازەیێ ئاڵقەلەگوێی فەرمانفەرمایی ئەو مەنگۆلییە دڕندە شەلە بووە. کوا لە کێهە دەزگای تەسەووف حورووفییەکان، شاگردانی مەنسووری هەلاج بەولاوە، دە بەرابەر فەرمانفەرمایانی زۆرداردا وێراویانە متەق بکەن. بەڵام بلیندترین خەسیەتی مرۆڤێکی هەمیشە لە هەڵپەی گۆڕان و بزووتندا، ئاگاییە. مرۆڤی ئاگا و وشیار، تێکڕا مرۆڤێکە کە لە سۆنگە و هۆکارەکانی ڕووداوەکانی دەورووبەری خۆی، دە هەموو زەوینەیەکدا وشیار و ئاگایە و لەبەر ئەوەی کە لە پێشینە و گۆڕانی پاشینەی زۆرینەی چتان باخەبەرە، هەرگیز هەڵوەدای ڕەواڵی ڕەنگین و

تریفەی ناوی چاوبەری وی نابێ، کە جارێ بۆ سەرنج ڕاکێشان و جارێ بۆ مەبەستی خەڵك فریودان خۆی تاسولووس بدا.

ئینسانی ئاگەە و شییار هیچ کاتێ بە ئالقە لە گوێی زێر و زۆرداری و دەسەلاتی واقع نابێ. لەبەر هەندێ لە دەربڕینی بڕوا و ئامانجی خۆدا کە بەرژەوەندی گشت لەبەر چاو دەگرێ، ڕێگا بە هیچ جۆرە ترس و هەراسانییەك بە دڵی خۆی نادا، بە ڕەچاوکردنی سەرەتا و بنەتا و ئەنجامی هەر کارێ، بگرە لە مەرگیش کۆ ناکاتەوە. باشە ئەو "خاوەن دەروونە بێ گەرد و قووڵان"ە بێگومان، یان لە هەموو حیزب و دەستە سیاسی ـ ئایینی و کێشە مەزهەبیەکان ئاگاتر و وشیارتر بوون و لە هیچ جۆرە پێشهاتێ، تەنانەت مەرگیش نەسڵەمینەتەوە و بەرژەوەندی سەرلەبەری خاوەن مافی ڕاستەقینەیان کە سەرچاوەی دامێنانی ماددی و مەعنەویی ڕەنێوهێنانە لەبەر چاو گرتووە، لەم حاڵەتەدا دەبێ لە جەنگەی کێشە و هەرای سیاسی نەکشێنەوە و دوورە پەرێز نەوەستن و ڕوو لە "دڵنیایی ـ سەیر و تەماشا" نەکەن، واتە: سەلبی نەبن، یان لە هەموو خەڵکانی دیکەی نێو جەنگەی خەباتی سیاسی، نەزانتر و ساویلکەتر و گەمژە و گەلۆرتر بوون و لە سێبەری خۆیان سڵەمینەتەوە و زۆر خۆپەرست نەبن. بەڕای من ئەم بابەتەیان لامژترین توێژاڵی کۆمەڵ بوون و لە هەموو دەرفەتێکدا بۆ زوڕنا ژەنیی ناڕاستەوخۆی حوکمڕانان ئامادەبوون.

ئێمە سەرەتا ئاوا دەستمان پێکرد: گوتمان ئابووریی ڕاوشکار هەیە، سروشتی ئابووریی ڕاوشکار ئەوەندە ساکارە کە پڕ بە پێستی خۆی سەرخانی گەرەکە. بە پێی ئاستی خۆی بیروبۆچوون و مەزەنەی ئینسانی دەوێ. ئەو سەرخان و بیروبۆچوونانە لەو قۆناغەدا پێی دەڵێن شارستانیەتیی جادوو، شارستانیەتیی ئەفسوون.

ئەو مرۆڤانەی کە لە ئەشکەوتدا دەژیان، وردە وردە فێری ئەوە بوون کە چارەنووسی چتی باشیش بکەن و چتی خراپیش بکەن. بۆ نموونە: ئاستی بیرکرنەوەیان بە ڕادەیەك گەیشت، کە ئەگەر هات و وێنەی کەڵەکێوییەکی لەسەر دیواری نێو ئەشکەوتێ کێشا، کە زەلامێ تیرێکی تێ سرەواندبێ، ئەمە قۆناغێکە کە مرۆڤ دەتوانێ، بێ ئەوەی

کەڵەکێوییەکەی لەو ئان و ساتەدا لەبەر چاو بێ وێنە بکێشێ. باشە ئەم کارە مانای چییە؟ ئەمە مانای ئەوەیە کە تۆ بیرت لەوە کردۆتەوە، ئەم کارە مادییەی تۆ بە ڕەسم ئیحایەکت دەداتێ (دەیخاتە دڵتەوە) کە لە سەتا سەت پێت وایە سبەینێ ئەو کەڵەکێوییە دەکوژی. ئەمە سیحرە. سیحر، واتە: بە کردەوەیەکی نمایشی و شانۆیی کار لە بەدیهێنانی ئامانجێ بکەی کە تۆ مەبەستتە. مانای سیحرە ئەمەیە.

واتە: مرۆڤ بۆ جێ بە جێکردنی ئامانجێ پەنا بۆ خەیاڵ دەبات؟ بفەرموو پەنا بۆ بەکارهێنانی بە خەیاڵی خۆی هێزێکی سەرووی خۆی دەبا. هەر وا بۆ نموونە: ئەمن خزمێکم کە ئامۆزازای فەقێ حسێنی حەکیمی ناسێ مەنتکی تیرەی ئارییان بوو و نێوی عەبدوڵا عومەر بوو و پیاوی ماڵە سەیید ئەحمەدی خانەقایێ بوو، مەلا نووریی کوڕەزای مام شێخی برای فەقێ حسێن کە ئێستا ماوە و لە هەولێرە دەزانێ، وەختی خۆی گورگێکی کوشتبوو و ئەم گورگ کوشتنەی لەبۆ بیوو بە ودمی نەساغیی برک ڕەواندنەوە. ئەوجا نەك هەر گورگەی کوشتبوو و بەس، گورگەی بە جۆرێ ـ خۆی گوتەنی ـ کوشتبوو کە گازێکێشی لە ڕەفیسکی گرتبوو و خوێنی دەگەڵ خوێنی گورگەدا گۆیا تێکەڵ ببوو و دە ژێر کارێکەریی گورگە (تۆتەم)کەدا ئەو کاری برك ڕەواندنەوە (جادوو)یەی لە بۆ نەساغان ئەنجام دەدا. ئەمەش جۆرە جادووکردنێ بوو کە لە سەروبەندی تۆتەم پەرستیی کوردانرا ماوەتەوە. کورد گورگ، ئەسپ، هەڵۆ، پەڕەسێلکە، کۆتر، مار، زریسك و دەیان جانەوەر و ئەیروتوو و دارودرەختی پەرستووە و تا ئێستاکانێیش ئاسەواری لە زۆر داوودەستوور و خوو ڕەوشتی کوردەواریدا هەر ماونەوە. بووکە بە بارانێ، گێچییەگێران، دە مانگی سەفەردا جەڕە و گۆزەی پڕ لە ئاو شکاندن، کۆسەوەوی، ڕان لە کەلدان، نوێژەبارانێ، چوونە سەر قسنی شەخس و پیر و باوە و مەشایەخان، چەرمەسەرێی لەشی ئافرەت بە دۆڵاشی ئەبوعلووکدا خشاندن بۆ ئاوس بوون، سەرمەقولاتدانی ئافرەت لە لێژەکەی پاڵ چیای سەفین لە شەقلاوە هەر بۆ هەمان مەبەست، بەزمی قسنەکانی گەڕەکی تەعجیلی هەولێر، ئەوەکەی ئارامگای موزەففەرەدین گوێك بەری ، چوونە سەر مەرقەدی ئیمام زەینولعابیدین بۆ چاوکرانەوە،

بۆ چاوکرانەوە، چوونە سەر وەیس، وەجاخ و چی و چیی تر و کوێ کوێی دیکە هەموو لە بناوانی جادوو و سیحر ناو دەخۆنەوە. بێگومان ئیدی لە هەوەڵ کویرکێشان (مێلکێشان)ێکی ستوونییەوە لەسەر دیواری ئەشکەوتێ، پاشان کویرکێشانێکی ئاسۆیی نیوە بازنەیی بەرەو سەروو و کویرکێشانێکی ئاسۆیی نیوە بازنەیی ئاسۆیی بەرەوژێرەوە، هونەری نیگارکێشان دەستی پێکرد، هەموو هونەرەکان لێرەوە دەستیان پێ کرد جا ئەم جادووە یان بە سەماکردن، یان بە وێنە کێشان، یان بە گۆرانی گوتن، یان بە نمایشت و شانۆبازی، یان بە پەیکەرتاشی، سەرویەرنراوە. کەواتە سەرچاوەی هونەر سیحر و جادووە. هونەر لەم قۆناغەدا پەیدا دەبێ. کەواتە هونەر لە پێش زانستدا پەیدا بووە. هونەر لە پێش فەلسەفەدا پەیدا بووە. چونکە ئەم ڕاستەوخۆ سەروکاری بە ژیانی ڕۆژانەی ماددیی مرۆڤەوە هەیە کە ئەو وەختە لەسەر خواردنی گۆشت و ڕاووشکار بەند بووە. مرۆڤی سەرەتایی دەیهەوێ ڕاو بکا، بەڵام خۆ ئەوە نییە سۆزی هەر یەکسەر بڕوا ڕاو بکا، نەخێر بیری لەوە کردۆتەوە کە ئەڕا تەکنیکێ وەکار نەبرێت، ئەم تەکنیکەش بریتی بووە لە ئیعابەخۆدان بەوەی کە ئەگەر وێنەی کەڵەکێوییێ لە سەر دیواری ئەشەکەوتەکەی بکێشێ و تیرێکی تێ ڕۆکا، سبیانێ لە سەتا سەت ئەو کەڵەکێوییە دەکوژێ، واتە: بە تەمسیل و نمایشت کار لە سروشت کردن، مل بادانی یاسایەکانی سروشت لە ڕێگای چتێکی خەیاڵی و شانۆگەریی دڕامییەوە. هەر لێرەڕا ئیدی زیرەکیی مرۆڤیش دەست پێدەکا، هەست بەوە دەکا کە ئاژەڵ نییە. زۆر جاری وا هەبووە ئاژەڵێ، دڕندەیێ مرۆڤەکەی خواردووە بەڵام هەرگیز ئاژەڵەکە بیری لەوە نەکردۆتەوە کە چۆن لەو کابرایە بگەڕێ و بیخوا. مرۆڤ بیری لەوە کردۆتەوە کە سبەینێ لە کوێ نێچیرێ پەیدا بکا. پەیدا کردنی نێچیر لەلایەن ئاژەڵەوە لەسەر ڕێکەوت و تووبەختەکی ڕادەوەستێ، بەڵام مرۆڤ وا نییە، کون بە کون دەگەڕێ، نەخشە دادەڕێژێ، ئەزموونی پێکەوەناوە، دەزانێ چدەکا. ئا لێرەدا، لە قۆناغی سیحردا تۆ تەنها تەکنیکی کار لە هێزەکانی سروشتێ کە تۆ پێی ناوەستی و توانات بەسەریدا زاڵ نییە بە شێوەیەکی دڕامی بەسەریدا زاڵ دەبی. ئەمە چییە ؟ ئەمە

شارستانیەتی سیحرە. تا ئەمڕۆش سیحر دەتوانم بڵێم بە شێوەیەکی وا گەشەی کردووە و فراوان بووە، کە ڕێکلامەکان، تەبلیغات و پڕوپاگەندەی سیاسی، بازرگانی، زانستی، پەروەردەیی، فێرکاری، هونەری، هەموو سەرلەبەر سیحرن. هەر چییەکی تۆ لەو دنیایەدا دەیبینی بۆ ئەوەیە کە پاڵت پێوەبنێ تۆ لە ڕووی سۆز و هەستوخوست و ئەقڵ و ئاوەزەوە، جا ئیدی لە دژی بوەستی، لایەنگریی بکەی، هەر چییەکی تۆ دەیبینی جادووە، مەبەست کار لە هەستوخوست و ئەقڵ و هۆش کردنە. دراماى هەسەن و حوسێن، نەورۆز، جێژنەکان، بۆنە میللییەکان و هتد . و هەر چییەکی کە ئەنجام دەدرێ، هەمووی پاشماوەی قۆناغی سیحر و شارستانیەتی سیحرە ماوەنەوە.

ئایا سیحر یان بەمانایەکەی دیکە ئەفسانە، ئەتۆ بە سەرەتا و سەرچاوەی دیاردەی ئەدەبیات و ڕۆشنبیری و کەلتووریی دادەندرێ؟ دەڵێم بەڵێ. من کەبیر لەوە دەکەمەوە قۆناغی سیحر تەنها سەرخانی پێداویستییەکانی ڕاستەوخۆی مرۆڤە بۆ ئەوەی پێی بژی، تەنها یەک لایەنی تێدایە کە لە مەسئەلەی ماددەی پەتی، واتە: ڕاستەوخۆ جیا دەبێتەوە تەمسیلەکەیە، واتە: نواندنی چتێکی غەیرە واقیعی. ئیمامی حوسێن کوژرا.. بەلام کە جارێکی دیکە تێی دەبکوژییەوە، میسالی بۆ جۆر دەکەی ئەوە واقیع نییە، واتە جارێکی دیکە کە واقیع دەگێڕییەوە و دووبارەی دەکەیەوە ئەمە چتێکی نوێیە لە ژیانی مرۆڤدا، یان نیگار دەکێشی، ئەمە چتێکی تازەیە لە ژیانی مرۆڤدا. مرۆڤ جاران ئەوەی نەدەزانی، ئەو تەنها هەر ئەوەی دەزانی بڕوا نێچیر بکوژێ، بەلام دوایی ئەزموونی دە بەستێنی پراکتیسی ڕۆژانە و بەردەوامدا گەشەی کرد، ئەو تەکنیکە فێر بوو کە بزانێ هەرچییەکی دەیکا لە خۆڕاییی ناکا و دەزانێ واتای چییە. واتە: تۆ قابیلیەتێکی نوێت دروست کرد، واقیعێ کە ڕووی داوە جارێکی دیکەی وەگێڕی، مێژوو لێرەوە دەستی پێکرد.

بە کردەوە دووبارەکردنەوە یان گێڕانەوەی ڕووداو، واقیعەکە دووبارەی دەکەیەوە، لێرەڕا مێژوو و مەنتیق و ناچاری لە بەستێنی دیالێکتیکیدا یەک دەگرنەوە. ئەمە وەچەرخانێکە لێرەدا. بەلام ئاسەوار، ئەو وێنانەی کە لە ئەشکەوتەکاندا دۆزراونەوە

ئەمڕۆ بۆ ئێمە دەبنە شاهید تا مێژووی پێ بخوێنینەوە. مرۆڤ بۆ خۆی نەیزانیوە. بەڵام لێرەڕا چۆتە نێو مێژووەوە مادام ئاسەواری بەجێهێشت کەواتە مێژووی دامەزراند واتە ڕابردووی سازکرد. ئەمن زۆرم سەیر بە قسەی گوترەی هێندێ کەس دێ کە دەڵێن کورد نەچۆتە نێو مێژووەوە؟! کوردیش، ئەوجا نێوی کورد بووگە، مورد بووگە هەر ڕموزنێ بووبێ، هەر لەوێ ڕێژێوە سەرە ڕەمبێکی بۆ ڕاووشکار ساوداییێ چۆتە نێو مێژووەوە لێرەڕا بتەوێ و نەتەوێ پێداویستی ماددی وردە ـ وردە هەندێ سێبەر بۆ خۆی دروست دەکا. بۆ نموونە ١٠ـ ١٥ کەس لە ئەشکەوتێکدا دەژین، دەبینی جاری وا بووە زێدەبەرهەمیان لێ ماوەتەوە، بۆ خۆیان ١٠ کەس بووگن وەلێ وەك دەڵێن، ڕۆژییەکە بەشی ٢٠ کەسی کردووە، باشە چی لەو زێدەیە دەکەن؟ گەلۆ تا ئەوە نەخۆن ناچنە ڕاوێ، یان بێ ڕاو ناتوانن دابنیشن و دەچنە ڕاوێ و ئەو زێدەیە (بەرماوە)ش هەر هەیە؟ جانەورانی وەکە شێر و پڵینگ تا برسییان نەبێ بیر لە ڕاوێ ناکەنەوە.

لێرەدا پیاوی ئابووریی سیاسی وەڵامت دەداتەوە دەڵێ لە هەندێ حاڵەتدا زێدە (فاین)ی بەرهەمیش هەبووە و چووگن چتی دیکەشیان هێناوە. لێرەدا سەرەتای دابەشکردنی کار دەست پێ دەکا، لێرەدا ژن دەوری خۆی دەبینێ. بەو پێیەی لەو قۆناغەدا ژن باڵادەست بووە ئابووری لەسەر دەستی ژن دەست پێ دەکا.

ئایا بەڵگەمان هەیە کە لەو قۆناغەدا ئابووری بە دەستی ژن بووە؟

مارکس عومری نووحی نەبووە، هەزار ساڵ بژی و سەرلەبەری کۆڕ و مۆڵگەکانی مرۆڤی پێ بەسەر بکاتەوە. ئەو هەر بەشی تەمەنی خۆی وەکۆڵینی مەیدانیی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵانی سەردەمی خۆی ئەنجام داوە و بەس ـــ ئەنێ هەر چەند دیاردە و چەند نموونەیەکی سنووورداری لە ژیان بەسەرکردۆتەوە و بەس. لە پێشدا گریمانەی داناوە، ڕێچکەی لە ڕاستینی نیسبی نزیکبوونەوەی (موقارەبات) گرتۆتەبەر، بە هۆی مەنتیق و مێژووی هەندێ شەواهیدی مادییەوە ئەنجامگری (استدلال)ی خۆی کردووە و مەرجیش نییە ئەنجامگرییەکانی لە سەتا سەت باوەڕ پێکراویش بن، بەڵام دەکرێ تا ئەوڕۆش بە دەسکەلا (ستاندارد) لەقەڵەم بدرێن. چونکە ئەڵتەرناتیڤی نییە. تۆ ڕایەکی بەرابەرت

نییە. من دەڵێم ئەوە ڕاستە جا تا ئەو ڕۆژەی تۆ دژی ڕایەکەی مارکس بە کردەوەوە و ڕامانەی ڕاستەقانی ڕایەکی ڕاستەقانیتر دۆزییەوە و بە مەنتیقی زانستانە بە هەموو مارکسییەکانت سەلماند کە مارکس سەرلێ شێواو بووە و ئەوەکەی تۆ ڕاستە، ئەمن پێم وایە هەموو مارکسییەك ئامادەیە بۆ سەلماندنی ڕاستی؛ چون تا ئێستا بە ڕای من ئەوان لە هەموو کەسێ دلسۆزانەتر هەوڵیەدای لە ڕاستی نزیك کەوتنەوەن. ئەتۆ لە بە چەوت و چێڵی پرۆژەی سۆسیالیستی بەڕێوەبردنی ئەحزابی کۆمۆنیستیی کلکی سۆڤیەت و ماو و ئەم و ئەو گەڕێ، بە لای منەوە مارکسیی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە بڕوای بەوە هەبێ کە ئەمڕۆ هەر نەتەوەیێ مافی ئەوەی هەیە بە پێی هەلومەرج و بارودۆخی وڵاتەکەی خۆی ڕەفتار دەگەڵ پرۆژەکانی گەشە و پەرپێدانی ئابووری ـ کۆمەڵایەتیی خۆی بکا و کڵاوی ئەم ئەزموون و ئەو ئەزموون پارادیگما نەکا، کڵاوی هەیاسی لەسەر هەباسی نەنێ.

بەڵگەی مەنتیقی هەیە: با، بە کورتی بیڵێم. من دەڵێم ئەمڕۆ ئاسەوار و پاشماوەگەلێ ماونەوە شایەتیی ئەوەت بۆ دەدەن کە لە پێشکەوتووترین کۆمەڵدا منداڵ تا قۆناغی پێنج ساڵی و شەش ساڵی لەگەڵ دایکیدا باشتر دەحاوێتەوە و زێتر هۆگری دایکیەتی، هەمیشە زیاتر لەگەڵ دایکیدایە، دایك شیری دەداتێ، دایك بەخێوی دەکا، لە زگی دایکیدا دەرسکێ، واتە پێوەندییەکی فسیۆلۆژی ـ سایکۆلۆژی ـ سۆسیۆلۆژی لە نێوان منداڵ و دایکدا هەیە، ئەم پێوەندییە بە گرێوگۆڵە بۆ ماوەی شەش حەوت ساڵ هەر لە برەو و هەڕمێندایە. ئەمە ڕێگەی ئەوەم دەدا کە بڵێم: ئەم پێوەندییە ئێستاش کاریگەریی خستۆتە سەر لایەنی عاتیفی. ئەمڕۆ لە کوردستانی ئێمەدا ڕاستە ژن لووتی دەبڕن، بەڵام هیچ پیاوێك نییە، تەنانەت بەهێزترین پیاو لە دنیادا فرمێسکی ئافرەت کاری تێ نەکا، زەردەخەنەیەکی جوانی سەر لێوی ئافرەتێ لە خشتەی نەبا. تۆ کە تەماشای ئەو نموونانە دەکەی ئەمانە مانای وایە کە ئافرەت سروشت، چ چەکێکی بەهێزی داوەتێ؛ ببڕێ بە ئاغای نێرینە. دوای ئەوە خۆ زانست ئەوەی پێ سەلماندووین

که قۆناغی مێوەجاغی (دایکسالاری) هەبووە، ئەوە هیچ کێشەی لەسەر نییە. ئەدی نابینی سەرلەبەری خودایانی سەردەمی مێوەجاغی هەموو هەر ژنن؟

دوو کەس وەدووی یەك نێچیر کەوتوون و لەسەر وەی کە ئی کێیەیانە ڕەنگە بەشەڕ هاتبن، یان لەسەر وار و ئەشکەوتی یەکدی بە شەڕ هاتبن.. ئابووریی سیاسی ناسان دەڵێن: بە هەزاران ساڵ مرۆڤ دەکاتێکدا کە پێویستیی بە ئاڵشتکردنی شمەك بووە، بەرەوڕوو دەگەڵ یەکێکی بیانیدا شمەکی ئاڵشت نەکردووە، بەڵکو هەریەکە شمەکی خۆی لە شوێنێکی دیار دادەنا ئەوی دیکەش دەهات شمەکەکەی خۆی لە شوێن وی دادەنا و ئەوەکەی ئەوی دەبرد، بێ وەی کەس چاوی بە کەس بکەوێ. بەڵام قۆناغی بەرهەمهێنانێکی بەهێز نەبووە، ئەوە بە پێی هەلومەرجی قۆناغەکە لێك دەدرێتەوە، مەسلەکە ڕێژەکییە.

باشە من قسەکەم ئەوە بوو گوتم وەختێکی تەکنیکی پەیدا کردنی بژیو لە ژیاندا تەنها مادەی پەتییە، بەڵام لەو کۆمەڵەدا کە وردە ـ وردە زێدەبەرهەم زۆر دەبێ، هەندێ جار کەسانێ دادەنیشن، بۆ کار ناچن. هەندێ چت بە تەجرەبە فێر دەبن. خۆت دەزانی گەشەکرىنی کۆمەڵ، تەنانەت گەشەکرىنی ئەندامانی یەك خێزان چوونیەك نییە هەر یەك بە جۆرێ گەشەدەکا. دەبینی کەسێ لەناو ئەوانەدا پەیدا دەبێ، با ناوی بنێین عاقڵتر، لەوان زیرەکترە ناوی بنێین کاهین، شامان، فەیلەسووف، شێخ، مەلا، فالگرەوە، حەکیم و هتد یان هەر ناوێکی لێ دەنێی، بنێ. ئەمانە هەندێ چت دەزانن کە ئەوانی دیکە نایزانن. دیارە ئیدی ئەوانی دیکە لە خۆڕا و ناچار بە قسەی دەکەن ئەدی کاهین و شێخ و مەلا و دەمڕاست و پیاوماقووڵ کوو پەیدابوون؟ ئەوە لە ئەنجامی ئەوەڕا که زێدەبەرهەم دێتیگۆڕێ و پێویست بەوە نەبووە ئەویش بڕوا ڕاوبکا، شەڕ بکا. بەڵام ئەو لێزانییەی کە بۆی ڕەخساوە وای لێ کردووە کە لەوان ئەچێ و چتێکی نوێ فێر بووە و کاری تێ کردوون. مرۆڤ وردە ـ وردە فێرە چت بەبێ وەی لەبەر چاوی بێ دەرك کردن دەبێ، واتە: قۆناغی ماددە لە مانادارێنێ (ئینتیزاع، تەجرید، ئابستراکت) دەبێ. قۆناغی بە ڕەمز و نیشانە دەرك کردنی چت دەست پێ دەکا.

تەسەووفیش لێرەوە چرۆدەکا. با بڵێین ساڵەهای ساڵ خەڵکی گوێ دەریایەك هەر بە خواردنی تیمساح دەژیان. تیمساح چتێکە ژیان و گوزەرانی خەڵکەکەی بەسەرەوەیە، گەنم، زەوادە و پیرۆزە، کوردەواری بە چاوێکی زۆر پیرۆزی دەڕوانێ، دەنکە برینج پیرۆزە، نابێ بە عاردی وەر بێ، ئەگەر دەنکە برینجێکت دیت، کەرتە نانێکت دیت لە عاردی کەوتبوو، دەبێ هەڵیگریەوە لە کونە دیوارێکی وەشێرێ، ئەمانە پیرۆزین، ڕزقن تیمساح، بۆق و زۆر گیان لەبەری دیکە، سەبارەت بەوە کە بەکەڵکن، سەرچاوەی بژیون، وردە ـ وردە شکڵ و شەمایلی پیرۆزیان بە باڵا دەبڕدرێن، شێوەیەکی ئینتیزاعییان دەبەردەکرێن، بە پیرۆز لە قەڵەم دەدرێن پیرۆزەکان سەرپاکیان بەم جۆرە دەپیرۆزندرێن، دەبن بە چتێکی سەروو توانست و قوورەتی مرۆڤ، وێنەی ناواقیعییانەی بۆ دەکێشرێ، پەیکەرەی ناواقیعییانەی بۆ دادەتاشرێ، چون دەبێ بە مانا، بە چتێکی لەبەرهەست بەدەر. ڕەمزێکی بۆ دادەندرێ چتێ کە لەویش بچێ و لەویش نەچێ. وێنەی گیان لەبەرێ بە دیوارەکەی پادشایی بابلستانەوە هەیە، دەستەکانی ئی گیان لەبەرێکن و لاقەکانی ئی گیان لەبەرێکی دیکەن. لە واقیعدا خواسایانە چتی وا نییە. بەڵێ ڕاستە هێندێ گیان لەبەر سەروفەسالی گیان لەبەری ئاوییش و بەژییش و ئاسمانییشیان هەیە، واتە: کۆمپلێکسێکە لە چەندین جۆر و دوور نییە مرۆڤ بۆ دەربڕینی چەمکی ڕەمزی و سەمبول بۆ ئۆبجەیێ لاسایی واقیعی کردبێتەوە. زۆر جار لە ئەنجامی کەرتبوون و جودابوونەوەی دەستەیێ و هەڵبژاردنی تۆتەمێکی نوێ بۆ دەستە جودابۆوە تازەکووڕەکە و بۆ لە دەستنەدانی پێوەندیی عەشیرەتی، تۆتەمێکی کۆمپلێکسی وا دادەتاشرێ، کە بۆ خزمایەتیی هەردوو کەرتەکە دەس بدا. ئەتۆ لە ئاڵایەکانی سەرلەبەری نەتەوەکانی جیهان بنواڕە، هەریەکە کۆمپلێکسێکی چەند ڕەنگ و نیشانە و سەمبۆل و ڕەمزێکن.. ئاڵای کوردستان لە چەند مانا و هەر مانایەکیش ڕەنگێك و سەمبولێکی بۆ داندراوە. زەردەکە، سوورەکە، ڕۆژەکە کەسکەکە هەر یەکە مانایەکیان هەیە. ڕەمزی میسرییەکان ڕۆژە لە نێوان دوو کەوانەی وەك داسولکەدا. لە ئەسڵدا ڕۆژەکە سەمبولی خلێنکە تەرس و شیاکە و دوو کەوانەکەش

دوو سەمبولی شاخی قالۆنچە (کێزك) کە لە بانووی نیلیٚ لە وڵاتی میسریٚ بە ملیۆنەها پیسایی و تەرس و شیاکەیان وەك هەڵماتی چکۆلە ـ چکۆلە خل دەدا و دەبن عاردیدا، سمۆرە ئاسایی کوو فەریکە گێران دەبن عاردی بۆ زەخیرەی زستانیٚ وەدەشێریٚ، وەیاندەشێرد و بەم کارە سەرلەبەری زەویوزاری بانووی میسر بەم پەیینکردنە بە بڕشت و پیت دەکەوت و کشتوکاڵێکی بیٚ شوماری لیٚ دەکرا. لە پاش دۆزینەوەی دەیان گۆڕخانەی فیرعەونەکان بە میلیۆن پەیکەرەی ورد ـ وردی لە داری سەندەلووس و شمشاد و بەوز و قەرەقاج و لیمۆ و پرتەقاڵ و جۆری دیکەی داری زۆر ڕەق لە دەوراویشتی نارووسە مۆمیاکراوەکانی فراڵ و فراڵیچە (فیرعەونەکان) دیتنەوە.

ئەگەر بپرسین قۆناغی ڕەمز مانای چییە؟ مانای ئەوەیە کە تۆ تا ئەندازەییٚ مێشکت وا پێش دەکەویٚ کە فێرە خەیاڵ کردنەوە ببیٚ، فێری چتیٚ دەبیٚ پارچەکانی چتێکی بتەویٚ دروستی بکەی، هەریەکە لە چتێکی دیکەی دەدزییەوە و لە یەکیان دەدەی و بەمە چتێکی تا ڕادەییٚ لە واقیعیشدا هەیە و لە واقیعیشدا نییە، سازدەکەی.

دەتوانین بڵێین لە ٩٠٪ی لە واقیعدا هەیە، بەڵام لە ١٠٪ی لە واقیعدا بەو جۆرە نییە. ئەوجا کە مرۆڤ توانی بە ڕمز و سەمبول گوزارشت لە مانا بکا، واتە: مرۆڤ لە قۆناغێکدایە وردە وردە بەرەو تەسەوراتی سەروو سروشت بیرکردنەوە لە گەشتی ئەزموونی بیٚ وچاندا، وەڕیٚ دەکەویٚ. ئیدی کەوتۆتە گوڕکاڵی ئەوەی بیر لە ڕۆژ و ئاسمان و هەموو چتیٚ بکاتەوە، هەوڵی ئەوەی داوە وەڵامێکی بچووك بۆ هەر پرسیاریٚ بداتەوە. ئیدی لێرەڕا دەکریٚ بڵێین سەرەتای فەلسەفە دەست پیٚ دەکا، ئەندێشە پەیدا دەبیٚ.

من قەناعەتی تەوارم هەیە، کە بەبیٚ وەی تۆ ئایین بکەی بە (ئەحکام و قەواعید و شەریعەت) وەکو مەزەنە و بیروبۆچوون و خەیاڵات تا ڕادەییٚ لە یەك سەرچاوەوە ئاو دەخۆنەوە. من پێم وایە ئایینەکان هەموویان یەك چتن. چونکە هەموویان تیٚ هەڵهکێشن، سەروینی یەکدین، بۆ نموونە: لە هیندستان پتر لە ١٠٠ ئایین هەن، باشە بۆ دەبیٚ سەرەتای بە دەستەخۆ خۆ مردارکردنەوە، زوهد و تەقەششوف و خۆ برسی

کردن و خۆ کوشتن و بەختیاری لەوەدابێ کە تۆ سەروکارت لەگەڵ دنیا و ژیان بڕی و بمری و نەمان، مردن بە بەختەوەری چونکە لە پێداویستەکانی سروشت خۆت قوتاردەکەی، بە بەختەوەری بزانی؟ مرۆڤ کە مرد و بڕایەوە هەست بە بەختەوەری لە کێندەرێ دەمێنی؟! ئەوە لە چیڕا هاتووە؟ ئەوە لە تەسەوفڕا لە نەمان، لە نێرڤانای بوودارا هاتووە، بەڵام واقیع چییە؟ واقیع ئابوورییە، نان نییە؟ ئاو نییە؟ واقیعێکی ماددی نییە؟!. داینەمۆی بزاوتی مرۆڤ لە ماندایە نەك لە نەماندا.. ئەوها بیرکردنەوەیێ، جۆرە بێهوودەییەکی نیهلیستییانەی لە نائومێدی چەکەرەبووی شێت و شوور و ئەقڵ لەدستدەر و هەلوەسە و جۆرە شیزۆفرینیایەکە  ئێمە هەر چتێکی کە مانای پێ دەبەخشین، ئەوە بۆ ئەوەیە کە سوغرا و کوبرای کێشەی مەنتیقی بوونی مرۆڤ بە شێوەیەکی ئەرێنی و ماقوڵانە دارێژین و قەناعەتی پێ بکەین، دەنا هەبوونی مرۆڤ وای لێ دێ بە تاراج و تاڵان و بڕۆی ئێکسیستانسیالیزمانەیەکی فرە نامرۆڤانە و بەدبینانە و شکستخواردووانە و پووچییانەی ئالبێر کامۆیانە و بێهوودەییانەی ئاندرێ ژید و نامۆیی و لە خۆبیانیبوونییانەی هایدگەری نازی، کافکایان، سادق هیدایەتانە بچێ.

دیاردەی تەسەوف تەنها هەر لە هیندستان نییە، خۆ لەگەڵێك شوێنی دیکەی دنیا هەیە، ئەم دیاردەیە لە هیندستان بە  شێوەیەکی زۆر تایبەت و ڕوون و شایانی باس، خسووسییاتی خۆی پێوەیە و بووە بە ماکیش، بە سەرچاوە بۆ تەسەوفی جیهانی، بەڵام ئەم دیاردەیە لای میللەتانی دیکەش هەبووە، بۆ نموونە: ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەی فەیلەسوفێکی کەلبیی وەکە دیۆجین دەچێ بە ناو توونی حەمام دەکەوێ، ئەمە دیاردەیەکە ئەمڕۆ هەندێك کەس دەیهەوێت بیخوێنێتەوە ، ئەمە میزاجێکی ڕۆشنبیرانەش بووە. ئەمانەش هەر دەکەونەوە ناو خانەی جۆرە وجوودییەت (ئێکسیستانسیالیزم) و عەبەسییەت و بێهوودەییەکی بەدبینانەی لە ئۆمەت نەچوو. دیۆجین لەزەتی لە وەك سەی ژیان وەردەگرت. ئەمڕۆ هیپییەکانیش تا ڕادەیێ لاسایی ئەو دەکەنەوە. ئەمن پێم وایە هەبوونی مرۆڤ مانایەکی گەورەی هەیە کە ئەویش

هەست بە بەرپرسیکردنە بەرانبەر خۆت و غەیری خۆت، دەنا ئێمەش هەر وەك كامۆ و كافكا و ئاندرێ ژید و سادقی هیدایەت و هتد .مان لێ بەسەر دێ. ئەم زاتانە هەریەكە لە چینێكی نەجیبزادە (ئەشراف) بوون. لە ئاكامی بە بۆرجوازی بوونی چینی ئەشراف ل ناو هەر نەتەوەیەكدا، جۆرە هەژان و سەرلێ شێوانێكی دەروونی دێتە گۆڕێ كافكا و سادقی هیدایەت و كەسانی كۆنە نەجیبزادانی وەكە وان دووچاری ئێش و ئازاری دەروونیی ڕەفاهییەت و خۆشگوزەرانی و ژیانی تێروتەسەل و كردەی میلیۆنەها چەوساوە و لە نیعمەتی خۆشگوزەرانی بێ بەهرە و بردەی لاگوێلێ نەكارە و لامۆ و توفەیلی، ببوون، ئەمانە لە ناخی دەروونیانەوە هەستیان بە بێهوودەییی ژیان بەم جۆرە ناعەدالەتییە كردبوو و هەموو ئان و ساتێ وەك نەخۆشیی خۆرە دەیخواردنەوە و لە ڕیشەی دەكێشان، ئەمە لە سەرێكەوە كاردانەوەیەیێ بوو كە لە ئاكامی چینی ئەشراف بە بۆرجوازی بوون هاتبووەگۆڕێ. پێش ئەم گۆڕانكارییە ئابووری - كۆمەلایەتییە، ئەندامانی چینی ئەشراف و نەجیبزادان بۆ خۆ لە هەراسانیی دەروونیی دووفاقیی ژیانیان، لە ناو ئێش و ئازاری ژیانی ڕەفاهییەت و خۆشگوزەرانی و تێروتەسەلی و لە تەڕێ خواردن و لە وشكێن نووستن، ڕوویان لە تەسەوف دەكرد و بەمە سەبووریی دڵی خۆیان دەدایەوە، تەسەوف بە مانای لە دنیا دەستبەرداربوون، لە واقیعێكی ناجۆر و ناعادڵ خۆوەشێردن، لە ئازاری وێژدان هەلاتن، وەكە هەتوانێ وابوو لەبۆ ئەندامانی ئەشرافی وەكە سوڵتان وەلەدما و شاشوجاعها و كێ و كێی دیكە. شێخ عوسمانی بیارە، پاش وەی كەوتە ئەستەمبۆڵ و لەوێ قۆناغی گرت، بە چاوی خۆمم دیت كە بە دەیان پیاوی ملیاردێر و كۆنە ئەشراف و كۆنە سەرۆك وەزیر و كۆنە چكمەڕێ و هتد لە خزمەتیدا ملكەچ دادەنیشتن و چاوەنۆڕی ئەو بوون فرێ لە بەرماوی چایەكەی بخۆنەوە، دە كاتێكدا بە دەیان منداڵ و ژن و پیر و نیفتادەش لە باخچەی خانەقایەكەیدا لە ئەستەمبۆڵ لە ناو ئەنفال و كیمیابارانی سەددامی دڕندە پەنایان بۆ بردبوو، سا بەلكو لە سای وی سەری خۆیان هەلگرن و بگەنە ولاتێ لە ولاتانی هەندەران. چون ئەوان لەم ئاوارانە لە ناو خۆشگوزەرانی لەسەرێكەوە و ترسی

گۆرانی ستاتووکۆ (راهین) لە سەرێکی دیکەوە، زۆر هەراسانتر بوون. ئەگەر ئەم ئاوارە کوردانە لە ترسی دڕندەییی سەددام دەیانویست بۆ هەر جەهەننەمێ هەڵێن، ئەم ئاوارە ئەشرافانە لە ترسی هەڕەشەی باری دەروونیی ناعەدالەتیی ئابووری ـ کۆمەلایەتیی سیستەمی چینەکەیان دەیانویست بۆ نێو دنیای خەیاڵ و ئەفسانە (تەسەوف) هەڵێن.

گۆڕانی باری ئابووری ـ کۆمەلایەتیی چینێکی کۆن بۆ بارێکی نوێی ئابووری ـ کۆمەلایەتیی نوێباو گۆتاوەڕۆیەکی زۆر خراوی بۆ چینە کۆنەکە لێ دەکەوێتەوە. دوور مەڕۆ، هەر لە کوردستانەکەی خۆمان من چەند کەسێ دەناسم، کە وەختی خۆی کوڕە ئاغا بوون و لە ئاکامی گۆڕانی باری ئابووری ـ کۆمەلایەتی، هێندێکیان تووشی نەساغیی دەروونیی زۆر پیس بووگن و هێندێکیان لە ناو لاتی و لەواری لە قومارکردن بەولاوە هیچ هەتوانێکی دیکەیان بە دەستەوە نەماوە، دیارە برێکیشیان جاشایەتی بەعس تا ڕادەیێ سەبووریی دابوون، بەلام ئێستا وا سەددامیش گۆڕ بە گۆڕ چوو، باشە ئەوجا چدەکەن، ئینتیحاردەکەن؟ نەخێر، زۆر ترسەنۆکن، وەکە کافکا و سادقی هیدایەت و ئاندرێ ژیدیان پێ ناکرێ! لە جۆزەردانی ۲۰۰۲دا لە ستۆکهۆلمێ بووم، لە برادەرێکی وشیارم پرسی: ڕاستە لەم ولاتە خەلك لە ناو خۆشگوزەرانی خۆدەکوژن؟ گوتی: ئەرێ. چۆن؟ گوتی سیستەمی سەرمایەداریی "خێرە" فرۆتن لێرە مێند پێشکەوتووە، کە دەولەت لە سەتا ۹۵٪ی پێداویستییە زەرووری و کەمالییەکانی بۆ هەموو هاوولاتییێ دابین کردووە، بەلام پێت وایە بۆچی ئەمەی کردووە؟ بۆ زێتر مژچەوساندنەوە، بۆ ئەوەی زێتر کاربکا، کە زۆرتری کارکرد، هەنگێ پوولی زێتر وەگیردەکەوێ، کە پوولیشی زێتر وەگیرکەوت، کالای هەر ڕۆژە لە مۆدێلێ دەکرێ، ئەوسا قازانجەکە هەر دەڕژێتەوە نێو خەزێنەی سەرمایەدارەکە، ئەم کارەساتی مرۆ بە کالابوونە، مرۆ بە یەك ڕەهەندبوونە لە مێشکی زۆر کەسانی وریا و وشیاردا بە زەق و زۆپی ڕەنگ دەداتەوە و دەگەلێ جەبەرووتی سەرمایەدا هیچیان ناکرێ و ناچار نائومێدانی کۆڵ دەدەن و چەکی خەبات تووڕهەڵدەدەنە نێو سەرکەوانی فەلسەفەی بێ تام و بێ ڕەنگ و بێ بێنەوە.

بەلاّم بابێین پێناسە زانستییەکەی تەسەوف بکەین: تەسەوف هەروەك لە پێشتریّ عەرزم کردن، ڕەنگدانەوەی واقیعە بە شێوەیەکی خەیاڵییانەی کلك و گویّ کراو کە لە حەقیقەتدا وانییە. ئێمە دەبیّ پێناسەکەی ئاوا بکەین، ڕەنگدانەوەی واقیعیّ کە تۆ جۆلەکەیە و دەیکەیە لەقلەقیّ ئەش سەری هەبیّ. واتە لە قۆناغی یەکەمدا، لە قۆناغی بە ڕەمز و سەمبول گوزارشت لە تۆبجە کردن، ئەمانە چاوگن، سەرەتای دەستپێکردنی پرۆسەی تەسەوفە لای ئیماندارەکان، بەلیّ کە دوایی بگاتە قۆناغی زۆر گەشەکردوو، دوایی بچێتە ناو هونەرەوە و بچێتە ناو هەموو چتەکانەوە تا وای لیّ بیّ مرۆف پێی وابیّ تەسەوف ڕێگای بەختەوەرییە، ئەمە دوایی وای لێهاتووە، بەلاّم تۆ وەرەوە بۆ سەرەتا: تەسەوف ڕەنگدانەوەی واقیعە بە شێوەیەکی شێوێندراو و خەیاڵی کە لەگەلّ حەقیقەتەکەیدا زۆر جیاوازە. تەسەوف ئەمەیە.

وەلیّ بابێین بزانین ڕەنگدانەوەی واقیع لە مێشکی مرۆڤدا بە شێوەیەکی شێوێندراو و خەیاڵی و دوور لە واقیع، ئەرێنییانە و نەرێنییانە چییە؟ لە ڕووی کۆمەڵەوە، لە ڕووی گەشەی مرۆڤەوە، لە ڕووی گەشەی زانستەوە چییە؟ ئینجا بابزانین ئێمە چۆن دەسخەڕۆی تەسەوفین؟ تەسەوف چەند کاریگەریی نەرێنی و ئەرێنیی هەبووە؟ یان بە شێوەیەکی گشتی ئەندێشەوبیری خەیاڵی و دواکەوتوویی بیرونەندێشەی پڕوپووچە، بۆ نموونە: ڕۆژیەردان بە تەپلّ لێدان و تەقە و زاری گورگ بە چەقۆبەستن و کشتەکبڕین بۆ لە نەخۆشیی تیفۆ قوتار بوون و تف کردنی شێخ و مەشایەخ لە زاری نەخۆش بۆ لە نەساغیی زەردوویی ڕزگاربوون و لەم وردە حیکیەتانە گوزارشتێکن کە تۆ بە هۆی بە هەڵە لە دیاردەڕوودانەکەگەیشتن دەیکەی، ڕەنگدانەوەی ئەو دیاردە گەردوونییە لە مێشکی تۆدا هەڵەی چارەسەرکردنەکەیت پیّ دەکا. ڕۆژ، یان مانگ کە دەگیرێن خەلکی سادە چۆنی لێك دەداتەوە؟ ئەوە دیاردەیەکی گەردوونیی فیزیکییە کە لە مێشکی من و تۆدا بە هەڵە ڕەنگ دەداتەوە: مانگ و ڕۆژ دێو و درنج ئەیان گرتووە تۆ بە تەپلّ لێدان و تەقە کردن بیان ترسێنی، خۆ کەروێشك نین. کە ئەوان بتوانن مانگ و ڕۆژ بگرن، کوو بە تەپلّ و تەقەکردن دەیان ترسێنی؟! بزنەکەت لە مێگەل دابڕاوە، بە

نازانم چی خوێندنێ، ئەویش بە زمانی عەرەبی، و قەڵەمبڕکردنەوە و داغستنێ چۆن زاری گورگی برسی و هار دەتوانی ببەستی؟! کشتەکبڕین و دوعای مەلا و فوو پێداکردنی چ دەسەڵاتێکی بەسەر گورگی هاردا دەڕوا؟! تفی خودا بۆ خۆی دەزانێ ژەهری نیکۆتینی تووتنی هیندی و باکووتیی قلیانکێشانی زاری شێخی مبارەکی چۆن و چەند قانگ دراو، چۆن نەخۆشینی زەردوویی لە کۆڵە نەساغی دەکاتەوە؟!

ئەو دیاردەیە لە یۆنان ، لە یۆنانی ئەو قۆناغەی کە پێش زاین فەلسەفە دەستی پێکربووە، کە فەیلەسوفانی کلاسیکی لە یۆنان سەریان هەڵداوە دوایی لەناوچەی فینیقیەکان و دوای ئەوە میسرییەکان و لە وڵاتی میزۆپۆتامیا کە ئێستا ناوچەی عێراقی ئێمەیە.ئەمانە جیا لە هیند لەوانەشدا دیاردەی تەسەوف بە شێوەی جیاجیا هەبووە. ئەو تەنەوعە چۆن دەخوێندرێتەوە؟ هەروەکو تەنەووع لە هونەردا دەخوێنمەوە، ئەوهاش لە تەسەووفیشیدا دەخوێنمەوە: کوردێک کە مەقامی بەیات دەڵێ لەگەڵ تورکێ، یاخود فارسێکدا جوداوازە. خۆ ئەورووپاییەکانیش مەقامی بەیاتیان هەیە، بەڵام مەقامەکان لای ئەورووپاییەکان ڕەنگە بە مجێزێکی دیکەی جوداواز بگوترێ. بیمۆل، دێز، چارەکە نەغمە و سێیەکە نەغمەیان وەکە ڕۆژهەڵاتناسێ ڕەنگە پێ خۆش نەبێ. کەواتە من دەڵێم ناوەوا، قۆناغی گەشە کردن، جۆری گەشەکردن، ڕادەی گەشەکردن، هەموویان کاریگەریان لە تەرزی بیرکردنەوە، تەرزی شارستانیەتەکەت، خانووەکەت چۆن دروست دەکەی، یان چۆن وڵاخی باری بەکاردێنی، چۆن باری لێدەنێی؟ ئەمانە هەموو ملکەچی کۆمەڵێک فاکتەری خۆیی و جوغراف و مێژوویین.

باشە مرۆڤ لە سەردەمی شوانکارەییدا بۆ ئەوەی کە سبەینێ ڕاوێکی باش بکات، ئەو ڕاوە بکات کە خۆی خەیاڵی لێدەکاتەوە، وێنەی دەکێشا و گۆرانی بۆ دەگوت و سەمای بۆ دەکرد، ئەم ڕێوڕەسمی سەرەتاییی شوانکارەییە، ئایا ئەم زیکر و تەهلیلە و ڕەقسی تەسەوفە بەشێکە لە محاوەلەی فیزیکی مرۆڤ؟ هەمووی بەشی سیحری تێدایە دە پلانی یەکەمدا کار لە هێزەکانی سروشت کردنە. ئەوەی کە ئەو بەزمە دەکا من قەناعەتی تەواوم هەیە کە بە هەموو عەقڵی خۆیەوە پێی وابووەیەو شانۆگێڕییە کە

خۆی حەزی لێیە، دەیهەوێ کار لە چتێ بکا بە سەر چتێکدا زاڵ بێ، ئامانجێ بەدیبێنێ. جا ئەو چتە چییە؟ ئەمن نازانم، واتە: هەندێ شەتەحات دەڵێ، هەندێ چت دەکا، کە ئەمانە ڕێوڕەسمی سیحرن. هەتا ئەمرۆش سیحر هەیە. قورئان دەڵێ (إن من البيان لسحرا)، دەڵێ ئەدەبیات و شیعر بە ڕاستی سیحرە. سیحر واقیع نییە، کینایەت، ئیستیعارە، مەجاز ئەمانە هەموو فێڵن کە لە ئەقڵی مرۆڤ دەکرێن کوڵمت سێوەلاسوورەیە، بەژنت عەرعەرە، قژت ئاوریشمە، ئەمانە هەموو فێڵن لە ئەقڵ. لە ڕاستیدا تۆ بری (بدیل) دەدۆزییەوە چاوشارکێ لەگەڵ بەدائیلی سروشتدا دەکەی، بەڵام خۆشیشە کاتێك فێڵ لە خۆت دەکەی.

ئەم فێڵ لە خۆ کردنەم مەبەستە؟ بەڵێ مرۆڤ لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا چتێکی کە لە ئان و ساتێکدا ئەنجام دەدا و پێی خۆشە و پێشتر خۆی بۆ ئەوە ئامادە کردووە کە ئەوە چتێکی کاتی و ڕەفتەنییە، هەتا هەتایی نییە. بۆ نموونە: کە کابرا گایەکی ڕاو کرد و هێنایە ئەشکەوتەکەی هەرگیز ئەو کابرایە دڵی بەوە داناکەوێ، چونکە کە ئەوەی خوارد ناچارە بڕوا، بیر لە نێچیری دیکە بکاتەوە. کەوا بوو هەمیشە لە حاڵەتی هەراسانیدایە، سرەوتی نییە، هاوسەنگیی سایکۆلۆژیی لەلای مرۆڤ وجوودی نییە: چونکە هیچ وەختێ تۆ خوایشتی خۆت مسۆگەر نەکردووە، بەڵگەی باوەڕپێکەر و زانستیت نییە بڵێی: من ٥٠ ساڵ دەژیم و هەموو ئامانجەکانم بەدی دێن. بۆ؟ ئەوە گەشەی عەقڵی بەشەر بۆ خۆی وەڵامی ئەوە دەداتەوە، دەڵێ (عرفت شيئا و غابت عنك أشياء). ئەتۆ هەندێ چتش بزانی، بەڵام هەزاران چتیش هەن فریان لێ نازانی و تەقەی سەرت دێ. کەوا بوو مرۆڤ هەمیشە لە ناهاوسەنگیەکی سایکۆلۆژیدایە، لە دوو دڵی و دڵەڕاوکەدا ژیاوە و تا ئێستاش هەر وا دەژی. ترسی دوارۆژی هەمیشە بۆ لە بۆسەدایە. مرۆڤ لە دوارۆژ دەترسێ.

ئایا ترس، نەزانین، دوودڵی، تۆ بە سەرچاوەیان دەزانی کە مرۆڤ بەرەو داهێنان ببەن؟ بەڵێ مرۆڤ ئەگەر ئەوانەی نەبوایە، ئەو ناهاوسەنگییە ڕەوانییە نەبوایە نەیدەپەرژا خۆی بپارێزێ، ئەوە هەمووی بۆ پاراستنی خۆیەتی، بۆ هێشتنەوەی

ڕەگەزی خۆیەتی. ئەسڵەن سارتەرەکان، هایدگەرەکان و هتد هەموو لە ترسی مردن بوون بە فەیلەسووفی ئێکسیستانسیالیست.

باشە ئەمانە هەر بەردەوام بن؟ هەمیشە بەردەوام دەبن، مەگەر لە یاسایەکانی ئەو گۆی زەوینە وەدەرکەوین، لە چارچێوەی یاساگەلێکی دیکەدا بژین.

ئێستا سەرەتایەکانی پەرینەوەی مرۆڤ لە قۆناغی تەسەوفدا، یەعنی با بڵێین لە قۆناغی تەسەوفی شوانکارەییدا بۆ قۆناغی ئەو کاتەی کە مەکتەبەکانی تەسەوف پەیدا بوون، وەکو زەردەشتی، بوودایی، سەرەتای ئەمانەمان چۆن پەیدا بوون؟

دیارە کە کەوتییە قەڵەمڕەوی کەشوهەوایەکی فیزیکی نوێوە، بڵێین لە کەشوهەوای ستێرێکی دیکەدا هەر بە تەواوەتی دەگەڵ کەشوهەوای فیزیکیی گۆی ئەم زەوینەدا جوداواز بێ، یان کەشوهەوای فیزیکیی گۆی زەوین هەر بە تەواوەتی ـ بە مەرجێ دەگەڵیدا رابێ ـ هەنگێ چتێکی تازە فێر دەبی، واتە: فێری سیحر بووی، واتە: فێری هونەر بووی، بەڵام خۆت دەزانی ئەو فێربوونانە هەمووی بە قۆناغی دیکەدا تێدەپەڕن، هۆکاری تازە پەیدا دەبێ، کلك و گوێی بۆ ساز دەکا، لێی زیاددەکا، لێی کەم دەکاتەوە. خۆت دەزانی ئەوانە بەر گۆڕانکاریی دواییێ دەکەون. بۆ نموونە: با بڵێین وەختێ ئەو سەرەتایانە: بڵێین تەسەوف بەو چەشنە لەگەڵ ئایین و بیروبۆچوونی ئایین تێکەڵ بووگن، هونەرە، تەسەوفە، ئایینە، ئەفسانەیە، هەمووی بووە بە هەرەمەیێ. لە سەرەتاوە ئەمەمان باس کرد. ئەوە ئاشکرایە کە لە ئابووریی ڕاووشکارەوە دێتە دواتر دەبێتە ئابووریی ئاژەڵ بەخێو کردن، شوانکارەیی، ئەوسا بەسەر ئاژەڵەکاندا زاڵ دەبێ، ئیدی ئەو بۆ خۆی دەبێتە ئاغای ئاژەڵان، ئیتر پێی ناوێ ڕاوی بکا. دەبێتە شوان لێرەوە قۆناغی ئابووریی ئاژەڵ بەخێوکردن دەست پێدەکا. ئەم قۆناغە تەکنیکی ئاژەڵ کەوی کردن و ئەو چتانەیە. ئەوەش لە ڕووی لەمێژینەوە قۆناغێکی درێژە. من لێرەدا بە کورتی باسی دەکەم ئەمەش بۆ خۆی سەرەتای خۆی هەیە، سەرەتای قۆناغی ئاژەڵداری، جاری پێش هەموو چتێ، لەم قۆناغەی ئابووریی ڕاووشکارە و ئاژەڵدارییەشدا، بە ڕەمز گوزارشتکردن پەیدادەبێ. گوتمان توتەم پەیدا دەبێ. دەبینی

مرۆڤ پێی وابووە بۆ نموونە: ڕووبارێ کە مادام تیمساحی تێدا بووە، مرۆڤ وای زانیوە کە تیمساح ئاغای ئەو ڕووبارەیە، کردوویە بە ڕەمزی خوداوەند. یان لە جێگایەکی تر گورگی بە خودا زانیوە. ئیدی وردە وردە مرۆڤ ئەمانەی پیرۆزاندووە و کردوونی بە تابوو. ئایینەکان ئەم پیرۆزانە بە پیرۆزکراوی مرۆڤ خۆیان نازانن، دەڵێن ئەمانە هەر لە خودی خۆیاندا پیرۆزن؟! بەلام وانییە، من و تۆ ئێستا مۆدیلات دەگۆڕین، مۆدێلاتی ئەمڕۆ، ئەحزابی ئەمڕۆ، بیروبڕوای ئەمڕۆ، ماشووقە و یار و دەنگی ئەمڕۆ، قارەمانی ئەمڕۆ، هونەرمەندی ئەمڕۆ، ئەگەر لە ڕووی سوودی مادییەوەیان بنۆڕینێ ئایا ئێمە عیبادەتیان دەکەین؟ نەخێر. ئەمانەش هەر هەمان ماددەی سیحرن، هەر هەمان بیربۆچوونێکن کە ڕۆژگارێ بۆ تۆتەمێکمان بەڕێوەدەبرد. قارەمانپەرستی، هیچ فەرقێکی دەگەڵ بتپەرستیدا نییە، هەریەکە ڕەمزی سەردەم و قۆناغی تەرزی لە نیگای بەرژەوەندەوە لە جیهانئۆرییە. قوربان، تۆ کە دیکۆری ماڵەکەت جوان دەکەی خۆ ئەمانە عیبادەت ناکەی، بەلام پێوەندی و تەماسێکت لەگەڵیدا هەیە، پێداویستییەکی ڕەوانییە، لەنگەرگرتنی سایکۆلۆژیت بۆ دابین دەکا، هەروەها تۆتەمییەت و فیتشییەتی ئەم زەمانە: وێنەی قارەمان بە دیوارەوە هەڵاوسین، پەیکەرە بۆ شاعیر و هونەرمەند و زانا و موناسەبەت و بۆنەی نەتەوەیی لە گۆڕەپان و سیلەی شارێیان قوتکردنەوە و هتد ئەمانە هەموو گوزارشت لە لایەنێکی دیکەی پەیوەندییەکانی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا دەکەن کە ڕەمز شکڵێکی ئەفسانەیی تەعبیری تێدا وەردەگرێت. بەلام ئەو مرۆڤانە کە بۆ نموونە: چەقەڵیان پەرستووە، دوایی بە ژن و ژنخوازی دەبن بە خزمی چەند مرۆڤێکی دیکە، ئیدی دەبێ جیابینەوە، هەر یەکە نیشانەیێ، دروشمێ لەبۆ خۆی دانێ؛ هەنگێ یەکێ گوێی چەقەڵەکە درێژتر دەکا، یەکێ کلکی کورتتر دەکاتەوە. خولاسە جۆراوجۆربوون لە سۆنگەی یە ئیستیلاحی وەحدەتی وجوود "کپرە"وە کە مەزهەری تەجەللای لەتوپەتبوونی "وحدة"ە، لە جەوهەردا هیچ جوداوازییەکی دەگەڵ ناجۆراوجۆربووندا نییە.

وەڵامدانەوەی ئەو جۆرە پرسیارانە هەندێ جار ڕەنگە بە بەڵگە و دەستاوێزێکی نوسراو سەروبەر بندرێ. جا جاری واش هەیە ڕەنگە هەندێ چتت بە خوێندنەوە خوێندبێتەوە کە ڕاستەوخۆ هیچ سەروکارێکی بە باسەکەوە نەبوو بێ. بۆ نموونە: تۆ کە دێی باسی مرۆڤ دەکەی واتە ئەنترۆپۆلۆجیا، کە کۆمەڵناسیی تێدایە، ئابووریناسیی تێدایە، مێژووناسیی تێدایە، زمانناسیی تێدایە و ئەمانەش هەندێ بوارن کە هەموو باسی مرۆڤ دەکەن. یان هەندێ جار ناچار دەبی کە میتۆدێ، ڕێبازێ بەکاربهێنی، واتە: ڕێبازێکی بیر کردنەوە بەکاربهێنی بۆ وەڵام دانەوە، واتە: بەرنامەیەکت هەبێ. خۆت دەزانی ئێمەمانان کە سەرەتای وشیار بوونەوەمان زیاتر لە گروگاڵی ئەفسانەبازی، پڕوپووچ بازی بەولاوە چیدیکە نەبوو، حەتمەن ئەم بەدبەختییە پەردەیەکی زۆر ئەستووری بەسەر مێشکماندا دابوو. دیارە بە ئاسانیش نەدەکرا من بە خوێندنەوەی چەند کتێبێک ئەو پەردە ئەستوورە لەسەر مێشکم هەڵماڵم، بەلام لەگەڵ وەشدا وردە ـ وردە دوو چت یارمەتیی دام: یەکەمیان بۆ خۆم هەر جۆرە حەز لەچت پشکنینێکم تێدامەبوو، زۆریشم مەبەست بوو کە لە خۆم بگەم، لە مرۆڤ بگەم لەبەر ئەوە هەندێ جار بۆ خۆم ڕۆڵی خۆم هەبووە لە دۆزینەوەی هەندێ وەڵام بۆ هێندێ پرسیار. ئێنجا با بێینەوە سەروکاری باسەکە، من پێم وایە ئەگەر ئەو دابەشکردنە ڕاست بێ کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەپاش ئەوەی کە مرۆڤ مەودایەکی دوورودرێژ لەسەر دار گۆیا ژیاوە و ئینجا ئەو لەسەر دار ژیانە، ئایا قۆناغی مرۆڤی نیاندەرتاڵە پێش نیاندەرتاڵە، پێشکەوتووترە یان پاشکەوتووترە ئەوە زۆر گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە کە مرۆڤەکە لە دار هاتۆتە خوارێ و هاتۆتە سەر وشکان. ئەو مەسەلەی وشکان و لەسەر دار ژیانە من پێم وایە تەنانەت ئایینە کۆنەکانیش ئاماژەی پێ دەکەن. کەوا بوو ئەو سەرزەمینە هەمووی ئاو بووە و تا ئێستاش بۆ خۆت تێبینیی دەکەی زۆرینەی گۆی زەوی زیاتر ئاوە لە ڕاستیدا.

بۆ نموونە تۆفانی نووح و حیکایەتی کەلگامێش و تەورات و ئەوانە، یان دەڵێن فلان پێغەمبەر لەناو سکی ماسیدا بووە، یا خوداوەند بۆ خۆی لە نێو دورێکدا بووە لە نێو

هەزاران دەریادا لە گەشتوگوزاردابووە. ئیدی حیکایەتەکە لەوێڕا دەست پێ دەکا.
دووبارە سەرچاوەی ژیانیش وەکو قورئان دەفەرموێ:
"و جعلنا من الماء كل شيء حي" ئەوە هەر لەپاش ئەوەی هەتا دێتە سەر ئەوەی کە دەڵێ: "و خلقنا الإنسان من صلصال من حماء مسنون" واتە لە قوڕەلیتە مرۆڤمان سازکرد، واتە: ئەو خانەیەی کە باسی دەکرێت زیندەوەری یەکخانە چۆن دروست بووە، ئەوە لە ڕاستیدا ئاماژەیە بۆ ئەوە. جامن مەبەستم ئەوەیە ئەگەر لەوێوە دەست پێ بکەین کە مرۆڤ توانیویەتی بێتە سەر زەوی، دیارە حەتمەن سەرەتا بە هەندێ چتی سەرەتایی دەستی پێ کردووە، بەڵام دوایی وردە ـ وردە فێری ڕاوی گیان لەبەری چکۆلە بووە و گۆشتی خواردووە، واتە: مەبەستم ئەوەیە هێشتا ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی دانەهێناوە. هێشتا هەر بە دەست چت دەگرێ، واتە: هێشتا جگە لە لەشی خۆی فێری ئەوە نەبووە ئامرازی دیکە بۆ دەستەبەرکردنی بژیوی بەکاربهێنێ، بەڵام دوایی وردە ـ وردە مرۆڤ بۆ یەکەم جار توانیویەتی سەرەڕمب ساز کاا، هەروەها ڕەنگە بەردیشی وەکو چەقۆ بەکارهێنابێ. ئەمن مەبەستم لەم تەفسیلاتە ئەوەیە کە زانایەکان هەندێ جار هۆیەکانی بەرهەمهێنان دەکەن بە پێوانەی قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵ، بەڵام هێشتاش دەبینی جۆری مەرتاڵ (مەعدەن) ڕۆڵی خۆی هەیە، وەکو دەڵێن قۆناغی بەرد قۆناغی مس قۆناغی ئاسن دەبینی جۆری مەرتاڵەکانیش ڕۆڵیان هەبووە کە ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی لێ ئامادە کراون. بۆ نموونە: ئەوانەی کە شەڕیان بە شمشێری مس کردووە بەرامبەر بەوانەی کە ئاسنیان داهێناوە بەزیون، هەروەکو سەفەوییەکان نەیانتوانی بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوەستن، لەبەر وەی ئەوان تفەنگیان هەبوو. ئامرازە مادییەکان لە ڕاستیدا ئەوە یەکچاودەکەنەوە کە ئەمیان لەویان پێشکەوتووترە. ئینجا ئەگەر ئەوانە بکەین بە ڕێبازی بیرکردنەوەمان حەتمەن لە هەموو قۆناغێکیشدا بیروباوەڕێ ساز دەبێ، واتە: سەرخان و ژێرخانێ ساز دەبێ: سەرخانەکە لەو قۆناغە سەرەتاییەدا کە پێی دەڵێین ئابووریی ڕاووشکار، دیارە ژێرخانەکەی، ئامرازی بەرهەمهێنانەکەی بەرد بووە، بەڵام

ئەم قۆناغــە ڕۆشــنبیریی تایبــەتی بــە خۆشــی هەیــە، بیروئەندێشەیەکیشــی هەیــە جیهانبینییەکیشی هەیە نەك ئایین بەو چەمکەی کە گۆیا مرۆڤ هەر لـە سـەرەتاوە ئایینی هەبووە، چتی وا نییـە و ئەمـە هـەر مومکین نییـە، چونکە مـرۆڤ مێشـکی زۆر چکۆلە بووە. بـۆ خـۆت دەزانـی قۆناغی (تجرید) هەیە و قۆناغی (تجسید) هەیـە لـە گەشـەکردنی مێشـکی مرۆڤدا. قۆنـاغی (تجسـید) ئەوەیە کـە مـرۆڤ وەخــتێ هێشـتا فینیقییەکان ئەلفوبێیان دانـەهێناوە شارستانیەتەکان شارستانیەتێکی وێنەیی بووە، هـیرۆگلیفی بـووە، واتـە: بۆ نموونـە: کەسـێ لـە جیـاتیی وەی بڵـێ: کتێـب، وێنــەی کتێبەکەی دەکێشا، بەڵام دوایی کە کتێبەکەی لە پێش چاو لادەبرد، وێنەی کتێبەکـەی لە زاکیرەیدا پـێ لەبەرنـەدەکرا، هێشـتا مێشـکی قابیلیـەتی ئـەوەی نـەبووە. زاکـیرە و حافیزەی تێدا سازنەبووە. ئەو خانانە هێمان گەشەیان نەکردووە. دەبێ ئەو چتە لەبەر چاوی بێ ئەوجا وێنەی بکێشی، بەڵام کە لای برد، ئیدی نەیدەزانی چونکە وێنەکـە لـە زاکیرەیدا نەبوو، جارێکی دیکەی وێنەکە کێشاباوە. تەجسـید واتـە: ڕاستەوخۆ ئیـدراك کردنی چت. ئەم بەهرەیە هێشتا نەبیبوو بە شوعوور، نەبیبوو بە تەجرید، بـە مانـادەرك کردن، بەڵام پاش ماوەیەکی تووڵانی ساڵەهای ساڵ قۆناغی دووەم دەست پێ دەکا، بۆ نموونە: پیتی (B) ئەگەر لێی وەکۆڵی چ لە ئارامی و چ لە لاتینیدا ئەمە لە بنچینەدا بـە مانای ئەستورکە نان بووە لـە شـکڵی ئەسـتورکە نـاندا سـازکراوە. وشـەی ئـەلفا A بـە زمانی فینیقی واتە: "گـا" وەك سەری گایەك دەچێ. لە ڕاستیدا مانای وایـە مـرۆڤ لـە پێشدا بە چاو دەوروبەری خـۆی خوێندۆتـەوە. بـە مێشـك و زاکـیرە نـەیتوانیوە چتـان بخوێنێتەوە: چونکە هێشتا مێشك ئـەو قابیلیەتـەی تێدا دروسـت نـەبووە کـە بتوانێـت ماددە بکا بە مانا. نە خەیاڵی بۆ سازبووە و نە زاکیرەی بـۆ دروسـت بـووە، هێشـتا بـە قۆناخی تەجرید (ئەبستراکت) نەگەیشتووە.وێنــەی چتـان وەکـو مانـا نـاتوانێ تەسـەوور بکا. لەم قۆناغەدا حەتمەن نە ئایین هەیە و نە هیچ؛ چونکە ئایین زێتر مانا و چەمکە تا چتی ماددیی بەرهەست..مرۆڤ پاش قۆنـاغێکی دوور و درێـژ کـە مێشـکی زۆر گەشـەی کردووە ئینجـا گەیشـتۆتە ئـەوەی تەسـەووری چتێکـی لـە ماددەبـەدەر بکـا، تەسـەووری

چتێکی سەروو سروشت کە خودایە، یاخود هەر چتێکی دیکەیە، مەحاڵە بکا. ئەمە قۆناغێکی زۆر پێشکەوتووە، واتە مێشک یەکجار زۆر گەشەی کردووە، ئەوجا مرۆڤ دەکارێ تەسەوری چتێ بکا لەسەروو خۆیەوە، لە خۆی گەورەتر و بەهێزتر کە نازانێ چ جۆرێکە، نازانێ رەنگی چۆنە (لیس کمثله شيء)ە. ئەو قسانە لە راستیدا زانست سەرلەبەریان بە درۆ دەخاتەوە کە مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە مەیلی فیتریی ئایینیی هەبووە و خودا پەرستیی کردووە، من دەڵێم ترساویشە، پێشکەنیوە، رووشی خۆش بووە، هەموو چتێکی کردووە، بەڵام هەرگیز مێشکی لەو ئاستەدا نەبووە و ئەوەندە گەشەی نەکردووە کە بتوانێ تەسەوری شتێ بکا لەوانەی کە ئەو بینیویانی بەدەربێ، لە چتی بەرچاوبەدەر، ئەوە چتێکی تەواو لە رووی زانستەوە راست نییە. تا لەم قۆناغەدا تا تەجسید هەیە، تا مرۆڤ تەنها راستەوخۆ بە چاو چت دەبینێ، بۆنی دەکا، گوێی لێ دەبێ، هەرگیز نە ئایین هەیە و نە تەسەوف هەیە و نە بیروئەندیشەی پووت هەیە، هیچ نییە، تەنها راستەوخۆ تۆ چت دەبینی و وێنەی دەکێشی، کە لەبەر چاوت لاچوو، بەبیرت نایەتەوە، تا جارێکی دیکەی نەیهێنییەوە بەرچاوت. لێرەدا هیچ جۆرە چتێ نییە کە ناوی بنێین بیروئەندیشە، مانا، چەمك. بۆ خۆشت دەزانی تەسەوف بە مانای تەسەوف واتە: چتێکی کە زیاتر لە سەتا سەت سەروکاری لەگەڵ تەجریددا هەیە، لەگەڵ ئەبستراکتدا هەیە، لەگەڵ مەشاعیردا هەیە، لەگەڵ ئەفکاردا هەیە، وەجدە، سۆزە، عاتیفەیە هەرچی هەیە، ئەوە هەمووی هی قۆناغی ئەبستراکتە، هی قۆناغێکە کە مێشک بە تەواوەتی گەشەی کردووە و دەتوانێ خەیاڵ بکاتەوە و بڵێ چتێ هەیە لە پشت ئەم سروشتەوە، مەرج نییە دار و بەرد و ئەمانە بن، نەخێر دەبێ چتێ بێ هیچی لە مانە نەچێ، وەکو حەزرەتی ئیبراهیم کە چاوی بە رۆژ کەوت، گوتی نەخێر خودا لەمە ناچێ، خودا ناشێ ئاوا بێ، چاوی بە مانگ کەوت، چاوی بە چتێکی دیکە کەوت کە ئەویش هەر رەفتەنی بوو، دڵ و ئاوەزی ئاوی پێ نەخواردەوە. ئەو تەرزە ئەنجامگری (استدلال)یە، واتە: دەبێ چتێ هەبێ لە هەموو ئەمانە گەورەتر و پایەدارتر بێ، ئەمە قۆناغێکی یەکجار گەشەکردووە لە مێژووی مرۆڤدا.

کەواتە: هەر خۆی مێژووی ئاین و دەقە ئایینیەکان جۆرێ لە پرۆسەی ئیستیدلالی بیرکردنەوەی مرۆڤی تێدا بیندرلومتەوە، بەلآم قۆناغێکی زۆر پێشکەوتووە. هەر ئەو نموونەیەی حەزرەتی ئیبراهیم نموونەیەکی ئیستدلالییە بۆ ئەوەی کە قەناعەت بە مرۆڤ بهێنێ، بەلآم ئیستدلالە لە ماددەوە بۆ چتێکی دیکە، نەک لە چتێکی دیکەوە کە نایزانێ بۆ ئیسپاتی ماددە، دووبارە پشتی بە بینین بەستووە، پشتی بە چتی ماددی بەستووە. دەڵێ: ئەو چتە دەبێ مانگ بێ، مانگ ئاوابوو، خۆر بێ خۆر ئاوا بوو، گوتی کەواتە خودا دەبێ چتێکی گەورەتر بێ کە هەر بمێنێ و ڕەفتەنی نەبێ، ئەوەش لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێ. شیکاری هەیە بۆ ئەوە دوایی چی بینی و چی نەبینی، گوتی ئەم چتانە مادام نامێنن دیارە هەمیشە ترسی لێ نیشتووە کە خودا نابێ ڕەفتەنی بێ، مەسەلەکە مەسەلەیەکی سایکۆلۆجییە، پشت و پەنا دەبێ هەمیشە هەبێ، بۆ ئەوەی بیپارێزێ. ئەتۆ بیر لە سەرلەبەری زیکروفیکری ئیسلامەتی بکەوە، هەر هەمووی حیکایەتی حوزووری خوداوەندە لە هەموو ئان و زەمانێکدا و هەمیشە ئاگای لە خشەی مار و مێرووە و "وهو بکلّ شیء علیم"ە، "حفیظ و حافیظ"ە، ئەوجا کە نەماوە، ترساوە، گوتوویە دەبێ چتێکی گەورەتر هەبێ لەوانە؛ بۆ ئەوەی تەواو نەبێ، ئاوا نەبێ، غەیب و پێوار نەبێ. ئەوە مرۆڤ هەر بە سروشتی خۆی وایە. تۆ بڕوانە منداڵێ کە دایکی لە تەنیشتێتی بۆ خۆی بێدەنگ و خەپ دەمێورێ و دادەسەکێ و ئارام دگرێ، بەلآم کە دایکی لا نەبێ لە ترسان دەگریێ. حەزرەتی ئیبراهیم مانگ و ڕۆژی بە پاسەوانی خۆی دەزانی، بەلآم کە ئەدەما ترسی لێ دەنیشت، دەیگوت: کەولتە دەبێ لەمانە بەهێزتر هەبێ، ئەم ترسە هەر لەوێ ڕۆژێوە کە دایکی لە چۆمی فراتێی شتبوو و سامی ڕێنیشتبووین، چەکەری کردبوو. بەندە، تا ئێستاش لە ئاوەکەی ڕۆخانەی پایین گوندی تەپەسەوز سام دەکەم؛ چون جارێکیان لەوێ ئاوەکە زۆر خوڕ و بە تەوژم بوو، ڕایمالیم و بردمی، واتە تووشی فۆبیای ئاو بووم تا وێستاکەش کە ترسێکم ڕێدەنیشێ، دایکم بەبیردێتەوە، کە خەونی ناخۆش دەبینم، دایکم فریادەکەوێ. ئەمن بابی خۆمم نەدیتووە، قەتم هەست بەوە نەکردووە نێرینەیی پاریزگارمە، زیتر مۆگری

مێیانم، ئەوەندەی لە ئامێزی مێیەکیدا ئارام دەگرم، هێندەم کەیف بە پەنای نێرێکی نایێ لە سەرەتاشەوە هەر مێیەکان پارێزگاری مرۆڤ بوون، سەرلەبەری خودلوەندەکان مێینەن مێ سەرچاوەی ژیانە، بناوانی هەموو خێروبێرێکە.

واتە جار پەنا دەبەمەوە بەر ئایەتەکانی قورئان و لەوێدا بەڵگە دەهێنمەوە بۆ فیکری پێشکەوتنی مرۆڤ، کەواتە لە قورئانیشدا هەولێکی ئیستیدلال بۆ سەرەتای باسکردن لە ئەنترۆپۆلۆجیا هەیە. بێگومان دەبینی قورئان بۆ خۆی هان و دنەی بیر کردنەوە دەدا (أفلا تنظرون إلى الأبل كيف خلقت و إلى الجبال كيف رفعت و هتد ) بانگت دەکا بۆ ئەوەی چی و چی ببینیت، خۆی لە ڕاستیدا، نەك هەر قورئان، لە پێش قورئانیشدا ئایینەکانی دیکەش ئەمەیان ڕەچاوکردووە.

قسەکەمان لەوەوە هات کە لەم قۆناغەدا، لە قۆناغی ئابووریی ڕاووشکاردا کە مرۆڤ هێشتا مێشکی بەو ڕادەیە گەشەی نەکردبوو ناتوانێ تەسەووری چتێکی لە ماددەبەدەر بکا، تەسەوف و ئایین زۆر بە درەنگەوە پەیدا بووگن.

لە تێڕوانینی خۆمدا بۆ فەلسەفە زیاتر پشت بە زانست دەبەستم واتە باوەڕم بە فەلسەفەی زانستی هەیە، یەعنی تێڕوانینە فەلسەفیەکانی خۆم دوای سەلماندنێکی زانستیانە دادەڕێژم. با هۆدەینەوە سەرەتای گاوخانی: جووڵەی مرۆڤ و مێشکی مرۆڤ لە جغزێکی تێ هەڵکێشدا دەخولێتەوە، لەپێشدا بیروئەندێشەیە، وەك ماددەیەکی خاوە، دارە، بەردە، هەموو شتێکە کە لە سروشتدا هەیە و هێشتا ناوت لێ نەناوە، تۆ دەچیە ئەو دەشت و دەرە، سەتان جۆر گژوگیا دەبینی کە ناوی هەندێکیان دەزانی و ئەوانی دیکەی نازانی، ئەوانە بنەما و ماکی بیروئەندێشەن، یان هەر لە خۆتەوە تەسەوراتێ دەکەی؟ ڕەنگە بیرت لێ نەکردبێتەوە کە ئەوانە تۆبجەن، ماکی بیروئەندێشەن. کە دەڵێم بیروئەندێشەن، واتە: جەنبەی تێکەڵ بوونی بە کەونەوە هەیە سنووریان نییە، ناویان نییە، ڕەنگیان نییە و دەنگیان نییە، ڕەهەندە ئەندازییەکانیان نییە، چتەکان جارێ هولامین، بەڵام ئەوانە لەو جغزەدا نامێننەوە، دێنە نێو جغزی فەلسەفەوە تۆ دەکەویە پرسیارکردن، سێ پرسیار دەکەی ئەمانە

ئەندێشەن، بەڵام هەر لەو سنوورە هولامییەدا نامێننەوە، مرۆڤ بێ وچان دە هەڵپەی سەرومڕی گەشە کردندایە، واز نامێنێ، ئینجا دەکەوێتە پرسیار کردن. فەلسەفە وەك گوتم،سێ پرسیارە: چییە چۆنە، بۆچی. فەلسەفە بریتییە لەم سێ پرسیارە. کە هاتیە سەر ئەم سێ پرسیارە، ئیدی تۆ هاتوویە نێو جغزی فەلسەفەوە، ئەوجا لێرەدا تۆ وەك فەیلسووفێ لەسەر بنچینەی ماتریالیستی، لە ماددەوە بۆ ئیسپاتی مەعنەوییات و ئەفکاری ئەبستراکت، یان وەکو ئەفلاتوون لە پێشدا پێی وایە دەبێ (مُثُل) هەبن، ئایدیا هەبن، ئەو گەردوونە لە پێشدا دەبێ نەخشەڕێژێ نەخشەی بۆ ڕشتبێ ئەوجا کاری لەسەر کراوە، ئەمە فیکرێکی ئایدیالیستانەیە لە ڕاستیدا، بەڵام فیکری ماتریالیستی دەڵێ: مرۆڤ کە پێش ئەوەی خۆی دروست ببێ، کائیناتی دیکە دروست بوون. مرۆڤ دوای ئەوانە هاتووە و بیری کردۆتەوە. مەعقوول نییە لە پێشدا و پێش ئەوەی مرۆڤ دروست بووبێت فیکری زەوی دروست کردن و ڕۆژ دروست کردن و ئەم هەموو گەردوونە فیکرەکەی هەبووبێ، چون کە دەڵێی فیکر هەبوونی پێشەکیی مرۆڤت بە بیردا دێ. گەلۆ دەبێ ئەم فیکرەیە لە کوێدا بووبێ؟ ئەگەر لە مێشکی مرۆڤدا بووە، خۆ مرۆڤ هێشتا خۆی دروست نەبووە، جارێ خۆ ئەگەر مرۆڤ دروست بوونە، خۆ مرۆڤ لە مێشکی خۆیەوە نەیهێناوە ئینعیکاسی واقیعە ماددییەکە بووە هاتۆتە سەر مێشکی؛ لەبەر ئەوە تێز و ئیدیعای ماتریالیستان کە دەڵێن لە پێشدا ماددە هەیە، ئەوجا وێنەی ماددە، سێبەری ماددە، فیکر دروست دەبێ و دەبێتە مەعنەوییات، ئەمە ڕات و دروستە..کەچی ئایدیالیستەکان بە پێەوانەی ئەمە بیر دەکەنەوە و دەڵێن، نەخێر لە پێشدا فیکر هەیە، واتە پێش پەیدابوونی مرۆڤ، چۆن کەسی مامی؟؟ کوێ، دار، بەرد، ئاسمان، زەوین تەڕەماش، تەڕەساز، ترشیات، کۆمپیوتەر، ئەمانە کێ نێوی لێ ناون؟ ماقوولە پێش پەیدابوونی مرۆڤ و مێشکی پێشکەوتوو و زمان، ئەمانە هەر لە خۆڕا نێیان هەبووبێ؟ قورئان دەفەرموێ: "وعلّمنا آدم الأسماء كلّها" ئەمە وا دەگەیەنێ کە خوداوەند هەر چتێکی ڕسکاندووە نێودێریشی کردووە. ئەم نێودێرییەی بۆ کێ کردووە؟ ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە لە پێشان زمانەکانی جیهانی سەرلەبەر بۆ ٥/٥

میلیارد مرۆڤ پێشەکی داناوە، ئەوجا پاشانەکێ ئەم خەڵکەی دروست کردوون، ئەدی منداڵانی حەزرەتی ئادەم بۆچی هەر لە زگی دایکیاندا فێری قسەی ئەستەق و ستران و نوکتە و پەندی پێشینان و ڕێزمان و ئەم هەموو چتانە نەبووگن؟ ئەم هەموو کوێرەوەری و مەینەتیی فێربوون و خوێندن و فێرگە و زانستگا و شەقی مامۆستا و ئەزموون و ناجیح بوون و ساقیت بوون و ئیکمالبوون و بەزم و شەڕەشەقەی بۆ چییە. دەبا چۆن مراوی هەر لە نێو هێلکەدا فێری مەلەوانی بووە، بنیادەمیش فێرە زمانی زگماکی بوایە بۆچی هەر لە زگی دایکیدا فێرەپشوودان و بێنکردن و بیستن و پێکەنین و گریان بێ، فێرە زمانیش نەبێ.. بە بڕوای من وەڵامی ئەم پرسیارانە زۆر ڕوونن کەوابوو بەم وتوویژە بە گرێوگۆڵە هاتینە نێو جغزی فەلسەفەوە. فەلسەفە بۆ پاساودانی قەناعەت هاتووە. تۆ دەڵێی قانوونی کێشمان (الجانبية) لەم گەردوونەدا ئەوەیە: کە من چتێکی هەڵدەدەم و دەکەوێتەوە خوارەوە، ئەوە خۆ تەجرەبەی هەموو ڕۆژێکمانە، بەڵام بە ملیۆنەها ساڵ مرۆڤ پەردەی لە ڕووی ئەم یاسایە هەڵنەماڵیوە، کە چی کاتێ نیوتن هات ئەم یاسایەی کەشف کرد، بەڵام پاش چی یاساکەی دۆزییەوە؟ سەتان پرسیاری لە خۆ کردووە. هەر لەو پرسیارکردن و گومانکردنەوە واتە: کارەکە بۆ خۆی، ئەو ڕەندو بەدەڵە بۆ خۆی، ئەو دیالێکتیکە بۆ خۆی، فەلسەفەیە، بەڵام وەختێ کە هۆکارەکەی دیتەوە، یاساکەی دیتەوە، هاتینە کوێ؟ هاتینە ناو زانستەوە، لێرەوە زانست دەستی پێ کرد، لێرەوە زانست لە فەلسەفە جیا بۆوە. کە تۆ هۆکارەکەیت دیتەوە و یاساکەیت دیتەوە، ئیدی گومان تەواو دەبێ و زانست واتە: یاسا، واتە: یاسایەکی وا کە کەس ناتوانێ بڵێ: یەك و یەك ناکاتە دوو. کەس ناتوانێ بڵێ ئەوە یاسای کێشمانی زەوی نییە؛ چونکە هەموو مرۆڤەکان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون. کەواتا:وا هاتینە نێو جغزێکی دیکەوە کە زانستی پێ دەگوترێ، بەڵام ئەو زانستە چ لە پێوەندییە مرۆییەکاندا و چ لە پێوەندییە ماددییەکاندا من لە فیزیادا لە کیمیادا، لە ئەندازەدا، لە ڕیازیاتدا کە دێم دەڵێم بۆ نموونە: من لە تێڕوانینی بەرژەوەندیی زاتی خۆمەوە لەسەر بنچینەی ئەپیکۆریزم،

واته: ئەسڵی لەزەت و ئازار کە تیۆرییەکی ماددیی پەتییە لەسەر ئەو بنچینەیە دەڵێم ئەو کەرتبوونە ئەو جووڵەی مرۆڤە، هەر چییەکی مێژوویی هەیە، مرۆڤ هەر چییەکی کردووە ئەنگێزەکەی ئازار و لەزەتە، ئەوە بۆ خۆی فەلسەفەیەکی ماددییە. من پێم وایە هەموو چتێ لەو دنیایەدا پێوانەکەی ئەوەیە کە یان لەزەت، یان ئازاری تێدایە، کەچی فرۆید دێ دەڵێ: نەخێر ئەوە سێکسە، یەکێکی دیکە دێ دەڵێ: مارکس دەڵێ: نەخێر ئابووری و هۆیەکانی بەرهەمهێنانە. بە کورتی ئەو کێشەیە بە پاساوی قەناعەتەکانەوە دێتە بوارێکی دیکەوە: تۆ حیزبی شیوعی دادەمەزرێنێ لایەنێکی دی حیزبێکی دیکە سازدەکا. واتە: ئیسلام بۆ خۆی بە جیا، جوولەکە بە جیا، مەسیحییەت بە جیا، هەر یەکە بۆ خۆی پاساوی هەبوونی چینایەتیی خۆی دەخوێنێتەوە و کارەکە دەچێتە نێو چقزی ئایدیۆلۆجیاوە.

کە بوو بەو ئایدیۆلۆجیا، ئەو وەختە بەرگری لێدەکەیت دەوڵەتی بۆ دادەمەزرێنی. هێزی بۆ ساز دەکەی، زیندانی بۆ ساز دەکەی خەڵکی بۆ دەکوژی، خەڵکی لەسەر دادگایی دەکەی، یاسای بۆ دادەنێی و هەزار فەوفێڵی بۆ دەبینییەوە و ئەمە دەبێتە ئایدیۆلۆجیای ئێسکسگران و ستالینیزم و نازیزم و سەددامیزم و قوزڵقورتیزم و ئیزمی کوڕی ئیزم و خەزووری سەپانی دراسێی ماڵە ئیزم ئاغای زاوای هەنەزای خاڵە ئیزمی و ئیدی بۆ خۆت لە سەر خوانی چەوری ئەو هەموو ئیزمانەدا دەلەوەڕێی کەواتا هیچ مەرج نییە ئایدیۆلۆجیەتەکە لە سەتا سەت لەگەڵ زانستدا ڕێك کەوێ. یاسایەکانی زانست، یاسایەکانی ئایدیۆلۆجیا نین بۆ؟ چونکە قانوونییەت (اطّراد)ی ئایدیۆلۆجیا، سنووره چینایەتییەکان و بەرژەوەندایەتییەکان کۆنتراستر و زەق و زێپتر دەکا و بەرەوبەری بە ناو، تەنانەت لە دیمکراسیی لیبرالیش دەکا ئەمە لە بواری دووفاقیی نێوان چینەکانی کۆمەڵدا، وەڵێ ئەم قانوونییەتە ئەگەر لە بواری پێوەندییە کۆمەلایەتییەکانی مرۆڤدا دەڵەمەیی بێ، لە بواری پێوەندییەکانی ماددەی غەیرە عاقیلدا جۆرێکی دیکەیە، دەڵەمەیی نییە. من ئەم بەردە بۆ ئاسمان هەڵداوێم، دەکەوێتەوە خوارێ، ئەمە هیچ پێوەندییەکی بە ئارەزوو و خوایشتی من و تۆوە نییە،

هیچ سەروکارێکی بە بەرژەوەندیی فلان چین و فیسارە چینەوە نییە، من بمهەوێ، یان نەمهەوێ، ئەوە وایە، بەڵام کە حیزبی شیووعی دەڵێ: شۆڕشی چەکداریی دەبێ ببێ یان نەبێ، ئەمە پێیوەندیی بە بەرژەوەندی مرۆڤەوە هەیە.

وەلیّ ئیختیارەکەش هەر بەرژەوەندی مرۆڤ و ژیان دیاریی دەکا. لەبەر ئەوە تۆ دەبینی ئەو ناکۆکییانەی نێو کۆمەڵی چین لەسەرچین کە ئەتۆ ناتوانی بە بێژینگیان بگرێ، بەڵام کۆمەڵی بۆرجوازی هەمیشە دە هەڵپەی ئەوەدایە ئەم ڕاستییە لە جەماوەر وەشێرێ و بە ئەفسوون و سیحر لیّ کردنیان، بە یەك ڕەهەندکردنیان، بە کاڵا و شمەك کردنیان وشیارییان تەزویر و تەزییف بکا و بانگەشەی درۆ بۆ برایەتیی مرۆڤ و هاوئایینی و هاوڕەگەزی و هاونەتەوەیی و هاوولاتیەتیی چەوساوانی ژێردەستی بکا.
بەڕاستی ئەمە یەکەم مانای ئایدیۆلۆجییە کە مارکس باسی لێوە کردووە. ئایدیۆلۆجی، دووەم جۆریشی هەس کەسی دامی: ئەویش ئایدیۆلۆجیای زۆرینەی خەڵکی چەوساوەی لەسەر هەقە. ئەم لەسەر هەقییەش لەوە ئاودەخواتەوە کە نابیّ دەستەیەکی لامژ و توفەیلی تەواوی سەرچاوەکانی ژیان بۆ بەرژەوەندی چینایەتیی خۆی قۆرخ بکا و لە سەتا ٩٠٪ی خەڵکی چەوساوە لە برسان و لە تاو نەخۆشی و نەزانی و بیّ دەسەڵاتی هەر ناڵەیان بیّ و لە خودا بپاڕێنەوە لە زوڵم و زۆری زاڵمانیان قوتارکا و هەر بێژن زاڵم زەواڵت بیّ و ئەم نانە بەو ڕۆنە و هەر بە تەمای کارزمایێ بن ڕزگاریان کا، بیّ وەی خۆیان هیچ ڕێچارەیەکیان بۆ خۆیان بەدی کردبێ و بۆ خۆشیان نەزانن زاڵمی ڕاستەقینەیان کێیە؟!

ئایدیۆلۆجیا بە مانای سێیەم کە جگە لە شوێنی سنووردار و دەگمەندا لە نووسینەکانی مارکسدا دەکارنەبراوە، ئایدیۆلۆجیا بە فەرایەندی هەموانی و جیهانگرەوەی ڕەنێوهێنانی بڕواکەل و زانایکەل دە کۆمەڵدا پێناسە کریاگە. ئەی مانا کە تا ئەبراکە کە لە چەند نووسینی مارکسدا هاتگە، بیّ خەسیەتی چینایەتی نییە، بەڵکو بەرتریی ڕوانگەکانی چینی فەرمانفەرمای تێدا بەرجەستە دەبێ. دیارە بە پێچەوانەی مانای یەکەمی ئایدیۆلۆجی بە پێی مانای دووەم و سێیەم کە پێشتریّ

دیاریم بۆ کردن، کرێکارانیش دەتوانن سیستەمی ئایدیۆلۆجیای خۆیان ڕێک بێخەن و سەروبەربێنێن و "ئایدیۆلۆجیی خۆیان سازکەن". لەم شوێنانەدا مارکس باسی "سیستەمی بەیانی واقیعییەت"ی دەکرد و ئەمەی دە هەمبەر "سیستەمی ڕەنێوهێنانی بۆچوون ومەزەنەکان"دا دادەنا. لینین لە چ دەبێ بکرێ دا؟ ئایدیۆلۆژیی وەی مانایە وەکاربردگە وەك هەمیشە بڕوا بە جیهانێ کە ڕەنگەکانی یان ڕەش یان سپییە، نووسیویە: "ئەمڕۆ تاکانە سەرپشکایەتی لە نێوان ئایدیۆلۆژیی بۆرجوازی و ئایدیۆلۆژیی سۆسیالیستییە کە ڕێگایێ لە نێوان ئەم دووەدا وجوودی نییە و مرۆڤایەتی هێمان ئایدیۆلۆژیی سێیەمی نەئانیوەتەکۆڕێ" (1).

بەڵێ ئەمە دوای ئایدیۆلۆجیەتە و ئەو ئایدیۆلۆجیەتە دێنێت و تیئۆریزەی دەکەی، هاوار بۆ زانست دەبەی: بۆ زانستەکانی کیمیا، فیزیا، خۆلاسە، زانستە ماتماتیکییەکان. مارکس کە دەڵێ: کەڵەکەبوونی چەندەکی بەرە ـ بەرە دەبێ بە هۆکاری گۆڕانی چۆنەکیی لەناکاو، ئەمەی لە فیزیاوە هێناوە، تۆ کە ئاو دەخەیە سەر ئاگر ئاگرەکە ئەگەر پلەی گەرمایی هاوسەنگ بوو لەگەڵ بڕی ئاوەکەدا، ئەوە هێواش هێواش گەرم دەبێت و لەپڕ دەبێتە هەڵم. ئەمە لە فیزیاوە وەرگیراوە. ئەمەیان بەسەر شۆڕشی گەلاندا پراکتیزە کرد. دەڵێ: ئەگەر حزبێکت سازکرد، سەد هەزار کەست بە بیروبڕوای ئەو حیزبە و بە دیزیپلینی وی ڕێکخست و کارت کردن ئەو حیزبە ئەگەر ماوەی ٢٠سالێ، ٣٠سالێ چالاکیی نواند و مەشقی کرد، ئەوە لە ناکاو دەتوانێ شۆڕشێ هەڵایسێنێ و ڕژێمی فەرمانفەرمای کۆن بڕووخێنێ. باشە مارکس و ئەنگلس ئەم یاسایەیان بەم دڵنیاییەوە لە کوێوە خواستەوە؟ لە فیزیاوە. لە ماددەوە. مرۆڤیش هەر ماددەیە، بەڵام ئەم ماددەیە کە عەقڵی هەیە ماددەیەکی لە گوێن دار و بەرد نییە (ئەم قسەیە مامۆستا مەسعوود محەممەد لە مارکسییەکانی بە شێوەی "المصادرة علی المطلوب" سوود لێ وەردەگرت و پێی دەفرۆشتنەوە و دەیگۆ: کوو مرۆڤ وەکوو ماددەی خوێڕوو ڕەفتاری دەگەڵ دەکرێ؟ کوو فەرقی کەر و مرۆڤ نییە؟ چۆن ئەرکی ماسولکە و

---

(1) V. I. Lenin, Selected Works, New Yoek, 1972, vol 1, pp. 121 122.

ئەركی بیرکردنەوە یەك حیسابی بۆ دەكرێ، كوو فەیلەسووفێك و كرێكارێكی نەخوێندەوار وەك یەك تەماشادەكرێن؟ بۆ دەبێ هەر ژنە بۆرجوازیی تێر و تەسەل بە بەرەللایی بۆسۆ بكرێ؟ خۆ ژنە كرێكاری هەژار لە هەموو ژنانی پۆشتە و پەرداخت و توفەیلیی بۆرجوازی بۆ خۆ فرۆشتن ئامادەترن، ئەگەر شەرەف هەبێ هەر لای ژنە دەوڵەمەندە، نەك لای ژنە برسی و هەژار و لات و لەوار بەڵێ ئەم قسانەی بە بەرەوازی و شێوەی "المصادرة على المطلوب" خۆی گوتەنی دووپاتە و سێ پاتە دەكردەوە و لای وابوو هەنگی لە كونە داردا دۆزیوەتەوە. نەیدەزانی ئەم باسانە زۆر لەمێژتر بە سەتان جار لە دەمەتەقێ و نووسینەكانی ماركسییەكان و ئەنتی ماركسییەكاندا كاوێژكراونەوە و تامی نەماوە و وەك بنێشتی بزركاوی لێ هاتووە. لەبەر هەندێ مەگەر تەنها لە كن بێ خەبەران بە فەلسەفەیەكی تازەنەفەس لە قەڵەم دەدران و وەك پێشینەی نەبووبێ و تازە بە بیردا هاتبنەوە، بەلام نەك ماددەیەكی بەركار (passive)ە، ماددەیەكی كارا (active)یە، كار لە گۆڕینی سروشت دەكا و سروشتیش كار لەو دەكا، ماددەشە و ماناشە، فیكریشە و ماددەشە. تەنها هەر وەسفی سروشت و گەردوون و جیهان ناكا، بگرە دەشی گۆڕێ.

جیاوازی چییە لە نێوان ماددەی هۆشمەند كە مرۆڤە لەگەڵ ماددەیەكی دیكە؟ مەبەستم ئەوەیە تێڕوانینی فەلسەفی بۆ ئەو جیاوازییە چییە؟

كاك مەسعوود محەمەد هەموو جارێ وەك هەر ئێستا عەرزم كردن دەكەوتە هەڵەیەكی زۆر گەورەوە: دەیگوت مەزهەبی ماددی دەڵێ مرۆڤ و ئاژەڵ جیاوازییان نییە، مرۆڤ و دار و بەرد جیاوازییان نییە. یەك دەڵێ خالیقی شارستانییەت یان خالیقی مرۆڤ خۆی (كارە) ئەدی خۆ كەریش كار دەكا. من دەڵێم ڕاستە كەریش و كۆمپیوتەریش كار دەكەن، بەلام كەر بە لێخوڕین و كۆمپیوتەر بە زانایی و ئەقڵی مرۆڤ نەبێ كار ناكەن، ئەوە مرۆڤە دەزانێ بۆ كار دەكا و چی سازدەكا و بۆ كێی سازدەكا، پێم وایە كاك مەسعوود بۆ خۆی لە هەر ئەجیورزادەیێ پتری دەزانی گەنم و جۆی كەندیناوە و ترووتنی بێتوێن و میوەجاتی كوردستان كێ ڕەتێویەدەهێنان، سووتەنیی شۆڕشەكانی نەتەوەی

کورد زێتر ڕۆڵەی کێ بوون؟ ھەروەھا دەشیزانی کە زێتری ئەنفالکراوەکان و کیمیابارانکراوەکان و زیندەبەچاڵکراوەکان، نەك کۆمپرادۆر و جاش و ماددەی خاو بۆ چەکە کیمیاوی بە دزییەوە کڕەکان و لە بەغدایێ بە پووڵی سەددامی درندە تورخەکردووەکان، منداڵ و ڕۆڵەی کێ بوون؟! لە چ چین و توێژاڵێکی نەتەوەکەمان بوون.

مەسەلەکە خۆی، ولنانی بنیاتی شارستانییەتە. تۆ ھەزار ساڵ کارت پێ وەك کەر، ھێستر، ئیرونشامور، پێمەڕە، تراکتەر، کامیۆن و لۆری، کۆمپیوتەرت پێ بکەن مادامێکی لەو بەھرەیەی کە مرۆڤی لە ئاژەڵ ھەڵاواردووە، بێ بەھرەبی، بە شامێر دەژمێردرێی. مرۆڤ ڕۆبۆت نییە؟! کاری بە غەریزەی وەك مێرووستان و جاڵجاڵۆکە و مێشەنگ تەنھا لە قەپێلکی خۆیدا قەتیس ماوە و ھێندەی مووێ گۆڕانکاریی بەسەردا نایە، بەڵام کاری مرۆڤ بە غەریزە نییە، بە بەرنامەڕێژی و ئەقڵ و ئەزموون و ھتد ە و ڕۆژبەڕۆژ گۆڕانکاریی ماریپێچیی بەسەردا دێ و دەتەنێتەوە و تەشەنەدەکا و گەشەدەکا و سەرەو ھەوراز ھەڵدەکشێ. مرۆڤ شارستانی سازدەکا. ئەرکی ماسولکە و ئەقڵ و ئاوەز لە جەوھەردا فەرقیان نییە. کاك مەسعوود محەمەد پێی وابوو کرێکارێکی کارخانەی پۆلاسازی دەگەڵ فەیلەسووفێکدا فەرقیان ھەیە، ئەویانی بە کەر و ئێستر دەچوواند و ئەمیانی بە بنیادەم بەڵام سەیر ئەوەبوو، ھەرچی چتە خۆشەکانی دنیایە، خانووبەرە، دانەوێڵە، خۆلاسە بژیوی مرۆڤ لە ولاتی مەدا ناخۆشبەختانە زێتر نەخوێندەوار ڕەنێوی دێنن و ئەوژی لە ھەر کەسێ پتری حەز لە نازونیعمەتی بەروبووی ڕەنجی ئەو کەسانە بوو کە بە داخەوە بە شامێر، کەر و گا و ئاژەڵی لەقەڵەم دەدان، چون وەکە وی بۆیان نەرەخسابوو ھەموو ببن بە خوێندەوارێکی فەیلەسووفی وەکو خۆی و بتوانێ ھەموو قسەیەکیش بدرکێنێ و ھیچ باجێکیشی لەسەر نەبێ؟!

ئەو تێڕوانینەی مەسعودد محەمەد لە (التفسیر البشری للتأریخ)دا ھاتووە، چۆنی ھەڵدەسەنگێنم؟

من هیچ لەوە لاری نیم کە مێژوو بە زیهنییەتی مرۆڤێ کە واقیعی بێ تەزویرکردن و ریسواکردن، دوور لە هەڵوێستی چینایەتیی دژمنانە، دە زیهندا زانستانە رەنگ دابێتەوە، بێریکلییانە لە جیهان نەتۆڕی، نیهلیستییانە لە چارەی خۆنووسینی نەتەوەکەی نەتۆڕی، نەتەوەکەی بە هیچ و پووچ لە قەڵەم نەدا، پێی وا نەبێ نەتەوەی کورد نەچوویتە نێو مێژووەوە، کورد لە لیستەی نەتەوە زیندووەکاندا نییە، بە شاکارانە و بلیمەتانە بە زمانێکی دیکە نووسینی لێ بووبێ بە مایەی شانازی و پێی وابێ زمانی نەتەوەکەی و زمانی عەرەبی ئاسمان و رێسمانە. مرۆڤیش لە ماددە سازکراوە. خودلوەند دەفەرموێ: "ولقد خلقنا الإنسان من صلصال من حمأ مسنون"، "ومنها نخرجكم و إليها نعيدكم" واتە لە خاکمان سازکردوون و بۆ خاکتان وەدەگێڕین. مەبەست لە خاک، هەموو سروشت (عنصر)ەکانی وجوودی زیندوو و بە رەواڵ مردووە کە لە زانستدا چتی مردوو وجوودی نییە، ئەدی ئەوە نییە شاعیری فەیلەسووفی ئەرەو، ئەبو عەلای مەعەڕی، مەرەمۆ: "والذي حارتِ البريّة فيه / حيَوانٌ مستحدثٌ من جمادِ". کەواتە: مرۆڤ بەلای مامۆستا مەسعوود محەمەدەوە ئەو چتە نییە خوداش و بەندەی خوداش و تەولوی زانایان و فەیلەسووفانی پشت بە زانست ئەستوور دەیناسن و دەگەڵیدا ئاشنا و رۆشنان، مرۆڤ لە کن وی ماددە نییە، خەڵکی ئەم کۆسمۆیە نییە، واپێدەچێ لە کاکێشانێکی ئاسمانیی غەیری ئەم کۆسمۆیەوە تەشریفی هاوردوێ، خودنییە، ئەوژی "ليس كمثله شيءٌ"ە، خۆلاسە مرۆڤەکەی ئەو یۆتۆپیاییە، شارئارمانجییە، خەڵکی خەیاڵستانە، وەك ئۆمەتی خواسایی ناچێ، ئەگەر بە تەلەیفۆن قسەی دەگەڵ کابرایەکی پەسیرگرتەدا لاقرتییەکی فەرموو، هەر یەکسەر ئەوژی پەسیوی دگرێ، دەیقەرموو: ئەو کە دەنووسێ بۆ "العقـول الكبـيرة" دەنـووسێ، لەبۆ "العظيـم جورباتشـوف"ی دەنووسێ.

مرۆڤ خودێ نییە، تەنانە یۆنانییەکان کە لەبۆ هەر چتێکی خوداوند، "ربُّ النَّوع"، یان "ربّة النّوع"ێکیان بە خەیاڵ سازکردبوو، هەر دە بیچم و شکڵ و شەمایلی مرۆی نێرینە و مێیینەدایان بیرلێ کردبۆوە، ئەوانیش هەر وەك مەمانان ئاشقێنییان دەکرد،

تووڕه دەبوون، لێکدی دەتۆران، مێینەکان زاوزێیان دەکرد، تۆڵەیان لێکدی دەستاندەوە، خۆلاسە هەموو ڕەفتارێکان بە شێ مەمانان دەچوو، تەنێ هەر ئەوبوو، کە ئەوان لە ئاسمانیش دەژیان و لە سەر زەوینیش دەژیان و لە نێو دەریاش دەژیان و هەموو چتێکی کە مەمانان پێمان ناکرێ، ئەوان پێیان دەکرا مەبەستم ئەوەیە کە تەنانەت ئەقڵی یۆنانیی ئامالْ ئیفلاتوونیی ئایدیالیستانەش مرۆڤی تەنێ هەر بە خەڵکی ئاسمان نەدەزانی، هەر لەسەر زەوین ڕسکابوون، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە مرۆڤ یان ماددەی ڕووتە یان مانای ڕووتە، ئەسڵەن فەلسەفەی ماددیی زانستانە مرۆڤ بە بوونەوەرێکی هەرە باڵای جیهان دەزانێ و ماددە و فیکرە بە وەك دیوی پوولێ لە قەڵەم دەدا، چون مانا وەك سێبەری ماددە وایە، مانا و فیکرە بە بێ ماددەی خاریجی زیهن، وجوودی نییە. مرۆڤ مانیشە و ماددەیشە، بەڵام سرووشتی لێکدی جوداواز نییە، یەك چتە و هەمیشە مارپێچانە لە گۆڕان و گەشەکردنی بیۆلۆجی ـ سایکۆلۆجیدایە.. ئەمن وەك کاك مەسعوود محەمەد بیرناکەمەوە بڵێم مرۆ وا دروست بووە کە بە سرووشت هەر بە لای هەڵەکردندا دەلەنگێ، یان هەر بەلای نەرێنی (منفی)دا دەلەنگێ، بە پێچەوانەوە، ئەمن گەشبینانە لە مرۆڤ دەنۆڕم، ئەو هەموو سامانە گەورەی زانستە و ئەزموونی میلیۆنەها ساڵی بە فیڕۆ نەداوە، شارستانیەتیی ڕاناوە، ئازادی، دیمۆکراسی، مرۆدستی، ئاشتی، مافپەروەریی چەسپاندووە. ئەمنی کورد دڵم بەوە خۆشە زانست ئەرکێکی گەورەی دەسەبەرکردنی ئازادیی نەتەوەکەمی لە ستۆ درتووە و لەوە دڵنیام کە زانست ئاسەواری مرۆچەوسێنیی چینایەتی، کۆمەڵایەتی، نەتەوایەتی، ڕەگەزی و هتد سەرلەبەر بە خەباتی چەکدارانەش و ئاشتیانەش، ڕادەماڵێ. زانست وێڕای وەی زێتر قۆرخ و پاوانکراوی سەرمایەدارییە، وەلێ وەکوو پەراوێزی کەوێ وایە وەناشێردرێ و دەست چەوساوانیش دەکەوێ..

مرۆڤ ماددەیە: چونکە هەرچی لە ماددەدا هەیە، لە لەشی مرۆڤیشدا هەیە. ئەو هەموو پێکهاتەی لەشی مرۆڤ لە کانزایەکان، پرۆتینەکان، خوێیەکان، خۆلاسە تەواوی ڕەگەزەکانی وجوودی تێدا هەیە.. شاعیری عەرەب گوتەنی: "وأنك جرم صغير

/ وفيك انطوى العالم الأكبر"، يان ئەسیمیی ئازەری زمانی حورووفی گوتەنی "من بو جهانه صغمازم/ مندە صغار ایکی جهان/ كون و مكانه صغمازم/ گوهر لامكان منم".
ئەم دوو بۆچوونە چوارچێوەی مرۆڤە، ماددەشە و ماناشە.

**_فەلسەفە چییە؟_**

ئێمە لە هەموو هەڵسوکەوتێکی ژیانی ڕۆژانەماندا لە ئەزموون و تاقیکردنەوەداین. ئەزموون و تاقیکردنەوەش بۆ ئەوەیە زێتر لە ڕاستییەکان بگەین. جا بۆ ئەوەی کە ئەوانەی لە دەوروبەرماندا ڕوودەدەن بە تەواوەتی و بەڕاستی بگەین، دەبێ پەنا بۆ سیستەمێکی تەواو زانستانە بۆ بیرکردنەوە لە ژیان، لە جیهان هەمووی ، لە شوێنی ئێمە لەم جیهانەدا، لەم دیاردە و ڕووداوانە بەرین. بەڵام ئەم بیرکردنەوەیە تەنها بۆ ئەوە نییە کە ئەتۆ هۆکار و سەرچاوەکانی ئەم دیاردە و ڕووداوانە ڕوون کەیەوە و دەستیشان کەی، بەڵکو دەبێ تۆ شوێنی خۆشت لە نێوانیدا بە دیاریبێخی و لەو ڕووداوانەدا دەوربگێڕی و کاریگەر بی و بتوانی چالاکانە لە گۆڕانکارییەکانی جیهاندا بەشداربی. ڕوونتری بڵێم: ئێمە ناتوانین هیچ چتێ لەوانەی کە لە دەوروبەرماندا ڕوودەدەن، حاڵی بین تا لە *ڕوانگەیەکی ڕاستەوە لە جیهان نەڕوانین، بە مەرجێ ئەم ڕوانگەیە گەلاڵەی هەموو مانا و چەمکەکانی ژیانمان ڕوون و ئاشکرا بۆ بەدیاربێخی،* جیهانمان سەرلەبەر وەك هێلکەی پاککراو لە پێشێ دانێ، لە هەموو دیاردە و ڕووداوەکان حاڵی بین. دیارە ئەوها لە ژیان و جیهان و لە هەموو چتێ گەیشتن، فەلسەفە پێشکێشمانی دەکا. ئەمەش مانای ئەوەیە کە بنیاتنانی ژیانی نوێ پێویستیی بە زانیاریی نرتونوێ هەیە. جارێ هەر خوێندنی فەلسەفە بۆ خۆی، حەز و ئاڵهای وەکۆڵین و لە هەموو چتێ وردبوونەوە فراژوودەکا و پێ دەگەیەنێ و بەرچاومان فرەوان دەکاتەوە. بەڵام نابێ پێت وابێ کە هەموو جۆرە فەلسەفەیێ بیروبۆچوونێکی زانستانەت لەمەڕ جیهان وەگیردێخی و فێرەڕاست بیرکردنەوەت دەکا، نەخێر، چونکە فەلسەفەی واش هەن کە هەر بە ئەنقەست ئەوانەی لە جیهاندا ڕوودەدەن، دەشێوێنن و مرۆڤ چەواشە دەکەن.کەواتا: هەموو فەلسەفەیێ بۆ ئەوە ناشێ ببێ بە کلیلی ئەقڵ و قەڵەوزی ڕێشاندەر. تەنها فەلسەفەیێ کە پشتی پێ ببەسترێ، فەلسەفەی زانستانەیە. هەر بە ئەزموون، خەڵك بۆی دەرکەوتووە کە بە فێربوونی فەلسەفەی زانستانە دەگەنە قەناعەتی ڕاست و دروست و زۆر مەردانە داکۆکی لە بەرژەوەندی گەلەکانیان دەکەن و

لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی نیشتمانەکانیاندا خەبات دەکەن و بۆ کاری گەورە لـە ڕێی دامەزراندنی ئاشتی و بەختەوەری لە سەر ئەم زەوینە، خۆیان بەخت دەکەن.

باشە ئەم گرینگییەی فەلسەفە لە چیڕا هاتووە؟

ئەتۆ دەبینی زانستەکان: فیزیا، کیمیا، بیۆلۆجی، ئەستێرەناسی و هتد هەریەکە بە تەنها بە بەشێکی یاسایەکانی دیاردە و ڕووداوەکانی خۆرسکەوە سـەرقاڵە، بـەڵام فەلسەفە، باسی ڕێساگەلێکی فرەوانتر و بە داوێنتری جیهان دەکا. هەر لەبەر ئەوەشـە کە فەلسەفە، زانستی یاسا و ڕێسایەکانی گەشەکردن و تەشەنەکردنی خۆرسك و کۆمەڵ و بیرونەندێشەی مرۆڤە لە چارچێوەیەکی فرەوانتردا. بەڵام ئەمە مانـای ئـەوە نییـە کـە فەلسەفە بە تاقی تەنها هەموو گرەپانەکە داگیردەکا و پێویستیی بە زانستەکانی دیکە نییە و زانستەکانیش پێویستییان بە فەلسەفە نییە. فەلسەفە بە بێ پشت بەستن بـە دەسکەوتەکانی زانستەکانی دیکـە، نـاتوانێ ببێ بـە ڕەنگدانەوەیـەکی پێشکەتخوازانە لەمـەڕ جیهان. ئـەو فەلسـەفەیەش بـەلای مارکسـییەکانەوە، فەلسـەفەی زانسـتانەی مارکسییەتە. فەلسەفە کۆمەڵێ بیروبۆچوونی کۆنکرێت لـە بـارەی جیهانـەوە بـە خـەڵك دەبەخشێ. واتە: بە چەمکەهایێ پرچـەکیان دەکـا و هـەر ئەمەشـە بـووە بـە ناوچـەقی هێزوگوردی وی. بەڵام بیروبۆچوونی خەڵکەکان لەمەڕ جیهان هەریەکە بـە جۆرێکن، لـە کن هێندێکیان زانستانە و پیشکەتخوازانە و لای برێکیان لەگەڵ زانسـتدا ڕێك ناکـەون و کۆنەپەرستانەن. بە نموونـە: هێنـدێ، خـەبات لـە پێنـاوی ڕزگاریی نەتـەوەکانیاندا بـە ڕێگای ژیان و بەختەوەری و ئازادی دەزانن، کەچی هێندێکیان چەوساندنەوە و زوڵم و زۆرکردن لە نەتەوەبندەسەکانیان بە ڕێگـای خواسـایی و ڕەوا دەزانـن. دیـارە ئـەم دوو جۆرە بیروبۆچوونە لە کۆمەڵێکی فرەچین و بیروبۆچوونی جۆراوجۆردا بـەو شـێوەیەیە. لەم جۆرە کۆمەڵەدا هەر چینە بۆ بەرژەوەندی خـۆی هـەوڵ دەدا و ململانێکـە بـە پێـی دەسەلاتی چینەکان حسابی بۆ دەکـرێ. لەبـەر ئەمـە لـە ئاوهـا کۆمـەڵێکدا یـەك جـۆرە بیروبـاوەڕ لەمـەڕ جیـهان، کـارێکی مەحاڵـە. کێشـەکە کێشـەی زۆردار و زۆرلێکراوانـــە. فەلسەفە هەمیشە داکۆکی لە بەرژەوەندی ئەوانە دەکـا کـە لـە خزمەتیاندایـە. کەواتـە:

فەلسەفە، دە کاتێکدا کە خەباتی ژێردەستان بۆ لە زوڵم و زۆر ڕزگاربوونە، ناتوانێ بێ لایەن بوەستێ بەم مانایە *فەلسەفە* حیزبایەتییە، واتە: داکۆکی لە بەرژەوەندی چینایەتیی حیزبی دەکا. هەر لەبەر هەندێ، دەبینین لە فەلسەفەی هەموو سەروبەندێکی مێژووییەندا حیزبی لێك دڕدۆنگ و دژبەیەکدی هەبوون. حیزبی بیروباوەڕ ماتریالیستی و ئایدیالیستی، لەم جۆرە حیزبانەن.

حەز دەکەم لە پێش هەموو چتێکدا ئەوە ڕوون کەمەوە کە زۆر جاران لایەنی داخ لە دڵ، بیروبڕوا ماتریالیست و ئایدیالیست، بە ماددەپەرست و بە کوێلەی بەرژەوەندی شەخسیی خۆی، بە کەسانێ کە لە پێناوی نیازێکی پاك و بیروبڕوایەکی باڵا و لە بەرژەوەند و غەرەز بەدەر، خەبات ناکەن، لەقەڵەم دەدەن. بەڵام ئەم جۆرە بیروبۆچوونە توڕەهاتە لە بارەی ماتریالیست و ئایدیالیستەوە بە تەقەی تفەنگیش پێوەندیی بە جوداوازیی نێوان هەردوو بەرە فەلسەفییەکەوە نییە. بە ڕاستی جوداوازیی نێوان ئەم دوو بەرە فەلسەفییە لە بوارێکی دیکەدایە. لە بواری سەرلەبەری ئەو کێشانەدا کە فەلسەفە باسیان دەکا، دوو چتی سەرەکی هەن و کردنەوەی گرێکوێرەکە بە دەستی فەلسفەکە خۆیەتی.

باشە گەوهەری کێشەکە لە چدایە؟ ئێمە بە چاوی خۆمان دەبینین، ئەم دنیایە پڕە لە دار و بەرد و ئاو و ئاسمان و بروسکە و زیندەوەر و گیاوگوڵ و پێش ئەوەی مرۆڤ لەسەر ئەم زەوینە پەیدا ببێ هەبوون و بوون و نەبوونیان هیچ پێوەندییەکی بە بیر و ئارەزوو و بەرژەوەندیی من و تۆوە نییە و کار لە هەستوخوستمان دەکەن و دەتوانین بە دەست دەستیان لێ بدەین و تامیان بکەین و بۆنیان بکەین و گوێیان لێ بگرین و هتد.. هەروەها جۆرێکی دیکەی دیاردەکانیش هەیە: وەك بیروئەندێشە، هەستوخوست، ویست و ئیرادە و حەز و ئارەزوو. ئەمانە هیچیان بەرهەست نین و مەحاڵە بە دەست بیانگرین و بۆنیان بکەبن و تامیان بکەین و پێوانەیان بکەین و کێشانەیان بکەین. ئەم دیاردانە لە نێو زەینماندا نەبێ لە هیچ شوێنێکی دیکەدا نین. کەواتە: لەم دنیایەدا دوو جۆرە دیاردە هەن: هێندێکیان مێشکی من هەبێ و نەبێ، سەربەخۆ، هەبوونیان هەیە، ئەمانە

دیاردەی *مادین*. بەشەکەی دیکەیان لە نێو ئاگایی و زەینماندا نەبێ، هەبوونیان نییە..ئەمانە دیاردەی نموونەیی *(مثال)و رەوانی (رۆحی)*ن. بەڵام ئەم دوو جۆرە دیاردانە کێهەیان لە پێش کێهەیاندا پەیدا بووە؟ روونتری بێژم: جیهان (خۆرسك) لە پێشدا، یان مێشك (ئاگایی) لە پێشدا هاتۆتە گۆڕێ؟ ئەمە کێشە بنەڕەتەکەیە لە هەموو فەلسەفەیەکدا. جیا لەم کێشەیەوە، دوو بەرەی لێك دووفاق پەیدابووگن. بەڵام خوێندنەوە و لە جیهان گەیشتن پێوەندیی بە جۆری ئەو ناسین (معرفة)ەوە، کەئەم فەیلەسووف یان ئەو فەیلەسووف بەکاری دەبەن، هەیە. ئەگەر لە رێی زانست و ئەزموونەوە لە خۆرسك بکۆڵینەوە، ئەوە، هەر وەك بە دیارکەوتووە، سەرکەوتووانە پەی بە زۆر نهێنییەکانی ئەم جیهانە دەبەین. نەخێر ئەگەر بە زانست و ئەزموون جیهان نەخوێنینەوە، ئەوە لە نێو تاریکستانی نەزانیدا هەر ئەمسەر و ئەوسەر دەکەین و بە هیچ ئاکامێ ناگەین. دیارە بۆ لە راستی گەیشتن، هەر زانستە و مێتۆدی تایبەتیی خۆی هەیە. باشە ئەدی مێتۆدی فەلسەفە کێهەیە؟ بێ گومان دوو جۆرە مێتۆد، دوو جۆرە بۆ لە جیهان گەیشتن هەن: یەکیان پێی وایە کە لە هەر چتێ، لە هەر دیاردەیێ دەنۆڕدرێ، دەبێ لە حاڵەتی گەشەکردنی سەروبن و بێ وچان و گۆڕانی بەردەوامدا، تێی بنۆڕدرێ. بەم جۆرە مێتۆدە، مێتۆدی دیالێکتیکی (وتووێژ) دەگوترێ. مانای وتووێژ (دیالۆگ) لای یۆنانییە کۆنەکان بەوە دەگوترا کە لە ئاکام و ئەنجامی وتووێژ و دەمەتەقێ و ململانێی نێوان دوو بیروبۆچوون، یا زێتردا، کێهە لا بەڵگەی بۆ راستیی تێز (تەرح)ەکەی خۆی بە هێزتر هێنایەوە، دەبێ لایەکەی دیکە تێزەکەی ئەو لایە بسەلمێنێ، بەڵام ئەمڕۆ دیالێکتیك بە مێتۆدێکی فەلسەفییانەی ئەوتۆ دەگوترێ کە تۆ واقیعی پێ بناسی. ئەو مێتۆدە دەڵێ: هەموو چتێ لەم جیهانەدا دە حاڵەتی گەشەکردن و گۆڕاندایە، هەرچی ئەوەکەی دیکەیە پێی وایە کە هەرچی هەیە، دە حاڵەتی مت و بێجووڵەدایە و جووتەواری لێوە نایە و ناگۆڕێ، بەم تەرزە لە جیهان نوارینە مێتۆدی میتافیزیکانە دەگوترێ. باشە کێهەیان راستە؟ دیارە وەك مارکسییەکان دەڵێن، ئەوی دیالێکتیکییەکەیان راستە. بۆ پاساودانی ئەمەش، نموونە

بە گۆڕانکارییە کۆمەڵییەکان دێننەوە. ڕزگاربوونی سیاسیی وڵاتانی ئەفریقا لە ئیمپریالیزم بە بەڵگە دێننەوە. بەڵام داخوا لە خۆرسکدا هیچ گۆڕانێکی بەرچاو ڕووی داوە؟ بەلای منەوە یاسا گشتەکانی خۆرسک، لە گوێن خولانەوەی ئەزەلی و هەتاهەتایی ئەستێرەکان و دیاردە کۆسمۆییەکان، تا ئێستا هیچ نەگۆڕاوە، یاسایەکانی زاوزێی زیندەوەران لە جەوهەردا هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتووە. ئەگەر ئێمە لە هێندێ یاسا و ڕێسای خۆرسک، بۆ نموونە: وەك یاسای کێشمان (جانبیة) تێگەیشتن، ئەوە خۆمان ڕزگار کردووە و دەتوانین بە فڕۆکە لە گۆی زەوین هەر لە چارچێوەی خۆیدا، تا ئەندازەیێ بەرەو ئاسمان هەڵفڕین و لە چارچێوەی کێشمانی زەوین بە مووشەك ڕزگاربین، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە لە کێشمانی ڕەها (مطلق) ڕزگار بووگین و یاسای کێشمانی زەوین، یان کێشمانی هەر ئەستێرەیەکی دیکە و خولگەکانی ڕزگار بووگین و دەتوانین یاسایەکان بەتاڵ بکەینەوە. بەش بە حاڵی ڕزگار بوونی ئەفریقا لە ئیمپریالیزم، بەلای منەوە، ڕاستە حوکمڕانیی بە ڕەواڵ، بە دەستی نوێنەرانی خەڵکانی ئەو وڵاتانەوەیە، بەڵام بە ئەمانی ئیمپریالیزم لەو وڵاتانەدا، سیستەمی سەرمایەداری نەگۆڕاوە. تا ئەو سیستەمەش نەگۆڕێ، گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەکان هەر لە شوێنی خۆیاندا دەچەقن و قەتیس دەمێنن. فەرموو نەك ئەفریقا، ئەوە عیراقەکەی کورد و عەرەب، پاش وەی لە چنگوڕکی ئیمپریالیزمی بەریتانیا ڕزگاربوونی، سەددامی هەر دەستنێژی شێتۆکەی ئەمریکا و هەر ئەمریکا بۆ خۆی، کارەساتێکی بەسەر عێراقەکەدا هێناوە، (لە ئاکامی بێ ئاگاییمان) سەت خۆزگە بە کفندز دەبەین. بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە گۆڕانکاری مەرج نییە لە هێڵێکی ڕاستە و ڕاستدا بڕوا. زۆر جار پێچ و پلووچی سەیری تێ دەکەوێ.

بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە دیالێکتیك کاتێ دەبێ بە ڕاستییەکی زانستانە کە دەگەڵ مادییەتدا یەکیەتییەکی ئۆرگانیکی پێك بێنن. ئەم یەککرتنە ئۆرگانیکییەش لە فەلسەفەی مارکسییدا مادییێتی دیالێکتیکی پێ دەکوترێ.

ماددیێتی دیالێکتیکی لەسەر دەستی مارکس (١٨١٨ ـ ١٨٨٣) و ئنگلس (١٨٢٠ ـ ١٨٩٥) دامەزرا و لینین (١٨٧٠ ـ ١٩٢٤) گەشەی پێ کرد و بوو بە چەکێکی فەلسەفییانەی چینی زەحمەتکێشانی جیهان لە پێناوی ڕزگاربوون لە چەوسانەوە بە دەست سەرمایەدارییەوە، بەڵام دەوڵەتە سۆسیالیستانەکەی لینین بە دەستی دیکتاتۆرییێتی ستالین و زۆر هۆکاری دیکەوە کە ئێرە جێیان نییە دیاردییان بۆ بکرێ، بۆ خۆی بە دەستی گۆرباچۆف و هەواڵانی هەرەسی هێنا و بڕایەوە و دنیای سەرمایەداری بە سەرکردایەتیی ئەمریکاوە وا خەریکە جارێکی دیکە نەخشەی جیهان بە لای بەرژەوەندی سەرمایەداریدا، سەرلەنوێ دەکێشێتەوە و تێبینییەکانی مارکسیزم لەمەڕ ڕووخانی سیستەمی سەرمایەداری، بەو جۆرەی پێشبینی کرابوو، نەهاتەدی.

فەلسەفەی ماددیی کۆن، فەلسەفەیەکی میتافیزیکانە بوو؛ چونکە خۆڕسکی بە چێتێکی بێ بزاوت لەقەڵەم دەدا و پێی وابوو گۆڕان بە خۆیەوە نابینێ. ماتریالیستە کۆنەکانی وەک فیۆرباخ لەوبڕوایەدا بوون کە تەنها خۆڕسک کار لە مرۆڤ دەکا، بەڵام بە ئەزموون بە دیارکەوتووە کە مرۆڤیش دە بەرابەردا، کار لە خۆڕسک دەکا و دەشیگۆڕێ. بۆ نموونە: مرۆڤ پێناو و ئامێرەکانی ڕەنتوهێنانی گۆڕیوە، بە دەستەمۆکردنی یاسایەکانی خۆڕسک بە سەر زۆر چتاندا زاڵ بووە، توانیویەتی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا یاسایەکانی تەنانەت چۆن سازبوونی مرۆڤیش بدۆزێتەوە و ئێستا لەم سەردەمەدا کۆپی دەکرێ. بۆ ئەستێرەکان گەشتوگەڕان دەکرێ، خەڵکانی ڕۆژروزەوەندی سەر زەوین زێتر لە دیموکراسیی و مافپارێزیی مرۆڤ و یەکسانیی ژنان و پیاوان نزیک دەبنەوە، لە دژی شەڕوشۆڕ و حەز لە ئاشتی دەکەن .

بەڵام ماتریالیزمی کۆن نوقسانییەکی هەبوو: ئەوەش ئەوەبوو کە تەنها خۆڕسکی بۆ کەرەستەی فەلسەفەکەی ڕەچاودەکرد، کەچی بەش بە حاڵی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی، هەروەک فەلسەفەی ئایدیالیستی بیر لێ دەکردەوە. بەڵێ ڕاستە ئەو خۆڕسکی بە یەکەم و بیروئەندێشەی بە دووەم و بەرهەمی خۆڕسک دادەنا، بەڵام بەش بە حاڵی گۆڕانکاری لە کۆمەڵدا، لای وا بوو کە بیروبڕوای ویست و ئارەزووی "قارەمان و کەسانی بەهێز"

کۆمەڵ بەرەو پێشی دەبەن، واتە: تەنها پشتی بە ئەنگیزەی خۆیی (زاتی) نەك ئەنگیزەی ماددی، بابەتی، دەبەست.

دوور مەڕۆ، یەکێکی وەك فیۆرباخ، کە ڕەخنەی لە ئایدیالیزم و ئایین دەگرت، کەچی کاتێ کە دەهاتە سەر دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی: ئاکار و خووڕەوشت و هاوپێوەندییەکانی خەڵکی دەگەڵ یەکیدا، لە جیاتیی وەی بە هەلومەرجی واقیعیی ژیانی خەڵکەوە گرێ بدا، دەیکوت: هێندێ ئاکار و ڕەوشت چ سەروکاری بە هەلومەرجی ژیانەوە نییە و هەر ناگۆڕێن. دیارە ئەمە بە لای فەلسەفەی ماددییەوە، بە بیروبۆچوونێکی ئایدیالیستانە لەقەڵەم دەدرێ؛ چونکە ئاکار و ڕەوشت و سەرەتا ئەخلاقییەکان بە دیاردەگەلێکی لە واقیعی ژیان بەدەر دەزانی.

دەبێ ئەوەش لە بیرنەکەین کە ماددییەتی و دیالێکتیك، لە فەلسەفەدا وەك ڕێسایێ بە دوو چتی لێکدی جوداواز لەقەڵەم دەدرا.ماددییەتی هەر بە میتافیزیکیانە مایەوە، بە دیالێکتیکانە پێش نەکەوت. دیاردەکانی هەرچی دیالێکتیکە لە فەلسەفە ئایدیالیستەکاندا، بە تایبەتی لە فەلسەفەی هیگڵدا، گۆڕانکاریی بەسەردا هات. بەڵام نوقسانییەکی زۆری هەبوو. دیالێکتیکەکەی هیگڵ عەیبی گەورەی لەوەدا بوو کە بە تەواوی، ئاڵقەلەگوێی ئایدیالیزم بوو. لەبەر ئەوە دیالێکتیکیان لە فەلسەفەی هیگڵدا تەنها بەسەر فکردا تەتبیق دەکرد. هیگڵ لای وابوو تەنها هەر ئەندێشە دەگۆڕێ و گەشەدەکا، نەك خۆڕسك کە بە قۆناخێ لە قۆناخەکانی گۆڕانی ئەندێشەی دەزانی و لای وابوو لە زەماندا هیچ گەشەکردن و گۆڕانێ بە خۆیەوە نابینێ، واتە: مێژوویەکی تایبەتیی نییە. ئەوەش بە بن لێوەوە ناکرێ، کە فەلسەفەی هیگڵ هێندێ چتی بە بەهای تێدا هەبوون و پێویستیی بە جۆرە نەشتەرکارییەکی ئەوتۆ هەبوو کە بە دەست پزیشکەوە بە جارێ گیانی لە دەست نەدا، بەڵام فیۆرباخ بە جۆرێکی نەشتەرکاری کرد هیچی بەسەر هیچەوە نەهێشت و پاك و پیسی پێکەوە ڕامالین.

بەڵام مارکس بە بلیمەتیی خۆی نێوکە ئەقڵانییەکی دیالێکتیکی هیگڵی لە توولۆی ڕێبازە ئایدیالیستانەکەیدا دۆزییەوە، ئەوەش ئەمەیە کە هەموو چتێ لەم دنیایەدا دە

حاڵەتی گۆڕان و گەشەکردندایە و دووفاقیی نێوەخۆی چتەکان ، هەر بۆ خۆی سەرچاوەی ئەم گۆڕان و گەشەکردنەیە. بەڵام ئەم کارە بە بێ هەڵاوردنی دیالێکتیك لە کاژە ئایدیالیستانەکەی، دیالێکتیکی هیگڵ سەرلەنوێ لەسەر بنەمایەکی ماددی و بە شێوەیەکی زانستانە مەیسەر نەدەبوو. بۆ ئەم کارەش تەنها چارە هەر ئەوەبوو کە پشت بە بەرهەمەکانی زانستی شۆڕشگێڕانە ببەسترێ. ئیدی ئەوەبوو کە مارکس ڕێبازێکی فەلسەفییانەی وای دامەزراند کە ماددییەتیش و دیالێکتیکیشی هەرتك پێکەوە توندوتۆڵ گرێ دا و بوون بە یەك چت و لەوەڕا ماددییەتی دیالێکتیکی هاتە گۆڕێ.

باشە، ماددە بۆخۆی چییە؟ بە ڕاستی ژیان و تاقیمانەکانی ڕۆژانە ئەوەی پێ سەلماندووین کە ئەم جیهانە، پێش وەی مرۆڤ لە سەر گۆی ئەم زەوینە پەیدا ببێ، هەبووە، نەك وەك ئایدیالیستەکان دەڵێن، تەنها لە مێشك و زەینی مرۆڤدا هەیە، واتە: گۆیا ئەگەر ئەقڵی مرۆڤ نەبا، ئەم جیهانە نەدەبوو. بەڵام زانست بە دیاری ئێخستییە کە گۆی زەوینەکە بۆ خۆی تەمەنی پێنج ملیار ساڵە، کەچی تەمەنی مرۆڤ خوراوڤوور، لە یەك میلیۆن زێتر تێ ناپەڕێ. کەواتە: هەبوونی جیهان بە بێ مێشك و زەینی مرۆڤ ئەو ڕاستییە دەگەیەنێ کە جیهان ماددییە.

بۆ خۆت دەبینی، دەوروبەرمان لە چتهایێ، لە دیاردەگەلێ شاخندرلوە نە سەرەتایان هەس و نە بنەتا. دارە، بەردە، چەوە، لمە، خاکە، زیندەوەرە، دەریایە، چۆل و بیابانە، هەسارەیە و هتد.. ئەمانەش سەرلەبەر واژەی "ماددە"یان بۆ وەکارتێرین. بەم جۆرە واژەگەلەیشە، "چەمکەیل" (مفاهیم) یەژین.

هێندێ چەمك، چتهایەکی زۆر فرەوان و هێندێکی دیکەی چتەیلێکی کەم فرەوانتر دەگرنەوە. بۆ نموونە: چەمکی "چت" لە چەمکی "گۆچان" یان "کۆمپیوتەر" فرەوانترە. باشە چەمکی لە هەمووان فرەوانتر هەیە؟ بەڵێ، هەیە. دە کە مادامێکی چەمکێکی وا هەبێ هەرچی هەیە و نییە بگرێتەوە، دیارە ئەم چەمکە لە هەموو چەمکەکان فرەوانترە. ئەم چەمکەش، چەمکی "ماددە"یە. کەواسە: "ماددە"ش چەمکێکی وەك چەمکی "چت"ە، وەلێ چەمکێکی یەکجار فرەوانە، نەخێر، بێژە،

فرەوانترین چەمکە. جیاوازیی ئەم چەمکە لێل چەمکەکانی ترا ئەوەسا کە نیشانە دایکانە و باوکانە جەوهەرییە گشتەکان دەگرێتەوە، نەك تەنیا هەر هێندێ چت. ئیدی بەم چەمکە کە لە هەموو چەمکەکانی دیکە بەرفرەوانترە، کەتەگۆریا (مەقوولات)یش دەگوترێ.

چاکە، ئەدی نیشانە دایکانە و باوکانە جەوهەرییە گشتەکان کە سەرلەبەری چتان دەگرنەوە، چین؟ یەکەم ئەوەیە کە ماددییە، واتە: ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ، هەن، مێشك و زەینی مرۆڤ هەبێ و نەبێ، هەن. دووەم ئێمە کە بە ئاوێکی شلەتێن خۆمان دەشۆین، هەست بە گەرمایی دەکەین، یان کە ئتۆرینە دارستانێ، دەبینین ڕەنگی داروبرەختەکان کەسکن. لەمەڕا ئەوەمان بۆ بەدیاردەکەوێ کە چتەکانی دەرێی زەین و مێشکی ئێمە کار لە ئەندامەکانی هەستمان دەکەن. کەواتە: ماددە مەقولەیەکی فەلسەفیی ئەوتۆیە کە دەلالەت لە هەبوونی چتان لە دەرەوەی مێشك و زەینی مرۆڤ لە ڕێگای ئەندامانی هەستوخوستیەوە، دەکا. کەواتە: ماددە ئەو ڕاستییەیە کە کار لە هەستەکانمان (بە چاو، دەست وێ کەوتن، بۆنکردن، بیستن، تامکردن) دەکا و هەستمان دەوروژێنێ.

کۆن، ماددەیان بە کۆمەڵە ڕێزە (ذرة)یێ دەزانی و لایان وابوو کەرت ـ کەرت نابن و چتی خڕ و گرۆڤەری ورد ـ وردن و ئەمانە بنەڕت و بناخەی سەرلەبەری جیهانن. بەڵام لە پاشان زانست یەکلای کردەوە کە کە ڕێزە (ئەتۆم = ذرة) کەرت ـ کەرت دەبێ و ئەم کەرت ـ کەرت بوونەش دواییی نایە. بەڵام سەیر ئەوەیە کە فەیلەسووفە ئایدیالیستەکان پاش ئەم کەشفە زانستییە، کردیان بە هەرا: ئەها، ئەرێ وەڵڵا فەلسەفەی ماددی بە فشەدەرچوو و تۆڕاندی ـ گوتیان، جاران ڕێزەی لە کەرتبوون نەهاتگ بە بنەڕەتی ماددە دادەندرا، کەچی بە دیارکەوت، نەخێر، ئەوەتا کەرت ـ کەرت دەبێ. کەواتا: ئەو کۆشك و تالارەی فەلسەفەی ماددی، لەسەر ماددە و ڕێزەکانی ڕۆنابوون، داتەپین و ڕووخان، کە ماددەیە. بەڵام کارەکە بەو جۆرە نییە. بەڕاستی ئەوەی ڕووی دا، ئەمە بوو کە خەڵك زانیاریی نوێیان وەگیرکەوت. جاران نەیاندەزانی کە ڕێزە (ئەتۆم) کەرت ـ

کەرت دەبێ و ئەلەکترۆن هەیە و پرۆتۆن و نێوکی ئەتۆمی هەن. وەلێ ئێستاکانێ دەزانن کە ئەم زانیارییە نوێیانە بیروبۆچوونەکانمانیان لەمەڕ پێکهاتەی ماددە، هەر بە جارێ گۆڕی.

زانست تا ئێستاکە نزیکەی ٣٠ وردۆکەی دۆزیوەتەوە و لە دۆزینەوەی هی دیکەشدا هەر وا بەردەوامە و ئەوەی بە ئەقڵمان سەلماند کە ئەم وردۆکانە بۆ خۆیان، سەربەخۆ هەن و هەر لە پێشدا هەبووگن و پاش ئەوەی کە زانست دۆزیونییەوە، ئەوجا هاتوونە نێو زەینی مرۆڤەوە و ماددین و هەرگیز لەناوناچن.

ماددە خەسیەت و نیشانەی دیکەشی هەن و زۆر جۆراوجۆریشن. خەسیەتەکانی هەریەکە لە بابەتێك و لە ڕەنگێکن. بە ڕاستی ئێمە دەبێ دوو چتان لێکدی هەلاوێرین: یەکەم ڕێبازی ماددە چۆن پێك هات و دووەم، چەمکی فەلسەفییانەی ماددە چییە؟ بەش بە حاڵی ڕێباز (مێتۆد)ی ماددە چۆن پێکهاتن، ئەوەیە کە بزانین ماددە لە ئەلەکترۆن، یان وردۆکەکانی دیکە پێك دێ؟ بەڵام ڕێبازی فەلسەفە، دەیهەوێ بزانێ: گەلۆ جیهان هەیە، ڕاستە ئەم وردۆکانە بە بێ زەینی ئێمە هەن؟ بیروبۆچوونمان بە هەر بارێکدا دەربارەی جیهان بگۆڕێ، ئەمە مانای ئەوە نییە کە مادام ئەم گۆڕانە هەبێ، دیارە "ماددە لەناودەچێ".. ڕاستیت گەرەکە، ماددە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بەڵگەی ئیسپات بوونی سەربەخۆیی خۆی هێندەی دیکە لە سای کەشفە تازەکانی زانستدا، زێتر دەسەبەردەکا. ئەوەی کە دەگۆڕێ ماددە نییە، بەڵکو بیروبۆچوونی ئێمەیە کە دەربارەی چۆن پێکهاتنی جیهان و تابلۆیە زانستانەکەی دێتەگۆڕێن..

بەڵام باسوخواسی ماددە هەر هەبووە و هەتاهەتایشە هەر وا بەردەوام دەبێ و کێشەشی لەسەر بوونی بەسەرچووە. بۆ نموونە: ئەگەر پاژە دارێکمان سووتاند، هەنگێن لە هێندێ مشکیی زێتر لێ بەجێ نامێنێ، باشە، پاژە دارەکە چیی بەسەرهات؟ دارەکە بوو بە چەندین ماددەی دیکە کە تاکە ـ تاکە و جوێ ـ جوێ، دارە سووتاوەکەی پێشوو نین. کەواتە: هیچ چتێ لە خۆڕسکدا نییە لەناوبچێ و هیچ ئاسەوارێکی لێ بەجێ نەمێنێ، یان سەرلەنوێ لە هیچ، لە نەبوو سازبێتەوە. کەواسا: هیچ چتێ لە خۆڕسکدا

لە هیچ و لە نەبوو پەیدا نابێ و لەناوناچێ، بێ ئەوەی ئاسەوارێ بە جێبێڵێ، بەڵکو شکڵ و شێوەی دیکەی ماددەی دیی لێ پەیدا دەبن.

ماددە لە جووڵە (حرکة) جوداناکرێتەوە. ئەتۆ کە چتێ لە جێگایەکی بە نموونە: پردێ، دەبینی ناجووڵێ و هەر لەو جێگایەدا قەتیسە و تا یەکێ نەیجووڵێنێ، جووڵە ناکا، بەڵام ئەگەر بە وردیی بتۆڕینێ، بەردەکە هەمیشە لە بزووتن و جووڵەدایە. ڕێزەکانی، کەرتەکان (ئەلەکترۆن، پرۆتۆن)ی کە دە هەر ماددەیەکدا هەن لە جووڵەدان و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە ئاڵوگۆڕدەکەن، داڕووخان بە هۆی نم و شێ و گەرمایی تیشکی ڕۆژ و باوبۆرانەوە بەردەوامە. ئەتۆ ئەو خانووەی کە تێیدای بێ جۆڵین و جووڵە نییە، دەگەڵ خولانەوەی زەویندا بە دەوری ڕۆژدا، دەخولێتەوە. ئێمە لە جێگایەکی کە دادەنیشین جووڵەناکەین، بەڵام ئەو جۆگەلە خوێنانەی کە بە لەشماندا دەڕۆن و دەخولێنەوە جۆرەها گۆڕانکارییان لێ دێنە گۆڕێ. بە هەزاران لە خانە کۆنەکانی لەش، خرادەبن و دەگۆڕێن، بە هەزارانی دیکەی نوێیان لێ پەیدا دەبنەوە، ئەمەش هەر جووڵەیە.

ئەتۆ هەروا بیر لە گەرمی بکەوە، پێت وایە لە چ پەیدا دەبێ؟ ئەوە لە ئەنجامی جووڵەی ژمارەیەکی یەکجار زۆری ڕێزەکان پەیدا دەبێ، چۆن؟ بۆ نموونە: ئاو بە ئاڵوگۆڕی ڕێزەکانی گەرم دادێ و دێتەکوڵ؛ بەڵام جووڵەکە، جووڵەیەکی مەکینەیی نییە بە چاو ببیندرێ، بەڵکو چتێکی زۆر بە گرێوگۆڵترە. لێشاو (تیار)ی کارەبا جووڵەی ئەلەکترۆنەکانە، کارێکی کیمیاوی، ئەویش هەر جووڵەیە، کەڵەکەبوونی ئەیۆنەکانی، ئەمەیان لەوی پێشوو زۆر بە گرێوگۆڵترە. ئۆرگانی زیندوو، ئەویش هەمیشە لە حاڵەتی جووڵەدایە. بڕوانە سیستەم و ڕژێم و یاسا و ڕێسایە کۆمەڵایەتییەکان چۆن هەمیشە لە گۆڕاندان، کۆمەڵانی خەڵک چۆن دەگۆڕێن، ئاکار و ڕەوشتیان، تەرز و شێوەی بیرکردنەوەیان لەمەڕ هەر چتێ، هەر دیاردەیێ، هەر ڕووداوێ کوو دەگۆڕێ؟

باشه، لەوەی گوتمان چ هەلدێنجین؟ لە سنیادا جۆرەها جووڵە هەن، یەکەم جووڵەی مەکینەیی، دووەم جووڵەی فیزیایی، سێیەم جووڵەی کیمیایی، چارەم جووڵەی بیۆلۆجی، پێنجەم جووڵەی کۆمەڵایەتی.

جووڵە سەرلەبەری گۆڕانکاریگەلێ کە لە جیهاندا ڕوودەدەن لە شازوگوێزێکی سادەوە بگرە تا دەگەیە بیرکردنەوە، هەموویان دەگرێتەوە. کەواتە: جووڵە سەرلەبەری ئەو گۆڕانکارییانەن کە لە چتەکان و دیاردەکاندا ڕوودەدەن، ئەمە بە گشتی گۆڕانی ماددەیە.

باشە، دەکرێ ماددە بکەوێتە حاڵەتێکی واوە کە هیچ گۆڕانێ بە خۆیەوە نەبینێ؟ نەخێر، تەنانەت لەو سەردەمەشدا کە هێشتا نە خەڵك، نە زیندەوەر، نە خانەی زیندوو، پەیدابیوون، گۆڕانکاری لە ماددەدا هەر هەبوو. کەواتا: جووڵە شێوەی مانی ماددەیە، شێوەی هەبوونی ماددەیە. جووڵە خەسیەتێکی نوسنەکی ماددەیە و هەرگیز لێی جودانابێتەوە و هەبوونی ماددە بە بێ جووڵە نییە و ماددە تەنها هەر لە حاڵەتی جووڵەدا هەیە.

پیرۆزە، ئەمە وای لێ دەفامرێتەوە کە ماددیێتی دیالێکتیکی متی (سکون) فت دەکا؟ نەخێر. متی لە خۆڕسکدا هەیە، بەلام لە چاو خۆیدا هەیە، ڕێژەکییە. ئەمەش واتە: هیچ دیاردەیێ نییە بتوانێ بێ جووڵە بێ و هەرچییەکی تێدایە مت و بێ جووڵەیە.

ئەتۆ کە چتێکی دەبینی ناجووڵێ، ئەمە لە چاو چتێکی دیکە وایە. بە نموونە: ئێمە لە نێو شەمەندەفەرێکدا کە لە حاڵەتی ڕۆیشتندایە، دانیشتووین و ناجووڵێین، بەلام لە ڕاستیدا، ئێمە دەگەڵ جووڵەی شەمەندەفەرەکەدا، لە جووڵەداین. ئەتۆ لە چاو شەمەندەفەرەکە، متی، بێ جووڵەی. دیارە لە متی حاڵیبوونی دیالێکتیکانە چتێکە و میتافیزیکانە لە متی تێ گەیشتن، چتێکی دیکەیە. میتافیزیاییەکان مت بە بێ جووڵە تێ دەگەن، بەلام ماددییەتی دیالێکتیکی هەر بە تەواوی دژی ئەمەیە.

بە ڕاستی، هەرچەندە کە متی هەیە، بەلام دیالێکتیك سەرقاڵی جووڵەیە، گەشەکردنە، گۆڕانکارییە کە ئەمەش بۆ خۆی لە خۆڕسکدا هەیە و پێویستیی بە بزوێن نییە. هیچ

پێویستیی بەوە ناکا ئەتۆ بپرسی، باشە، ئەوەی کە هەر لە عەزەلەوە هەبووە، لە کوێڕا پەیدا بوو؟

کات و شوێن (زمان و مکان) شێوەی ماددەن. بۆ خۆت دەزانی هەموو چتێ درێژا و پێوانەیەکی دیاری هەیە: پانی، درێژی، بڵندی،. ئەمانەش شوێنێ داگیردەکەن. جگە لەمەش، باری هەڵکەوتی جوداوازیان هەیە، لە یەکدی دوورتر، نزیکتر، سەرووتر، خوارتر، بە لای چەپدا،، یان بە لای ڕاستدا هەڵکەوتوون. ئەمەش واتە: هیچ چتێ نییە دە شوێنێکدا نەبێ و مەحاڵە کە وا نەبێ. جا هەر لەبەر هەندێ شوێن بە شێوەیێ لە هەبوونی ماددە دەناسێندرێ. هەروەها هەرچی دیاردە و ڕوودار لە جیهاندا هەن، وەك گوتمان لە حاڵەتی جووڵەی هەمیشەیی هەتا هەتاییدایە. جگە لەمەش، یەك لە دوو یەکدی دێن، ڕۆژگار لە پاش شەوگار، سۆسیالیزم لە پاش کاپیتالیزم (سەرمایەداری) دێ، ڕووداوێ زووتر، یەکی دی درەنگتر دێ و هەریەکەشیان تەمەنێ، درێژایەکی دیاری هەیە. جا ئەم گۆڕان و گەشەکردن و بە تۆرەهاتن و یەك لە دوو یەکدی ڕیزبوون و درێژابوونی ڕووداوان، مەحاڵە لە دەرێی چارچێوەی کاتدا ڕوویدەن. کەواتە: هەرچی لە جیهاندا ڕوودەدا، لە کات (زمان)دایە. جا لەبەر هەندێ، کاتیش هەر شێوەیەکی دیکەی ماددەیە. کەواتا: لە ماددەی جووڵەدار بەولاوە هیچ چتێکی دیکە لە جیهاندا نییە. ئەوجا "ماددەی جووڵەداریش لە کات و شوێندا نەبێ ناتوانێ جووڵەبکا".

باشە، ئەدی خەسیەتەکانی کات و شوێن چین؟ شوێن، سێ ڕەهەندی هەن: درێژی، پانی، بڵێندی. هەموو دەزانین کە گۆڕانی دیاردەکان لە کاتدا بە یەك بەریاندا دەڕوا، لە ڕابردووڕا بۆ هەنکە، لە هەنکەڕا بۆ دوارۆژ. ڕابرانی کات، بە پێچەوانەی ئەم یەك بەریانییە، مەحاڵە. وەلێ خەڵك لە چیرۆك و داستانە خەیاڵچنەکاندا توانیویانە "ئامێرێکی کات" دروست بکەن چزەکەی بە "پێچەوانە" بگەڕێ. مەحاڵە هەموو پلەکان بە بەریانی پێچەوانەدا، دووبارە بینەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە کات بەرەوپاش وەناگەڕێ، دیرۆك خۆ دووبارە وەناکا. ئەتۆ کە ئامرازی "کێندەرێ" ، "کەنگێ" بە کاردەهێنێ. بەمانە لە کاتی ڕووداو و جێی ڕووداوی دەپرسی. بەمەش

ئەوەمان لەبۆ ساغ دەبێتەوە کە کات و شوێن، دوو ڕووی ماددەنە، کە ئەمەیان بە بێ ئەوی دیکەیان هەبوونیان مەحاڵە. لەبەرئەوەی کە ماددە لە کات و شوێندا هەبوونی نییە، مەحاڵە لێکیان دابڕی، بگرە لە ماددەدابڕینیشیان هەر مەحاڵە. ئیسحاق نیوتن (١٦٤٢ ـ ١٧٢٧) لای وابوو کە شوێن و کات بە بێ ماددە و ڕاستەوخۆ هەن، یان وەك سندووقێکی زەلام، یان ژوورێکی بێ پایانی بێ دیوار و بنمیچ و زەوین دەچن و دەتوانی چتیان تێدا دابنێی و چتیان لێ دەربێری و وەك بڵێی ئەم جیهانە لە ناو ئەم "سندووق"ەدا "دانراوە". نیوتن لەمەڕا گوتی: شوێن بێ سەرەتا و سنوورە و دەخلی بە ماددەوە نییە. هەر بە هەمان ئاوا، بیری لە کاتیش کردەوە.

بەڵام ئەوەبوو، ئاینیشتاین (١٨٧٩ ـ ١٩٥٥) کێشەکەی بە تیئۆریی ڕێژەکی یەکلاکردەوە و هەروەك مارکس و ئەنگلس بیریان لێ کردبۆوە، گوتی: شوێن و کات دەگەڵ یەکتری و ماددەدا وەك یەك هاوپێوەندن و بە بێ خەسیەتەکانی ماددە بە بیردا نایەن. ئەتۆ وا دەزانی کە کات لەسەر ڕووی زەوین لە ناو مووشەکێکی زەلامی یەکجار خێرادا یەك چت بێ: بەڵام وا نییە. ئەگەر مووشەکەکە، بە خێرایی مەیلەو خێراییەکی تیشك بڕوا، هەنگینێ، کات زۆر لەوەی کە لە سەر ڕووی زەوین دەگوزەرێ، سستترە. ئەگەر بەم مووشەکە سەفەرێکی سێ ساڵەمان بۆ فەزایێ کرد، کاتێ وەدەگەڕێینە سەر زەوین، بڵێ، چەند ساڵمان پێ چوویێ باشە؟ ٣٦٠ ساڵ. ئەمە وەك بڵێی، چتێکە بە ئەقڵەوە ناچێ، بەڵام ئەمە ڕاستە و کێشەی لەسەر نییە.

جا، ئەمە ئەوەمان پێ دەسەلمێنێ کە زەوین کاتی خۆی هەیە و مووشەکیش بە خێرایی تیشك دەڕوا و کاتی خۆی هەیە. کەواتە: کات ڕێژەکییە و سستی و خێرایی بەسەرچوونی بەخێرایی جووڵەوە بەندە. چت، تا خێراتر لە شوێنێکدا جووڵە بکا، کات بەسەرچوون بەو پێیە سست دەبێتەوە. بەڵام شوێن هەر بۆ خۆشی ڕێژەکییە. ئەتۆ لە شەمەندەفەرێکدا دانیشتووی، وا بزانە شەمەندەفەرەکە بە خێرایی تیشك، بە تەنیشت شۆسەیەکدا دەڕوا (خێرایی تیشك ٣٠٠ هەزار کم لە چرکەیەکدایە) سەرنشینانی شەمەندەفەرەکە تەماشادەکەن، شۆسەکە کرژەڵکەڕاوە، بەڵام ئەوانەی کە لەسەر

شۆسەکە ڕاوەستاون، کارەکە بە پێچەوانەوە دەبینن، واتە: شەمەندەفەرەکە کرژ هەڵکەڕلوە. ئەمە لە ڕاستیدا فێڵی چاو نییە، بەڵکو ڕاستییەکە لە حاشابەدەر. ئیدی بەم جۆرە دەبینین، شوێنیش ڕێژەکییە.

بەڵام ئایدیالیستەکان ئەم دیاردە ڕاستە، وا لێك دەدەنەوە کە ئەمە تەنها لە زەینی مرۆڤدا بەو جۆرەیە، نەك لە ڕاستیدا.

باشە، مرۆڤ بەرابەر بە ڕابردنی کات دەستەپاچە و داماو نییە؟ مرۆڤ ناتوانێ کات ڕابگرێ، بەڵام بەرانبەر بە ڕابردنیشی وەنەبێ دەستەپاچە بێ؛ چونکە دەتوانێ بۆ بەرژەوەندی خۆی، کووی دەکاریەرێ، دەکاری دێنێ. بۆ نموونە: لە زۆر وڵاتاندا بە جۆری لە خواسایی بەدەر سوود لە کات وەردەگیرێ.

پرۆژە پێنج ساڵییە بە بەرنامەڕێژییەکانی گەشە و پەرە بە ئابووریدان وڵاتانی تازەفراژوو، لەم بوارەدا نموونەی ئاشکرایە.

باشە، ئەدی *ئاگایی* (وعی) چییە؟ ئاگایی خەسیەتی ماددەیەکی زۆر باڵایە. هەزاران ساڵە مرۆڤ لەو پێوەندییەی کە لە نێوان لەش و ئەوەی کە گیان (ڕۆح) یان ئاگاییی پێ دەگوترێ، چییە؟ دیارە وەڵامی ئەم پرسیارە، زۆر سەخت و گران بووە؛ چونکە ئەوەی کە نابیندرێ و بەر گوێ ناکەوێ و ڕەنگی نییە، کووی لێ دەکۆڵدرێتەوە کە ئاگاییەکەمان هەر بۆ خۆی لەم بابەتەیە؟ دیارە هیچ کەسێ لە بیری من ئاگا تا قسەی لەگەڵدا نەکەم. باشە، ئەدی بیرکردنەوە و ئەندێشە چییە؟ ئایدیالیستەکان ئەوە چەندین چەرخ و چاخە، ئەم پرسیارەیان کردووە بە بیانووی خۆیان و هەروا وەك بنێشتەخۆشە، دەیجوونەوە و دەیجوونەوە..

ئەوان دەڵێن: سەرچاوەی ژین و بیروئەندێشە، دەروونی مرۆڤە و مەحاڵە لەشی بێ گیان لە دنیادا هەبێ. ئەگەر هەش بێ مردووە. بەش بە حاڵی گیان، وەك دەڵێن، دەتوانێ بە لەش هەبێ. کاتێ مرۆڤ لە دایك دەبێ، هەنگێن گیان دەچێتە لەشیەوە و کاتێ دەمرێ لە لەشی دەردەچێ و لێی جودادەبێتەوە. باشە ئەمە ڕاستە؟ جا با قسەت بۆ بکەم.. کاکە ئاگایی بریتییە لە بیروئەندێشە و هەستوخوست و بیروبۆچوون و

ویست و ئیرادە ـ ئەم سیفەتانەش، یەکەم هی مرۆڤن. ئەگەر کەسێ نەبێ هەست بە چت بکا، دیارە هەستوخوست هەبوونی نییە. هەروەها ئەگەر کەسێ نەبێ بیهەوێ و ئیرادەی بەکاربەرێ، ویست و ئیرادە وجوودی نییە. بەڵێ ڕاستە هێندێ ماکی ئاگایی لە زیندەوەرلندا، لە گوێن هەست بە ڕەنگ، بێنکردن و بۆرەدەرککردنێ هەیە، بەڵام تەنانەت ئەم ماکە ئاگاییە لە سەرویەندێکی زۆر کۆندا پەیدا نەبووە، تا ڕادەیێ تازەیە.

لەم قسانە ئەوەمان بۆ بەدیاردەکەوێ کە خۆڕسك نەك هەر لە پێش خەڵکاندا بگرە لە پێش سەرلەبەری بوونەوەرانی زیندوودا تێکڕا، پەیدابووە و بێ ئاگایی و دەرکی مرۆڤ جوداوازانە و سەربەخۆ پەیدابووە. ئەوە پێشەنگە و مرۆڤ و زیندەوەر لە پاشەوێ هاتوونە گۆڕێ. ئەتۆ دەبینی، کەسێ دەستی بریندار دەبێ و برینەکەی هێند سەخت دەبێ، ئەو کەسە لە تاوان دەبووڕێتەوە و ئاگای لە خۆ نامێنێ و ئیدی هەست بە هیچ ناکا. زانست پێی سەلماندووین کە بووڕانەوە ـ هەستکردن لە دەست دان ـ لە سۆنگەی کەمخوێنی لە دەماخدا، یان نەخۆشییەکی سەختی دڵ و دەمارەکانی خوێن، یان بە هۆی ئێش و ئازارێکی لەکێشبەدەر و خوێنبەربوونێکی زۆر، ڕوودەدا، ئەمەش واتە: کە ئاگایی و هەستکردن لە سای پرۆسێسگەلێکی ماددیی نێو لەش و نێو دەماغ و نێو ڕەگ و دەمارەکانەوە، هەستی پێ دەکرێ و هەیە. نموونەیەکی دیکە: زۆر جاران ئەتۆ لە کارکردندا تەواو شەکەت و ماندوو دەبی و هەست بە ناڕەحەتی دەکەی و مێشك بە تەواوەتی ساف نییە، بەڵام کاتێ بۆ پشوویێ وچان دەگری و دەحەسێیەوە، یان وەرزشێ دەکەی، یان ئاوێکی بە خۆتدا دەکەی، هەست دەکەی بە خۆتدا هاتوویەوە و وزە و توانستێکت وەبەر هاتۆتەوە و مێشکت ساف بووە. ئیدی بەمە، جارێکی دیکە بەو قەناعەتە دەگەین کە ئاگایی بە بێ هەبوونی ماددە، وجوودی نییە و هەرگیز نابێ.

بەڵام ئایا، هەموو ماددەیێ بیردەکاتەوە؟ نەخێر. بە نموونە: بەرد، بیرناکاتەوە، هەر خۆڕسکێکی دیکەی بێ گیان، بە گشت، بیرناکاتەوە، هەروەها زۆر لە ئۆرگانیك (عضويات) ەکان بیرناکەنەوە. چاکە، ئەدی کەنگێ ئەم ئاگایی و بیرکردنەوەیە پەیدابووە؟

زانست پێی سەلماندووین کە خۆرسکی زیندوو لە خۆرسکێکی بێ گیان سازبووە. بە ڕاستی ئەمە چتێکی یەکجار گرینگە. هەر بەم بۆنەیەوە، شاعیری فەیلەسووفی عەرەب، ئەبو عەلای مەعەڕریش فەرموویە: والذي حارت البريّة فيه حيَوانٌ مستحدث من جمادِ

پێشتر باسی ماددە و شێوەکانیمان کرد، ئێستاش باسی یاسایەکانی جووڵەی ماددە دەکەین. ئەم یاسایانە، مەقوولاتەکانی دیالێکتیکیشیان پێ دەگوترێ و دەگەڵ یەکدیدا هاوسەروکارن و یەکتر تەولودەکەن. بۆ ناساندنی یاسا، ئەم ڕووداوە بە نموونە دێنینەوە: ئەگەر بەردێ بۆ ئاسمان هەڵدەین، یەکسەر لە ئاسمان بەردەبێتەوە سەر زەوین؛ چونکە کێشمانی زەوین ڕایدەکێشێ. کەواتە: یاسای کێشمان هەیە. ئەم کێشمانەش وە نەبێ جارێ ڕوویدا و جارێ ڕوونەدا، نەخێر، هەمیشە ڕوودەدا و دیاردەیەکی ناچاری و لە لە ڕوونەدان بەدەرە. ئەوجا، کە دیاردەی وا دەبینین، دەڵێین: دیاردەکان دەگەڵ یەکدیدا هاوپێوندن، هاوسەروکارن. ئەم هاوپێوەندییەی نێوان دیاردەکان بە هاوپێوەندیی یاسایی، جەوهەری دەزانین، واتە: پێوەندییێ نین کە لە ئەنجامی هەلومەرجی لەناکاو و دەرەکی و سەرپێیانە بێتەگۆڕێ، نەخێر، دیاردەکان هەر بۆخۆیان سروشتیان بەو جۆرەیە. لە یاسادا هەموو پێوەندییەکان ڕەنگ نادەنەوە، ئەوەی کە ڕەنگ دەداتەوە تەنها پێوەندییە هەرە سەرەکییە دایکانە و باوکانەکانە.

یاسا لە سەر یەك بار دەڕوا، بیژی و ئەکولۆك (شاذ)ی نییە. هەموو دیاردەیەکی بەردەکەوێ. یاسای ئەرخمیدس، بە نموونە: باسی چتێکی هەموانی دەکا، باسی چتێکی هاوبەشی سەرلەبەری ئەو تەنانەی کە دە هەر ماددەیەکی شل باوێترێ، دەکا. باسی پێوەندی لە (نێوان تەن و هێزی پاڵی هەر شلێ بە تەن)ەوە دەکا کە شەقڵومۆرەی گشتگری بەبەرەوەیە. لە یاسادا تەنها پێوەندیی گشت ڕنگ ناداتەوە، بگرە پێوەندیی ناچارییش ڕەنگ دەداتەوە، واتە: یاسا گشتییش و ناچارەکییشە. ئەتۆ کە ئاو لەسەر ئاوری دانێی، پاش قەدەرێ ئاوەکە بەکوڵ دێ، ئەمە بۆ هەموو ئاوێ ولیە، هەموو ئاورێ ئاو گەرم دەکا، هەموو ئاوێ بە ئاگر دەکوڵێ. ئەتۆ لەم واژەی

(هەموو، هەموو، هەموو)انە وردبەوە، کە ئەگەر یاسا بە "مام هەموو" نێونێین، زۆر ڕاستە.

یاسا، بە مانایەکی دیکەش لە ژیاندا بەکاردێ، ئەویش یاسا بەو مانایە کە ئەم دەوڵەت یان ئەو دەوڵەت دەستوورێکی نوێ دادەنێ. بەم دەستووره یاسای "بنەما" دەگوترێ ئەمە بۆ ژیانی وڵات، یاسایەکی مافەکییە، دەسەلاتی قەزاییی هەیە، بەلام ئێمە کە باسی چەمکی فەلسەفییانەی یاسا دەکەین، مەبەستمان ئەو یاسایەی کە خەڵك بۆ خۆیان دای دەنێن، نییە، بەڵکو ئەو یاسایەنەمان مەبەستە کە لە خۆڕسك و کۆمەڵدا، سەربەخۆ هەن. کەواتە: گرنگترین نیشانەی یاسا ئەوەیە کە سەربەخۆ لە دەرێی زەین و خواێشتی مرۆڤدا هەیە، واتە: ئۆبجەکتیڤە، بابەتییە. ئەم یاسایانەی خۆڕسك پێش ئەوەی کە مرۆڤایەتی لەسەر گۆی زەوین پەیدابێ، هەبوون و کاریان دەکرد و ئەمێستاکەش هەر دەیکەن. وەك گوتمان تیرەی مرۆڤ زۆر دوور نییە لەسەر زەوین پەیدابووە. جا، مانای ئۆبجەکتیڤیەتیی یاسای خۆڕسك و کۆمەلایەتی لەوەدایە کە خەڵك ناتوانن دروستیان بکەن، یان بە خواێشتی خۆیان بەتاڵی بکەنەوە. بەلام سەبارەت بەوە کە یاساێکانی خۆڕسك و کۆمەڵ بە دەست من و تۆ نین، ئەوە ناگەیەنێ کە خەڵك ناتوانن لێیان تێ بگەن و بۆ بەرژەوەندی خۆیانیان بەکاربێنن. دیرۆکی زانست و تەکنیك تێکڕا، بۆ سوود لە دۆزینەوەی یاسایەکان وەرگرتن لە بواری چالاکییە کردەنییەکاندا، کێڵەڕێ و قەڵەوزێکی ئاشکرایە. هەروەها نابێ ئەوەش لەبیربکەین کە مادییەتی دیالێکتیکی ددان بە دەوری ئاگاییی مرۆڤ لە ژیاندا دەنێ. هەر تەنها خەون و خەیاڵی ساغڵەم بۆخۆیان بەلگەی ئەوەیە کە مرۆڤ بە گەشبینییەوە لە دواڕۆژ دەڕوانێ، وەك بڵێی لەم حاڵەتەدا دەیهەوێ پێش ڕووداو، واقیع بکەوێ و چالاکانە کاریان تێبکا. وە نموونە: خەیاڵی بوێرانەی نوسیاری نامێ، گۆڵ مەرن، پێش کەشفە زانستانە زۆروزەوەندەکان کەوتووە.

باشە ئەم *یاسایە هەموانییانە* چین؟

یاسای گۆڕانکارییە چەندیەتییەکان بۆ گۆڕانکارییە چۆنیەتییەکان دەگۆڕێ. ئەتۆ ئەگەر بتهەوێ مووشەکێ ساز بکەی، پێویستیت بە چتهایێ دەبێ کە لە خۆرسکدا نین. چاکە ئەدی لە کوێیان پەیدا دەکەی؟ دارشتەی لە پۆلا ڕوختەتر و قاییمتر و لە شووشە ساف و لێکولوورستر لە کوێ دێنی؟ زانستی کیمیا کلیلی ئەم کارەمان بە دەستەوە دەدا.

زلنایان فێرە ئەوە بووگن کە چۆن پۆلیمەرەکان: ماددەگەلێ کە ڕیزۆکەکانی لە میلیۆنەهای ڕیزە (ئەتۆم) پێك دێن، سازیکەن، واتە: دەتوانن دەست لە (چەندیەتی)ی پێکهاتەی ڕیزۆکەکان بدەن (زۆریان کەن، کەمیان کەن) و بەمە چۆنیەتیی تازەبابەت، خەسیەت و نیشانەگەل نرتونوێیان هێنایەگۆڕێ. زۆر بەجێیە، ئەدی مانای چەندیەتی و چۆنیەتی چییە؟

ئەتۆ لە هەر چتێکی دەتوڕی، دەبینی نیشانە و شەقڵ و مۆرکی خۆی هەیە و ئەمە لە چتەکانی دیکەی غەیری خۆی جوێ دەکاتەوە. ئەتۆ بۆ دەڵێی: قەڵەم؟ چونکە دارێکی باریکیان لە گوێن تەرکەی ڕاست لەمسەر تا ئەوسەر بە بارستی سووژنێکی کونکردووە و پڕیان لە قوڕقوشمی ڕەش کردووە، دەتوانم بۆ نووسین و هێلکێشانی بەکاریبەرم. ئەوجا، ئەمن بەم قسانە خەسیەتە سەرەکییەکانی چتێکم دەسنیشان کرد، چییەتییە (پێناسە) نێوەخۆییەکەی، شکڵ و شەمایلێکی کە بەو جۆرەی لە چتی دیکە جوێ کردۆتەوە، دەستنیشان کرد.

کەواتە: چۆنیەتی بە چییەتییەکی نێوخۆیی (تەنها هەر لە خۆیدا هەیە)، تێکڕای ئەو شەقڵ و مۆرە جەوهەرییانەیەتی کە بە هۆی ئەوەوە تا ڕادەیێ لەسەر بارێ دەمێنێ و لە چتەکانی دیکە، جوێ دەکرێتەوە. منداڵێ لە شووشەیەکدا شیری لە دووکانێکی کڕی، بە ڕێکەوت لە دەستی بە سەر شۆسەیدا کەتەخار، شووشەکە هیچی لێ نەهات، بەڵکو وەك تۆپە لاستیکێ دەستی بە هەڵبەز و دابەز کرد. زۆرمان پێ سەیربوو. کە لە سای خەسیەتگەلێکی تازەوە چتێکی تازەمان دیتەوە، چۆنیەتییەکی نوێمان دیتەوە و هەمیشە هەر واش دەکەین. ئەگەر لە مەرتاڵ (معدن)ێ وەکۆڵین، خەسیەتەکانی

دەستنیشان کەین، ڕەنگی چۆنە، ژەنگ هەڵ دێنێ (دەئۆکسیدێ)، هەڵ ناهێنێ، کێشی ئەتۆمیی چەندە، نەرمە، ڕەقــە و هتـد. ئێمـە لەمــە وەدەکۆڵـین، لـە چییەتییـە نێوخۆییەکەی چت، لە چۆنیەتییەکەی دەگەین.

ئیدی بەم جۆرە بەو بیر و قەناعەتە دەگەین کە خەسیەت نیشـانەی ئـەوتۆی چتێکە، سیفەتێکە، چتەکـە لـە چتێکی دیکە جویێ دەکاتـەوە، واتـە: خەسـیەتەکانی. ئـەوجا خەسـیەتە نێوخۆییەکانی چتـان بریتـین، لـە چۆنیەتییەکـەیان. کەواتـە: چۆنیـەتی بـە خەسیەتەکان بەدیاردەکەون.

چت، تەنها یەك خەسیەتی نییە، زۆری هەن. لەبەرەمەندێ، نابێ خەسیەت و چۆنیەتی دەگـەڵ یـەکدی تێکـەڵ بکـەین. چۆنیـەتی یەکانـەی (وحـدە) نێوخۆییـی هــەموو خەسیەتەکانە، تێکڕا و سەرجەمیەتی. کەواتە: چۆنیەتیی چت، بـە تەنها خەسیەتێکی لاتـەریك و چەپــەك دەرنـابڕدرێ، بـەڵکو بـە سـەرلەبەری خەسـیەتەکان، سـەرجەم دەردەبڕدرێ. وێدەچێ، مەرتاڵێ ڕەنگی ببوێرێ، واتە: یەکێ لە خەسیەتەکانی بگۆڕێ، بەلام هەر بە مەرتاڵی دەمێنێتـەوە، وەلێ لـەناوچوونی هـەموو خەسیەتەکان، یـا هـەرە گرینگەکانی، واتە: لە ناوچوونی چۆنیەتی.

چتیـش، وەنــەبێ هــەر لــە ڕووی چۆنیەتییــەوە وەســف بکـرێ، بـەڵکو لـە ڕووی چەندیەتییەوەش وەسف دەکرێ. ئێمە کە لە چتێکی پرسیار دەکـەین، تەنها نـاڵێین: ئەمـە چییـە، یـان ئەمـە چۆنـە؟ بـەڵکو دەشپرسـین: چــەندە، چــەند باتمانــە، چــەند مەترەیە،، چەند ئەستوورە، چەند گەورەیە و هتد

وەسفی چەندیـەتیی چتـان، یـەك نییـە و دوو نییـە، زۆر جۆرە. دەتوانین بڵێـین: بـە ژمارە، فلانە کەس ٥٠٠ سەر مەڕی هەیە، ٥٠ گامێشـی هەیـە. ئەگـەر بمانهـەوێ داهـاتی گەنمی ئەمساڵمان دەگەڵ هـی پارەکـەماندا بەراوردبکـەین، بـە ڕێـژەی سـەتی دەڵێـین: داهاتی گــەنمی ئەمســاڵمان لـەچاو هـی پارەکـە ٥٠٪، یـان ئـەوەندە تـەغارە. کەواسـا: چەندیەتی ناساندن (تعریف)ی "چییەتی"ی چت و دیاردەکـان، بـە ژمـارە و میقـدار و ڕێفازۆ (وتیرە) و پلە و بارست (قەوارە) و هتد ٠.

کاتێ چۆنیەتیی چت دەگۆڕێ، چتەکە دە خودی خۆیدا دەگۆڕێ. بەڵان، داخوا ئەگەر چەندیەتیی چتەکە، ژمارەکەی، میقدارەکەی، بارستەکەی، گۆڕا، چتەکە بۆ خۆشی دەگۆڕێ؟ دەیجا با بزانین ئەوە کووە؟

هەموو دەزانین بەنداوەکان چۆن سازدەکرێن. بە هەزاران گابەردان دەتێو ڕووبارێکی گەورە دلوێن.. ئەوەتا، وا یەکەم گابەردیان تێ هاویشت، بەلام هێشتا بەندلو سازنەبووە، ئاو نەپەنگاوەتەوە. نەخێر، بە گابەردی دووەم و سێیەمیش کارەکە پێك نایە. بەلام وردە ـ وردە هەروا گابەردی دیکەی تێ داوێترێ و هێدی ـ هێدی کار لە ئاوەڕۆی ڕووبارەکە دەکا، بەری تەسك دەکاتەوە، نەخێر وا بە جارێ ئاوڕۆیەکەی گرت. بەم کارە بەندلو سازیوو. چی ڕووی دا؟ تاوەکو گۆڕانکاریی چەندیەتییەکە کەم بوو، گابەردەکان کەم بوون، چۆنیەتییەکی تازە نەدەهاتە گۆڕێ، بەندلو سازنەدەبوو، بەلام هەرکە گۆڕانکارییەکە، گابەرد بە ئەندازەیەکی پێویست گەیشت، واتە: بە عەیارەی خۆی گەیشت، ئەمە کاری لە چۆنیەتیی چتەکە کرد. ئاوەڕۆ لە حاڵەتێکەوە کە ڕووباریوو، بە حاڵەتێکی دیکە گۆڕا کە بەنداوە.

باشە، ئەدی *عەیارە* چییە؟

ئەتۆ هەروا چاوێ بەم دنیا پان و بەرینەدا بگێڕە، دەبینی هەر چتە میقدارێکی خۆی هەیە: ئەمەیان هەزار تەنە، ئەوی دییان دە هەزار، ئەوە گابەردێکە بە چار ترێلەش هەڵ ناگیرێ، ئەوە یەکی دییە بە دە سلینگان نابزوێ، بەلام وێڕای وەش، گابەردەکان بارستی تایەن (معین)ی خۆیان هەن. ئێوە قەتتان چاو بە گابەردێکی بە بڵێندایی چیای کوڕەك نەکەوتووە. ئەوەی گرتمان ئەوەمان پێ دەسەلمێنێ کە هەموو چتێ لەو دنیایەدا عەیارەی خۆی هەیە، چۆنیەتی، چەندیەتییەکەی بەرابەری هەر وا لە خۆڕا و بە گۆترە نییە، بەلکو چەندیەتییەکی بەم ئەندازە، یان بەو ئەندازەیە هەیە. هێندێ خەڵك، بەژنیان بڵێندە، هێندێ مامناوەندی، هێندێکان کورتەبنەن، سەنگ و کێشیشیان هەر بە هەمان ئەندازە جودلوازن، بەلام سەرەڕای وەش خەڵك هەریەك بۆ خۆی درێژاییەکی تایەنی هەیە. ئێوە کەسێکتان بە بڵێندی (درێژی)ی منارەی چۆل و بە کێشی تەنێ

نەدیتووە. ئەو چەندیەتییە (یەك تـەن) دەگەڵ چۆنیـەتیی گۆڕیـن (ئـەو کەسـە)دا ڕێـك ناکەوێ. ئیدی ئەوە دە هـەموو چتێکدا هـەر بـەو سـەنگ و تەرازووەیـە. هـەموو چتـێ خێری چۆنیەتییـەکی حسێوکریاگی خۆیەسـی، هـەموو چەندیەتییـەکی بـۆ ناشـێ، هەرچەندێکی ئەتۆ لە گۆترەی بۆ دانێی، ڕێك ناکەوێ.

لەم قسانە ئەوەمان بۆ بە دیارکەوت کە عەیارە (پێوانە) واتە: هاوجووتی (هاوکێشی، هاوسەنگی)، یەکیەتیی هەردووسەر (لایەن)ی چەندیـەتی و چۆنیـەتی دە چتـاندا. هـەر چتێکـی تـۆ دەیگـری، هەمیشـە و بـەردەوام بریتییـە لـە چۆنیەتییـەك دەبەرابـەر چەندیەتییەك.

ئەوە لەمە هەڵ دێنجین کە هەر گۆڕانکارییەکی چەندیـەتی، دە چتـاندا ڕوویـدا، هیـچ کارێ لە چۆنیەتیی چتەکان ناکا تا لە چارچێوەی عەیارەدا (نە لە عەیارەی خۆی زیاتر و نە لـە عـەیارەی خـۆی کـەمتر) ڕوویـدا. لـەم حاڵەتـەدا چتـەکان وەك بڵێـی گ وێ بـە گۆڕانکارییە چەندیەتییەکان نادەن و فەرقیان پێناکەن. بەڵام هەرکە تخووبی عـەیارە بـەزێندرا، هـەنگێ گۆڕانکارییـەکان وردە ـ وردە دە حاڵـەتی چۆنیـەتیی چتـدا ڕەنـگ دەدەنەوە: چەندیەتی دەبێ بە چۆنیەتی، وەك ئاو لە باری شلییدا بـە هـەڵم دەگـۆڕێ، بە سەهۆڵ و بەستەڵەك دەگۆڕێ، کۆمەڵی کشتوکاڵی بە کۆمەڵی پیشەسازی دەگۆڕێ و هتد .

دیارە ئەمەش بە یاسای یەکیەتی و ململانێی هاودژان پێك دێ. باشـە، هـاودژ، مانـای چییـە؟ هـەرچی تـۆ لـەو دنیایـەدا بـەر هەسـتت دەکـەون، دەنێـو خۆیـاندا دەشـەڕ و هەڵاویگردان. واتـە: دیاردەگـەڵێ کـە یـەکدی بـەتاڵ دەکەنـەوە. چاکـە و خراپـە دژ بـە یەکدین. بەڵام ئەگەر مات و هەریەکە بۆ خۆی لە قولینچکێکدا خـۆی مـات دا و دەخڵـی بەسەر ئـەوی دییـەوە نـەبوو و هیـچ پێوەندییـەك دە جغزیکیـدای کۆنەکردنـەوە، ئـەوە هـەنگێ هیـچ لێـك هەڵـەنگوتن و دژمنایەتییـەکیان دە نێوانـدا نییـە، واتـە: هیـچ دووفاقییەکیان دە نێواندا نییە. بەڵام ئایا ئـەو تـەبایی و دۆستـایەتییە تـا سـەر دەڕوا؟ نەخێر، چونکە هیچ چتێ بـە بـێ پێوەنـدی دەگـەڵ چتێکـی دیکـەدا ناحاوێتـەوە. هیـچ

چتێکیش بە یەك عەیارەی چۆنیەتی و چەندیەتی نەهاتووە و نایەتە گۆڕێ. کەواتە: لێك هەڵەنگوتن و ململانێ دەگەڵ یەکدیدا چ لە خۆڕسکدا و چ لە نێوان ماددەی زیندووی بە ئاوەز (مرۆڤ)دا کارێکی لە ڕوونەدان بەدەرە. ئەم شەڕ و هەڵلایەی نێوان بوونەوەرەکان سەرچاوەی گۆڕانکاری و گەشەکردن و پێشڤەچوونە. دیارە هاودژەکان هەمیشە لە حاڵەتی لێکجودابوونەوە و یەکدی قڕکردندا نازین، بەڵکو بەشەڕدێن و ئاشت دەبنەوە و ئاشت دەبنەوە و بە شەڕدێنەوە و هتد هەر ئابڕێتەوە.

خوێندەی بەڕێز، بەندە کە بەم چەند لاپەڕە کورت و ڕەنگە تا ڕادەیەکیش بێ سەروبەرە لەمەڕ فەلسەفەی ماددی، سەرم ئێشاندن، مەبەستم ئەوە نییە کە خۆم بە مامۆستای کەس بزانم و پڕوپاگاندە بۆ بیروباوەڕی هیچ لایەنێ بکەم، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە بڵێم ئەم فەلسەفەی ماددییەتەی ڕووس دە جەوهەردا و لە پێش هەموو چتێکدا بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆی و هەر نەتەوەیەکی دیکەش هەر بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆی، بەکاریان برد و ئەوەندی پێیان کرا لە خۆیان بەولاوە کەسی دیکەیان نەخوێندەوە. کوردیش، هەروەك لە پێشتریچ بوون بە زەردەشتی و سوورمان و چی و چیی دیکە، هەروەها بوون بە ماتریالیست و ئێستاش زۆری وا هەن، ماتریالیستانە: چ وەك بیرکردنەوەی فەلسەفییانە و چ وەك بیرکردنەوەی سیاسییانە و چ وەك بیرکرنەوەی فەرهەنگی و هونەری و هتد یانە، بیردەکەنەوە. بەڵام چەند جێی خۆشحاڵییە ئەگەر کورد ئەوڕۆ نەك هەر دە فەلسەفەی ماتریالیستانە، بگرە دە فەلسەفەی میتافیزیکانەش و سەرلەبەری فەلسەفەکانی دیکەشدا، دە پلانی یەکەمدا بیر لە فەلسەفەی چارەی خۆنووسین و کوردایەتی و هەبوونی نەتەوەیی خۆی بکاتەوە؛ چونکە تەواوی نەتەوەکانی دیکەش هەر وایان کردووە و واش دەکەن کورد بە ئیسلامبوونی، خێروبێری بۆ نەتەوەکەی خۆی نەبوو؛ بە فریودران و بەشوودرانی لە لایەن بیانییانەوە، هیچی وەگیرنەکەوت، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، لە پێشدا بە گوێی بەرژەوەندی خۆی بکا و بە فەلسەفەی دژ بە بەرژەوەندی خۆی گومڕا نەبێ.

ئەگەر بیروبڕوای کەسانی وەك: کارل کورش (١٨٨٦ ـ ١٩٦١) و ئەنتۆنیۆ گرامشی (١٨٩١ ـ ١٩٣٧) و گێـورگ لۆکـاچ (١٨٨٥ ـ ١٩٧١) و ئەرنێسـت بلـووخ و مـاکس هورکهایمـەر (١٨٩٥ ـ ١٩٧٠) و تیـۆدۆر ئـادورنو ١٩٠٢ ـ ١٩٦٩) و والـتر بنیـامین و هێربێرت مارکووزە (١٨٩٨ ـ ١٩٨٩) و بزاوتی چەپی نوێ و یورگن هابرماس و سارتەر و مۆریس مەرلۆپۆنتی (١٩٠٨ ـ ١٩٦٠) و لووی ئەلتۆسـەر و نیکۆلاس پۆلانتزاس (١٩٣٦ ـ ١٩٧٩) و جیمز ئۆکانر و ئەریك ئۆلین رایت و ئەندرێ گوندەر فرانـك و ئامـانۆئێل والرستین و فێرناندۆ کاردووزوو و ئەنزوو فالتۆ و هتد.. سەرلەبەر بخوێنینەوە، سەتان سەرە دلوی وامات وەگێردەکەون کە هەموو، ڕێگا بۆ ئەوە خۆش دەکەن کە کورد بـە تەڵـەی ئـایدیۆلۆژیی وشـك و برینـگ و بـێ سـوودەوە نـەبن و دەسـخەڕۆی لـەم وشکەسۆفیەتییە ڕزگاربوون و بە تەپکەی ئەو وشکەسۆفیەتییەوە نـەبن. ئازادانـە بیرکردنەوە، لە ڕوانگەی بەرژەوەند و قازانجی خۆوە بیرکردنـەوە، ئەمازا بـۆ نەتـەوەی کوردی سەتان ساڵە ژێرچەپۆکەی تورك و عەرەب و عەجەم، زیـانی کەسـی تێدا نییە. کوردی بێ دەسەڵات کەی ئەوەی لە باردا هەیە دژمنایەتیی خەڵکی دیکە بکا، کوردی ئازادی لێداگیرکراو چۆن دەتوانێ زیان بە ئازادیی خەڵکی دیکە بگەیەنێ؟! بڕایەتیی نەتەوەکان بە مافی بەرابەر بە هەر کەسە دەماڵە خۆ و برامان برایی و کیسەمان جیایی سەردەگرێ.

ئەوەی لەم چـەند ڕووپەڕەیـەدا لەمـەڕ بـیروبڕوای فەلسـەفەی مارکسـییەتم عەرزی خزمەت کردن، مارکسییەتی ئەرتەدۆکسی (حەنبەلییانە)ی ڕووسییە. ئاشکرایە کە بیروبڕوای مارکسییانە جارێ زۆر یان کەم بە لای چەپ و جـارێ زۆر یان کـەم بـە لای ڕاستدا: ئۆپۆرتۆنیستی (بێبـاری)، بـەرەڵڵایی گـەری، ئاژاوەگـەری، سازشـتکەری، زەمانەسـازی، ئێکسیستانسیالیسـتی (وجوودییـەت) مارکسیسـتی، ئێکسیستانسیالیسـتی ـ سـۆفییانە، ئێکسیستانسیالیستیی ئاتەئیستی (ئیلحادی)، تەوفیقییەت، ئینتیقائییـەت،

فۆرمالیستی و ئایدیالیست و هتد  سەرلەبەر ڕێگای بۆ سەرلەنوێ مارکس و مارکسییەت خوێندنەوە خۆش و هەموارکرد و دەرکەی چاوپێداگێڕانەوەی وەسەر گازی پشت ئێخست و ئەویش وەك هەر ئایینێ چەندین تۆل و مەزەب و تەریقەتی لێ کەوتنەوە.

باشە ئەمڕۆ چارەنووسی فەلسەفە لە چارچێوەی فەرهەنگی ئیسلامیدا بە چی گەیشتووە؟ فەلسەفە هەرچەند لە سەرەتاوە تایبەتمەندییەکی نوێباوانەی پیشان دەدا، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە هەموو سەروبەندێکدا ناچاربووە تۆگما ئایینییەکان لە بەر چاو بگرێ و نەتوانێ خۆیان لێیان نەبان بکا، هەر لە پاش سەتەی هەشتەمەوە بۆ خۆی وەسرا و تلّپی تەپی تێدا نەما. فەلسەفە لەپاش ئەمە، هەروەك عیسەرییەتی سەتەی ناوین هەروەك ئێستا دە خزمەت ئایینناسی (لاهووت)یشدا ئیدی ناتوانێ ئیسپاتی هەبوونی خۆی بکا. زانستی "کەلام" بە شێوەیەکی لەتەڕێنخۆر و لەوشکێن خەوخۆش و تەنها هەر بخۆر، جێگای فەلسەفە دەگرێتەوە. بە دەم ڕۆژگارەوە کەلامیش دینامیکییەتی خۆی لە دەست دەدا و قاڵبە بیری لەبەرکراوی هەمیشە و بەردەوام نوێژەن و دەمەزەرد و سەرنیا و جووتبەقێکراوەکان، دەمەیێن، کەلامێ کە لە فێرگە برش و کەپووهەڵێناوەکانی عوسمانیدا دەخوێندران و بە ئەرێبابە لەبەردەکران و لە تۆولۆی دوو کتێبان ئاخندرابوو، سەتان ساڵ فەلسەفە لەبیردەباتەوە، بە جۆرێکی دیکەی بڵێم فەلسەفەی ڕاستەقینە وەك ئەندێشەیەکی مەنتیقی، سەربەخۆ و ئازاد و ڕەخنەگر لە وشیاریی مرۆڤ وشیارییەدەردەکرێ و هەبوونی بە مانای واچەیەکی بۆش و بەتاڵ، یان لە مانای خۆلەبابیرلو و تەنها بە مانای زانایی و ئاکار و ئەخلاق درێژەی پێ دەدرێ. لێرەدا ئەوەی سرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە کە فەلسەفە لە بواری ئایینەوەی بۆ بواری ئەوەی لە دژی ئایینە تووڕهەڵدانی، بە چتێکی گومراکەر و چەواشەکەری سامناکزانییە، هەروەك نابیی شاعیری ترکزمان دەڵێ:

حکمت و فلسفەدن ایلە حذر    اولیا زمرەسنە ایلە نظر

واتە: لە دانایی و فەلسەفە بسڵەمێوە، لە دەستەی وەلییان بنۆڕە.

ئەگەر بیر لە کاریگەرییەکانی فەرهەنگێکی تەمەن شەشسەت ساڵ لە خۆیەتی (ذاتیت)ی مرۆڤ بکەینەوە کە چۆن باروتۆخەکە بە پینەوپەڕۆی شکڵیانەی کۆمەلایەتی ـ سیاسی بە ئاسانی ناگۆڕێ؛ دەتوانین بەو ئەنجامە بگەیەین کە فەلسەفەیش بەم جۆرە چەکوپینە (ڕیفۆرم)ە چاویەستانە هەروا بە سانایی بە گۆڕینی ڕووتی باروتۆخێکی لەباوچوو و برشوکەڕووەهەڵێن ڕزگاری نابێ. بەڵکو ئەمە بەوەهێ ڕزگاری دەبێ کە تۆ لە ناوجەرگەی ژیانی کردەکیی ڕۆژانەدا هەڵی سەنگێنی و بزانی تا چ ئەندازەیێ وەڵامدەرەوەی پرسیارەکانی ژیانیی مرۆڤە؟ فەلسەفە بەوە دەبێ بە فەلسەفە کە تۆ بزانی ئایدیلۆژیی ڕەسمیی پینەوپەڕۆچی (ڕیفۆرمچی) چۆن ـ چۆنی لە فەلسەفە دەگا، بەوە دەبێ بە فەلسەفە کە کە تۆ بزانی لە پراکتیك و زمانی ڕۆژانەدا بە چ مانایەکی دێ؟ و شوێنی وی بە تەواوەتی دەستنیشان کەی و قاییم و بنچەسپ کەی.

لە تەواوی وڵاتانی ئیسلامیدا ئەم پینەوپەڕۆ چاویەستانەی کە هیچ کارێکی لە ئابووری نەکردووە و هەمیشە بە بڕوبیانووی بڤە و نازانم چییە مەلەرزە و چییە مەترسەی بە ڕۆژاوییبوونەوە فەلسەفە، پاش وەی کە ئایدیۆلۆژیی ئایینی هەر لە کۆنەوە ڕەگەزنامەی لێ ساندۆتەوە و شاربەدەری کردووە، هەمیشە وەك لەباو (ستاتووکۆ) پێناوێکی بیرەکی لەبۆ تۆکەرایەتیی خۆی، بەکارهێناوە و تەقاندۆتەوە و ڕەقاندۆتەوە. بەڵێ لە زوربەی زانستگایەکانی ئەم وڵاتانەدا بەشی فەلسەفە زۆر بە ئابوتابەوە دەخوێندرێ بەلام بە سانسۆرێکی ئایدیلۆژیای کلکوگوێکەر و لە سای مامۆستای ڕەوشت پۆلیسانە و بانبانك و تەلیسمی سەرخەزێنەی بیروبڕوای پووچەڵی کۆنەپەرستانە، بڕێ لەمە و چەردەیێ لەوە و بە پچڕپچڕی و لێکدووفاق و قاچەڵقیچانە، وەك قوزەڵقورت و تالاو لە بەرنامەی فێرکردندا دەرخواردی خوێندکاری داماو دەدرێ و چەند فەریکە خوێندەوارێکی پارادایمی هەرزەکار، منداڵانی کوردیان لە زانستگایەکاندا چەواشە کردووە و تەنها هەر باسی تەجرەبەی ئاشقێتی و هەرزەکارانەی خۆیان لە جیاتیی دەرزی فەلسەفە بۆ کاوێژدەکەنەوە و بەس ، کەچی فەلسەفە ڕاستەقینەکە وەك چەکی بایەلۆجی و تیرۆر، یان بە نێوی " بیروبڕوای وڵات ڕووخێن"ەوە ڕاوە دوو دەنرێ. کورت و کرمانجی

فەلسەفە وەك چالاكییەكی عەقڵی و رەخنەگرانە ملۆزمایەتیكی بەرامبەر بە ئایین زەق و زۆپ كشی لێكراوە و تاراندراوە لەبەر لووتی ئایدلۆژیای رەسمیدا قنج و قیت قوت كراوەتەوە و یا ساغ كرلوە. شەل نیە پای شكاوە نموونەی زەقی ئەوەش ئەوەیە كە ساڵەهای ساڵە فەلسەفەی دیالیكتیكیی هیگڵ و ماركسیزم كە ئەویش لەو سەرچاوەیە ئاو دەخواتەوە، بە هەزار بروبیانووی بێتام لە زانستگاكاندا یاساغ كرلوە و بە قاچاغ دەزاندرێ. ئەمڕۆ لە تەولوی زانستگایەكانی ولاتانی بە ناو ئایین موسڵماندا نەك هەر فەلسەفە، بەلای منەوە خوێندنی ئایینیش: چ شەریعەت چ كەلام بۆ خودی شەریعەت و كەلام ناخوێندرێن، بەڵكو تەنها بۆ مامۆستای رەوشت پۆلیسانە ئامادەكردن دەخوێندرێن . ئەمن مامۆستایەكم دەناسی بە بیروباوەڕ، فرە پابەندی موسڵمانەتی بوو و نەك دەرزی ئایین، یان فەلسەفەی دەگوتەوە، بگرە دەرزی بیۆلۆژیای دەگوتەوە. كاتێ شەرحی ئەو چتانەی كە دژ بە بیروبروای لاهوتن دەكرد و دەگەڵ بیروبروای ئایینی خۆیدا دووفاق و لاترقەوچ دەوەستان، بە دەنگی بەرز دەیفەرموو: " خودایە، لێم نەگری ئەمن تەنها لە بۆ مووچەكەم ئەو دەرسی فەرمەسۆنیە دەڵێمەوە، دەنا بۆ خۆم هیچ بروایەكم بەو قسانە نیە "

خوێندەی بەرێز، پاش ئەم هەموو قسانە، دەكرێ بەش بە حاڵی كەڵك وەرگرتن لە كاریگەریی كارڵ ماركس لە تێگەیشتنی مۆدێرن لە مەسەلەی سیاسی و ناسینی چەمكە ئەسڵییەكان و رەوشتی كاری وی دە قەڵەمرەوی رامانە(تێئۆری)ی كۆمەڵایەتی و سیاسیدا ئەم پرسیارانە بكەین:

١) ئایا رامانە كۆمەڵایەتییەكانی ماركس دە سنووری رامانەكانی ئەفلاتوون و ئەرەستوو و جۆن لۆك و رۆسۆ و هیگڵدا جێی ئیعتیبار و بایەخن؟

٢) هەروەك ماركس بۆ خۆی پێی وابوو، ئایا زانستمەند و كارەكەی زانستانە بوو؟

٣) ئایا رەها و ئازادانە و لە میتافیزیك بەدوور بیری دەكردەوە؟

٤) نوێهێنییەكانی دە چارچێوەی رەوشتناسیدا قەتیس دەمان؟

٥) نوارینە چینایەتییەکانی و ڕێدۆزییە ماتریالیستییەکەی لە مێژوو، کۆن بووگن و بێ کەڵك ماونەوە؟

٦) هەڵە ڕامانەیی (تیئۆری)ەکانی تا چ ئەندازەیێ بنەمایی و گرینگ بوون کە بتوانین باس لە مەرگی ئەندێشەییی وی بکەین؟

٧) ئایا ئەندێشە ڕەخنەییەکانی پاش ڕووخانی کۆمۆنیزم مردن؟

٨) ئایا دەتواندرێ ڕەها و ئازادانە لە تەئویلکارییەکانی مارکسییەت بیر لە "مارکس پاش مارکسییەت" بکرێتەوە؟

٩) ئایا تەنها دەگەڵ یەك مارکسدا ڕووبەڕووین و ئەندێشەکانی ئەو تەنها خاوەنی یەك تەوەرەی مانایی بێ کێشە بوو؟

١٠) ئایا بنەماشکێنی دەقەکانی وی کارێکی کردەنییە؟

١١) ئایا دەتواندرێ ڕەها و ئازادانە لە دەرکی ڕەخنەییانەی وی بە ناوی "ڕامانە پەرداختی قەیران" بیر لە مۆدێرنیتە بکرێتەوە؟

١٢) ئایا لە سیاسەتی مۆدێرندا فەزایەك هەیە کە بە بێ بایەخدان بە ئەندێشەی وی، بناسرێ؟

١٣) ئایا جێگای "پرسی سیاسی" لە ڕامانەی ڕەخنەییدا بەتاڵە؟

١٤) چەمکی ئازادییەك کە ئەو هێناویەتیە گۆڕێ دلخۆ هێشتا جێی ئیعتیبارە؟

١٥) ئایا لە قەڵەمڕەوی وتاری سیاسیدا دەتواندرێ حیسابی ئەو لە ئنگلس هەڵاوێردرێ؟

١٦) ئایا دەتواندرێ پەردە لە ڕووی بنەچەکەی دەروونمایە سیاسییەکانی نووسینەکانی هەڵ بدرێتەوە و ئاشکرا بکرێ؟

١٧) ئایا ڕامانەکانی وی لەمەڕ دیموکراسیی مۆدێرن و دەوڵەتی دیموکراسی بۆرژوازی ناتەواو نین؟

ئەم پرسیارانە لە کارێکی فەلسەفییانەی دیکەدا، تەمەن و لەشساغی بوار بدا وەڵامیان دەدەمەوە.

*ئەوەش* لە چەند رووپەرەیەکدا، پێشتریش، لەمەڕ بیروبڕوای فەلسەفەی مارکسییەت ئەرزی خزمەت کردن، مارکسییەتی ئەرتەدۆکسی (حەنبەلییانە)ی ڕووسییە. ئاشکرایە کە بیروبڕوای مارکسییانە جاری زۆر یان کەم بە لای چەپ و جاری زۆر یان کەم بە لای ڕاستدا: ئۆپۆرتۆنیستی (بێیاری)، بەرەڵڵایی گەری، ئاژاوەگەری، سازشتگەری، زەمانەسازی، ئێکسیستانسیالیستی (وجوودییەت)ی مارکسیستی، ئێکسیستانسیالیستی ـ سۆفییانە، ئێکسیستانسیالیستیی ئاتەئیستی (ئیلحادی)، تەوفیقییەت، ئینتیقائییەت، فۆرمالیستی و ئایدیالیست و هتد سەرلەبەر ڕێگای بۆ سەرلەنوێ مارکس و مارکسییەت خوێندنەوە خۆش و هەموارکرد و دەرگەی چاوپێداگێڕانەوەی وەسەر گازی پشت ئێخست و ئەویش وەك هەر ئایینێ چەندین ئۆل و مەزەب و تەریقەتی لێ کەوتنەوە.

ئەوەی کە ڕەنگە لە هەموویان بە تایبەتی لە نێو گرۆی ڕۆشنبیران: شاعیر و ئەدیب و هونەرمەنداندا کاریگەر و بە ئاوازە بوویێ، ئێکسیستانسیالیزم (هەبوونایەتی)ە. وجوودییەت واتە: *مرۆڤ پێش ئەوەی کە چی بێ و چی نەبێ، جاری بە هەبوون، هەیە.* ئەم جۆرە فەلسەفەیە کاردانەوەیێ دژ بە هەموو فەلسەفەکانی جەوهەرگەریی(هەموو چتێ بۆ جەوهەرێکی ئەسڵی دەچێتەوە) وەك فەلسەفەی ئەفلاتوون و هیگڵ کە بڕوایان بە هەبوونی جەوهەرەکان و چییەتی (ماهییەت) و وێنەگەلێ پێشەکی دارێژراو بۆ مرۆڤ و کۆمەڵ داندراو و ئامادەکراو هەیە و لایان وایە کە مرۆڤ لە پێش ئەوەدا مێشکی لە قاڵب بدرێ جاری وەك ماددەیەکی خاو و پاك و خاوێن هەیە، بە تەرزێکی دیکەی بڵێم: وجوودییەت دە بەرابەر هەر جۆرە فەلسەفەیەکدا کە بڕوای بە ئۆتورووحەی نەخشەی خوایشت (ئیرادە)ی پێشەکی بڕیاردراو (بە نموونە: لە لەوحومەحفووز)دا بەش بە حاڵی چارەنووسی مرۆڤ، چ فەلسەفە ئایینیەکان یان فەلسەفە ئەقڵییەکان، هەروەك دەزانین لە فەلسەفەی ئەفلاتووندا، هەبوون دەبێ بە هۆی نزمی و پەستی و پووچیی جەوهەرەکان. دنیای هەبوون یان دنیای شەبەنگ (أطیاف)کان دە بەرابەر نموونە (مثال)کاندا هیچ و پووچ و ناتەواوە.

بە ڕای ئەفلاتوون "هەبوونی واقیعی" سەر بە دنیای نموونەکانە، نەک دنیای بوونەوەرە بەرهەستەکان. بە جۆرێکی دیکەی بێژم: ئەوەی کە هەبوونی هەس واقیعییەتی نییە و ئەوەی کە واقیعییەتی هەس، هەبوونی نییە. نموونەکان هەمان جەوهەر، یان نموونەگەلی پێشەکی بڕیاردرپاگ، کاملّ و لە گۆڕان بەدەرن و مرۆی واقیعی لە سنوورەکانی واندا دێ و دەچێ و دەڵەمەییانە دەلەرێتەوە. لە فەلسەفەی مەسیحییەتدا جەوهەرەکانی دنیای نموونەکان جێگای خۆیان بە ئەقڵی خوادایانە بەخشی. بە قسەی یەکێ لە خودناسان: "ئەگەر ئەقڵی مرۆڤ بیروبۆچوونێکی لەمەڕ بوونەوەرێکی بێ کەموکووڕ نەدەبوو، کووی دەتوانی دەربارەی کەموکووڕیی چتان ڕای خۆی دەربڕێ؟"ئەرەستووش لە جیاتیی دنیای نموونەکان قسەی لەمەڕ وێنە دە بەرابەر "هیولا" دەکرد. فەلسەفە و ڕامانەگەلێ کە هەر بە دەم فەلسەفەی ئەرەستووەوە لە پەیجووی دۆزینەوەی یاسا هەموانی و ناچارەکییەکانی چتاندا هەڵوەدا بووگن، بە هەر جۆرێ بێ جەختیان لەسەر خواپشت "إرادة" و چارەنووسی پێشەکی بڕیاردراو (داندراو) کردووە. بابەتی زانست لەم گۆشەنیگایەوە، هەموانی (کلیات) و ناچارەکییەکانە. لە سەتەی نۆزدەهەم بەم لاوە پۆزیتیڤیزم (چتی قابیلی ئیسپاتکردن، چتی بەرهەست و قابیلی تاقیکردنەوە) بە ناوی مەیلی ئەسڵی لە کۆمەڵناسیدا بەلای ئەوەدا لەنگی کە ڕێکخستنی یاسا و ڕێسا هەموانی و ناچاریگەلێ کە بەسەر مێژوو ڕادەگەن، ببێ بە ئامانجی زانست، واتە: هەرچی لەم جیهانەدا هەیە، بە پێی یاسا و ڕێسای هەموانی و ناچاری دەگەڕێ، نەک لە پێشدا نەخشەبۆکێشراوی و پڕبەپێستی نموونەیی. وجوودییەت لە نواوە لەم هەموو بیروبڕوا و چەمکە فەلسەفییانە بە دەنگهاتن (ئیعتیراز) بوو. وجوودییەکان هەر بە تەواوەتی لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە ناکرێ تایبەتمەندی و بێ هاوتایی و بێ کەموکووڕیەتی بەهەستی هەبوون، بەش بە حاڵی هەر چتێکی تایبەت، لە چارچێوەی جەوهەرەکان، یان وێنەکان، یان یاسایە گشت و هەموانییەکاندا (بە دەروونناسی و کۆمەڵناسی و فەلسەفە و ئایینەوە) بناسرێ. بە قسەی هێندێ بیرمەند، وجوودییەت چتێکی یەکپارچەی پتەوی ئەوتۆیە کە بەسەر

هیچ ژمارەیەکی لەخۆی بەدەردا دابەش ناکریّ. واتە: بیروبڕوایەکە کە لەنێوان هەبوون و ناکی هەبوودا هەیە.

بەرداشتی وجوودییەت کاتێ پەیدادەبێ کە تاك لە ئاکامی تەماشاکردنی هەبوون، تووشی سەرسوڕمان و واقوڕمان بێ. بەلای وجوودییەوە "هەبوون" و "نەبوون" نییە، ئەم دوو چتە لێکدی جودلوازن. هەبوون واتە: کاری کاریگەر و دروستکەر و چتێ کە لە بەدیهاتن بێ، بەدیبهێنێ و خێوی سەرپشکایەتی و بەخوایشتی خۆ هەلّبژاردن بێ، لە سەرووی جەوهەر و چییەتییەوەیە، تا سەرپشکایەتی ڕاوەستابێ، ئەتۆ جەوهەری لە پێشدا هەبووی، داری، بەردی، پادشای، سەددامی، هیتلەری، ئەوەت چیی تێدابەستەنییە، هەبوونی ڕاستەقانیی تۆ بە وەکاربردنی سەرپشکایەتیی خۆتەوە بەستراوە. جیهانی لەخۆبەدەر دیاردەیەکی بێ مان و بێهوودە و پووچە و ئەوەی کە مان و پاساوێکی پێ دەبەخشێ یان لێی باردەکا، تەنها مرۆڤە. مرۆڤ چییەتیی خۆی و دنیای خۆی بەردەوام لە ڕێی کردەوەی بەخوایشت و سەرپشکایەتیی خۆیەوە سازدەکا و دەخولقێنێ. لەم حالّەتەدا ئەم کاری "بۆ خۆی دنیای خۆ خولقاندنە"ی لەسەر هیچ نموونەگەلێکی پێشەکی بۆداندراو دانەمەزراوە و تەواوی ئاکار و ئەخلاق، یان تراژیدیای سەرپشکایەتی و کردەوەی ئازاد و سەربەخۆی مرۆڤ لێرەڕا سەرهەلّدەدا. مێژوو لەسەر بنەمای ئولگوو و نموونەیەکی پێشەکی داندراو جوولّەناکا، بەلّکی بەرهەمی لەناکاو و کاری تازەکوورەی خودی مرۆڤە.

بە ڕاستی هەستی ئێکسیستانسیالیستی چ جۆری ئایینیانەی مەسیحییانەی لە گوێن ئەوەکەی یاسپەرس و گابرێل مارسێل کە هەرتك مەسیحیی ڕەسمیی کەلّەعەیارەن و چ جۆری ناخودایییانەی وەك ئەوەکەی هیدگەری کۆنە نازی و سارتەر و وجوودییە فەرەنسزەکانی دیکەن، کەسانی زۆر دەگمەتی وەك نووری و سوورەوەردی و شیبلی و ئیبن عەرەبی و کەرخی بوستامی و هەللاج و نەعیمی و نەسیمی و مەحموودی پسیخانی و سەربەداران و قەرامیتە و بابای عوریان و باوەکانی ئەهلی هەق و حافز و زاهیدی گەیلانی و مەولانا خالیدی کورد و هتد مان بە

بیردێننەوە. هەستی هەبوون، واتە: هەست بـە سەرپشکایەتی (اختیـار) و کـردەوەی بێ سنوور. هەروەك سیمۆن دو بـوار دەڵـێ: سنـوور و کـون و کەلەبـەری کردەوەیـەك ناتواندرێ تـەنگ پـێ هـەڵچندرێ و کـارێکی کـە بـە ئەنجامدانیـەوە سـەرگەرمین، پێشبینیی ناکرێ.

بە پێی بیروبۆچوونی وجوودییەت حاڵی خۆچارەنووس ئامێزی تیرەی مرۆڤ وێـڕای ئەمە، حاڵێکی دەردناك و پڕپەرپرسییە، چونکـە مـرۆڤ بـێ ئـەوەی هیـچ نوسـوولێکی پێشبینی، یان نموونە و ئولگووهایەکی پێشەکی دەستنیشانکراو، واتە: بە بـێ گـوێ بـە جەوهەر و چێتی لەم جۆرە بابەتە دان، دەبێ دەست، یـان بەمـە، یـان بـەوە هـەڵبژاردن بکا و لێبڕێ، چێێ هەر بکا. جـا هـەر لێرەڕا خەسڵەتی هەراسـانی ئامێز و دڵـەڕاوکێی هەبوون و سەرپشکایەتی سەرهەڵدەدا. مرۆڤ بۆ نێو گێژەنەی هەبوون تووڕهـەڵدراوە و دەبێ بۆ خۆی تەکلیفی خۆی بزانێ و ڕوونی کاتـەوە. مـرۆڤ دەبـێ بـۆ خـۆی بـە سـەر بێهوودەیی و هیچ و پووچـی و بێمانـاییی خۆیدا زاڵ بـێ و ئـەو بـەها (قیـم)یانـەی کـە پێویسـتن لـەویانی باربکـا. ژیـانی ئێمـە فـێرۆ و دەشخۆشـی کــردەوە و عــەزم و سەرپشکایەتیە بێ پێشـینەکانە. مـادامێکی مـن هەرچییـەکی دامـەزرێنم و بنیـات نێـم لەسـەر هیچـی دادەمـەزرێنم و بنیـاتی دەنێم، چونکـە هیـچ بنەمایـەکی پێشـینەم بـە دەستەوە نییە، کەواتا خۆشم و هەرچییەکیشی کـە دەیکـەم بـەر تـاڵان و بـڕۆی هیچـە دەکەوێ و خەییام گوتەنی:

یکچند به کودکی به استاد شدیم    یکچند ز استادی خود شاد شدیم

داستان سخن شنو مارا چه رسید    از خـــاك بــرآمدیم و برباد شدیم

لەبەر هەندێ مرۆڤ خۆی "جەوهەر"ی خۆی هەڵدەبژێرێ. سەرپشکایەتی و ئـازادیی مرۆڤ بە پێچەوانـەی بـیروبۆچوونی لـەباو، نـەك کـارێکی بەدەستەخۆ، بگـرە ڕەمـەکی (غریـزی) و ناچارییـە، مـرۆڤ ناچـاری ئازادبوونـە، بـە دەسـتەخۆی نییـە، مـەحکوومی ئازادبوونە. هەڵبەتە مرۆڤ لەدلبیك بوونی خۆی لەخوایشتی خۆی بەدەر دەزانێ، بـەڵام بێیە سەر ڕاستییەکەی، دەتوانـێ بڵـێ نـەخێر، بـە مانایـەکی، لـە دایبیك بوونـی وی بـە

دەستە خۆی بووە؛ ئەدی هەر مرۆڤ کە دایك و باوکی وین، بە ئیرادە و خوایشتی خۆیان، یا تا ئەندازەیەکیش ناچاریی ڕەمەکایەتی دەخڵی لەو لە دایك بوونەدا هەبوویێ، لە دایك نەبووە؟! حەزرەتی ئەییوبیش، کاتێ لە تاو ئێش و ئازار و دووڵی و دڵەڕاوکێی شەیتان و تاقیکردنەوەی ئاسمانی، بەسەر پیسایی خۆیەوە دەگەوزی و دەینالاند: "بە ملی شکاوم بۆچی هەر لە زگی دایکمدا لەناونەچووم و لەم مەینەتییە ڕزگار نەبووم؟" لەدایك بوونی خۆی بۆ خۆی هەڵنەبژاردبوو، لە دایك ببێ یان نەبێ، بۆ خۆی لەوەدا سەرپشك بوو؛ چونکە ئەگەر وا نەبا و نەهاتبا دنیاوە، نەیدەتوانی لەحنەت لە ڕۆژی لە دایك بوونی خۆی بکا، تەنانەت هەندێ بیرمەندی سورمان فەرمایشتی حەزرەتی عومەر کە دەفەرموێ: "متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم أمهاتهم أحراراً" هەر نزیك بەو مانا ئێکسیستانسیالیستییەیان لێکداوەتەوە. بە بیروبۆچوونی وجودییەت، سەرپشکایەتی (حرية الاختيار)ی مرۆڤ سەرپشکایەتیی یەك لە دووان هەڵبژاردنە، یان ئەمە یان ئەوە هەڵبژاردنە، نەك هەڵنەبژاردن. *ئەسڵەن خودی هەڵنەبژاردنیش هەر هەمان هەڵبژاردنی هەڵنەبژاردنە.*

بە قسەی سارتەر مرۆڤ ناچارە کە هەم بۆ خۆشی و هەم جگە لە خۆشی لێبڕێ و هەست بە بەرپرسی بکا و هەر لەبەر ئەمەشە کە تووشی هەستی پەژارە و نیگەرانی و لەرزۆکی دەبێ.. ڕاستیت گەرەکە هەر کردەوەیێ لە کردەوەکانی ئێمە دەگری، تەواوی جیهان جێگای مرۆڤی تێدا دێنێتە دووبەختی و مەترسییەوە. مرۆ ئەمەهێ، یان ئەوەهێ، لەسەر هیمی بەهایەکان هەڵنابژێرێ، بەڵکو بەهایەکان بۆ خۆیان لە سای ئازادیی هەڵبژاردن (حرية الأختيار)ەوە دێتەکۆیێ و مانایان پێ دەبەخشرێ. "بەها" لە بازاڕی مرۆڤدا بەهایان دەدرێتێ و دەترخێندرێن (سەرچاوەی ئەم بۆچوونە سۆفیستەکانن) . بە قسەی سارتەر، جیهان چتێکی "لەخودیخۆیدایی"یە کە هیچ هۆکار و پاساو و مانایەکی نییە و ڕێژەکی و بێهوودە و پڕوپووچە و دوور لە ئاگایی و کردەوەی مرۆڤ لە جەنگەی هەڵا و ئاژاوەی ڕووت و بێهوودەییدا بەسەردەچێ. جیهانی ماندار و ئامانجی جیهان تەنها بۆ "من"ە.. واتە: مانای جیهان بە منەوە

بەستراوە. لەبەر هەندێ مرۆڤ تەنها بە هەبوون و حوزووری خۆی دنیا و مافیها دەخولقێنێ، خۆلاسە، ئەگەر مرۆڤ نەبا جیهان (جیهان دە نیگای ئازادیی مرۆڤەوە) هیچ مانایەکی نەدەبوو. ئاگاییی مرۆڤ جیهان ئافەرینە، مرۆڤ بە ئاگایی (وعی)ی خۆی ئەم جیهانەی خولقاندووە و جیهان بۆ "من" جیهانێکە لەپێش سەرپشکایەتی (اختیار)ی کردەوەی مرۆڤدایە و بەس. ئەتۆ بتەوێ جیهان هەیە، نەتەوێ جیهان نییە (ئیارە ئەمە بیروبڕوای هەموو ئایدیالیستێکە). جیهانی هەس و مانادار جیهانێکە کە ئێمە، تیرەی مرۆڤ بۆ خۆمان دروستمان کردووە، جیهان، بێیە سەر ڕاستی، بەرهەمی حوزوور و ئاگایی و هەبوونی کردەوەی بە خوایشت هەڵبژاردەی مرۆڤە (؟). ئێمە نەک تەنێ هەر بە کردەوەی خۆمان جیهان دەگۆڕێنین، بەڵکو بە ئاگاییی خۆمان هەبوون دەخولقێنین (دووبارە چەواشەیی و سەرلێشێواویی مرۆڤ، کە هەر لەنائاگاییی خۆی، لافی ئەوە لێدەدا کە بە ئاگاییی نائاگایی، هەبوون دەخولقێنێ؟!) هیچ چتێ پێش پەیدابوونی مرۆڤ و کردەوەی ئاگاییانەی مرۆڤ وجوودی نییە (؟). هەرچی لە جیهاندا هەیە، بە هەبوون و حوزووری مرۆڤی ئاگا ڕۆحی بە شارەگدا دەگەڕێ[1].

---

(١) فەلسەفە بەو جۆرە کە لەم دووسەت ساڵەی دواییدا نووسراوەتەوە، تا ڕادەیەکی پشتگوێ خراوە و بە فەراموشی سپێردراوە. پاش مەرگی بەیکەن و سپینۆزا، فەلسەفە تا بێژی خراوی وەسەر هات. جارێ خۆ تا لە گێژاوی چۆنیەتیی ناسین و بگرەوبەردەی نامەفهووم و تەمومژاوی لە باسی هەبوونی جیهانەوە سەری دەرهاورد، شەیتان وە شەیتانیی خۆی شەقی برد. ئەو هۆش و فامەی کە دەبوا فەیلەسووفەکانی بە فەرمانڕەوای جیهان کردبا، کەچی دەبینی لە پێناوی شتێکدا بەکاربەستراون کە ئایا ئەستێرەکان و دەریاکان و باکتریاکان و دراوسێیەکانمان تەنها کاتێ هەن کە ئێمە دەرکیان پێ دەکەین، یان هەبوونیان هیچ سەروکارێکی بە دەرک پێکردنی ئێمەمانانەوە نییە؟

بە ڕاستی ئەم کێشەیە کە زێتر وەک شەڕی نێوان مشکان و بۆقەکان دەچێ! دووسەت ساڵە کە هەر وەک خۆی ماوە بێ ئەوەی ئاکامێکی پەسەندی بۆ فەلسەفە و ژیان لێ کەوتبێتەوە یان کەسێ جگە لە دەزگایەکانی کتێب بڵاوکردنەوە و کتێبفرۆشی سوودێکی لێ وەرگرتبێ.

ڕەنگە هێندێ گلی و گازێ لەم بارەوە بەرۆکی فەلسەفە ساکار و سادەلەوحانەکەی دیکارت بگرێتەوە کە دەڵێ: "ئەمن بیردەکەمەوە، کەواتا، ئەمن هەم". دیکارت بە هەوبابور فەلسەفەکەی بە

قەدیرترین ئوسوولی گریمانەگەل دەست پێ بکا؛ ئەو دەیهەویست بە "گومانی میتۆدی" لە هەموو بڕوا و ئوسوولی سەلمێندراوی مرۆ بە گومان بکەوێ و هەوڵی دەدا لە تەنها پێشەکییەک ساختمانێکی مەحکەم و ڕەخنە و چەسپ لە زانستەکان سازبکا. بەڵام بەستنەوەی هەبوونی ئەم حەمکە چتانە بە "بیر"ەوە کارێکی مەترسیناک بوو، چونکە لەو حاڵەتدا هەبوون تەنها دەبوو بە نیشانەی "بەرتریی شەرافەتمەندیی خەڵکی خاوەن بیر و بەس و سەیانی(cynic)یەکان نەک تەنها نکوولییان لە کاملایەتیی ڕەگەزیی یەک تاک (واینینگەر گوتەنی) بەڵکو ئەسڵەن نکوولییان لە ڕەگەزایەتی بە شێوەیەکی هەموانی دەکرد.

وێڕای ئەمە سەرلەبەر، فەلسەفە لە هەمووان زیانی زێتر پێ گەیشت، چونکە تەسەووورکردنی جیهانێ لەسەر بنەواشەی ئەم ڕاستییە کە "من بیردەکەمەوە" کۆمەڵە گیروگرفتێکی ئەوتۆ دێنێتە گۆڕێ کە زەین موقلاشییەکانی دە بەرە لە شیکارگەرانی ناسین ناسی epistemology دەتوانم بڵێم بە خۆڕایی بۆ یەکلاکردنەوەی ئەم کێشەیە بە خەرجدرا. گرفتی یەکەم لێرەوە سەرهەڵدەدا کە ئەم "من"ە بیرمەندە چتێکی نامادی نەبێ. دیارە کە بزاوتی تەنێ لەوەدایە کە بەر تەنێکی دیکە بکەوێ، واتە: هەرتکیان تەن بن، بەڵام ئەم تەنە نامادییە چۆن دەتوانێ ڕیزە (ذرة)کانی مێشکی مرۆڤ بە جووڵە بێنێ؟ بیروبڕوای مادییەت و میسالییەت و "ناسازەی گیان و لەش" یان "هاوبەرزیانیی لەش و گیان" لە هەمان کوێرەڕێوە هاتنەگۆڕێ. پەیڕەوانی هاوبەرزیانیی لەش و گیان گوتیان مادام زیهن و مێشک دوو چتی لێکدی جوداوازن چناقیان ناتوانن کار لەوی دیکەیان بکەن. لەبەر ئەوە دوو ڕێی لێکدی جوداواز، واتە: مادی و مەعنەوی، مێشکانی و زەینانی، شان بە شانی یەکدی ڕادەوەستن. مادی لافی ئەوەی لێدا کە مادامێکی کاری زیهن لە لەش چتێکە نکوولیی لێ ناکرێ، کەواتە دەبێ چتێ بێ لە جۆری لەش وەک زەردەو و ڕەشاو (صفرا و سودا)، مادی و لەشانی (جسمانی). میسالی دەڵێ: لەبەر وەی کە هەبوونی ئێمە، دیکارت گوتەنی، تەنها بە هۆی "بیر"مانەوە دەسەلمێندرێ، چتەکانی دیکەش هەبوونی خۆیان بە قەرزاریی بیری ئێمە دەزانن و وەختێ پەیدادەبن کە بە هەستەکانی ئێمە دەرک بکرێن و هەبوونی زیهنی پەیدابکەن؛ لەش لە چەمکێ، لە مانایێ زێتر بەولاوە چیدیکە نییە و ماددە تەنها کۆمەڵەتەسەووراتێکە و هیچیتر..

دەبینی بەم جۆرە ئەم کێشە گاڵتەجاڕییە دەستی پێ کردووە، بەڵام ئێستا ئەوەی ماوەتەوە تەنها کێشەکەیە و لە گاڵتەجاڕییەکە هیچ خەبەرێ نییە.. کۆمەڵێ لەم لیوەکۆڵانە لەم بابەتەدا، لە گوێن ویلیام جێمز، بەردلی، زەردەیەکیان وەسەر لێوان کەوتووە و هێندێکی دیکەیان، لە گوێن دێڤید هیوم، ئەمەیان بە یاری دەزانی و کەسانێکی دیکە، هەموو گرژ و مۆن چارەیان بە یەکدا داوە و لە جان لاک ـ ەوە بگرە تا دەگاتە ڕۆدۆڵف ئۆیکەن چرچارەی ترش و گرژی خۆیان وەشارتییە و بەرە ـ بەرە ئەم

جیهان بێ مانایە (ئنکلسیش، قسەیەکی نزیك لەمەی هەیە، کە دەڵێ یاسایەکانی خۆڕسك کوێرن"، کەواتا: دەبێ مرۆڤ چاویان بکاتەوە، بە چی؟ بە ئەقڵ، کێهە ئەقڵ؟! ئەو ئەقڵەی کە بە (قیاس)ەکەی ئەرەستوو، بەرهەمهێن نییە؟ وەك: سوقرات مرۆڤە و هەر مرۆڤێ گیانلەبەرێکی قسەوێژە (ئەم ڕستە نازیرەکانە گێلانەیە تا ئێستاش لە کتێبەکانی مەنتیقدا کاویژدەکرێتەوە) کەواتا: سوقرات گیانلەبەری قسەوێژە. پیروون (٣٦٠ ـ ٢٧٠ پ. ز.) گوتی هیچ وا نییە و ئەمە قسەیەکی قۆڕە و بەڵگە لە خەڵك دزینەوە (مصادرة على المطلوب)یە؛ چونکە ڕاستیی (القضیة الكبرى): "هەر مرۆڤێ دەگری، گیانلەبەرێکی قسەوێژە" بەوەوە بەستراوە کە ئەنجام (النتیجة) ": سوقرات گیانلەبەرێکی قسەوێژە" لەپێش دامەزراندنی (قیاس)ەکەدا، بە ڕاست بگەڕێ؛ پێش ئیسپاتی ئەوەی کە سوقرات گیانلەبەرێکی قسەوێژە ناتوانی بڵێی هەر مرۆڤێ دەگری، گیانلەبەرێکی قسەوێژە، کەواتا بەم حیسابە بێ، بەڵگەهێنانەوە (استدلال) هەمیشە ناتەولوە. جا هەر لەبەر هەندێش بوو کە ئەپیکۆر گوتی: دە کەواسا، لێگەڕێ، با بە گوێی سۆفیستان بکەین و هەر ملی هەستەکان بگرین و هەست بکەین بە (ڕێبەر و پێوانە)ی ڕاستی.. بەڵام گوماندارانن (شکاکان) گوتیان ئەمە نابێ؛ چون خۆر بە لای ئێمەوە وەك قوتووی حەڵوا و ستێران وەك دانە بە ڕوخساری ئاسمانەوە دەچن. دەیجا کوو بڕوا بە هەستەکان بکەین؟ پیروون بەو ئاکامە گەیشت کە هیچ چتێ بێ چەندرچۆن و قەتعی نییە و هەر لەبەر هەندێ شاگردەکانی، وێڕای ڕێزی زۆریان لەبۆی، کاتێ کە مرد بۆی نەگریان؛ باوەڕیان لە سەتا سەت بە مردنی نەبوو. دەیجا مام سارتەر و

---

چەوچارانە ترشتر و گرژ و مۆنتریان لێ هاتووە. ئەسقوف بێرکلی گوتی: هیچ چتێ لە زانستی خودا یان مرۆڤ بەدەر بەدی نایە، تا ئەو شوێنەی کە ئێمەی لێ ئاگاین فەلسەفە، هەرچەند هەر خۆی حسێو بوو و کەس شانی لە شان نەدەدا و خێوی تەخت و تاجی دەوڵەتی ئەقڵ و هۆشی مرۆڤایەتی بووە، بەڵام پاشان میراتگرانی بە ناوی چەندین زانستەوە، هەریەکە بەشی خۆی پڕپۆڵێکی بەرکەوت و هاپۆ فەلسەفەش لە قولینچکێکەوە بۆ خۆی هەڵکورما.

ھەوالانی، ھەر لەم گێژەنەدا دەخولێتەوە    جیھان بێ مانایە، بەلام دەشێ مانای پێ ببەخشرێ. ڕاستی لە بنەڕەتدا بنیاتێکی خۆیەکی (سەبجەکتیڤ) و زەینیی ھەس. ئەسڵەن مرۆڤ بە گوێرەی مەیل و ئارەزوو و خوایشتی خۆی شکڵ و شەماییل و ڕەنگوڕوو و تاموبێن بە کۆتەڵ و کۆمەڵی تاریك و ئەنگوست لەچاوی جیھانی دەرەکی دەبەخشێ. باری ھەڵکەوتی چۆن ھەبوونیی ھەرکەسە بە جیا، پایە و بناخەی بیروبۆچوونی وی دەربارەی ڕاستی ئەخشەدەکێشێ (لێرەدا، سارتەر وەك مارکس، واقیع و ڕاستی لێکدی جودادەکاتەوە. ڕاستی دەکا بە سیفەتی بیروبۆچوونی مرۆڤ لەمەڕ واقیع. بۆ نموونە: ئەتۆ ناڵێی خۆرگیران ڕاستییەکە، بەڵکو دەڵێی ئەوە واقیعێکە، بەلام دەڵێی بیروبۆچوونی من لەمەڕ خۆرگیران بە شێوە فەلەکییە زانستییەکەی ڕاستە و بە شێوەیەکی کە خەڵکی نەزان پێیان وایە دێووەرنج دەیگرن و لەبۆ بەرُدانی تەقەدەکەن و تەنەکە لێ دەدەن، ڕاست نییە.

مانایەکان، شێوە و شێوازەکان، بیچم و قەوارەکان، بەھایەکان، عەیارە و پێولنەکان، ھەڵوێستەکان سەرلەبەر، بە ئەزموون و تاقیکردنەوەی ژیبەکیی تاکەوە بەندن. ڕەگ و ڕیشەی بیروبۆچوونی مرۆڤ دەبێ لە ئائومێدی و بێ وەرەیی ویدا پەیجوویکرێ. لە جیھانی بێ مانادا مرۆڤ لە بڕواھێنان بەولاوە ھیچ چارەیەکی دیکەی نییە. جا ھەر لەبەر ھەندێکەشە کە سکولاستیکەکان ڕاستییان، کاتێ بە ڕاستی دەزانی کە ئەندێشە (فکر) دەقاودەق دەگەڵ دنیای دەرەکیدا ڕێك و جووت بن و بە پەیڕەوی لە ئەفلاتوون و ئەرەستوو، پەسنی ئەقڵیان دەدا. گوتیان چاترین ئەنجامگری (استدلال): بە بەڵگە، ڕاستی دۆزینەوە، [1] "قیاسی برھان"ییە کە دەتوانێ لە بڕوایەکی کۆنکرێت و چەسپرا

---

[1] ئەنجامگری (قیاس): گوتەیەکە لە دوو، یان چەند کێشە (قضیة) proposition یەك پێکھاتوو کە ئەگەر ئەمیانت سەلماند دەبێ ئەوی دیکەشیان بسەلمێنێ و قوبووڵی بکەی کە ئەنجامەکەیەتی، وەك: ھەر مرۆڤێ بکری گیانلەبەرە و ھەر گیانلەبەرێ بکری تەنە." ئەنجام: "ھەر مرۆڤێ بکری تەنە."
ڕاستیی قیاس بە ڕاستیی ئەنجامەکەی دەگەڕێ و ناڕاستیی ئەنجام بە ناڕاستیی قیاس دەگەڕێ، بەلام مەرج نییە نە ناڕاستیی قیاس ناڕاستیی ئەنجامی لێ بکەوێتەوە و نە لە ڕاستیی ئەنجام ڕاستیی قیاس

فەلسەفەیەکی جیهانیی بەکێشوسەنگ سازیکەن؛ ئەوەبوو "نموونە" (المُثُل)کانیان بە ڕاستیگەلێ زانی لە دەنگ و ئاوێنە بالآتر، چونکە ئەمانە چتهایەکی مادیین و سەرەتا و بنەتایان هەس و بەلآم نموونەکان، یان بتوونەخۆڕسکانەکان (الکلیات الطبیعیة) لە نابوودبوون نایەن و هەوڵ و ئاخیر و زاهیر و باتینن و بەرهەست (محسوسات)ەکان کەرتەوێنە (سور جزئیة)یەکانی وانن؛ ڕاستینی مرۆڤی بتوون (هەموانی) لە تاکی مرۆڤ زێترە و جوانیی پەتی (محض) لە هەر گوڵێکی دەیگری، جوانترە.

بەلآم وێڕای ئەمەش مرۆڤ لە پراکسیسی وجوودیی خۆیدا دەگەڵ ئازادیی تەولوی خۆیدا دەس لەملانە کە ئەمە تایبەتمەندییەکی بێ هاوتای مرۆڤە و لەمەڕا کە مەرجی بەدیهاتنی ئازادی، هەڵبژاردن و کردەوە، لە جیهانی بێ ماناداییە؛ ئازادی سەرچاوەی ئێش و ئازاری مرۆڤە. دیکارت دەیگۆ: "مرۆڤ کەوشکەنی ناوینی نێوان هەبوون و نەبوونە و لە نێوان هەبوون و نەبووندایە." ئەسڵەن سارتەر کتێبە نامیەکەی بە سەردێڕی ئەم ڕستەیەی دیکارتەوە نووسیوە.

مرۆڤینی (ئومانیستی)، مارکسییەتی بتوونگەرا (کوللییەتگەرا) و فەلسەفی دەگەڵ ئێکسیستانسیالیزمدا سەروکاری زێتر هەیە تا مارکسییەتی پۆزیتیڤیست و ئەرتەدۆکس، چونکە هەروەك دەزانین مرۆڤ، زیهنییەت، پراکتیك و کرداری مرۆڤی و

---

بکەوێتەوە، چونکە ئەم (لازم)ە لە (ملزوم)ەکە گشتترە. بەلآم زۆر جاری واش هەیە، کە قیاس ڕاستە و ئەنجامەکەی ناڕاستە، ئەویش نەك بەو بارەیدا کە ڕاستیی ئەو ئەنجامە لەو قیاسە هەڵێنجرابێ؛ بەڵکو بەو بارەیدا کە ئەو ئەنجامە لە خۆی: "فی نفس الأمر"دا ڕاست و دروست بێ. دیارە، ئەنجامگری سێ ڕووی هەن: (قیاس، استقراء و تمثیـــل). قیاس بەو جۆرە (استدلال)ە دەگوترێ کە زەین لە "بتوونی" (کلی)ڕا بۆ "کەرتی" (جزئی)، یان لە ئەسڵڕا بۆ ئەنجام و لە یاساڕا بۆ بەرکەوتەکانی بڕوا. بە نموونە کاتێ لە پێناسەکردنی جفزدا ئەم ئەنجامەوەردەگرین کە "تیشکەکانی جفز دەگەڵ یەکدیدا یەکسان"ن و لەم یاسایەی کە دەڵێ: "ئاو لە سەت پلەی گەرمیدا و ٧٦٠ پلەی وشاری هەوادا دەکوڵێ؛ بەو حوکمدانە دەگەین کە "ئاوێکیش کە لە جامێکدایە لە سەت پلەی گەرمی و ٧٦٠ پلەی وشاری هەوادا دەکوڵێ. قیاس بە دەیان جۆری هەن و ئێرە جێی ئەوە نییە باسیان بکەم. هەروەها باسی (استقراء و تمثیل)یش ڕەنگە کۆلکە خوێندەواریش بیانزانێ

"هێزەکانی ڕەنێوهێن" لە مارکسییەتی ئومانیستی و فەلسەفیدا لە چتی ماددی و بەرچاو و پێوەندییەکانی ڕەنێوهێنان، بە کاریگەرتر لە قەڵەم دراون. مارکسییەت وەك هەر تایەن (عەینییەت)ێ بە دوو ڕەنگ، یان بە سێ ڕەنگ تەشبیات نەبێ : بە حەنبەلی، مالیکی، شافیعی و حەنەفی بەش بە حاڵی ئۆلە سوننییەکان، شیعەی دوازدە ئیمامی و زەیدییە و ئیسماعیلییە، بەش بە حاڵی ئۆلە ڕەسمییەکان، دەیان ئۆلی پەنامەکی (باطني)ی بە ئیستیلاح (غلاة)، چەندین فێرگەی کەلامی (فەلسەفەی لاهووتی)ی لە گوێن ئەشعەرییە، موعتەزیلە و ماتوریدییەی سووننی مەزەب و هتد... لێکدانەوە بە لەڕێ لادان (تحریفییەت) دەزاندرێ. بە گوێرسەی ئەوانەی کە دەیانەوێ خزمایەتی لە نێوان وجوودییەت و مارکسییەتی ئۆمانیستی ـ فەلسەفیدا بدۆزنەوە، سنووری پراکتیکی مرۆڤ، پێشەکی دەسنیشان نەکراوە و مرۆڤ پێشەکی هیچی لە چارە نەنووسراوە، واتە: هەبوون و نەبوونی سەر بە چتێکی لە خۆی بەدەر نییە. هەڵبەتە مرۆڤ دەبێ لە هەلومەرجی مێژوویینە، یان بوون بە چتی ئاسایی کە بەرهەمی پراکتیکی پێشەکییە، ئاگابێ تا بتوانێ لەوە تێپەڕێ و هەورازتر بڕوا. لە ڕوانگەی مارکسیزمی فەلسەفی و ئۆمانیستەوە، هەروەك پێشترێ دیتمان، مارکس لە ڕێی مانا و چەمکی لەخۆبیانیبوونەوە، جیهانی بەچتبوو (العالم المتشیّء) و باروبۆخە بەرهەست (المحسوس)ە مێژوویینەکانی (بەرە ـ بەرە هاتنەگۆڕێی چت لە سەرەخۆ و، نەك وەك باوکە ئایەم یەکسەر لە قوڕ دروست کرێ و گیانی بە بەردا بکرێ) جارێکی دیکە بۆ ئەسڵەکەی خۆی، واتە: بۆ "کار" وەگێڕا. هامانا: ڕۆح خالیق نییە، بەڵکو کاری مرۆڤ، ئەو ئەرکەی کە مرۆڤ بە خەرجی دەدا، خالیقە.. بە پێی ئەم بنەمایە، مرۆڤ هەمیشە دەتوانێ بە نەلێکردن (نفی)ی هەر کۆسپ و لەمپەرێکی لەخۆبەدەر (المانع الخارجي) دووبارە ئازادی و بەرپرسیی تەواوی خۆی لەمەڕ سەرلەنوێ سەرەنجامی خۆی بڕیاردان و نووسینی جارێدا. هەڵبەتە جەخت لەسەر سریشت (عنصر)ی ئازادی و زیهنییەت (الذاتیة)ی مرۆڤ، بە مانای بەتاڵکردنەوە (الإلغاء)ی ئەم ڕاستییە نییە کە ئەوەی مرۆڤ لە ڕابردوودای دروست کردووە، ناچاری و بێچارەییگەلێ و بێ سەرچەدوسنوورەیلێ لە

کاروکردەوەی وی باردەکا. پراکتیك و بەچتبوون (الفعالیة والتشیؤ = العمل والصیرورة إلی السلعة) هەمیشە لە ململانێدان. لەبەر ئەمە ناتوانریٚ بەچتبوون (reification)ی جیهانی بەچتبوو لە زیهنییەت و ئازادیی پراکتیکی مرۆڤدا یەکسەرە و ڕاستەوخۆ هاوشێوە (ئاسیمیلا)بکا و هەروەها ناشتوانریٚ سریشتی زیهنییەت هەمیشە لە چەمەرەی یاسا بەرهەستەکانی مێژوودا داماو و دەستەپاچە و گرفتار، لە قەڵەم بدریٚ.

واتە: هەر قسەکەی مارکس دەگرێتەوە کە واقعییەتی ماددیش و بیروبروا، ژێرخانیش و سەرخانیش لێکدی کاردەکەن. بە نموونە: بیروبروای ئایینی (سەرخان) بە گۆڕینی سیستەمی ئابووری (مالیکییەتی زەویوزاری کشتوکاڵ) یەکسەر لە مێشکی خەڵکدا گۆڕنابێتەوە، بەڵکو تا دێرزەمانێ هەر دەمێنێتەوە و بە چالاکی کاری خۆیان دەکەن و داکۆکی لە ژێرخانە کۆنە ڕووخاوەکە دەکەن. لە ڕوانگەی مارکسییەتەوە کاری مرۆڤ هەر خۆی پەیکەرەی پێکهاتەی زەمینیش و هەر هەمان فاکتەری خوڵقێنەرە لە مێژوودا.

واتە: ئەتۆ کە کورسییەکی دروست دەکەی مانا و شکڵی کورسییەکە لە نێو زەینتدا کوتومت هەر کورسییەکەی نێو ماڵەکەتە. جیهانی چتان، بەرهەستان، ڕەنگدانەوەی پراکتیك، کاری مرۆڤە لە مێژوودا. جا هەر هەمان بەرهەست زەمینەی بەچتبوون و لەخۆبیانیبوونە. کاری مرۆڤ لە هەر سەروبەندێکدا بە شۆڕش هەڵیساندن کاژ و پۆستی دنیای بەچتبوو و بنیاتە پێشینەکەی لەبەریەك هەڵدەتەکێنیٚ و دەڕووخێنیٚ و لە نێو وێرانەکانی ئەو دنیایەڕا دنیایەکی بەشتبووی دیکە (پێوەندییەکانی ڕەنێوهێنان، پێکهاتەی دەوڵەت و ئایدیۆلۆژی) دەخوڵقێنیٚ. جیهانی بەچتبوو لە هەر سەردەمێکیدای دەگری، لە لایەن دەستە حوکمڕانەکانەوە بە دیاردەیەکی هەر لە عەزەلەوە هەبوو و هەتاهەتایی و بنیاتانە (stractural) بەدیاردەکەوێ، کەچی لە ڕاستیدا کاژێکی هیشکەهەڵاتوو و ڕەقهەڵگەڕاوی ئەوتۆیە کە دەبن ویدا، کاری مرۆڤ ماکی بنەڕەتی پێکهێنی سەرلەبەری دیاردە کۆمەڵایەتییە لەباو و ستاتوکۆکەیە. واتە: سەرچاوەکە کارە. لە نێوان پرۆسێسی مێژوویینە (چت وردە ـ وردە و لەسەرەخۆ هاتنەگۆڕیٚ، نەك بە کون فەیەکونیٚ دروست بوون) و جیهانی بە چتبوو، یان ڕوونتری بڵێم: لە نێوان

هێزەکانی ڕەنتوهێنان و پێوەندییەکانی ڕەنتوهێناندا کاتێ ناتەبایی و ململانێ پەیدا دەبێ کە بەرەوپێشتر چوویێ دە کاتێکدا کە جیهانی هیشک هەڵتووی هەرچی لەو جیهانەدا هەیە دە بەرابەردا نەیەتە ژێر بار و بەریەرەکانێ بکا. گۆڕەپانی کردار (پراکتیك) یان هێزەکانی ڕەنتوهێنان، گۆڕەپانی "بزاوت" و گۆڕەپانی جیهانی بە چتبوو و سەرخانەکان ، گۆڕەپانی بەریەرکانێ و ململانێیە. بەڵام هەمیشە مێشکی بزۆز و فڕەندە، کاژی هیشك هەڵتوو دادەدڕێ و لەتوپەتی دەکا و سەرلەنوێ لە ناخی وییەوە دامودەزگایەکی کۆمەڵایەتی تازەنەفەس و تازەگوورە پەیدادەبێ. لە هەر چەرخێکی مێژووییەدا پاژێ لە کۆمەڵ بە نێوی ڕەواڵی خەللاقیەت و کرداری مرۆڤ، یان بە نێوی خەللاقترین و پێکهێنترین پاژی کۆمەڵ، ئەم گۆڕانکارییە بەدیدەهێنێ. جارێ بۆرجوازی و جارێ پرۆلیتاریا، نوێنەری دەقاودەقی توانستی مرۆڤ لە کار و خەللاقییەت و گۆڕینی خۆڕسکن و هەریەکە دنیای بەرهەستی تایبەتی خۆی سازدەکەن. لەم ڕووەوە چەمکی کار و کرێکار لە ئەندێشەی مارکسدا بە چینی کرێکاری پیشەسازییەوە لە سەردەمی سەرمایەداریدا سنووری بۆ ناکێشرێ، بۆرجوازی لە سەردەمی پشکووتن و ڕۆنانی خۆیدا وەك چینێکی خاوەن زۆرترین وزەی ڕەنتوهێنان لە زەمینەکانی ماددی و فەرهەنگیی "چینی کرێکار" واتە: فاکتەری کرداربوو. بەم جۆرە مێژوو، گۆڕەپانی ئازادی و کار و پراکتیکی مرۆڤ و ڕۆنان و ڕووخاندنی جیهانە بەرهەستەکانی یەك لە دوو یەکە. بەڵام مرۆڤ لە گۆڕەپانی مێژوودا وەك " بابەت" (موضوع) یا کارنەنجامدەری ئاکار بەدیاردەکەوێ. دنیای بەرهەست و ڕەق و هیشك ناتوانێ بەرەوبڕی لەوە بکا کە مرۆڤ هەست بە بەرپرسی و جێگەی خۆی وەك "بابەت"ی مێژوو، نەکا. هەرچی زێتر جەخت لەسەر ئەم مەیلە مرۆڤەکی (ئومانیستی) و فەلسەفییە لە مارکسییەتدا بکەین، لە چەمەرەی وجوودییەت نزیکتر دەبینەوە. بەم ئاوایە، مرۆڤی "بابەت" یان بەرهەمی هەلومەرجی ژینەکی گۆیا مێژووییینە و یاساگەلی بەرهەست و میکانیکی نییە (وەك هێندێ لەو کەسانەی کە بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، وەك وجوودییەکان بیریان دەکردەوە کە گۆیا بە خەیاڵی خۆیان مێژوو تەنها لە

نیگای "بەشەری" (التفسير البشري للتأريخ)یەوە وەك هەنگیان لە دیواردا دیتبێتەوە، لێك دەدایەوە مرۆڤ لە فەرایەندی دیالێكتیكدا بە كرداری خۆی بەرهەستییەت (عینیت) دەئافرێنێ و بە جۆری دیكەی دەگۆڕێ و سەرلەنوێی دروست دەكاتەوە. مێژوو بوار و سەڵەفگای سەرپشكایەتی (اختیار)ی مرۆڤە. لە ئاوها ڕوانگەیەكەوە، ژێرخان و سەرخان بە چەمكی ماركسییەتی ئەرتەدۆكسی هەرتك بەرهەمی كاری مرۆڤە. بەم جۆرە ماركسییەتی فەلسەفی مەیلی فەرایەندەیەك بە لای ئایدیالیزمدا دەكا.. هەروەك گوتم فەلسەفەی وجوودییەتیش كێشەی زیهنییەت (subjectivity) لە مێژوودا، هەرچەند ڕەوتی وی لەم ڕووەوە "زەینگەرایانە" نییە، وەك كێشەیەكی بنەمایی دێنێتە پێش. جا لەم ڕوانگەیەوە، مرۆڤ لە هەموو كاتێكدا لەو سەرحەدەوە كە خۆڕسك و كۆمەڵ لە پێشێی بە چرابەكی سوور قوت دەكاتەوە، هەورازتر هەڵدەكشێ و هەر ئەمە بۆ خۆی تایبەتمەندییەكی مرۆڤە. مرۆڤ بە ترازان لە سنووری بواری چتە (خۆڕسكانە و ئەفسانەییانە و سرووشتییانە) پێگەكی داندراوەكان، بۆ بواری دڵەڕاوكێ و پرسیار و كار و بەرپرسی، ئازادیی خۆی دەردەبڕێ. لێك دووفاقییە مێژووییینە و كۆمەڵەكییەكان، ئەمانەن كە زەمینەی ئازادی و كار و پراكتیكی مرۆڤ دابین دەكەن . ئەتۆ وەختێ دەتوانی سەرپشك (خێوی ئیختیار) بی كە دوو بارودۆخ بە شێوەیەكی دووفاقیئامێز بە ئەنیشت یەكەوە بحاوێنەوە و هەڵبكەن. دوفاقی و قەیرانە كۆمەڵایەتی و مێژووییینەكان دەگەڵ سەرپشكایەتی (انتخابات) یە تاكییەكاندا تەشپیات نەوێ، كەروخۆڵەمێشانە، یان دۆشاووڕۆنانە، تێكەڵن. سەرهەڵدان و شۆڕش لە دژی بنیاتی سەردەم بەسەرچوو و ڕزیوی كۆمەڵ، بڵندترین نیشانەی خۆسەرپشكایەتی (خودمختاری)ی مرۆڤە. بەم جۆرە لە سەرێكی دیكەوە لە مەیدانی ماركسیزمی فەلسەفیرا بەرەو دۆڵی وجوودییەت هەنگاوهەڵدێنین. پەڕینەوە لە بارودۆخی قوبوولكردنی بنیاتی بەرقەرار و پێشەكی پێكهاتووەوە بەرەو مەیدانی لە بەرپرسی و خەللاقییەتی تاكانە و ئەزموونی شەخسیی لێك دووفاقی و گۆڕانی لێك دووفاقیئامێزی كۆمەڵ، هەموو تاكێ دە بەرابەر بارودۆخی باودا ڕوبەڕوو ڕادەگرێ و ئازادیی وی لە

حاڵەتی وجوودی بیلقووە، (پۆتانسیێل)ڕا بۆ حاڵەتی بیلفیعل دەگۆڕێ. (واتە: هــەروەك چۆن دەشێ لە هەر ماددەیەکی بتهەوێ، ئاور پەیدا بکەی، چونکە ئاوری بیلقووە، تێدا هەیە، پەیدادەکەی، هــەر بــە هــەمان شــێوە دەشــێ لــە هــەر مرۆڤــێ ئــازادیی لێ بەبەرهەمبێنی، چونکە ئازادیی بیلقووە، تێدا هەیە. لە وجوودییەتدا ئازادیی زیهن و کار و ئاکاری تاکانە هەم دە بەرابەر مەیدانی زیهنی میتافیزیکی و هەم دە بەرابـەر مـەیدانی چـاوی میتـافیزیکیدا قیت ڕادەوەسـتن. کۆمـەڵ و ئاکـار و بـەندباو و فەرهـەنگ، ئـەو مەیدانی بەرهەستی چتینەیە(لە ڕەنگی چت)یە کە لە ڕوانگەی پۆزیتیڤیزمی سەریەخۆڕا - واتــە: بــێ ســەروکاریی وی بــە مــەیدانی ئــازادی و خەلاقییــەتی زیــهنیی تاکانــەوە - دەفامرێ، هــەروەك ڕۆح یــان خودلوەنــد وەك "سـووژە" بابـەتی مێـژوو لـە فەلسـەفەی ئایدیالیستیدا بە پارێزگای میتافیزکی لەقەڵەم دەدرێ.

لە فەلسـەفەی ئایدیالیسـتیدا، زیهنی تاکانـە دە بتوونیـی ڕۆح یـا فەرایـەندی زیـهنیی مێژوودا نقـوم دەبـێ و سـەربەخۆیی و توانـاییی خـۆی لـە دەسـت دەدا. هــەروەك لــە ڕوانگەکانی پۆزیتیڤیزم، یـا ئامـاڵ بەرهەسـت (المحسـوس التصـور) بەرهەسـتایەتیی گشتگری زیهنی دە خۆیدا قووت دەدا. بەڵام هەروەك دیتمان، وجوودییــەت هــەر جــۆرە چەمکێکی بتوونیی ئەقڵانی بەلاوە دێخی. هەر لەبەر هەندێکەشە کە یەکێ لە گرینگترین جودلوازییەکانی نێوان مارکسییەتی هیگڵیگەریی بیرمــەندانی وەك لۆکـاچ و مارکسـیزمی وجـوودی بەدیاردەکـەوێ. لـە وجوودییـەتدا دە بەرابـەر فەلسـەفەی هیگـڵ، تــاك وەك هەستێك (موجود)ی بێ هاوتا جێگای بتوونیی ئەقڵانی و مێژووییبە دەگرێتەوە. ئەسڵەن کێشـەی نـامێی "کیرکگـارد" دەگـەڵ فەلسـەفەی هیگڵیشـدا هـەر لـە ئاوهـا جوداوازیـی گۆشەنیگایەکەوە ئاو دەخواتەوە.

هەڵبەتە لە سەرێکی دیکـەوە لـە نێـوان مارکسیسـتە هێگڵگەرییەکانی وەك لۆکـاچ و وجوودییەکانی وەك سارتەردا، لە ڕووی جەخت لەسەر فاکتەری پراکتیك، وەك دیتمان، هاوچونیـەکی هەیـە. وێـڕای وەش وێکچوونـی بنچینـەییی مارکسـیزمی (ئۆمانیسـتی) و وجوودییەت لەمەدایە کە گۆیا هیچیان تیۆریی واقیعیی بەرهەستی هەسی (وجود) نین.

له ئاوها تیۆرییەکدا، ئاگایی و زەین بە ڕەنگدانەوەی واقیعییەت لەقەڵەم دەدرێ و لە ئەنجامدا واقیع ڕەچاوناکرێ و فەت دەکرێ. ئەوجا لە مارکسیزمی ئومانیستیش (مرۆپەروەری) و لە وجوودییەتیشدا، ئاگایی و کار یا پراکتیکی مرۆڤی بنیاتی واقیعییە و هەرچەند لە بەرهەمی کاردا ڕابردووی مرۆڤ گرفتارە، بەڵام لە لێشاوی مێژوودا لە سنووری وی هەورازتر هەڵدەکشێ و جیهانی کۆمەڵ سەرلەنوێ ڕۆدەنێتەوە. بە شێوەیەکی هەموانی، بتوونیگەریی ئەقڵانی کە بە کەمکردنەوەی ئاگایی لە ناسین و حاڵیبوونی دەرەکی، فاکتەری تاک وەک "سووژە" و زیهنییەت نادیدە دەگرێ و لە حیسابی دەردادێ، پەرپەرچ دەدرێتەوە و قوبووڵ ناکرێ. جەخت لە سەر سریشتی تاکانە لەم ڕووەوە گرینگە کە ناتواندرێ ئاگایی زیهنییەت دەگەڵ بەرهەمی کرداریی ویدا بە یەک چت و یەکسان لەقەڵەم بدرێ، چونکە ئاگایی لە ڕێی کارەوە لە خۆی بەولاترەوە دەڕوا. زیهنییەت بە هەر حاڵ دەبێ بە پێی کار بناسرێ نەک بە پێی واقیعییەت. هەسی (وجود) بۆ خۆی کارە، یان سارتەر گوتەنی: "هەسی، هەبوون، واتە: خۆ دروستن کردن". بەڵێ جەخت کردنی وی لەسەر گرینگیی تاک و ئازادی و سەربەخۆیی بەکردەوە و ئاکاری (أخلاقی)ی وی لێرەوە ئاودەخواتەوە. تاکی مرۆڤ بەرهەمی کاری خۆیەسی. زیهنی کارئەنجامدەری مرۆڤ هەمیشە بە پێی خواستی مەبەستی خۆ وەدەست هێنان، لە خۆی بەولاترەوە دەڕوا. وێڕای وەش هەموو، دەبێ ئەوە بزانین کە دە حاڵێکیدا کە لە ئاغڵەبەی فەلسەفە وجوودییەکاندا کار و پراکتیک و زیهنی تاکانە وەک کارگوزاری بەرهەمهێنی بەها (قیم)یەکان جێی جەخت لەسەرکردنە، لە مارکسیزمدا بە شێوەیەکی سەرومر و هەموانی، پراکتیک لە زیهنییەتی دەستەجەمعی (کاری کۆمەڵەکی)دا، جێی بایەخ و گرینگییە. ئاشکرایە کە سارتەر بە مەبلێکی ڕاشکاوەوە بە لای مارکسیزمدا جەختی ئەسڵیی خۆی لە تاکەوە بۆ گرۆی کۆمەڵەکی ڕادەگوێزێ.

سارتەر، لەمەڕ هاوسەروکاریی مرۆڤەئاگایەکانەوە دە نێوان یەکدیدا "دیکە" (غەیر) بە سنوورێک لە پێش ئازادیی تاکدا لە قەڵەم دەدا و هەمیشە مایەی کێشەیە و بە

ناکامی ئەنجامی دێ. بەم بۆچوونە، هەر تاکێ دەگرێ، لە ئامرازێ بەولاوە زێتر نییە.
وەك کاورای شاعیر یەژێ: "الناس للناس من بدو ومن حضر / بعض لبعض وإن لم یشعروا خدمُ"، بەڵام لەپاشان ئەم فەیلەسووفە هاوچەرخە، لەم ئەسڵە پەژیوان دەبێتەوە و بۆ ئەوە دەچێ کە تاك لە شێوەیەکدا دەتوانێ ئازادیی خۆی ڕەچاوبکا کە بە هەمان سەنگ و تەرازوو، ئازادیی غەیری خۆ(دیکە)ش سەریەسەر ڕەچاوبکا. بەم پێیە ئازادیی هەر تاکێ بگرێ، بە ئازادیی یەکێکی دیکەوە گرێ دراوە. چونکە هەر هەڵبژاردنێکی تاکانە لە واقیعدا هەڵبژاردنێکی هەموانییە و بۆ هەموانە. ئاکامی کردەوەکانی هەر تاکێ وەك شەپۆلی لافاو داوێنگیری هەمووان دەبێ، لە ئەنجامدا هەر تاکێ لە کردەوەگەلێ کە ئەنجامیان دەدا، بەرابەر بە هەمووان یان خەڵکانی دیکە بەرپرسە. جا هەر ئەم هەست بە بەرپرسایەتی کردنەیە کە لە نیگای سارتەرەوە دەبێتە هۆی هەراسانیی نێو دڵی مرۆڤ و تووشی ناڕەحەتیی دەکا. ڕاستیت گەرەکە، ئاوها وەرچەرخانێ، زەوینەی بۆ پێشوازیی تەواوعەیاری سارتەر لە مارکسیزم هەموار کرد. سارتەر لە پاش ١٩٤٤ سەرقاڵییەکی تەواوی لە گەڵ سۆسیالیزمدا پەیداکرد و قسەی لەوە دەکرد کە دەکرێ کۆمەڵێکی بێ چین بێتەگۆڕێ. لە سەرێکی دیکەوە لێوەکۆڵینەکانی لە باسی "هەبوون و نەبوون" دەربارەی دژایەتی دەگەڵ ڕەسەنایەتیی چییەتی (مبدأ الماهیة) لە فەلسەفەدا و جەختکردن لەسەر ڕەسەنایەتیی هەبوون (هەسی) و ئازادیی مرۆڤ دە خۆدروستکردندا، زەوینەی پێویستی لەبۆ پەسەندکردنی دەربڕین (گوزارشت)ێکی مرۆگەرییانە لە مارکیسزم هێنابووەگۆڕێ. هەڵبەتە سارتەر بە چاوێکی باشی لە پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسە نەدەڕوانی، بەڵام پشتیوانی لێ کردنی بۆ پێشخستنی سۆسیالیزم بە کارێکی پێویست دەزانی و هەر لەم ڕووەوە لایەنگری و پاسەوانیی خۆی لە پارتی کۆمۆنیست و یەکیەتیی سۆڤیت سەرسەختانە دەکرد.

وەرچەرخانی بیرەکیی تەواوی سارتەر بە لای مارکسیزمدا، بە نووسینی کتێبی "ڕەخنە لە ئەقڵی دیالێتیکی (١٩٦٠) هەر بە تەواوەتی یەکلابۆوە و بە چڵەپۆپە گەیشت. سارتەر لەم کتێبەیدا بە پێچەوانەی بیروبۆچوونەکانی لە کتێبی "هەبوون و

نەبوون"دا، لە جیاتیی تاك، كۆمەڵ و پێوەندییەكانی نێو كۆمەڵی بە تەوەرەی لێوەكۆڵین كرد. سارتەر لەم كتێبەیدا ویستوویە ماركسیزم و ئێكسیستانسیالیزم لێكدی جۆش بدا. نەك هەر ئەمە، بگرە وجوودییەتی بە لكێ لە ماركسیزم لە قەڵەم دا. ئەم فەیلەسووفە ماركسییەتی بە فەلسەفەی ڕەسەنی زەمانە دەزانی. بەڵام دەگەڵ وەشدا لەو بڕوایەدا بوو كە ماركسیزم بەو شێوەیەی كە لە باوە، پێویستی بە فیچقەیەكی خوێنی نوێی وجوودییەت هەیە. سارتەر زۆری ڕك لە زاراوەگەلی وەك ئەرتەدۆكسی ماركسییەت و ئابووریگەری و حەتمییەتگەری دەبێوە و هەمیشە وەبەر هێرشی بێ بەزەییانەی دەدان. بەلای وییەوە ماركسیەت هیچ جۆرە سەروساخت و هاوئاهەنگییەكی دەگەڵ ڕامانە (نظریة)ی ماددییەتی حەتمییەتگەری و ئابووریگەریی دیزكییەوە نییە و ئەوەی كە هەیە هەر یەكسەرە ڕامانەی پراكسیس و كار و ئازادیی مرۆڤە لە مێژوودا و بەس. ژێرخان و سەرخان هەرتك، بەرهەمی كار و پراكتیكی مرۆڤە. بە شێوەی هەموانی (بتوونی) سارتەر دەیگۆ: " مرۆڤ تەنها لە تاكایەتیی دژمنایەتی ئامێزدا ژیان بەسەرنابا، بەلكو دەچتە نێو جەنگەی ژیانی كۆمەڵایەتیشەوە و لەم ڕووەوە هاتووە بە ڕەگوڕیشەوە لە میكانیكییەتەكانی پێكهاتنی وەكولێیەوە. پێوەندییەكانی دژمنایەتیئامێزی تاكان وەزعێكی بەردەوام نییە و بە ئەنجامگری لە كتێبی ڕەخنە لە ئەقڵی دیالێكتیكی، ئەم دژمنایەتی ئامێزییە لە ئەسڵی ناتەواویی كۆمەڵەوە ئاودەخواتەوە و لەبەر ئەمە، بە خۆیی (ذاتي) و ناچاری (ضروري) لە قەڵەم نادرێ. بەلای سارتەرەوە، جیهانی كۆمەڵ، ئەفراندەی كرداری دەستەجەمعیی مرۆڤانە، هەرچەند ئەم فەرایەندە خەسڵەتە تراژیكەكانی فەلسەفەی وجوودیی سارتەرە. بە كورتی، فرەپێداگرتنی سارتەر لە سەر ئازادی و كاری مرۆڤ، لە ماركسییەتەوەی نزیك ئێخستەوە. بەلای ئەوەوە دەشێ مرۆڤی "لەخۆدائازاد" جارێكی دیكە (لە ڕووی سیاسی - كۆمەلایەتییەوە) ئازادبكرێتەوە؛ چونكە ئازادیی مرۆڤ لەم دوو لایەنەوە جوداوازە.

بەلای منەوە، سارتەر دەیهەوێ هەر هەمان قسەی مارکسییەت دووبارەبکاتەوە کە دەڵێ: مرۆڤ لە قۆناخی کۆمۆنەی سەرەتاییدا ئازادانە دەژیا، کەس کەسی نەدەچەوساندەوە، واتە: هەر خۆی لە خۆیدا ئازادانە پەیدا ببوو، بەڵام لە پاشان لە قۆناخەکانی دیکەی مێژوودا تووشی چەوساندنەوە و کۆیلەتی و بەردەگی بوو و دەکرێ جارێکی دیکە بە شێوەیەکی پێشکەوتووتر ئازادبکرێتەوە، واتە: لە کۆمەڵی کۆمۆنیستیی نوێدا، جارێکی دیکە دەس لە ملانی ئازادی ببێتەوە

مارکسییەکان فەلسەفەی وجوودی بە هەموو جۆرەکانیەوە بە فەلسەفەیەکی کۆنەپەرستانەی ئایدیالیستانە دەزانن. ئەوان پێیان وایە کە ئەم فەلسەفەیە، یان ئەم تەرزە فەلسەفەلێدانە ئاکامی قەیرانی شەڕی یەکەمی جیهانییە کە سەرمایەداری هەڵیگرساند.

بە ڕاستی وجوودییەت، فەلسەفە نییە، بەڵکو شێوەی فەلسەفەلێدانە. باشە، ئەم شێوەی فەلسەفەلێدانە بۆ خۆی چییە؟ لەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا، هەمیشە دەگەڵ جۆرێ لە فوونەجوڕکێدا ڕوویەڕوو دەبینەوە. ئەمەش تا ڕادەیێ لەوەڕا سەریهەڵداوە کە ئەمەی بە ناوی جۆرێ لە فەلسەفەی جیددی دەبەر هەتەری چاو گیراوە بە زۆری بە هونەرکارییەکی عەوامزەدە کراوە؛ لەبەر هەندێ ئەتەکێتی فەیلەسووفی وجوودی یان فەلسەفەی وجوودی بۆ هەموو جۆرە کەسان و چالاکیگەلێ بەکاردەبرێ کە ئەگەر بۆرە هاوسەروکارییەکیان پێکەوە هەبێ، هەر تەنها لە دوورەوە دەگەڵ فەلسەفەی وجوودیدا سەروکاریان هەیە. سارتەر گوتەنی: "ئەم واژەیە بە ئەندازەیێ ناقۆلایانە بۆ هەموو چتێ بەکاربراوە کە ئیدی ئەسڵەن هیچ مانایەکی نییە."[1] هەرچۆنێ بێ، ئەم گرفتە تا ڕادەیێ لەبەر ئەمەیە کە جۆرە فوونەجوڕکێیەک دە خودی فەلسەفەی وجوودییەتیش ئاخندرایە. دلکۆکیکەرانی ئەم فەلسەفەیە بە ژێر ئەوەوە ناچن کە بتواندرێ واقیعییەت وەک مێلکەی پاککرای دە چەمکان ئێخرێ، یان

---

[1] **JEAN Paul Sartre, Existentialism is a Humanism** *Exsitentialism from Dostoevsky to Sartre*, ed,. Walter Kaufmann (Cleveland 1956), p. 289.

دە سیستەمێکی ڕێکوپێکدا نیشان بدرێ. کیرکگارد، بابی فەلسەفەی وجوودیی خولی نوێ، بەرەچاوکردنی هەمان مانا نێوی دوو دانە لە گرینگترین کتێبەکانی بە نێوی چەند *پارچەیەکی فەلسەفی و پەراوێزی نازانستانەی دوایین،* نێوناون و لە دژی سیستەمی هاوداوێن (جامع)ی فەلسەفەی هیگلی تێ هەڵچوو. لە نیگای فەیلەسووفانی وجوودییەوە بێ سەروین بوون هەمیشە هەر هەیە. شیکردنەوە و زانستی ئێمە کەت و ناتەواو و کوتوپچڕە.

فەلسەفەلێدانی وجوودییەت، یان فەلسەفەی وجوودییەت، وەك هەر فەلسەفەیەکی دی، دەمی لە هەموو چتێ کوتاوە و لووتی دە هەر چتێ ژەندووە و دەکرێ لە زۆر سەرەوە باسی لێ بکرێ، دیارە ئێرە ئەو بوارەی بە بەرەوە نییە کە بە تان و پۆی سەرلەبەریدا بچین، ڕەنگە ئەگەر بە خێرایی سەرباسەکانی بەسەر بکەینەوە خراپ نەبێ وەك شێوەی *فەلسەفەلێدانی وجوودییەت:* فەلسەفەی وجوودی چییە؟ بڕێ نێوەرۆکی دووپاتە بوونەوە لە فەلسەفەی وجوودیدا، هەمەڕەنگی و هەمە جۆریی فەیلەسووفانی وجوودی، فەلسەفەی وجوودی و ڕەواڵناسی، ڕووی لێکجوداوازیی فەلسەفەی وجوودی لەگەڵ هێندێ جۆری بە فەلسەفەوە هاوسەرکار، *فەلسەفەی وجوودی و مێژووی فەلسەفە:* هێرمینۆتیك (تأویل)ی ئوستوورە و پەیدابوونی دەروونناسی، فەلسەفەی کۆن، لە سەرهەڵدانی عیسەوییەتەوە تا سەتەکانی ناوین، ئایین ئارایی، نوێژایی، ڕۆشنگەری، فەلسەفەی وجوودیی سەردەمی نوێی سەتەکانی نۆزدەهەم و بیستەم، چەمکی هەسی: (مفهوم الوجود)، وجوود و چییەتی (الماهیة)، چۆنیەتیی فامینی هێندێ لە فەیلەسووفانی وجوودی لە واژەی "هەسی"، بنیاتە بنەڕەتەکانی وجوودی، شیان (إمکان)ی شیکردنەوەی هەسی، *هەسی و جیهان:* هەسی و دەوروبەر، جیهانی هەر ڕۆژە، جیهانەکانی زانست و هونەر و ئایین، لەش، شوێن و کات، خۆڕسك، *هەسی دیکەکان:* هەسی ـ لەگەڵ ـ دیکەکان لەو ڕووەوە کە سیفەتی بنیاتیی هەسی دەڕسکێ، پێوەندییەکانی نێوان کەسەکی، لەش و دیکەیی، دەگەڵ ئاماژەیەکی تایبەت بۆ زایەند (سێکس)، هەسی ـ لەگەڵ ـ دیکەکانی ڕەسەن و ناڕەسەن، *ناسین و حاڵیبوون (فهم):*

فەلسەفەی وجوودی و زانستت ناسی حاڵیبوون، فەرافکنی، تەئویل، وێنەکانی شناسایی، کێشەی ڕاستی، *بیرکردنەوە و زمان*: بیرکردنەوە، زمان، بەرتەسکایەتیی بیرکردنەوە و زمان، *هەستکردن*: هەست و فەلسەفە، بڕێ تێبینیی هەموانی لەمەڕ هەست، نیگەرانی و هەراسانی، هێندێ هەڵچوونی گرینگی دیکە، *کردار*: هەس (موجود) دە پێگەی بکەری کردەوە (فاعل الفعل)دا، سەرپشکایەتی و ئازادی، عەزم و هەڵبژاردن، *کۆتایی هاتن و دڕێغیکردن*: واقیع بوونەتیی مەرگ، مەرگ، کاتمەندی، دڕێغی و نامۆیی (لەخۆبیانیبوون)، *هەڵوەدایی لە دووی هەبوونی ڕەسەن*: پرسی مرۆڤایەتیی ڕاستین، ویژدان، وەدەستهێنانی خۆیی، *مێژوو و کۆمەڵ*: لە هەبوونی تاکەوە تا مێژووی جۆری مرۆڤ، فەیلەسووفانی وجوودی و بیروبڕوای لێکنووفاق لە بابی مێژوودا، فەلسەفەی وجوودی لە پایەی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا، *میتافیزیکی فەلسەفەی وجوودی*: بوارەکانی میتافیزیکای فەلسەفەی وجوودی، لە هەبوونەوە تا هەسی، هەڵوەدایی لە دووی واقیعییەتی دوایین، ئاکام و تاك، کاریگەریی *فەلسەفەی وجوودی لە هونەر و زانستەکان*: فەلسەفە و فەرهەنگ، فەلسەفەی وجوودی، دەروون ناسی، دەروون پزیشکی، فەلسەفەی وجوودی و فێرکاری و پەروەرشت، فەلسەفەی وجوودی و ئەدەبیات، فەلسەفەی وجوودی و هونەرە چاوبیتەکان، فەلسەفەی وجوودی و ئاکارناسی، فەلسەفەی وجوودی زانستی کەلام (لاهووت) *نرخاندنی فەلسەفەی وجوودی*: هێندێ ڕەخنەگەل لە ئارادا.

ئەم سەرناوانە، هەریەکە بۆ باسێکی تیروتەسەلی فەلسەفییانە دەشێن و لە ڕوانگەی مارکسییەتەوە هیچیان لە جەنگەی ڕەخنەکاریدا بە سەری سەلامەت دەرناچن؛ چونکە مارکسییەت لە ڕوانگەیەکی ماتریالیستییانەی زانستییەوە لەم هەموو چتانە دەنۆڕێ، بەڵام فەلسەفەی وجوودی، یان وەك لە پێشەوە ئاماژەم بۆ کرد، فەلسەفەلێدانی وجوودییانە، بە هەموو تەرز و شێوەکانیەوە، لە نیگایەکی ئایدیالیستانە و میتافیزیکانەوە دەنۆڕێتە ئەمانە.

ڕەنگە لە باسی مۆدێرنیتە و مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزمدا، ناوبەناو خێرا ئاوڕ لەم سەرەباسانە بدەمەوە..

***بەپێلەکەی*** واژەی "مۆدێرن" کە لە سەرلەبەری زمانانی ئەورووپاییدا و لە زۆر زمانانی دیکەی وەک ئەمڕۆی، بە نموونە: کوردی، فارسی، تورکی و هتد دا بەکاردەهێندرێ، modormusی لاتینییە کە بۆ خۆی لە تەواوکەر (قید)ی modo سازکراوە. Modo بە لاتینی واتە: "ئەم دواییە، تازە، چەنانێ لەمەوبەر". هێندێ لەو بڕوایەدان کە ڕۆمییان واژەی moderni یان لە دوادوای سەتەی پێنجەمدا بە مانای بەهایەکان (القیم) و بیروبڕواگەلی یۆنانییەکان بەکاردەهێنا. بە بیروبڕوا کۆنەکانیان aktiqui دەگوت. مێژوونووس و سیاسەتمەداری نامێی ڕۆمی کاسیۆدۆرۆس کە لە سەتەی شەشەمدا ژیاوە هەردوو واژەکەی وەک دوو زاراوەی دژ بە یەکدی بەکارهێناوە. کورد و عەرەب واژەی "مۆدە" و "عەلمۆدە"ی بۆ جلوبەرگی ئەورووپاییانەی ئافرەت و "عەنتیکە"ی بۆ چتی سەیر و دانسقە و دەگمەن بەکاردەهێنن. هەروەها "عەنتیکەخانە"ش بە مانای مووزە و ئاسەوارخانە بەکاردەهێنن. بەڵام هێندێ ئەم دوو واژەیە بەم مانایانە بە ڕاست نازانن و پێیان وا نییە کە کە ئەمانە دوو زاراوەی بەرانبەر بە یەکدی و دژبەکەن، بەڵکو بەم پرسیارە تەئویلی (هێرمۆتیکی)یە لێک دەدرایەوە: ئایا ئێمە دەتوانین بەهایە کۆنەکان دەگەڵ هەلومەرجی نوێدا هاوخوان و هاوئاهەنگ بکەین؟ و ئەگەر وەڵامەکە، بەڵێیە، باشە ئەم کارە چۆن ئەنجام بدەین؟ ئەگەر ئەم تەئویلە ڕاست و دروست بێ، قسەکە وای لێ دێ کە بتوانین بیروبڕوا و ئەنجامەکانی ژیان و ئەزموونە فەلسەفییە کۆنەکان بە زمانی ئەمڕۆ و شان بە شان دەگەڵ زەمینەی نوێی ژیاندا بەرچڤەبکەین و هەنگێن دەلالەتی ڕەسەنی واژەی modo دەزاندرێ[1].

لەمەڕ نێوەرۆکی واژەی moderne دوور و نزیک لە ڕووی مێژووەوە جوداوازی نییە. ڕەنگە هەر لە ساڵی ١٤٦٠ەوە مەبەست لە نێوەرۆکی زیمنیی واژەی

---

[1] R.B. Poppin Modernism asa philosophical problem. Cambridge Massachusetes. 1995, P. 17. معمای مدرنیته/ بابک أحمدی (بە فارسی)

moderne له زمانی فەرەنسزیدا هەر بە مانای دژی چتی کۆن بەکاربردنی دەگەڵ مانا ئەسڵییەکەی ئەوڕۆکەیدا نەگۆڕابێ و هەر وەکو خۆی مابێتەوە. زۆر کەس کە ئەم واژەیە لە وتاری هەر ڕۆژەدا بەکاردەبەن، مەبەستیان "چتی نوێ و ئەمڕۆیینەیە کە لە جێی چتی کۆن ئیدی پەسەند نییە" هەر وەها لای ژمارەیەك لە تیئۆریسیەنەکانی کۆمەڵناسییش ڕەوایەتیی "مۆدێرن بوون" یا "مۆدێرنیتە" بەو مانایە دەفامرێ کە دەگەڵ دابودەستووری کۆندا لە شەڕ و هەڵلادا بێ.(٢)

مۆدێرنیتە بە زۆر جۆرە ناساندن ناسێندراوە. دەبەرابەر یەکدی گرتنی دوو جەرەیانی لێکجوداوازی بەکێشەی ڕووبەڕوویی مۆدێرنیتە لێل دابودەستوورە کۆنەکاندا هەر ئەوەندە دەکرێ کە بگوترێ مۆدێرنیتە هەرچی لاف و گەزافێ لەمەڕ لێکدابڕانی کۆن و نوێدا لێ بدا کارەکە بە تەواوەتی ناگاتە حاڵەتی دوو چتی لێك دووفاق، بەڵکو هەمیشە چەند ڕەگەزێ لە دابونەریت، ئەفسانە و پڕوپووچ و بیروبڕوای ڕابردوو و بەریانە کۆنەکان بە بەر ژیانەوە هەر دەمێنێ و شێوەی ئیمڕۆیینی بە خۆوە دەگرێ. ڕاستە گۆڕانکاری لە ڕوانگەی یاسای دیالێکتیکەوە واتە: کەڵەکەبوونی چەندیەتیی بەرە ـ بەرە بۆ گۆڕانێکی چۆنیەتیی لەپڕ و ناکاوە، بەڵام یاسای لێك دووفاق بوون و گۆڕان و سەرلەنوێ یەکگرتنەوە هەر بەردەوام دەبێ و نابڕێتەوە و ئەم ئەم دیاردە مادییەش واتە: "جووڵە" کە گوزارشت لە واقیعییەتی ماددە دەکا.

بەلای منەوە چ مۆدێرنیزم و چ مۆدێرنیتە و چ پۆست مۆدێرنیزم لە مانای یاسای "نە لە نە کردن" (قانون نفي النفي) بەولاوە ناترازێ و بەم جۆرەی تێ نەگەین دەکەوینە توونە میتافیزیکەکانی ئایدیالیستەکانەوە و لە چەواشەیی بەولاوە هیچی دیکەمان لێ وەگیرناکەوێ.

هەر لەبەر هەندێکەش مۆدێنیزم و مۆدێرنیتە و پۆست مۆدێرنیزم، لە ڕوانگەی مارکسییەکانەوە، لێشاوێکی هاوچەرخی بۆرجوازیی سەردەمی ئیمپریالیزم لە

---

(٢)بابك احمدی، معمای مدرنیته، لا٤ کە ئەویش لە Lexis, Larousse de la Langue francaise, paris 1979.P.1172. وەریگرتووە

هونەردایە. مۆدێرنیزم بە لای تیئۆریسیەنی ئیسپانیایی ئۆرتیگا کاسیتییەوە واتە: نکوولی کردن لە تەواوی هونەری کۆنەباو. سەرەتای مۆدێرنزم ئایا لە سەروبەندی پووچانەوە و بەرەو هەڵدێرگلۆربوونەوەی فەرەنسی، یان کوبیزم [٣] (١٩١٧ ـ ١٤)

---

(٣) کوبیزم *Cubism* (شەشپاڵوونوێنی) بزاوتێکی هونەری، کە بە زۆری بە شۆرشگێرترین و دەسەلاتدارترینی بزاوتی هونەری سەدەی بیستەم دەژمێردرێ. کوبیستەکان بە پێشەنگایەتیی پیکاسۆ و براك دە نێوانێنی کۆششت بۆ نیشاندانی ئەوەی کە چاوی مرۆڤ دەیبینێ بە کەڵك وەرگرتن لە شکڵەیل و نمادەیلی شێوازەکی یان قاڵبگرتە بۆ ئەوەی چتان ماددییانەتر و دەسگرتەنیتر بنوێنن، هەولیان دەدا

کوبیسزم خوڵاسایانە بە سێ قۆناخەوە دابەش دەکرێ . یەکەمیان دەکرێ لێل تەواوکرنی پەردەی دووکیژەی ئاوینیۆنی پێکاسۆ لە ساڵی ١٩٠٧دا بە هاوسەروکار بزانەرێ، کە شکڵەیلە گۆشەدارە بەرەوازەکانی رەنگدانەوەیەك لە پێوەندیی پێکەییوی هونەرمەندانی پەیکەرتاشی سەرەتایی و شێوەی کاری "سزان"ە لە دوو ساڵی داهاتوودا، پێکاسۆ و براك بە سوودوەرگرتن لە شکڵە تێ هەڵکێشچنکراوە ئەندازەییەکان پەرژانە سەر پەرجەستەکردنی چتی ئاشنا و رۆشنا هۆگرەچاو و دەستیان لە پەرسپەکتیف و سێوەرۆشنی لەباو هەڵگرت.

دووەمین قۆناخ، واتە: کوبیزمی "شیکاری" (١٩١٠ ـ ١٩١٢) لە نیگای تەواوکرنی شێوەگەلی پیشاندانی رووە جۆراوجۆرەکانی یەك چت لە یەك کاتدا، دەگەڵ یەکیدا دەقاوەدەق جووت، یان بە تەنیشت یەکەوە زۆر گرینگە. گیتار، بوتڵ، سەویلە (پایپ) و وشەگەلی نووسراو، ئەغڵەبە لە نیگارەکانی ئەم سەروبەندەدا بەدیاردەکەون. هونەرمەندەکانی دیکەی پەیرەوی بزاوتی کوبیزم ئەمانە بوون: خوان گریس، لژە، دلوونە، مەتزەو و گلزا و دوو نیگارکێشی پاشین کتێبێکیان بە نێوی "دەربارەی کوبیزم" (١٩١٢) بڵاوکردەوە، هەرچەند نیگارکێشیی خۆیان لە لایەنی "شەشپاڵوونوێنی"ی بابەتی کارەکەیان لە تەرحە هاوئاهەنگەکان و بێ هیچ جۆرە ساختمانی بنەمایانە دە بزووتندا بوو.

پێکاسۆ لە مانگی مەی، ساڵی ١٩٤٢دا یەك تاکە پارێ لەچاپدراوی بە نیشانەی رووی کورسییەك لە یەك پەردەی نیگارکێشیکدا گونجاند، ئەم کارە لە شێوەی پێکهاتنی کۆلاژدا پێشدەستییەکی گرینگ بوو. هەروەها لە مانگی سێپتامبەری هەمان ساڵدا براك تیلماسکەیلێکی لە کاغەزی دیوارپەندی لە پەردەی نیگارکێشیی خۆیدا بەکارهێنا و هێندەی پێ نەچوو کە پێکاسۆ و گری بنەمای شێوەی پاپیە کۆلە ( *papier coll* کاغەز چەسپانی)یان دامەزراند و بە بروای خۆیان رەگەزێکی نوێیان لە

ئاوردەخواتەوە یان نا؟ ئەمە تا ئێستاکەش کێشە و مشتومڕی لەسەرە. ئەدەبیاتی تیئۆریانەی مۆدێرنیزم دە هونەری باڵادا وەک گەورەترین شۆڕش دەنرخێندرێ. هەرچی ئەدەبیاتی مارکسیستە بە پێچەوانەوە بە چاوێکی زۆر نەرێنی و خراپی تۆپیوەوتیێ و بە بەرەو هەڵدێر نزمبوونەوە و داخزینی شارستانیەتیی بۆرجوازیی لەقەڵەم داوە. لە جوانناسی و ڕەخنەکاریی سۆڤیەتی بەرێدا لە پێشان وەک دیاردەیەکی ئایدیۆلۆجی تەماشای مۆدێرنزیم دەکرا و لە دنیای ئەدەبیات و هونەرە

---

"ڕیالیزم" هێنایە نێو هونەری خۆیانەوە. ئەم پێوەندییە بە بنەمایەکانی چتی چندرلوەوە ئەمانی بە لای ئاڤیکردنەوەی پەیکەرتاشیدا ڕاکێشا، واتە: پەیکەرتاشیی کووبیستی ئەمجارەش بە پێشەنگایەتیی پیکاسۆ و لە ساڵانی سەفەریەری یەکەمدا لە کارەکانی هونەرمەندانی وەک ئارکیپنکۆ، لۆراس و لیپیتس (پێشەنگانی ئاوێتەگەری *Contructivism*) بە چڵەپۆپەی خۆی گەیشت. لە دوا قۆناخدا واتە: لە کووبیزمی "ئاوێتەیی (١٩١٣ ـ ١٩١٤)"دا نیگارکێشیی کووبیستی دژوارتر و بە گرێوگۆڵتر و ڕەنگاوڕەنگتری بەسەرهات دووبارەبوونەوەکانی چەندجارەکیانەی شکڵەکان و زمانی نیشانەگەل دێتەنیی بەکارهێنا، بەڵام لە سەروبەندەدا دەستنیشانکردنی فێرگەیەکی یەکانەی کووبیستی کارێکی زۆر سەخت و دژواربوو، جگە لەمەش لچکی دارێنەی کووبیزم بەر وڵاتانی دیکەش گەوتن و بزاوتەکانی ئێکسپرسیۆنیزم *Expressionism*، ئایندەگەرایی *Futurism*، بزاوتی دادائیزم *Dadaism*، گەردلوولیان *Vorticism*، ئورفەواری *Orphism*، واڵاگەرایی *Supramatism*، ئیستایڵ *De Stijl* و لەم جۆرە فێرگانەیان دەبن کاریگەریی خۆ ئێخستبوو. دە پیشانگەی چەکسازیخانە (قۆرخانە)دا (نیویۆرک ١٩١٣) بەشێ بۆ نیگارکێشییەکانی کووبیستی جوداکرابۆوە. لە لایەکی دیکەوە پەتیگەرایان *Purism*، پاش ئەوەی لژە پێوەندیی پێوە کردن، بە گەڕانەوە لەبۆ شکڵەکانی یەکپارچە و وردەکاریی موقلاشانەی میکانیزمی، دە بەرابەر کووبیزمدا هەڵزەقییەوە.

کووبیزم هاوسەروساختییەکی نزیکی دەگەڵ پێوەندیی نوێی ئەورووپاییان بە حازرەوە هەبوو و لە ١٩٢٣دا لژە چەند شانۆیەکی کووبیستیی لەبۆ بالێی ئەفراندنی جیهانی "داریۆس مێ یۆ" کە بە شێوەی جازی ڕەشپێستەکان تۆمارکرابوو، نەخشەڕێژی کرد. بەڵام ئێوی "کووبیستی" بە کارێکی هونەریی زۆر لە بوارەکانی دیکەش لەبەر ئەوەی کە ڕاستەوخۆ لە نیگارکێشیی کووبیستی ئیلهامیان وەرگرتبوو (وەک هێندێ لە شیعرەکانی ئاپۆلینز و ساندرل) یان لەبەر ئەوەی کە ساختمانی پارچە پارچە و چەندسیمایان هەبوو (وەک بالێی پەترووشکای ئەستراڤیسکی ١٩١١، ڕژە ساتی ١٩١٦ و ئۆلیس جۆیس١٩٢٢).

جوانەکانی ئایدیۆلۆجیای بۆرجوازیدا بە چێتێکی ئەوپەڕی کۆنەپەرستانە و لە دەرکی جیهانی بابەتیی بەرچاو و خۆریەدوورگر و بە هونەرێکی دژی هونەری مرۆڤەکی (هومانیزم) دەزاندرا. بەڵام پاشانەکێ بە داوێنتر و فرەوانتر و تێروتەسەلانەتر پەرژانە سەری و خەستتریان ڕوون کردەوە. مۆدێرنیزم لێشاوێکی هونەریی ئەوتۆیە کە لە هەموو جۆرەکانی هونەرە جوانەکاندا سەریهەڵدا و پاشانەکێ بەرە ـ بەرە چالاکییە مێژووییەکانی پتر پەرەپێ دا. بەڵام لە قۆناخە جۆراوجۆرەکانی دواییدا بە نێوی چەندین لێشاوی هونەریی دژی ڕیالیزم، وەك ئێکسپرێسیۆنیزم [٤]، کوبیزم،

---

(٤)ئێکسپرسیۆنیزم Expressionismزاراوەیەك کە لە ١٩١٠ بەم لاوە تێکرا لەبۆ وەسفی سەرلەبەری هونەرەکان، بە سێ مانا بەکاردەهێنن:

a)چۆنیەتیی جەخت ، یان هەڵگێڕانەوە distortion (قلب) ی دەربڕینی باری نێوەوە (یان، هەڵگێڕانەوەی واقیعییەت) کە لە کارە هونەرییەکانی هەر سەردەمێکدا یان هەر وڵاتێ، یان لە بواری هونەری تایبەتدا، دەکرێ دەستنیشان بکرێ. بە نموونە: لە ڕۆمانەکانی دستایفیسکیدا شانۆنامەکانی ئیستریندبەرگ و پەردەکانی ئیل گرکوو، یان ڤان گۆگ و هی دیکە.

b) کردەکییانە، سەرلەبەری بزاوتی نوێباو دە هونەرەکانی ئاڵمان و نەمسا ـ هەنگاری لە ١٩١٠ەوە تا ئاقاری ١٩٢٢، بە تەواوی ئەجەلییە خۆوار (محلی)یەکان فوویزم، کوبیزم و ئایندەگەرایی سەرەتا (مبدأ)یەکانی بزاوتی دادا و *Neue Sschlickeit* (زاراوەیەك کە بۆ ئەرکداری *Functionalism* ی میعماری لە هونەرەکانی دیکەشدا بەکاردەهێندرێ و بە مەبەستی زێتر کاردانەوەیك بەرابەر بە ئێکسپرسیۆنیزم لە دەیەی ١٩٢٠دا.. بە نموونە: لە نیگارکێشیدا گ. ف. هارتلوب بەرەووی دلیێ و بە "واقیعگەرایی نوێباو بە تامی سۆسیالیستی" ی تاریف دەکرد) ئەگەرچی پاشانەکێ بە ڕابردوو سپێردرا تا نیگارکێشییەکانی ئەدوارد مونکی ئەرویژی یا کارەکانی برۆکەش بگرێتەوە. بەڵام لە ١٩١٠دا عیبارەتی "ئێکسپرسیۆنیزم" لە ڕێی فەرەنسەوە لە ئاڵمان بڵاویەوە و پاش ئەوە بۆ یەکەم جار لە لە نیگارکێشیدا و پاشانەکێ لە ئەدەبیات، شانۆ (لە ١٩١٨ڕا) موزیك، میعماری، و سینەمادا بوو بە وەسفی بزاوتەکانی ئاڵمانی. ئیدی بەم ناولیە سیفەتە زەقەکانی ئەم بزاوتە ئەمانەن: هەڵگێڕانەوە، یان پارچە پارچەتوێتی و دەربڕینی ورووژانە توندەکان..ئەم فیێرگەیە لە کارەکانی وەك برووکە و سوار ئاپی لە نیگارکێشیدا و گیورگ هایم، گیورگ تراکل، و فرانتس وەرفل، لە ئەدەبیات، شیمردا و ئالفرێد دوبلین و فرانتس کافکا لە پەخشاندا و گیۆرگ کایزەر ئەرنێست توولەر لە شانۆدا و

فوتوتووریزم، ئەبستراکسیۆنیزم، موزیکی ئەتونالّ و هتد بڵاویبۆوە. لێشاوەکانی مۆدێرنیزم تەنانەت کاریگەریی خۆی لە ڕوخسار و نێوەڕۆکی بەرهەمەکانی نوێنەرانی ڕیالیزمی سۆسیالیستەکان، وەك ڤ. ڤ. مایاکۆفسکی، پ. ئیلوار، ب. بریخت، پ. نیرۆدا، ن. حیکمەت و هەروەها نوێنەرانی ڕیالیزمی ڕەخنەگەری سەدەی بیستەمدا، هی وەکو ی. هەمینگوای، و. فۆلکنەر و ف. گرین و نوێنەرانی نیگارکێشە نوێخوازەکانی وەك پ. پیکاسۆ و ئا. ماتیس و هتد نواندووە. لە سەرێکی دیکەوە ئەگەر دەوری هی وەکو ج. جۆیز، م. پرۆست، پ. کافکا و لە جۆری وان کە بە سیما بەناوبانگەکانی مۆدێرنیزم لەقەڵەم دەدرێن (بە مەرجێ لایەنە نووفاقییە زەقوزۆپەکانیان لە داهێنانەکانیادا ڕەچاونەکەین) لە کاری ئەدەبیی سەدەی بیستەمدا دەکرێ دیمەنی گەشەکردنی ئەدەبیاتی هاوچەرخ بیێ بە بابەتی چتی یەکسەرە و تیئۆریانە؛ جا تەنێ

---

کارەکانی پێشینی ئارنۆلد شوونبەرگ و ئاڵبان بەرگ لە موزیکدا و ئەریك مەندلسون لە بورجەکەی ئاینیشتاین و ئەرحە خەونییەکانی برۆنۆ تائووت لە میعماریدا و ڕۆبەرت فینە، کارگێڕی چیکی، لە سینەما، لە فیلمەکەی شیفاخانەی دوکتۆر کالیگاریدا.

ئامانجە سیاسیەکانی ئەغڵەبە ئاشتیخوازانە سۆسیالیستییەکانی ئێکسپرسیۆنیزمی ئاڵمانی کە لە بزاوتی چالاکیی سیاسیی سەرویەندی شەڕ گەڵاڵەدەبوو، لە ئاکامی پاژێ ڕووداوگەل دوای شەڕ وەکو سەرکوتکردنی ئیسپارتاکۆسەکان و شوورایەکانی مۆنیخ بەرەو نائومێدی چوو و بزاوتی پراکماتیزمتری ئۆبجەکتیڤیزمی نوێباو جێی گرتەوە ـ و ئێکسپرسیۆنیزم بۆ ئەم بزاوتەش، هەروەکو لەمەڕ فێرگەی پۆمۆسدا بەدیارکەوت شەقڵی خۆی لە جێژی هونەر دا، وێڕای وەی کە نازیزم هەرسێ بزاوتی ناوبراوی بە نێوی بزاوتەیلی چرووکەوە سەرکوت کرد. ئێکسپرسیۆنیزم لە بووژاندنەوەی هونەرەکاندا لە ئاڵمان لە ١٩٢٥ەوە سەرلەنوێ کاریگەریی خۆی نواند.

c) کارەکانی هونەریی سەدەی بیستەمی قارێەکانی دیکە کە ڕەنگ بە قەڵەمڕەویی ئێکسپرسیۆنیزمی ئاڵمانی دەداتەوە یان تایبەتمەندیگەلێکی هاوشێوەیان هەن، وەك "ئێکسپرسیۆنیزمی فلاندەری" کە لاتمسن مارتن بڕێ کاری دیاریکراو لە فێرگەی پاریس و ئێکسپرسیۆنیزمی ئابستراکتیی ژمارەیێ لە نیگارکێشانی نیۆیۆرکی وەك باڵك و دە کۆنینگ لە دەیەی ١٩٥٠ . (ئێکسپرسیۆنیزم حاڵەتگەراییشی پێ گوتراوە).

هەر لەبەر ئەمە لەم قۆناخە هاوچەرخەدا دەربارەی دیاردەی مۆدێرنیزم سەرلەنوێ ئاوڕەدرێتەوە و بۆ زێتر وردکردنەوە و تاوتوو و هەڵسەنگاندنی زێتر هەوڵدەدرێ. لە مۆدێرنیزمدا کۆنەکاری و نوێکاری بە وردی لێکدی جوداناکرێنەوە، چوون لە یەکپارچەییەکی زکماکدان. مۆدێرنیزم بە تێکرایی لە سیمای دوا خاڵی گەشەکردنی مێژوویینەی مرۆڤایەتی لە سیمای سەرمایەداریدا دەبینێ و دەیکا بە چتێکی بێ سنوور، بەلاّن وێرای ئەمەش ئەم مۆدێرنیزمە کە باری دەروونیی چینی بۆرجوای چکۆلە دەنوێنێ، دە پێوەندییەکی یەکجار توندوتیژ و سەلبی لێل دەورووبەر و ڕاستینی بۆرجوازیدا هەڵدەزەقێتەوە و لە ناکۆکی و ناتەبایی خۆی گوزارشت دەکا. لە مۆدێننزمدا ئەم جیهانە وەك پادشایەتییەکی پڕئاژاوە و بێ سەروبەر و دژمنی مرۆڤایەتی کە مرۆڤی تێدا بە هەزاران جۆرە نیگەرانی و پەژارە و بەدبەختی و ترسی مردن دەستەپاچە و مەحکووم کرابێ وێنەدەکێشرێ و لە نیگایەکی ڕەشبینانەی وەك خەییامەکان و کیرکگاردەکان و هیدگەرەکان و نیچەکان وسارتەرەکانەوە لە دنیا دەنۆڕێ و بە ئاوشت بەرەو بێهوودەیی و هیچ و پووچی و مەرگی ڕادەدا

یکچند بکودکی استاد شدیم

یکچند ز استادی شاد شدیم

داستان سخن شنو مارا چه رسید

از خاك برآمدیم و برباد شدیم

پشووکورتی و کورتهێنیی مۆدێرنیزم لە بەراوردکردن لەگەڵ ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە و ڕیالیزمی سۆسیالیستدا بە ئاشکرا دەسەوبەرۆکی یەکدی ڕادەوەستن و کێشەکە کێشەی خۆشەویستیی مرۆڤ و ژیان و خەباتی بێ پشوو لە پێناوی دنیا بە بارێکی مرۆڤانەتردا گۆڕینە، کێشەی مرۆڤی لامز و تەمبەڵ و تەوەزەل و لە تەرێن خۆر و لە وشکێن خەوخۆش و مرۆڤی ماندوو و چەوساوە و ڕەنج بە تالاّن و بڕۆ چووە، کێشەی هونەرێکی ڕوون و ئاشکرا و بێ تەمومژ و دەو بە خەندە و ڕوو لە ڕووناکییە، هونەرێکی چروچارترش و مۆن و گرژ و چاوبەفرمێسکی بێ دەسەلاّت و نائومێد و بێ بڕوا نییە.

* * *

مۆدێرنیزم هێندەی پێی کرابێ کێیەتی (هوویەت)ی مرۆڤی لە تووناوتوونی چەواشەییدا شەوارە کردووە و بە بەزەك و دۆزەکی ساویلکەفریوانەی بۆرجوای چکۆلە تا توانیویە و دەتوانێ  ورەی بە مرۆی بێ بڕوا و سەرگەردانی دنیای لەخۆبیانیدا بـەرداوە و خەریکە مرۆڤە بە یەکڕەهەندکراوەکانیش بـۆی بکرێ، بکا بـە بێ ڕەهەند. لـە هیـولای مـەری شـلییەوە کـە وێنـەی مرۆڤـی بێ زمـان و حەپەسـاو و دەسـەپاچە و دامـاوە و نـاتوانێ بەسەر خۆ ڕابگا و چاکە و خراپە لە یەك خانەدا دەحاوێنێتەوە بگرە تا هیووم و کانت و لایبنیتس و دیکارت و هێدگەر و چێمسکی و کێ و کێی دیکە لە میتـافیزیکی مۆدێرنیتـە بەدەر نییە.مۆدێرنیتە هەروەك پێی وایە پێناسەکردنی مەزنەی کێیەتیی مرۆڤ کـارێکی مەحاڵە، هەروەهاش لەمـەڕ پێناسـەکردنی مرۆڤگـەرایییش و  ئـەخلاق و زانسـتباوەڕی و ئەورووپاتەوەری ناسازەکانی دیموکراسی و فەیلەسووف و سیاسەتمەداریش، دەسەپاچە و چەواشەیە.

پارادۆکس paradox (بـە ڕەواڵ دووفـاق و کـەچی مـەقبوولیش)ی ئـایدیۆلۆژیی مۆدێرنیزم لە زۆر سەرەوە قسەی لەمەڕ کراوە. جارێ پێشەکی مۆدێرن و مردێرنیزم لـە دوو ڕوانگەوە: ڕوانگەی عەوام و ڕوانگەی خوێندەواری تەولوعەیارەوە جێی قسەوباسە. سەرلەبەری خەڵك کە لەمەڕ مۆدێرنیتەی لێ دەپرسی، دەڵێ: دنیای ئێمە دەگەڵ دنیـای ڕابردوودا زۆر جوداوازە و ئەگەر بە چاوی کابرایەکی زەمانی پێشینەوە لە هـەر چتێکی بنۆڕی سەرسام دەبی و جەلال نووریی تورك گوتەنی وەك ئەو کەسەی لێ بەسەردێ کـە پاش مردنی بە سەتەیەك زیندوو بۆوە و وەگەڕا سەر زەوین، بـەڵام نـە ئـەو تـاس و نـە حەمام، دنیا هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو..

ئەم نوێبوونەوەیە کـە لـە جیـهانی دەرەکیـدا ڕوویداوە و کـاتێ بـە ناوی مۆدێرنیتـە دەردەبردرێ، نوێبوونەوەیەکە کە هیچ پێویستیی بە بیرکردنەوە و تێڕامان نییە و تەنێ بـە چاوهـەڵێنانێکی هەسـتەکییانە دەتوانـین ببیینـین و بیناسـین. مەکینـەی چـاپ و

ئەلیکتریسیتە و فرۆکە و کامپیوتەر و بەرهەمەکانی پێترۆکیمیك و رادیۆ و تەلەفیزیۆن و فاکس و تەلەکس و تومبیل و سینەما و وێنەی ڕەنگاوڕەنگ و دەرمانەیلی کیمیاوی و ئامێرەیلی زانستی (میکرۆسکۆپ و شەوەنگنیگاری جورمی و ) کوورە و بۆمبەیلی ئەتۆمی هەموو سەر بە دنیای مۆدێرنن و ئاسەواریٚ لەمانە لە دنیای کۆندا نەبووە.

هێندیٚ پێیان واسە کە چتهایەکی زۆر لە تازەکوورەی جیهانی دەرکی، تازەبوونەوەیەکی دنیای بیرۆئەندێشەس و ئەمەش ڕوانگەی هەڵوێژردە و تایبەتە. هێ واش هەن یەژن: مرۆڤ کە لە دنیای نوێدا بڕیاری ئەوەی داوە بەسەر خۆڕسکدا زاڵ بیٚ، دژمنانە لەگەڵ خۆڕسکدا ڕەفتاردەکا، دە حاڵێکدا کە لە دنیای ڕابردوودا ئاوها لە خۆڕسك نواڕینێکی دژمنانە لە گۆڕێدا نەبووە. هێندیٚ دەڵێن: لە دنیای نوێدا، زانستە پراکتیکییەکان چەندین قات باڵایان بەسەر زانستە تیۆرییەکاندا دەشکێنەوە و ئەوان دەستڕۆتر و باڵادەستترن و پێشینیان بیریان زێتر لە تیئۆری پەرداختی کردۆتەوە تا زانستە پراکتیکییەکان و ئاسینی خۆڕسك و هەسی (وجود) بە لای وانەوە ئەسڵە ڕەسەنەکە بووگە، دەست لە خۆڕسك یان لە هەسی دان ئەوەندە مەبەست نەبووە و زۆری وە تەنگەوە نەهاتگن. هەروەها یەژن: جیهانبینیی مرۆڤی نویٚ ئەقڵانییە، کەچی نیگای بەشەری کۆن ئوستوورە بووە.

بگرە گوتووشیانە کە ئەقڵی مرۆڤی نویٚ، جودلوازیی چییەتەکیی لێل ئەقڵی مرۆی کۆندا پەیداکردووە. هەروەها گوتووشیانە: کە دنیای ڕابردگ، دنیایەکی ئایینیتر بوو. مرۆڤ لە ئاسمان و لە پشتەوەی خۆڕسکی دەنۆڕی و دابینبوونی نیازوخوازەکانی خۆی لەویٚ داوادەکرد و پشتیوانەی هەسیی خۆی لەوێدا دەدیت، کەچی لە دنیای نوێدا مرۆڤ پێوەندیی خۆی دەگەڵ ئاسماندا پچڕاندووە و پشتیوانە پیرۆز، یان مەعنەوییەکانی هەسیی خۆی فەرامۆش یان ئینکار کردووە. خودا لە ژیانی پێشینیاندا کاریگەرییەکی بیٚ هاوتای هەبوو، کەچی لای مرۆڤی نوێیاو خوداوەند کەمتر بە بیردێتەوە و زێتر پشت وە هەسیی مرۆڤ و ئاوەزی وی دەبەستریٚ.

پەڕێن: جوداوازیی جیهانی نوێ نیل جیهانی کۆندا لەوەدایە کە بە فەرمایشتی مارکس لە ڕابردوودا بیرمەند[illegible]ـیتر لەدووی نیکدانەوە و تەفسیری جیهان هەڵوەدابوون، بەلاتەکینێ ئەوە[illegible] ـە دوای گ[illegible] ـیبەوەی، دەڵ[illegible] دنیای ڕابردووان [illegible]ـرە وەسەرحەدوسنوور بوو. زەوین کە لە ژێر چەتری ئاسماندا بوو، بە ماڵیکی گەرموگوڕ و چکۆلە و ئارام دەزاندرا و مرۆڤ ڕابردووی حوشیان و دەورویەری خۆشیان یەکجار بە چکۆلە دەهاتە پێش چاو، وەلێ لە دنیای نوێدا مرۆڤەیل لە ڕووی کاتی و شوێنییەوە لە دنیایەکی بێ لێواردا دەژیێن و بە ڕاستی لە پێشینەی خۆیان بێ خەبەرن.و دنیای جوغرافیاییی خۆیان لەوە بە گەورەتر دەزانن کە هەست یان ئەقڵ بتوانێ بڕ بە سەرلەبەری ڕەهەندەکانی وی بکا. دیارە ئەمانە قسەگەلێکن کە وە باریکان و قەویان، ڕێسریاگن و مێژوونووسان بە جیا ـ جیا هەریەك لەم جوداوازییانەیان لە نێوان دنیای کۆن و دنیای نوێدا بە گەورەترین جوداوازی لە قەڵەم داوە.

بەڵام ئەم قسانە بۆ ئەوە دەست نادەن کە تۆ گەورەری مۆدێرنیتەیان تێدا بدۆزییەوە. بەڵێ لە بڕێ ڕاستی و دروستیش وەنەبێ بەدەربن. بەڵام ئەم نوێبوونەوەیە، نوێبوونەوەیەکە کە دنیای نوێ بە درێژا و دەوامی دنیای کۆن دەنوێنێ، نەك لەو لەبەرتر و دوورتر. ئێمە دوو جۆرە نوێبوونەوەمان هەن: یەکێکیان نوێبوونەوەیەك کە هەیە یان دیاردە نوێیەکە وێڕای جوداوازییەکانی دەگەڵ هی پێشیندا بە درێژای وی دەزانێ. هەرچییەکم لە پێشەوە عەرزی خزمەتکردن هەموویان جیهانی نوێ بە درێژا و دەوامی جیهانی پێشین دەزانن و هەڵیەتە لەو بڕوایەدان کە گۆڕان و وەرگەڕانێکی سەخت و قووڵی تێدا ڕوودلوە، بە جۆرێکی کە پێشینیان نەیانتوانی وا بزانن کە ڕۆژێ لە ڕۆژان چارەنووسی جیهان بەم جۆرە دەشکێتەوە.

وەلێ نوێبوونەوەیەکی دیکەمان هەیە کە بریتییە لە "لە ڕابردوو دابڕان و دوورتر لەوی ڕۆیشتن و لێ وەدەرکەوتن" و بە وردی ئەوەی کە لە دنیای نوێدا لە مرۆی نوێ ڕووی

داوە، ئەمەیان مۆدێرنیتە و نوێبوونەوەیە و ئەمەیە کە ئێمە بە چراوە لە دووی قەلاشتنی دەگەڕێن. هەروا بیری لێ بکەنەوە، کەسێ دەتوانێ لە ستاتووکۆ (باو) بدوێ کە لێی وەدەرکەوتبێ، هەروەها کەسێ دەتوانێ باسی مۆدێرنیتە بکا کە لێی دابڕابێ و لێی دوورکەوتبێتەوە. ئەمەی کە پێشینیان لەبەرچی لەمەڕ ستاتووکۆ نەدەدوان ئەوە لەبەر هەندێکە بوو کە سەر تا پایانی تێدا نقووم ببوون. لە ستاتووکۆدا نقووم بوون دژی وەیە کە ئەتۆ وەبەر پاسوخواسی ئێخی. کەسێ کە لەمەڕ بابەتێکی وەدەکۆڵێ دەبێ توانستی ئەوەی بە بەرەوە هەبێ کە بتوانێ لێی دابڕێ. شاعیری عەرەبی زمان لە خۆڕایی نەیگوتووە: "یموت الهوی منّي إذا ما لقیتُها/ ویحیى إذا فارقتُها فیعود". بە کوردییەکەی: کە پێی دەگەیەم و دەبین بە یەک جەستە، ئازاری ئەوینم دادەمرکێ و دەمرێ/ کاتێکی لێی دادەبڕێم و دووردەکەومەوە، زیندوودەبێتەوە و وەدەگەرێ. ویستیان قەناعەت بە ماسی بکەن کە جیهانێکی دیکەی غەیری جیهانی دەریا هەیە کە زیندەوەری تێدا بە بێ ئاوی نێو دەریا دەژین، گاڵتەی بە قسەکانیان ... ئەمن نەدەم پێ سەیرە کە مرۆ سەرتاپای لەم کەون و کائیناتەدا نقووم بێ و باسی کۆتایی و ناکۆتایی هاتنی بکا. هەروەها کە میتافیزیکانە و ئایدیالیستانە بیردەکەمەوە ئەو نەقڵە چکۆلەیەم هەرچەندی دەکەم و دەکۆشم ناتوانم لەو بڕوایەدا ... "جزء" وەک چەمکێکی رووت بە بالای "کل"دا دیسان هەر وەک چەمکێکی رووت بگاتەوە، یان "کل" لە "جزء"دا جێی ببێتەوە .. هەر لەبەر هەندێکەش ئەمن هەرچەند دەکەم قسەکانی عیمادوددینی نەسیمیی حورووفی و سەرلەبەری سۆفییە بڕوا بە وەحدەتی وجوودەکانم بۆ قووت ناچن کە دەڵێ:

Men bu cehane sıgmezem
Mende sıgar uki cehan
Kevn u mekane sıgmezem
Cevher - i lamekan menem

بە کوردییەکەی: ئەمن لە نێو ئەم جیهانەدا جێم نابێتەوە/ هەردوو جیهان لە مندا جێیان دەبێتەوە/ لە کەون و مەکاندا جێگەم نابێتەوە/ گەوهەری بێ مەکان منم

بەلاّم کە ناچار، یا دەدەمەوە سەر بە ماددییانە بیرکردنەوە، "کـل" وەك مـاددە نـەك وەك چەمکی ڕووت، بە چڕکردنەوە و خەست و پەیت کردنـەوەی ئەتۆمـە پێکهێنـەکانی دە "جزء"دا بە شاشوواشتر و بەربلاّترکردنەوەی ئەتۆمە پێکهێنەکانی جێی دەبێتەوە و دەگەیەمە ئەو ئەنجامە کە چەمکی ڕووت لە سێبەری ماددەی واقیعی بەولاوە چیدیکە نییە و بەمە دڵم دادەکەوێ.

ئێمە کە باس لە مۆدێرنیزم دەکەین ئەمە ئەوەمان بۆ بەدیاردێخی کـە ئێمـە هـەم لـە لەباو (ستاتوورکۆ = تقلیـدی)یـش و هـەم لـە مۆدێرنـیزمیش وەدەرکـەوتووین، واتـە: وردە ـ وردە لـە مۆدێرنـیزم دادەبڕێـین، مۆدێرنـیزم لـەبۆ مـە بوویتـە گوتـە (مەقوولـە)یـەکی قـابیلی بـاس لێ کـردن و هـەر لەبـەر ئەمەشـە کـە دووفاقییـەکی ڕەوالأنەسووفاق (پارادۆکس) دەگەڵـە خـۆ دێنـێ کـە پاشـانەکێی لێ دەدوێـین. یـا وە تەرحێکی تری بێژم، ئێمە ئەمڕۆکە لێل ستاتوورکۆ و مۆدێرنیزم، هەرتکاندا پێوەندیی سووژە ـ ئۆبجە (ذاتی و موضوعی)مان هەڵبەستووە و ئەی ئەمە نیشـانە و بەڵگـەی ئەوە نییە کە ئێمە لە هەرتکان وەدەرکەوتووین. پێشینیان بە ئاوەز کاریان دەکرد، بەلاّنەکێنیێ لە خودی ئاوەزیان نەدەپرسی گەلۆ چییە و چی نییە. لە ئاییندا سەرتاپا نقوم ببوون، بەلاّم خەریکی ئایینناسی نەبوون، لە ڕاستیی ئایینیان نەدەپرسی داخۆ چییە و چی نییە و لە چ قوماشـێکە. ئایدیۆلۆجییـان هـەبوو، وەلێ ئایدیۆلۆجیبـازی، ئایدیۆلۆجیناسییان نەدەکرد، ماریفەتیان هـەبوو، لێ ماریفـەتبازی، ماریفەتناسـییان نـەدەکرد. ڕاسـتییەکەییت گەرەکـە گەوهـەری مۆدێرنیتـە، بریتییـە لـە پـەیدابوونی ماریفەتەیلی پلەدووەم؛ هەر لەبـەر هەندێکـە دەبینـین گوتەگـەل (مقـولات)ێ کـە دە دنیای نوێدا سەریان جووقاون، بۆ کەسانێ کە هێمـان سـەریان لـە بن لێفـەی لـەباو دەرنەهانیوە هەرگیز چەشکەی تێگەیشتنیان ناکەن و مەگـەر هـەر بێـژن ئـەم نانـە وەو نۆشاوە جیهان وە زانست و سنعاتی نوێ نەبووگە وە مۆدێرنزم، وە ڕوانگـە و تێنۆڕینێکی پلەدوومەوە بووگە وە مۆدێرنیزم.

ئینجا با ئەوەیشتە پێ بێژم کە مۆدێرنیزم لێل مۆدێرنیتەدا جیاوازییان هەس. مۆدێرنیتە هەر هەمان نوێبوونەوەیە، نوێبوونەوەیێ کە کەس نیازی نوێهانیی نەبووە و هەر خۆی لە خۆیەوە ڕووی داوە، بەڵام مۆدێرنیزم جۆرێ ئایدیۆلۆژی، جۆرێ ئەندێشەیە کە لە دوای نوێ لە جێگەی کۆنە دانانە و لەسەر ئەم بنەمایە مۆدێرن لە کۆنە لە بەرتر دەزانێ. بە پێی ئەمە مۆدێرنیزم جۆرێ ئایدیۆلۆژییە کەچی مۆدێرنیتە حاڵەتێکە کە لە ئەندێشە یان لە دنیای دەرەکیدا ڕوودەدا و هەر بە تەواوەتی غەفلەت ئالوود و بە خوایشت و عەزمی کەسێ نایەتەگۆڕێ و بە خوایشت و عەزمی کەسێکیش ناگۆڕێ. هەر بۆیەش مارکس دەڵێ یاسایەکانی مێژوو بە بێ ئیزن و خوایشتی مرۆڤ کاری خۆیان بەڕێوەدەبەن.

بەڵام جوداوازیی ئەسڵیی دنیای پێشین و دنیای ئەمرۆ لەمەدایە کە ڕابردووان وەك ماسیگەلێ لە نێو ئاوی دەریای ئایین، ئاکار و ئەخلاق، ئایدیۆلۆژی، لەباو، ماریفەت و ئاوەزدا نقوم ببوون، وەلێ چون لە ئاو وەدەرنەکەوتبوون لە چییەتیی ئەم ئاوەیان نەدەپرسی. ئەوەندە دەگەڵ دەوروبەری خۆدا جووت و ساز و هەمواربوون و جۆشیان خواردبوو موویان بە نێوانیدا نەچووە و هەستیان بە هیچ لێدابڕانێ نەکردبووە. هەرلەبەر هەمان هۆ ژیانی خۆیان بە خواساییترین و سروشتیترین ژیان دەزانی و بیروئەندێشەکانی خۆیان لە هەموو بیروئەندێشەیلی تر بە ڕاستتر و بەڵگەنەویستتر دەزانی و مرۆڤەکانی دەوروبەری خۆیان بە هاوتاترین و هاوسەنگترین و هاولەبارترین و مرۆڤترینی مرۆڤ دەزانین و مێژووی خۆیان، بێ چۆن و بۆچی، بە تەنیا جۆری مێژووی مومکین و لەچارەنووسراو لەقەڵەم دەدا. بستوو و ئاسۆگەلی هەتەر و بڕی ئاوەز بە چندلشکان هێمان هێندە نەکرابۆوە و فرەسەری (تعدُّدی) هێشتا ئەم یەکسەری (أحادی)یە ئامالێ زیندانەی نەشکاندبوو و لەسەرڕا و لە دەرێڕا لە زگی داکی ڕۆژگار لە داك نەبیبوو و لەبەر هەمان هۆ گرینگترین خەسڵەتی ئەو مرۆڤانە، یەقینی غەفڵەتاوی و بێ دڵەڕاوکێ بوو کە لەویدا نقووم بوون، هەمان بەهەشتێ کە کاتێ کەسێ لەویدا دڵنیا و سەرسووکانە پاڵی لێ دلوەتەوە نرخی

نازانێ و کاتێ بە شەیتەنەت و گڕی و فڕیی ئـەقڵ لـەوێ دەربـەدەر دەکرێ، ڕێگـای وەگەڕانی لەبۆ وێ جارێکی دی وەگیرناکەوێتەوە. ئەم یەقینـە غەقڵەتاوییـە زیمنـەن بە چلەپۆپەی عەقلانییەت دەزاندرا و ئەقڵی کاملیش بە هەمبانەیەك لە قەڵـەم دەدرا کە لە بیروبڕوای حاشـاهەڵنەگر و یـەقینییات ئـاخندرابوو و ئەگـەر موتەسـەوویفە لـە ئەقڵدا دژمنایەتییان دەکرد، خۆ هەر ئەقڵی چۆن و بۆچیگەر و تامـەزرۆی گومان و یەقینی بێ خەوشیش بوو کە لە گرفت (ئیشکال)ی فەلسەفی لەزەتی دەبرد، نەك لە خۆ بەدەستەوەدان و یەقین.

باسی بابەتایەتی (الموضوعیـة objectivity) بـە زاراوەی فەلسـەفە ئـەمڕۆ لـە کۆمەڵـە باسـەیلێکی کـە بابــەتی مرۆڤـی نـوێ و ماریفـەتی تازەیـە، لـە نیگـای ڕابردووانەوە کە هەموو چشـتێکیان لـە ڕوانگـەی ڕاست و هەڵـەوە هەڵسـەنگاندووە، چتێکی تازەبابەت نییە، مرۆڤەیل هەمیشە ملیان لەبـەر ملـی خۆڕسك ناسین ناوە، باسی ڕاست و هەڵەی بیرونەندێشەی خۆیان کردووە (تا پێش کانتیش نەمانبیستووە کەس باسی بابەتایەتیی ماریفەتی کردبێ. ئەمە وەك بڵێی کارێکی پلـە دووەم بـووە کە زێتر لە دنیای نوێ و مرۆڤی نوێ دەوەشێتەوە. هـەر لەبـەر ئەمەیشـە دەبینـین کەسانێکی کە هێشتا لەگەڵ بیرکردنـەوەی نوێدا ئاشـنایەتیی پـەیدا نـەکردووە یـان خووی پێوە نەگرتووە، لەوە حاڵی بوون کە داخوا بابەتایەتی (چتی بەرهەست، نەك چتی ناو زەین) چییە؟ مانا وردەکەی چییە؟ ئەم پرسیارە بۆ چی هاتۆتەگۆڕێ؟ بـە ڕاستی ئەم پرسیارانە بە هەراشبوونی ئەقڵ کە گویـا هـەر ئـەو توانـی فریـای مـرۆڤ بکەوێ و لە زیندەوری دیکەی جـوێ بکاتـەوە و ڕاسیۆنالیزمەکان بەمـە وایان زانـی هەنگیان لە کلۆری داردا دۆزیوەسەوە و پێیـان وابوو کارەکە بەمە کۆتـایی هـات و کێشەکە بڕایەوە. بەڵام ئەقڵ نەیتوانی ببێ بە دەمڕاستی سەرپشك (فاعیلی موختار) و پێشەوا (ئیمام) و کارەکە بەوە گەیشت کە سەرچاوەی ڕاستی تەنها هەر خودایـە. مرۆڤ ناچارە بڕوای بە ڕۆحی ڕەهـا (مطلق) هـەبێ و بەمـە ئـازادیی مـرۆڤ بـوو بـە قوربانی ئەم ڕۆحی ڕەهایـە و کارەکـە لـە جەبرییـەت بـەولاوە چیدیکـە نـەبوو، وەلێ

پاشان یەکێکی وەك فیۆرباخ گوتی: بابە، مرۆڤ تووشی چەواشەیەکی گەورە هاتووە، ئەوەیش ئەوەیە کە ـ ئەستەغفیروللا ـ مرۆڤ بۆ خۆی خودای دروست کردووە (لە زەین و ئەقڵیدا) کەچی کارەکەی بە تۆراپەتیی چاوی ئەقڵی چەت بەهەڵگەڕاوەیی دیتنەوە لێکدایەوە و وای زانی خودا ئەوی دروست کردووە، واتە: کە خالیق بوو، کەچی خۆی بە مەخلووق زانی، ئیدی ئەوەبوو مارکسیش هات ئەمەی لە فیۆرباخ قۆستەوە و دەگەڵ تیئۆریی ئابووریی جووتبەقیٚ کرد و گوتی کرێکاریٚ کە خاوەن سەرمادارێ ناچاری دەکا ڕەنجی بەرهەمهێنی خۆی پێ بفرۆشێ و لە ٩٠٪ی بەری ڕەنجەکەی بێ بەش بێ و سارمایەدارەکە لێی بدزێ، ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەم ڕەنجبەرە چتێکی کە بۆ خۆی دروستی دەکا، چتێکی کە بۆ خۆی خالیقیەتی لە شێوەی پوولێ (زێرووزیوودا)دا لیٚ دەبیٚ بە خالیق و وای لیٚ دیٚ چۆن چتی پیرۆز لە بتخانەی قەلاٚی قەلاٚدار و دژداردا وەدەشێردریٚ، سەروەت و سامانی لە بەری ڕەنجی مرۆڤی تالاٚنکراو دەردەستکراویش لە خەزێنە و بانق و قاسە و شوێنی سەخت پارێزراودا تەقەت دەکریٚ و وەکو بتی لیٚ دیٚ و بانبانك و تەلەسمی پۆلیسی بە دەوردا دەتەندرێن و بە پاساوپێسای شەرعییەتی چینی فەرمانفەرما، وەك دۆم بیٚ کەلاٚش بۆ خۆی دروست بکا، داکۆکیی لیٚ دەکا. ڕەنجبەریش بەم کارە تووشی لەخۆبیانیبوون (ئەلیناسیۆن) دەبیٚ، هەروەك مرۆڤە خالیقەکەی خودا کە بۆ خۆی خودای دروست کرد، کەچی ئەوەی بۆ خۆی دروستی کرد لە خۆی کرد بە ڕەووەن و هەر بە خەیاڵ پلاٚو و لە دژی خۆیی کرد بە کەڵەگا و ئەوجا وەرە کڕنووشی بۆ بەرە و قوربانیی بۆ سەر برە و نوێژی بۆ بکە و لێی بتۆقیٚ و لە ئاوری دۆزەخی زەندەقت بچیٚ و لەبۆ یەهەشتەکەی زارت ئاو بکا و هەریەکە بە تەمای حەفتا حۆریی گۆڕان گوتەنی: قژکاڵی لێوئاڵی سەرگۆنا نەختیٚ ئالٚ بیٚ و هتد بەلاٚم با بزانین ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە لە چیڕا سەری هەڵدا؟ پێدەچیٚ مرۆڤ نە بە لێکدانەوەی خەیاڵ و نە بە چرای ئەقڵ و ئاوەز، هەتا هەتایە دڵی داکەوتووە و دادەکەویٚ. لە ئابووریی میوەچنینەوە و وردە زیندەوەرراوکردن و پاشان بە سەرەڕمبی لەبەرد داتاشراو

کەلەزیندەوەر ڕاوکردن وازی هێناوە و فێرە ئاژەڵ کەویکردن و شوانکارەیی بووە، ئەخێر ئەوجا بیری لەوە کردۆتەوە تا کەنگێ هەر ڕەوند و کۆچەر بێ و وەرزێ لە چیا و کوساران و وەرزێ لە دەشت و ئارانان لە دووی پەز و گاوگۆتاڵی کۆڵ بە کۆڵەوە، لۆژە لۆژی بێ ئەشکەوتی بە جێ هێشتییە، دەستی بە کۆلیت ڕۆنان کردییە. لە ژنەوە فێرە کشتوکاڵ بووە، فێرە حەسانەوە بووە. گوندی ئاوەدان کردیتەوە. ژن و منداڵ بوونی زۆر، بە هەرمێن و بەرەو کەوتووە. پێویستی بە ڕەنجدانی زێتر بووە، ژن کە سەرچاوەی منداڵ دروستکردن بووە، پەرستراوە (خوداییەکان لەسەرتاوە هەموو ژنن) ئەو بووکە وە قوێخا، پیاوی لەبەر لەرزیوە (تا هەنگەش، قسەیەکی خۆشی شۆخێ سەت دیکتاتۆرت بۆ لە خشتە دەبا، دەتوانێ تەخت و تاجی دەوڵەتان تا ئەوڕۆش بە تاراج بەرێ و بە بزەیەکی سەر لێوە ئاڵە عەننابییەکەی ئیمپراتۆریەکەت بۆ دامەزرێنێ و بیشی ڕووخێنێ. ئەخێر تەنێ بە کشتوکاڵیش دڵی دانەکەتییە، پیشەی جۆراوجۆری داهێناوە، بۆ خۆت دەزانی ئەوە ژیانە، ژیان هەموو چتێکی گەرەکە. بازرگانی پەیدا بووە، سنعەت، تەکنۆلۆجیای سەرسوڕهێن و واقوڕمێنی ئەوڕۆ پەیدابووە دبارە مرۆڤ بە خۆرسك ڕەخنەگرە، ڕەخنە لە هەموو چتێ دەگرێ. ئەگەر دە تاریك و لێڵەی گرۆگاڵیدا سیحر و ئەفسانەی بۆ ڕاپی کرنی کارەکانی داهێناوە و ئەوە بووە بە فەرهەنگی شارستانیەتی هەزاران ساڵی، پاشانەکێ ئایینی فرەخوداوەندی و یەکخوداوەندیی داکسالاری و بابسالاریی داهێناوە. لە پاشان پشتی لە ئایینیش کردووە و لە جیاتیی خودای لە هیچ چتێ نەچوو، ئەقڵی پەرستووە، پاشان وازی لە ئەقڵی ڕووت هێناوە و بایداوەسەوە سەر هەست و ئەزموون و ئەمەی لە هەموو چتێ بە ڕاستتر زانیوە، بەلام ڕاستییەکەیەت گەرەکە نە ئەقڵ بە تەنها بەشی هەموو کارەکە دەکا و نە هەست و ئەزموون بە تەنها. مارکسییەکان دەڵێن: نابێ موبالەغە لە دەوری یەك لەم دوو پلەیەی مارێفەتدا بکرێ و دەوری ئەوی دیان بە کەم بزانرێ. لە پرۆسێسی مارێفەتدا، مارێفەتی هەستی و مارێفەتی ئەقڵی هەرتك هەمان گرینگییان هەس،

هیچیان به بـێ هیچیـان وجوودیـان نییـه و هەڵناکـەن، جا هـەر لەمـەڕا یەکایـەتیی تیئۆری و پراکتیس کەوتۆتەوە. ڕاستی و درۆیی چت بـە کردەوە، بـە ئـەزموون و تەجرەبە بـە دیاردەکـەوێ. ئەگـەر خـەڵك هیـچ کارێکیـان نـەکردبا، مـەحاڵ بـوو زانیارییەك دەردەستکەن، بگرە هەر نەشیان دەتوانـی ژیـانی ژیـان ئاسایی بژیێن. کاتێکی تیرەی مـرۆڤ لـە ئـاژەڵ جوێ بۆوە، هیچ زانیارییـەکی تیئۆریـی لـەبارەی گۆڕانکاری و گەشەکردنەوە نەبوو، بەڵام ڕەنجیشیان دەدا: بۆ بژیوی خۆ هەڵپـەیان دەکرد، خانومانی خۆیان بنیاتدەنا و فێری سازکردنی جلك و بەرگان دەبوون و هـەر دە جەنگەی ئەزموون و تەجرەبەی ژیانی ڕۆژانـەدا مـرۆڤ لـە زۆرانبـازی و ملاملانـێ لەگەڵ خۆڕسکدا هەرچییەکی پێویستی بوو، فێربوو.

ئەمە ئەزموون و تـەجرەبەی ڕۆژانە پێمان دەسەلمێنێ. مرۆڤ کـە لـە دایـك دەبـێ هیچ جۆرە سەرەوبەرێ لەم دنیایە دەرناکا، لە هیچ نازانێ، هەرچییەکی کە وردە ـ وردە فێری دەبێ، ئەوە بە ئەندازەی دەگەڵ دیاردەکانی دەورویـەریدا هەڵـەنگوتن و هەڵکەوتنی وییە کە بە دەم کار و پراکتیسەوەی فێردەبێ. ئەتۆ دەبینی ساوایێ کـە هەڵپەدەکا و دەستی بۆ ئاور درێژدەکـا، بیگـرێ هێشـتا فـڕ لـە خەسیەتەکانی ئـاور نازانێ، بەڵام هەرکە بە ئەزموون و تاقیکردنەوە لە پراکتیسدا دەرکی خەسیەتەکانی دەکا، واز لە هـەولودەولی خـۆلێ نزیکبێخسـتنەوەی دێنـێ، بەمـەهێ بـۆرە ماریفـەتێ وەدەستدێنێ. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێ کە تەنێ ئەزموونی شەخسیی خەڵکەکە دە پراکتیسدا ڕاستە و بەس، نەخێر لە ئەزموونی خەڵکی دیکەش کەڵك وەردەگرین، لـە سەرلەبەری ئەزموونی کۆمەڵـەکیی تـیرەی مرۆڤیش سـوود وەردەگرین. پراکتیسـی کۆمەڵەکی گەلاڵەی چالاکییەکانی ئەو خەڵکەیە کە دە بەستێنی ویـدا کـار لـە دنیای ماددی دەکەن و دەیگۆڕن. مەبەستم لەمە: چالاکیی بە دەسـتەجەمعی و کۆمەڵـەکی بەرهەم ڕەنێوهێنانە، تێکڕا خەباتە، بە نموونە بزاوتی نەتەوایەتییـە، تاقیکردنـەوەی زانستی و هتد ... بزاوتـی ڕزگاریخوازانـەی نەتـەوەی کـورد، بـە زنجیرەیێ لـە ئەزموون و تەجرەبەی تاڵ و سەخت و هەوراز و نشێو و هەڵە و ڕاستدا تێپەڕیوە، لە

ییسدا ماریفەتێکی زۆری لە واری شۆڕشی چەکدارانە، سیاسەت، دیپلۆماسییەتدا
ڕکەوتووە. ئەتۆ هەر وا لە دیرۆکی زانست بنۆڕە: ئەندازە کوو پەیدا بوو؟ ئاوی
ی نیل بە هەزاران ساڵ وڵاتی نیلی بە لافاوان سەروبن دەکرد، هەر جۆرە
کی ئەندازیانەیان لەبۆ گۆڕخانەکانی فیرعەونەکان بنیاتدەنا، سێڵاوی بێ بەزە
ساڵێن و خشتی بەسەر دیواریەوە نەدەهێشت. لە گرد و تەپە و تەلانیان نەوڕی،
هەزاران ساڵە لافاو و لێمشت دێ، کەچی ئەو گردانە هەر لە جێی خۆنە. لەم
و تاقیکردنەوەیە ئەو شکڵە ئەندازەیە فێربوون کە قووچەکەکاس ئەمڕۆی
میسریان لێ هاتوونە گۆڕێ. میسرییە زیرەکەکان بەمە ئاوی نیلیان بەزاند و
ئیدی ئاو نەیکاری گۆڕخانەکانی فیرعەونە پیرۆزەکانیان بڕۆخێنێ و ڕامالێ.
زانیاری و زانست، بە ئەزموون و تاقیکردنەوە دەردەستدەکرێ. ئەزموونیش
اکتیس و کردەوەدا شایەتیی ڕاستبوون و هەڵەبوونی بۆ دەدرێ. پراکتیس و
ی دە چتی بەرهەستدا بەڕێوەدەچێ. لە پرۆسێسی گۆڕان و گەشەکردندا ڕاست
بیی چت، هۆکار و ئاکام (علّة و معلول) هەن، لە پرۆسێسی بیرکردنەوەی
تیکانەدا، تێز و بەڵگە (قضیة و دلیل) هەن. هۆکار چت دروست دەکا یان
خێنێ ، هەرچی بەڵگەیە، بیروبۆچوون ئیسپات دەکا یان بەتاڵی دەکاتەوە.
هۆکار و بەڵگە تێکەڵی یەکدی بکرێن. ئەوجا هەروەکوو "واژە" هەیە و
تاشی"هەیە، هەروەها "بەڵگە"ش هەیە و "بەڵگەتاشی"یش هەیە. دەڵێن: بە
ی مارکس، ئایدیۆلۆژی لە بابەتی بەڵگەتاشییە. بەرژەوندیی چینایەتی و جۆری
پێوەندییەکانی پەنێوهێنان و دەورووبەری کۆمەڵایەتی، هەروەك هۆکارەیلێ
ناچاردەکەن ئایدیۆلۆژی (کە بە پێچەوانە لە واقیمییەت گەیشتنە)
بهێنن. خەڵك لەسەرەتاوە ئاشقی جۆری ژیان و گوزەرانی خۆیان دەبن و
لەبۆ چاکی و ڕەوایی وی پاساو و بەڵگە هەڵدەبەستن و دەتراشن. ڕوونتری
ڕە: بۆرجوازی ئاشقی تەرزی ژیان و گوزەرانی بۆرجوازییانەی خۆی دەبێ کە
ری ئایدیۆلۆژییەکەیەتی، پاشان داکۆکی لە هەمان ئایدیۆلۆژی دەکا بۆ

مانەوەی. لێرەدا دەبینی هۆکار بە داتاشین کراوە بە بەڵگە، واتە: کڵاوی هەبا... لەسەر هەیاسی نرایە. کارەکە کڵاوڵەسەرنانە و هیچی دی... ئەوجا پرسیار ئەمە: ئایا قسە... ـ وەی مارکسیش هەر لە بابەتی ئایدیۆلۆژییە؟

مرۆڤ لە سەرەتاوە، ئەروا، بت، تۆتەمپەرست بووە، لە سەروبەندی ڕاووشکا... شوانکارەییدا، سیحر و جادوو (پێت وابێ بە ئەنجامدانی هێندێ چتی ناخواسا... چارەنووسی چتان دەگۆڕی. وەك: وێنەی کەڵەکێوییێ لە دیواری ئەشکەوتێکا... بکەی و بە ڕمبێ سەرەقولاتی پێ بدەی و بە تەواوی بڕواوە پێت وابێ... کەڵەکێوییەکەت کوشتووە و بۆ سبەینێ دەچیە ڕاوێ، بەو ئیحایەوە فیعلەن، بتوانی... کەڵەکێوییێ ڕاوبکەی..)، لە سەروبەندی کشتوکاڵدا بڕوای بە فرە خودایی یەکخودایی بووە. خودایەکانی لە دارودرەخت و خورما و تەیروتوو و ئەستێرە... هەرچی ڕەواڵەکانی خۆڕسکەوە هەن بگرە تا دەگاتە خودی مرۆڤ، لە پێشا... مێیینە و پاشان نێرینە، پەرستوون. پاشان بیری یەکخودای لە هیچ نەچووی (لیـ... کمثله شيء)ی بۆ خۆی داهێناوە و دڵی خۆی بەوە داوەتەوە و خۆی لە دڵەڕاوکێ... نیگەرانی و ترسی کەسنەزان (مجهول) تا ڕادەیێ قورتارکردووە. خۆلاسە: لە... قۆناخی هەستکردن بە چتی بەرهەست (تجسید) تێپەڕیوە و بە قۆناخی دەرککردنی... چتی بەرنەقڵ (تجرید) گەیشتووە. لێرەدا بیری خودا وەك چتێکی ناچاری بەسەر... مرۆڤدا زاڵ بووە. بەڵام پاشان "ئەقل" بەرە ـ بەرە لە قەڵەمڕەوی "ئەقل" وحی... کەم دەکاتەوە و بۆ نموونە: موعتەزیلە ئاسایی لە کەلامدا و حەنەفییە ئاسایی لە شەریعەتدا، دەورێکی گەورە بە ئەقڵ و "رأی" دەدرێ و تەنانەت جێگەی خودا دەگرێتەوە. نەخێر کارەکە بەوەندەوە ناگیرسێتەوە، ئەوجا لە ئەقڵ و ڕەئییش دەکەوێتە تەقەوە و گومان لە ڕاستی و دروستیی حوکمەکانی دەکرێ و سەروبەندی گومان کردن لە هەرچی چتی ئەقڵی هەس دادێ و نە هەست و تەجرەبە و ئەزموون و نە ئەقڵ و مەنتیقی ئەرەستوو بە شایەت قوبووڵ دەکرێن، ئیمامی غەزالی و دیکارتەیل پەیدا دەبن.

بە داخەوە ئەمڕۆ پۆست مۆدێرنیزم لە گێژاوی بێ بڕواییدا سەرگەردان و سەراسیمە دەخولێتەوە. چارەسەر لە هیچ چتێکدا بەدیناکا. پێی وایە خودایش و ئەقڵیش و هەستیش فریای خولیای مرۆڤ ناکەون. بەڵێ سۆسیالیستەکان دڵی مرۆڤیان بەوە دەدایەوە کە کۆمۆنەی پاریس تروسکەیەکی گەشی لە شەوەزەنگی چەوساندنەوەی مرۆڤدا درەوشاندەوە، وەلێ مخابن، تا ئێستاش هێشتا مرۆڤایەتی چەشکەی بەری ڕاستەقینەی نەکردووە (نازانم، تۆ بڵێی بە خەیاڵ لەمە چەشکەی بکا؟). بەلای منەوە، لە خەباتی بێ پشوو زێتر بۆ هەڵێنانی موعەممایەکانی ژیان هیچ چتێکی دیکە فریای مرۆڤ ناکەوێ. ئازادی، دیموکراسی، کۆتایی بە دڕندەیی سەرمایەداری هێنان، پابەندبوون بە بیر و دەسەڵاتی یەکتەوەرەیی و یەکڕەهەندی کردن، ژن لە دیلێتیی پیاو ڕزگارکردن، منداڵی چاوشین و چاوکاڵ، کیژی قژکاڵ و لێوئاڵ، لە برسێتی و نەخوێندەواری و نەخۆشی و بێکاری ڕزگارکردن، لە شەڕنانەوەی بەردەوام بۆ سوود و قازانجی ئەم کومپانی و ئەو کومپانیی زەبەلاح قوتاربوون، لە خۆڕسك وێرانکردن ڕزگاربوون و هتد فریای مرۆڤ دەکەون. لە کۆتاییدا مەگەر هەر قسەکەی شێخی سەعدی دووبارە بکەمەوە کە دەفەرموێ: "توانا بود هرکە دانا بود" و لە فێربوونی زێتر و زانایی پتر بەولاوە بۆ مرۆڤ کە لە هەردوو دەسەڵاتی سیاسی و سامانی بەهێزترە، نەماوەتەوە.

بەڵام با ئەوەشت بە گوێدا بچرپێنم کە ئەم باسە ئەوەندە چڕە درێژە خۆ بەم چەند ڕووپەڕەیە کۆتاییی نایە و ئەگەر بە تێروتەسەلی و خەستیی لێ وەکۆڵدرێ بە سەتان لاپەڕەش نابڕێتەوە. جا با هەر وەك سەرەباس هێندێ چتت لەمەڕ ئەم بەیتی بلەیە، یان مەتەڵی مێشە وەبیربێنمەوە، کە هیچ لێوەکۆڵێ ڕەنگە نەکارێ خۆیانی لێ نەبان کا.

ئەگەر بمانەوێ دە نێو گۆماوی ئەم باسەدا وە باسکەمەلە بکەوین، دەبێ ئەمانە وەبەر باس و لێوەکۆڵین بێخین: مۆدێرنیتە چۆن پێکهات: ڕێنەسانس (فەرهەنگی دێرینی یۆنانی سەرلەنوێ بووژاندنەوە و زیندووکردنەوە)، ئومانیست

(مرۆڤگەرایەکان، ئەوانەی کە هەر لە کۆنەوە مرۆڤیان بە تەوەرەی بیرلێکردنەوە و خەمی شەو و ڕۆژیان کردبوو و پێیان وابوو دەبێ مرۆڤ لە پێشان خۆی بناسێ و هەر مرۆڤ سەرچاوەی هەموو چتێکی ڕاست و درۆیە. ئاراسمۆسی ڕۆتردامی پێشەنگی ئومانیستانی سەدەی ١٦ کە پێی وابوو زیندووکردنەوەی فەرهەنگ و هونەری کلاسیك، بەبێ ڕووخاندنی فەلسەفەی سکۆلاستیك و ئایین چاکردنەوە سەرناگرێ. دە نامەیەکدا کە لەبۆ پاپی لویسی دەیەمی لە سالی ١٥١٧ دا نووسی نوخشەی ها ئەمڕۆ تا سبەینێ ڕوودانی سەردەمی زێڕینی لە سەروبەندی لویسدا پێشبینی کرد، سەردەمێ کە هەرچی زیاتر ئاشتی و ئارامی قاییمترکرێ و بەهێزترکرێ، هونەر، ئەدەبیات و شیعر و تەشەنەی ئاییندار و لەخوداترسی و پەروا و ترسپیشەیی هێندەی دیکە دەتەنێتەوە و حەوزەل دەستێنێ. بەلێ سەردەمی ڕێفۆرماسیۆن لە هەمان سالدا دەستی پێ کرد و ئیدی ئەوەبوو بە خێری هەموان گەڕا     پاشان یاکوب بورکهارت، مێژوونووسی بنەچەکە سویسری هات. ئەم پیاوە، نە گڕ و ئالهای میشلەی بۆ نەتەوەگەری لە کەللەدا و نە بێمەیلی و دڕدۆنگی و دژایەتیی ویی لەگەل سەتەکانی ناویندا لە دلدا هەبوو. ڕێنەسانسەکەی بورکهارت لە گۆڕین هینەکەی میشلە نەبوو. ئەمەکەی ئەم، ئیتالیایانە بوو. واتە: "ڕۆحی سیاسیی مۆدێرنی ئەوروپا" لێرەوە سەری دەرهێنابوو، ڕۆحێ کە گەرچی ئەغلەب بەدیارنێخەری خراوترین خەسلەتەیلی جۆریێ لە خۆپەرستی و خۆخوازیهایەکی پەتیسێن و دەستەڕێشمەبچڕای بوو، لە هەمان حالدا توانستی ئەوەی وە بەرەوە هەبوو کە بکارێ واقیعییەتێکی بە تەواوەتی تازە و نرتونوێ بێنێتەگۆڕێ واتە: "ئەتۆ لە دەولەت وا تێ بگەی کە بەرهەمی هونەرێکە". بە کورتی بۆرکهارت جەختی لەسەر تاککەرایی (ئیندیڤیدیالیزم)دەکرد، چونکە بە بڕوای وی تاککەرایی واقیعییەتێکی سایکۆلۆجیی وایە کە هەرگیز نکوولیی لێ ناکرێ.(٥)[*]

---

[*] (٥) ج. لوکاچ، یاکوب بوکهارت، ترجمە ح. کامشاد ص ٣٥-٣٧

جا ئەم جەخت لەسەر تاکگەراییە یەکێکە لە نیشانە هەرە گرینگەکانی ڕێنەسانسی ئیتالیایی کە ئاکام و پاپەندیگەلێکی فرە قووڵی بۆ ژیانی بیرەکی و هەستوخوستی مرۆڤ لێ کەوتنەوە. هەر جەخت لەسەر گەشەکردنی ئەم تاکگەراییە بوو کە کەشفی جیهان و کەشفی مرۆڤیشی سانا و مەیسەر کرد. بۆرکهارت پێی وایە، ڕاستە زیندووکردنەوەی فەرهەنگ و ئاسەوارەکانی سەروبەندی دێرین بە یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی بەرچاوی ڕێنەسانس دەژمێردرا، وەلێ نەك بەڵگە یان هۆکاری پێکهێنی وی. خۆلاسە بورکهارت لەو بڕوایەدایە کە کارەکە تەنها زیندووکردنەوەی سەروبەندی دێرین و ئاسەواری کلاسیك یان فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کلاسیکی یۆنان نەبوو بەڵکو پێوەندی و یەکیەتیی ئەم لێشاوە یان بلیمەتییەی خەڵکی ئیتالیا بوو کە دەستیان دایە دەستی یەکدی و فەتحی دنیای ڕۆژاوایان ساناکرد و وەدیهێنا. واتە: خەڵکەکە بۆ خۆی تایبەتمەندییەکی خۆی هەبوو. کەواتە: هەلومەرجی خۆیی (ذاتی) بۆ خۆی فاکتەرێکی تایبەتییە و گرینگە. نەتەوەکانی ڕۆژهەلات وێڕای هەلومەرجی تایبەتی خۆیان کە بەش بە حاڵی خۆیان بە هەند دەزاندرێ، وەکو ئەورووپاییان پێ نەکرا. ڕەنگە بگوترێ ئاخر، لە نواوە پێشکەوتنی ئەورووپا، ڕێی لە پێشکەوتنی ولاتانی بۆ نموونە: عەرەب و تورك و هتد گرت، بەلام خۆ لەسەروبەندی عەبباسییاندا عەرەب لە ئەورووپاییان پێشکەوتووتربوون. دیارە هۆکاری خۆیی دەوری گەورەی هەیە. لە خۆڕایی نەبووە کە هۆمێرۆسی یۆنانی بە ناوچەق و نموونەی فەرهەنگ لە قەڵەم داوە، لە خۆڕایی نەبوو کە لە هەموو چنێکدا هەر ئەورووپا بە سەنتەری هەر گۆڕانکارییەك دەزاندرا. ئەمە ڕێنەسانس، ڕیفۆرماسیۆنیش قۆناخی دووەمی مۆدێرنیزم و مۆدێرنیتەیە. ئەتۆ کە لە بنەمایەکانی سەرهەڵدانی ڕیفۆرماسیۆن و پێشهەنگاوانی وی وردەبییەوە کتێلەڕێیە بلیندەکانی وەك مارتن لۆتەر (١٤٨٣ ـ ١٥٤٦)، تۆماس مۆنتسەری سویسری، هۆلدریخ تسوینگلی (١٤٨٤ـ ١٥٣١) و جان کالۆنی فەرانسەوی (١٥٠٩ـ ١٥٦٤) لە شەوەزەنگی تاریکستانی لە ئایین بەبەرەوائی حاڵیبوون و بۆ بەرژەوەندی چاوچنۆك و بوودەلە و

گەمژە و لامژ بەکاربردنی لە دووڕا دەتوێ، گەورەیی و پایەبڵیندیی ئەم زاتانەت بە ڕوونی بۆ بە دیاردەکەوێ. خۆ ئەگەر بۆت بکرێ بە وردی، ڕەنج و تێکۆشانەکانیان بۆ نوێخوازی و نوێیاوی وەخوێنی و تەنها بەم چەند قسانەی من دانەکەوی، ئەوە باشترە، چون کارەکەی من زێتر هەر نێو بە بیرهێنانەوەیە و هیچی دیکە.

هەروەها خۆ بیر لە سەروبەندی ڕۆشنگەری، سەردەمی ئەقڵ وەکارهاوردنیش بکەیەوە دەهـا پـیرۆزتر. ڕۆشنگەری کوو پەیدا بوو؟ بنەمایەکانی چبوون؟ بنەمایەکانی ئەقڵانی و ئەزموونیی پەیدابوونی شۆڕشی زانستی کامانەن؟ بەیکەن و دیکارت و نیوتن کێن و کوویان بیرکردەوە؟ گالیلە کێیە و چیی کرد؟

وێنە ئەدەبییەکانی ڕۆشنگەری نیشانەکانیان چین؟ پێکهاتنی ئاشکرای ئەدەبیاتی فەلسەفیی چاخی ڕۆشنگەری لە بنەڕەتەوە هێندێ شێوازی دیالۆگی نێوان هیلاس و فیلۆنۆسی لە باسی ئاین (١٤١٣)، لە نووسینی بێرکلی و کتێبی گفتوگۆ لە مەڕ ئایینی خۆرسکانەی هیوومی لێ بترازێن، سادە و ڕاستە بوو. لە نێوەڕۆکدا عومدەی نووسینەکان لێوەکۆڵین، لێوەتۆژین، دەمەتەقێ، سیمینار، ناملکەیل، کۆتاییینامەیل و وتارەیلێ بوو کە بە گشتی بە پەخشانێکی ڕەوان، ڕوون، لە چاو خۆیدا ناهونەرییانە نووسرابوون. بەڵام کانت نە تەنها زاراوە و گوزارشتەیلی فەلسەفییانەی لە خواسایی بەدەری هونەرییانەی لە نووسینەکانی خۆیدا بە کارهاوردووە، بگرە داهێنەری شێوەیەکی فەلسەفیی نوێی ئەوتۆ بوو. "ڕەخنە" یان "لێوەکۆڵینی ڕەخنەگرانە" کە میعماری و ناسکیی تایبەتیی خۆی لێ ببوون بە نەخش و هەر لە خۆی دەوەشایەوە. هەر یەك لە ڕەخنەکانی سێیانەی کانت دابەشبەندییەکی هاوشێوە و یەك جۆر بوو بە سێ بەش: (١) بەشی "شیکاری" یان شیکردنەوەی کارکردی ڕاستەقینەی ئەقڵ و (٢) بەشی "دیالێکتیکی"، یان مەنتیقی هەڵە کە تەپکە و داوێلێ ئاشکرا دەکا کە ئەقڵی بێ ئیحتییات و ناشارەزا تێیان دەکەوێ و (٣) "ڕێبازناسی" (مێتۆدۆلۆجی) کە هەڵبەستێکی نووسراوەیە لە ڕێساگەل و ئوسوول لەبۆ بەکارهێنان. ئیدی بەم جۆرە پێکهاتنی ئەدەبیاتی فەلسەفەی نێوبراو

شێوەیەکە تەنها هی کانتە، کە بێ گومان گرفتەیلێکی تایبەتیشی لەمەڕ بیری "نووفاقی" و پێچەوانەخوانی لێ دەکەوتنەوە کە فەیلەسووفەکانی سەتەی ۱۹ وەکو هیگڵ و کیرکگارد بایان دایەوە سەری.

هەروەها ئەزموونگەرایی کلاسیکی ئینگلیس و پەیامەکانی وی. بەرویشت و ئەسڵ و ئەستەڕ و چییەتیی ئەقڵ لە کن لاک و بێرکلی. زانستە مرۆڤییەکان لە ڕوانگەی هیوومەوە. بزاوتەکانی غەیری ئەپستمۆلۆجی لە چەرخی ڕۆشنگەریدا. ماددەگەرایی و دۆزینەوەی زانستی. فەلسەفەی کۆمەڵایەتی و سیاسەت. تایبەتی بوونی فەلسەفە. سرنج و وردەکاریی ڕەخنەگرانە لە ئەقڵ لە کن کانت. ئینجا چەرخی گەشەکردنی تەکنۆلۆجی. زەمینەکانی پەیدابوونی شۆڕشی پیشەسازی. ڕوانگە بەبرەوەکان لەمەڕ شۆڕشی پیشەسازی. ڕوانگە کۆنەکان. ڕوانگە نوێیەکان. کاریگەریی فرەوان بوونەوەی بازرگانی لە پیشەسازی و لێشاوەکان (جەرەیان)ی موولەر لە خێراپوودانی شۆڕشی پیشەسازیدا. ئۆرگانیزەکردنی ڕەنێوهێنان. لە پیشەسازیی گوندەوە بۆ کارخانە و کارگە. شۆڕشی پیشەسازی لەبەرچی لە ئینگلستانەوە دەستی پێ کرد؟ داهێنانەکان لە پیشەسازیی تەونکاریدا. مۆتۆری هەڵم وات. ڕەژیی بەرد و ئاسن. گۆڕانکاری و گەشەکردن لە بارودۆخی ژیانی و کۆمەڵایەتیی ئینگلستاندا. کەناڵ لێدان و ڕێگای ئاسن دامەزراندن. فراژووبوونی شاران و زێدەبوونی کۆمەڵ. هەلومەرجی کار و بارودۆخی کرێکاران. لێکنووفاقیی کار و سەرمایە. پەیدابوونی یەکیەتییە کرێکارییەکان. تەشەنەکردنی شۆڕش بەرەو وڵاتانی یەکگرتووی ئەمەریکا. پیشەسازی و داهێنانە پێشەنگەکان. سەردەمی پۆلا و سەردەمی کارەبا. دووەم شۆڕشی پیشەسازی.

مۆدێرنیتە و پێوەندیی وی دەگەڵ هەوراز چوارینەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و دەستکەوتەکان و گۆڕانکارییەکانی وی. دەستکەوتەکانی مۆدێرنیتە. مۆدێرن چییە؟ گرینگترین دەستکەوتەکان لە زەمینەی تەکنۆلۆژیی نوێیاودا: گۆڕانکاری لە بواری ڕاگەیاندنەکانی دەستەجەمعی و کەیفوسەفا و ڕابواردن. ئەو گۆڕانکاری و

دەستکەوتانەی کە لە بواری زانستدا بەدیهاتن. مۆدێرن هەر هەمان پۆست مۆدێرنیتەکە خۆیەسی! نەژادناسیی هونەری مۆدێرنیستی. قەیرانی دووبارەنوێنیٚ (سەرلەنوێ واقیع پیشاندانەوە. کامێرای سینەمایی و هتد ) لە ناوینایەتی داشکاندنی مۆدێرنیتە و هەڵپە بۆ ڕەخنەلێ گرتنی. مۆدێرنیتە لە ئەدەبیاتی داستانی و هونەردا: هەوڵدان بۆ ناوینایەتی دۆزینەوەیەکی نوێ. بەسەرکردنەوە و لە هێندێ ئاسەوار دەربارەی مۆدێرنیتە و مۆدێرنیزم کۆڵینەوە. پۆست مۆدێرنیتە. چاوپێکەوتن لە پاش لە دایك بوون: بنەما تیئۆریکەکان. چالاکییە زمانییەکان و پرۆسێسی پەیدابوون و پێکهاتن. پۆست مۆدێرنیزم و شرۆڤەکەرانی وی. ژان - فرانسوا لیوتار (١٩٩٨ـ ١٩٢٢) ویژمانی (دەلالەتی مانایی) و بنەمای گۆڕانکاریی وی. وێنە و چێتی وێنەیی. پشت لە فرەریوایەتی کردن، وردەریوایەتی، کەڵەریوایەتی، فرەریوایەتی. ڕەوایی (مەشرووعییەت)بەخشین بە زانست. لیوتار و پۆست مۆدێرنیزم. ئاسەوارەکانی ئەم دواییانە. ژاك دریدا. بنەماشکێنی. دریدا لە ئاوێنەی ئاسەواردا. میشێل فۆکۆ. پاشبنیاتگەری. دێرینناسیی شێتی. دێرینناسیی زانست/ ڕەچەڵەکناسیی دەسەلات. ڕەچەڵەکناسیی ڕەگەزایەتی. ژان بودەریار. شیکردنەوەی کۆمەڵی نیستیهلاکی. ڕەخنە لە تیئۆرییەکانی مارکسیزم. ڕژێمی سەرووخەیالی. مەزەنەی کۆتایی. ژیل دلۆز و فلیکس گاتاری. پێوەندی فەلسەفە و دەروون شیکاری. بنیاتی درەختیی زانست.فەردریك جێمسۆن. داکۆکیی مارکسیستی لە پۆست مۆدێرنیزم. تایبەتمەندییەکانی فەرهەنگیی پۆست مۆدێرن. ئیهاب حەسەن. وەرچەرخان لە مۆدێرنەوە بۆ پۆست مۆدێرن. کلافەکانی یازدەیانەی پۆست مۆدێرن. دیڤید هارڤی. بار (وضعیت)ی پۆست مۆدێرنیتە و قۆناخەکانی گەشەکردنی وی. ژاك لاکان. لاکان: دەروونکاری، زمان و ویژمان (discourse). چارلز جنکز. جنکز و مەرگی میعماریی مۆدێرن. میعماریی پۆست مۆدێرن. موتوربەی هونەر: ئەدەبیات و میعماریی پۆست مۆدێرن. پلورالیزم کرانووی ڕەسەنی پۆست مۆدێرنیتە. جیهانبینیی پۆست مۆدێرن: ڕەگەز و

بزاوتەکانی کلیلانە لە بەرنامەی پۆست مۆدێرنندا. لێکجوداوازییە دیالێتیکییەکان. حەوت قۆناخەی پۆست مۆدێرن. بەرنامەی کاری پۆست مۆدێرن: مۆدێرنی ناپێك (ناجۆر) پێوەند خواردوو بە پۆست مۆدێنەوە. پۆست مۆدێرنیزم و فەلسەفە. ڕەخنەکانی پۆست مۆدێرن لە ڕۆشنگەری وەك بنەما و نێوەرۆکی ڕەسەنی فەلسەفەی مۆدێرن. نکوولییە بنیچەکان لە فەلسەفەی پۆست مۆدێرندا. نە لە مانای نەگۆڕ (ثابت)ی دەمان (زمان) و جیهان. نە لە چەمکی بەرهەستی (مەحسوسی، عەینییەت). نە لە چەمکی خۆ، یان "من"ی نەقلانی. کۆتاییی فەلسەفەی کلاسیك و مۆدێرن و پەیدابوونی فەلسەفەی پۆست مۆدێرن. میتافیزیکی لەڕوو (حضور). میتافیزیکی جوداوازی. نوێلۆژیی دابڕان یان جوداوازیی بەدرەنگەوە. نوێپراگماتیزم و نە لە مێژوو. پۆست مۆدێرنیزم: خۆ، تاك و کێیەتی. نە (نفی) لە میتافیزیکی لەڕوو و نە لە سووژەی نەقلانیی دێکارتی. سەرگەردانیی تاك و نەمانی کێیەتی. پۆست مۆدێرنیزم و سیاسەت. باری سیاسیی پۆست مۆدێرن و شەڕ. بەکارهێنانە سیاسییەکانی پۆست مۆدێرن: سیاسەتی جوداوازی. پۆست مۆدێرنزم و مارکسیزم. داکۆکیی مارکسیستی لە پۆست مۆدێرنیزم. ڕەخنەی مارکسیستی لە پۆست مۆدێرنیزم. پۆست مۆدێنزم: پارادۆکسی موحافەزەکاری و ڕادیکالیزم. پۆست مۆدێرنزم و نە لە مارکسیزم وەك کەڵە داستان. پۆست مۆدێرنیزم و ئایین. پۆست مۆدێرنیزم و مەسیحییەت. پۆست مۆدێرنیزم و ئیسلام. پۆست مۆدێرن بۆ خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز. پۆست مۆدێرنیزم، کۆمەڵناسی و ڕامانەی کۆمەلایەتی. پۆزیتیڤیزم، کۆمەڵناسیی کلاسیك و بنیاتگەرایی. کۆمەڵناسیی پۆست مۆدێرن. قەیران لە کۆمەڵناسیی پۆست مۆدێرندا. پۆست مۆدێرنیزم و مەنتیقی فەرهەنگیی سەرمایەداریی دوایی. ڕەوتی گۆڕانکاریی کۆمەڵناسیی پۆست مۆدێرن. پۆست مۆدێرنیزم: ڕانەگەل و چەمکەیلی ڕەخنەگرانە. کار لە دژی ڕامانەگەل و چەمکەیلی کلاسیك و مۆدێرن. پۆست مۆدێرن و شێوازە بایی (قیمی)ەکان. پۆست مۆدێرنیزم و ڕامانە سیاسی ـ کۆمەلایەتییە نوێیەکان. پۆست مۆدێرنیزم. ڕەخنەی ئەدەبی و

پێشڕەوی (پێشەنگی). بەردەوامیی ئەدەبیاتی مۆدێرنیستی. دابڕان لە ئەدەبیاتی مۆدێرنیستی. پێشڕەوایەتی و پاش پێشڕەوایەتی لە ئەدەبیاتی پۆست مۆدێرندا. پۆست مۆدێرنیزم. ڕامانەی ئەدەبی و ڕۆمان. پۆست مۆدێرنیزم و ئەدەبیاتی داستانی: ڕیشاڵۆییی مێژووییینە و کەرەکتەریزەی ڕامانەیی. ڕیشاڵۆییی مێژووییینە. کەرەکتەریزەی ڕامانەیی. نێواخنێی ئەوەرەیی لە ڕامانەگەلی ئەدەبی و ئاسەواری داستانیی پۆست مۆدێرن. پۆست مۆدێرنیزم. فەرهەنگ. هونەر و فێرکردن و پەروەردەکردن. فەرهەنگ و ڕامانەی فەرهەنگی لە نیگای پۆست مۆدێرنەوە. پۆست مۆدێرنیزم و فەمینیزم. پۆست مۆدێرنیزم. فەزای شاری و دەوروبەری ژین. تەکنۆلۆژیی مۆدێرن و قەیرانی ژیانی دەوروبەری. شارگەرایی لە حاڵی پەرەساندن و قەیرانی ژیانی دەوروبەری.

لە کۆتاییدا با ئەم بیروبۆچوونانەی دواییش کە منیش هاوبەشییان دەکەم، عەرزی خوێندەی بەڕێز بکەم:

ماركس و نیچە و هاوسەردەمانیان مۆدێرنیتەیان وەك بتوون (كلّ) لەسەروبەندێكدا تاقیکردەوە کە تەنها بەشێکی چکۆلەی جیهان بە ڕاستی ببوو بە مۆدێرن. پاش یەك سەتە، سەروبەندێ کە پرۆسێسەکانی مۆدێرنیزاسیۆن تۆڕێکیان بەسەر جیهاندا کێشا کە هیچ کەس، تەنانەت لە دوورترین شوێنەکانی جیهاندا ناتوانێ لێی دەربازبێ و لێیهەڵێ، دەکرێ چتهایەکی زۆر لە یەکەمین مۆدێرنیستەکانەوە فێرببین، کە زێتر بە سەردەم و زەمانەی ئێمەوەیان سەروکاردەبێ، تا سەردەمی خودی وان. ئەوان لەبۆ درێژا بە ژیانی خۆدان دەبوا بە هەموو هێزێکیانەوە لە تاکە تاکەی تروکەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا لە دووفاقی و لێك ناڕوجووتیگەلێ حاڵی بن، کە ئێمەمانان ئیدی لە دەرککردنیان دەستەپاچەین و هەرپان لە بریان جوێ ناکەینەوە. ڕەنگە سەرەنجام بەدیارکەوێ کە ئەم یەکەم مۆدێرنیستانە، بە شێوەیەکی مەتەلێ نامێزانە و لەغز و موعەممایانە، باشتر بەسەر پێکهێنەی ژیانی ئێمەوەن ـ لە خودی ئێمە ـ واتە: هەمان مۆدێرنیزاسیۆن و مۆدێرنیتە لەمە حاڵی بن. ئەگەر بۆمان بکرێ دیتنی

وان، یان خەیاڵی وان بە ئی خۆ بکەین، وەك وان لە دنیا بنۆڕین و خەیاڵ بکەینەوە، بۆمان بەدیاردەکەویٚ کە ژیانی ئێمە قووڵترە لەوەی کە بیرمان بۆ دەچێ. ئێمە هەست بە پێوەندییەکانی خۆمان دەگەڵ خەڵکی سەرانسەری جیهانادا دەکەین، خەڵکانیٚ کە هەمیشە سەرکەرمی ململانیٚ لەگەڵ هەمان گیروگرفتەیلیٚ بوون کە ئێمە دەگەڵیاندا دەستەوبەرۆکین و بەم جۆرە، جارێکی دیکە لەگەڵ ئەو فەرهەنگە مۆدێرنیستەی دەوڵەمەند و بە گروگلپەیەدا دەس لە ملان دەبینەوە کە لە ناخی هەمان ململانێدا گەشە و تەشەنەی کردووە، فەرهەنگیٚ کە پڕە لە سەرچاوەگەلی گەورەی هێز و سەرسەلامەتی، بە مەرجیٚ دەگەڵیدا ئاشنایەتی پەیدا بکەین و بە ئی خۆمانی بزانین.

بەڵام ڕەنگە لە دواییدا ئاشکرابیٚ کە بۆ دواوە چوون (!؟)، بۆ خۆی دەتوانیٚ ببیٚ بە ڕێگایەك بۆ بەرەوپێش وەچوون ئەوەی کە بەبیرهێنانەوەی مۆدێرنیستەکانی سەتەی ۱۹ هەم دەتوانیٚ یارای خەیاڵ و بوێریی خوڵقاندنی مۆدێرنیستەکانی سەتەی ۲۱ مان پیٚ ببەخشیٚ. ئەم کاری بەبیرهێنانەوەیە دەتوانیٚ یارمەتیمان بدا تا مۆدێرنیزم بۆ ڕەگوریشەکانی خۆی بگەڕێنینەوە، تا لەم ڕێگایەوە بتوانیٚ خۆی بژێنیٚ و ببووژێنێتەوە و لەگەڵ کارەساتی مەترسیگەلیٚ کە لە پێشیدان، ڕووبەڕووی کێشمان (جذب)ی مۆدێرنیستەکانی دوێنیٚ دەتوانیٚ هاوکاتی نۆری ڕەخنە لە مۆدێرنیستەکانی ئەمڕۆ و تەرزی تەجەللای بروا بە مۆدێرنیستەکانی - پیاوان و ژنانی مۆدێرن — ی سبەینیٚ و دوو سبەی بیٚ.

کۆمەڵی بۆرجوازیی مۆدێرن، کۆمەڵیٚ ئامێر و پێناوەیلی زەبەللاح و غوول ئاسای بۆ ڕەنێوهێنان و ئاڵوگۆڕ هێناوەتەکۆڕیٚ، وەك جادووگەریٚ دەچیٚ کە ئیدی ناتوانیٚ ئەو توانستە ژێرزەوییانەی کە بە ئەفسوون و دوعا و ویردخوێندنەوەی خۆی بەخەبەرهاتوون، لغاو بکا.

(مانیفێستۆی کۆمۆنیست).

"بۆ ژنان و پیاوانی مۆدێرن کە پەیجووی ناسینی دەروونن، هەق وایە فاوستی گۆتـە بە وردی بخوێننەوە، چون گۆتە بێ گومان خـاڵی دەسـپێکێکی باشـە. گۆتـە، هـەر هـەمان کـەس کـە لـە شـێوەی شـەپیکی فاوسـتدا یەکـەم تراژیدیـی گەشـەکردن ی بە ئێمە بە دیاری بەخشیوە. هەڵبەتە هیچ کـەس ـ نـە وڵاتـانی devlopment پێشکەوتە و نە وڵاتانی پاشکەوتە و نە ئایدۆلۆگە کاپیتالیسـتەکان و نـە ئایدیۆلۆگـە سۆسیالیستەکان ـ حەزیان لەوە نییە کە ڕووبەڕووی ئەم تراژیدییە ببنەوە، وەلێ هەر هەموو بێ وچان، ئەوە لە ژیانی خۆیاندا بەکاردێنن، خەیاڵەکان و دیمەنـەکانی گۆتـە کۆمەکی ئەوەمان دەکا کە لـەوە حـاڵی ببن چۆن کامڵترین و قووڵترین ڕەخنـە لـە مۆدێرنییتە بە هۆی هەمان کەسانێکەوە تەرح دەکرێ کە بە شەوق و ئاڵهای زۆرەوە خۆیان داوێنە نێو باوەشی بەسەرهات و ڕۆمانسی مۆدێرنیتەوە، بەڵام ئەگەر فاوست جۆرە ڕەخنەیـەك لـە مۆدێرنیتەیـە، خـۆ لـە هـەمان حـاڵدا جـۆرێ لـە هەڵپـە و مەیدانخوازییشە ـ ئەوەش زێتر بەش بە حاڵی دنیای ئێمـە تـا دنیـای خـودی گۆتـە ـ هەڵپەیێ بۆ بەرجەستەبوونی خەیاڵی و خولقاندنی شێوەگەلی نوێی مۆدێرنیتـە کـە گەشەکردن لەویدا بۆ خزمەتی مرۆڤە، نەك بۆ خـودی گەشـەکردن. حەوشـەی بینـای ناتەولوی فاوست هەر هەمان زەمینی پرجۆش و خرۆش، بەڵام لەرزۆکە کە هـەموومان دەبێ ژیانی خۆمانی تێدا بپارێزین و دامەزرێنین.

"لەپاش لـەدایکبوونی میکانیزاسیۆنی پیشەسازیی مۆدێـرن.. لافـاوێکی ڕەگوڕیشـە هەڵکەن هەڵستا کـە لـە سـەختی و تەشـەنەکردنیدا وەکـو هەرەسـێ بـوو. سـەرلەبەری سنوورەکان و کەوشەنەکانی ئەخلاقی و سروشـــتی و تەمەنـــی و زایەنـــدی و ڕووناکی و تاریکیی تێکوپێك نا. سەرمایە جێژنی سەرکەوتنی گێڕا".

"سەرمایە"

"من ئەو ڕۆحەم کە وەك هەموو چتێ دەکا."

"مەفیستۆفلیس لە فاوستدا"

"خۆخرابکاریی ئیبداعی!"

"ڕیکلامی بانگەشە بۆ مۆبایلی تۆیل ، ۱۹۷۸

" بێ سەرویەریی زەقوزۆپ له ڕاستیدا ئەوپەڕی سیستەمی بۆرجوازییە."

داستۆیفسکی، لەندەن ۱۸٦٢.

**هێرمسی** hermetic: سیفەتی لە ناوی هێرمس تریسمگیستۆس، خودای یۆنانی (کە یۆنانییان لەگەڵ تحوتمسی میسری، نووسیاری بەگریمانەی کتێبە عیرفانییەکان و دامێنەری جزدانیێ کە جادووی لێ کردووە و هەوای تێ نەچووە، جۆرە شیعرێکی ئەفلاتوونی، پەنامەکی (باتینی) و بە گرێوگۆڵ، یان ڕازئامێز و مەڕموز شێوەیەکی بەرچاوتر لەمەڕ بزاوتێ لە شیعری هاوچەرخی ئیتاڵیادا بە ناوی پۆئێزیا هێرمەتیکا poesia ermetica دەگوترێ. ئەم زاراوەیە فرانچیسکۆ فلۆرا دایهێنا و بابەتەکەی بۆ خۆی لە لا پۆئێزیا ئێرمەتیکا (١٩٣٦) پەیگیری و پێناسەکردووە و سوودی لێوەرگرتووە و پێشەنگی تیۆریی وی ئارتور و ئۆنۆفری بوو کە چەمکە نەرم و پەسپا و ڕەمزییەکانی "شیعری لوتکە"ی لە فەرەنسییەوە کرد بە ئیتاڵیایی و هەر بۆ خۆی لە بن کاریگەریی مرۆناسیی ڕۆدۆلف ئیستاینەردا بوو. ئۆنۆفری لە ١٩٢٥دا لایەنگریی "شیعری ڕووت"ی دەکرد کە جۆرە شیعرێ بوو دەبوا سەرلەبەری پێکهێنە مەنتیقییەکانی لێ فت کرێن و لەسەر جادوو و سیحری واژەی تەنها و کپوکپ و سەرکاغەز دەگیرسایەوە (تەنانەت تا ئەوڕۆکەش کە هێندێ شاعیری نوێخواز لە خاڵدانان و ڕێزی نووسین و دێڕە شیعرەکانیاندا، بەم شێوەیە:

————————

————————

————،　　　————————

———،

از کدامین فرقه‌اید؟

بگوئید

شما که فریاد برمیدارید:ـ

که اگرچه میدلندار هر میدانید،

نه کسی را به صداقت یارید

دشمن می دارید

(خنجر و خاگره "شاملو")

Çıkıyor kayık
Iniyor kayık
Çıkıyor ka...
Iniyor: a...
Çık...
In...
Çık...

"Nazım Hikmet"

بەرنامەی دی لە هەمان حاڵدا لە لایەن جوزەبب پیپ ئۆنگارتی - یەوە (١٨٨٨-١٩٧٠) بەڕێوەدەبرا . ئۆنگارتی لەسەر وەی سووربوو کە شیعرەکانی لە مانا و بەیان بپاڵێوێ و بەوپەڕی ساکارییەوە رووی لەواژان کرد و مانا "سەرەتاییەکان"یانی بۆ وەگێڕانەوە: "هەر بە تەواوی پێ لەسەر واژە دادەگیرا، لەسەر هەر واژە و ئاهەنگ و مانا و سترێسی وی و فەزایەکی کە دەبوا پڕیکاتەوە". جێگرانی ئۆنگارتی واتە: ئیئۆجیۆ مۆنتاله و سالواتوورە کوازیمۆدۆ مجێز و تەبیاتێکی دیکەیان هەبوو. بەڵام هەرتك دەیان هەویست شیعر لە کراسی مانا و بەیان ئازادکەن. مۆنتاله کەشوهەوایەکی موزیکیی بە شیعری هێرمسی و کوازیمۆدۆ بە پارلویی یۆنانیانەی واژەموتوربەکردن دا. ئەم ساکارییە بەریانێکی نێوەخن زیهنییەتێ بوو کە هێندێ لە ڕەخنەگران زۆریان بە گیروگرفت دەزانی، بەڵام ئێستا پۆئێزیا هێرمەتیکا بە قۆناخێکی پێشەنگ لە شیعری ئیتاڵیاییدا دەزانن. ئەو شاعیرانەی دیکە کە لە ڕیزی شاعیرانی هرمسیدان ئەمانەن: ماریۆلۆتسی، ئلفۆنسۆ گاتۆ و ڤیتۆریۆ سێرینی.

لە سەرێکی دەکەوە ئەم واژەی Hermetismە بە کۆمەڵە ڕامانە (نظریات)یلێ دەگوترێ کە ڕەنگە لە چەند کتێبێکی میسری، بە نێوی Tohe trois fois grandەوە ناوبخولتەوە. ئەم ڕامانانە لە چەند ناميلکەيەکدا بە زمانی یۆنانی کەوتوونە ئارلوە کە مێژوو و بنیچەیان بە دروستی نەزانراون.

هەروەها بە مانایەکی دیکەش هاتووە کە هاومانای کیمیایە. جا هاوسەروساختیی ئەم دوو واژەیە لەوەڕا چەکەرەی کردووە کە کیمیاییە یۆنانییەکان خۆیان بە لایەنگری "هێرمس" لەقەڵەم دەدا و بە خالیقی زانستی کیمیایان دەزانی. "هێرمس - هورمز؟" خوداوەندی یۆنانی کوڕی زیئۆس و مایا، خوداوەندی زمانپاراوی و ڕەوانی و بازرگانی و دزان و پەیامهێنی خودایان، لە گوێن "مەرکور"ی لاتینی بووگە.

تەئویل، بەلای زانایانی ئیسلامەوە، فرەی لەسەر ڕێسرپاگە چێ وە چێ وەگێڕی (أقرب الموارد)، (منتهى الأرب). پەژن لە واژەی "أول"ەوە وەرگیرپاگە کە لە زماندا بە مانای گەڕاندنەوەیە (كشاف مصطلحات الفنون) "ومنه قولهم في الدعاء للمضل: "أوّل الله عليك، أي ردّ عليك ضالّتك"(أقرب الموارد). جورجانی لە "تعريفات"دا دەڵێ: "تەئویل مەزەنە بە مەبەست و تەفسیر یەقین بە وی. بە قەولێ تەئویل بەدیارخستنی یەکێ لە موحتەمەلاتی لەفز و تەفسیر بەدیارخستنی مەبەستی قسەکەرە تەئویل زێتر لە کتێبەکانی ئیلاهییاتدا بەکاردەهێندرێ. ئەبوعوبەیدە و گرۆیەك دەڵێن: هەرتك بە یەك مانا دێن. گرۆیەکی دیکە بە پێچەوانەوەی تێ دەگەن. ڕاغیب دەڵێ: تەفسیر لە تەئویل ئەعەمترە و زێتر لە واژەگەل و موفرەداتدا بەکاردەهێندرێ؛ بەلام تەئویل پتر لە مانا و ڕستەدا بەکاردەهێندرێ و ئەغڵەبە لە کەلامدا بە هەرمێنە. هێندێ دەڵێن: تەفسیر بەیانی لەفزێکە کە پێویستیی بە یەك وەجە زێتر نەبێ، هەرچی تەئویلە ڕووکردنی لەفزە لە یەکێ لە چەند مانای جودا ـ جودا، ئەویش بە پێی بەڵگەگەلێ کە ڕوون و ئاشکراین. ماتوریدی دەفەرموێ: تەفسیر تەعیینە لەسەر وەی کە لە لەفز ئەو مانایە ویستراوە و گەواهی لەسەر خودایە کە ئەم لەفزە، ئەو مانایە دەخوازێ. هەرچی تەئویلە تەرجیحی یەکێ لە مانا موحتەمەلەکانە بە بێ یەقین و شەهادەت. ئەبوتالیبی تەغلیبی دەڵێ: تەئویل بەیانی وەزعی لەفزە، حەقیقەت بێ یان مەجاز. بەلام تەئویل تەفسیری باتینی لەفزە و لە واژەی "أوّل" وەرگیراوە و گەڕانەوەیە بۆ ئاکامی کار، وەلێ تەئویل ئیخبار لە حەقیقەت مەبەستە و تەفسیر ئیخبارە لە بەڵگەی مەبەست، وەك ئەم فەرمایشتەی خوداوەند: "إنّ ربّك لبالمرصاد" تەفسیری ئەم فەرمایشتە ئەوەیە کە

"مرصاد" لەسەر وەزنی "مفعال"ە، لە "رصد" و هەرچی تەویلەکەیەتی: وریاکردنەوەیە لە تەماشاکردنی فەرمانی خودلوەند بە چاوی کەم. ڕاغیبی ئەسفەهانی دەڵێ: تەفسیر مانایەکانی قورئان بەدیاردێخی و مەبەستان بەکاڵادەکاتەوە چ لە ڕووی لەفز، یان لە ڕووی ماناوە، هەرچی تەئویلە پتر لە ڕووی ماناوەیە. هەروەها تەفسیر لە بارەی واژەگەلی نامۆوەیە کە بەکارهاتوون یان لەسەر واژەگەلی زۆر چروکورتکرلوە کە دەبێ بە شرۆڤە و شەرحان ڕوون کرێنەوە، یان لەمەڕ قسەیەکی کە چیرۆکێکی لەسەر هەس و بێ ڕوون کردنەوەی ئەو چیرۆکە مەبەست بەدیارناکەوێ. وەلێ تەویل هێندێ جار بە گشتی و هێندێ کاو بە تایبەتی، وەك "کوفر" کە هێندێ جار بە مانای ئینکاری موتڵەق بەکاریهێندرێ و هێندێ جار لە ئینکارکردنی بە تایبەتی هەبوونی خودادا، یان لە واژەی هاوبەش لە نێوان چەند مانایەکی جودا ـ جودادا بەکاریهێندرێ. هەروەها هی وەهاش هەن دەڵێن: تەفسیر لێل ڕیوایەت و تەئویل لێل دیرایەتا هاوسەروکارە. ئەبونەسری قوشەیری فەرموویە: تەفسیر تەنها لە قسەی بیستەنی و مەسموعاتدا و ئیتباع و هەڵهێنجان (استنباط) لەوەدا کە دەگەڵ تەئویلدا هاوسەروکارە بەکاردەهێندرێ. هەشە دەڵێ: تەفسیر بۆ فەرمایشتەکانی خودا و پێغەمبەر و لەوەدا کە کەس نەتوانێ ئیجتیهادی تێدا بکا و بەڵکو هەر لەسەر ئەو مانایەی حەمل بکا کە تێیدا ولرید بووگە و لەوە نەترازێ، بەڵام تەئویل چتێکە کە زانایانی لە مانای خیتابزان و ماهیر دە ئامێرەکانی زانستەکاندا هەڵێنجن، هەروەها برێ یەژن، کە بەغەوی و کەواشی لەولن: تەئویل بەوە دەگوترێ کە ئەتۆ بێی لە ڕێی هەڵێنجان (استنباط)ەوە ئایەتێکی بە لای مانای موافیقی ئەوەی پێشەوەی و ئەوەکەی پاشەوەی ویدا بلەنگێنی کە ئایەتەکە ئەو مانایە هەڵبگرێ و دەگەڵ قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا موونافاق نەبێ و ڕەنگە ڕاستییەکەش هەر ئەمە بێ (کشف الظنون)

ناسری خوسرەو گوتوویە:

هر که بر تنزیل بی تأویل رفت

او بچشم راست در دین اعور است

+ +

شوراست چو دریا بمثل ظاهر دریا

تأویل چو لؤلؤاست سوی مردم دانا

+ +

بطه‌و دین حق در پود تنزیل

بایشان یافت از تأویل تاری

دیاره ئەم باسە بە لای ئەهلی ئوسوولەوە هەویرەکەی ئاو لەمە زێتر دەکێشێ و ڕەنگە بتوانم بێژم، زانایانی ئیسلام زۆریان لەمەڕ درێژە پێ داوە و ئەم چەند ڕووپەڕەیەتان کە لە ڕوانگەی ئەورووپاییانەوە لەبۆ ڕەش دەکەمەوە و سەروو و پێ دێشێنم ماکەکانیان تا ڕادەیەك هەر لەم بیروبۆچوونانەی ئەو زانا ئیسلامیانەوە کە ئاغڵەبەیان عەرەب نەبوون سەریان هەڵداوە.

ئەم بابەتە لە زۆر سەرەوە باسی لێوەکراوە: بۆ نموونە، بابەکی ئەحمەدی لە ڕووی پێوەندیی تەویل و زانابیەوە لە دەقەکۆنەکانەوە تا فرۆید، تەئویل و ناسین: شلایر ماخەر، دیلتای، تەئویل و ڕازی دەق: هوسرل، هێدگەر، تەئویل و مانا: گادلمەر، هێرش، لەزەتی تەئویل: ریکۆر، ئاسۆی تەئویل: ئایزەر، یاس، لەم ڕووانەوە زۆری لەسەر ڕۆیشتووە. ئەو ئەم پرسیارە دەکا: ئایا زانایی لە ناساندن و تەئویل هەتەرەووتر و فرەوانترە و هەوڵی تەئویلکردن کارێکی بێهوودە و دوای کڵاوی بابردووکەوتنە؟ ڕەنگە ئەمە مانای ئەوە نەبێ کە تەئویل ناکرێ بە جارێ لە لیستە فت بکرێ. چونکە زاناش زۆر جار بە ناچاری پەنا وەبەر تەئویل دەبا. ئەگەر ئەوەی کە دەوانی لە شیعرناسی سانسکریت، مەمم مەتەی وەرگرتووە بە ڕاست بزانین دەبێ دەلالەتی واژە لێکدانەوە هەروا بە کارێکی سانا نەزانین. ئەم شیعرناسە سانسکریتە گوتوویە هەر واژەیەك چار جۆرە نەخشەی هەن، یەکەم: دەلالەتی مانای هەموانی و ڕووتەنی (کە هیچ واژەیەك لە ڕستەدا ئاشکرا دەلالەت لەم جۆرە مانایە ناکا، بەڵکو ئەمە دەلالەتێکی ڕێزمانییە. لە دەقە پیرۆزەکاندا هێندێ واژە، یان هێندێ پیت لە

دەرك بەدەرن و ئەمە نەخشی "ئاتیەرییەی پێ دەگوترێ.(ئەمانە لە قورئانیشدا بەرچاو دەكەون. وەك ألم، كهيعص، ألرا و هتد   هەروەها زانستی جەفر و بیروبڕوای حورووفییەت و گرێدانی سروشت و مجێزی مرۆڤ بە جۆری پیت و ڕەمزی جۆراوجۆر و پێوەندیی هێز و تیرە و نەتەوە و ولاتان و دەوڵەتان بە ئارم و نیشانە و وێنەی دار و درەخت و زیندەوەر و باڵدار و سەرلەبەری ڕەواڵەكانی خۆرسكەوە، زۆر جاران وات لێ دەكا پەنا بۆ تەئویل بەری. دوو نەخشەكەی دیكە پێوەندییان بە كاربردی مەجازیی واژەوە هەیە، مانای مەجازی و دەلالەتی مەجازی بە ڕیز "لەكشنە" و "وین جەنە"یان پێ دەگوترێ). ئاشكراكردنی مانای واژەكان لە یەك ڕستەدان، واتە: ئاتیەرییە، كاری زمانناسانە، بەڵام ئاشكراكردنی مەجازییەكانی واژەگان ، تاكە ـ تاكە، واتە: لەكشنە و هەروەها لە پێوەندییەك كە وەل مجازییەكانی دیكەدا لە قسەی ڕمزئامێزیدای وەردەگرێ، واتە: وین جەنە، كاری ئەوانەیە كە تەئویل دەكەن، یا بە شێوەیەكی دیكەی بێژم: هەروەك لە نێوان مانای یەكەمی واژە (گەوهەری وی) و مانای ڕێزمانیی (شێوەی قاڵب گرتن، یان بە كاربرانی وی)جوداوازی هەیە، هەروەها لە نێوان مانا مەجازییە تاكە ـ تاكەكان و مانا پێوەندییە مەجازییەكانیشدا جوداوازی هەیە. ئاو، ڕوویار، ڕووباری كەنگ، ڕووباری پیرۆزی كەنگ، چار نەخشی واژەن. پێوەندیی ڕەمزی و تەمومژاوی لە نێوان واژەی ئاو و واقیعییەتی ئاودا هەیە كە هێندێ جار ناسینەوەی ڕەچەڵەكی واژە تا ئەندازەیێ تەنها هەرلە چەند ئاستێكی حاڵی دەبین (واژەی سانسكریتێی ڕوویار، بە مانای فرمێسكە) سوقراتیش لە دەمەتەقێ دەگەڵ كراتیلۆس ئەفلاتووندا گوتوویە: لە نێوان واژەكان و "مانای گەوهەری و كرتاییدا" پێوەندییەك هەس و تەئویلی چەند بابەتێ لەوانی بە "حاڵەتی كەمەنكێشی (جذبة) و لێكدی ئاشكرایی (مكاشفة)ەوە نیسبەتداوە كە لە تروسكەكەلێكی گفتوگۆدای دەست بۆ داوە، وەلێ كاتێ واژەی ڕووبار لە ڕستەیەك، یان لە قسەیەكدا بەكاردەهێندرێ، ئەوە مانایەكی تایبەتیی لەبۆ دەرەخسێ و هێندێ جار ئاماژە بۆ ڕووبارێكی تایبەتی دەكەین لە گوێن ڕووباری كەنگ. لێرەدا مانای بەهەست و سنووورداری ڕووباری لێ دەفامینەوە،

بەڵام ڕووباری کەنگی پیرۆزە. خزمایەتیی نێوان واژەی ڕووبار و واقیعییەتی کۆتاییی ڕووباری پیرۆزی کەنگە. خزمایەتی لە نێوان پیرۆزبوون و کەنگ (مانای تایبەتیی ڕووبار) کوتومت وەك خزمایەتیی نێوان واژەی ڕووبار و واقیعییەتی کۆتاییی ڕووبار زانستەنی نییە. تەنها لە بەکاربردنی مەجازیی واژە، واتە: لە ڕستەیەك، یان لە قسەیەکدا، ئەم خزمایەتییە دەناسرێتەوە و هەنگێ تێ دەگەین کە مەبەست ئاوی پیرۆزی ڕووباری کەنگە. کەسێکی کە بە بیستنی ڕووبار، خۆی دە نێو ئاوی پیرۆزی کەنگدا ببینێتەوە، لە تەئویلی واژەی زانیوە و بە ڕاستی دەکرێ بڵێین: کە کار لە تەئویل تێپەڕیوە. تەئویل کردەوەیەکی خۆکار نییە. دەبێ تروسکەیەك دە دەقدا هەبێ ـ بەڵگەیەکی لەدەقبەدەر ـ ئەوەمان پێ بسەلمێنێ کە مانای یەکەندەردوو و فەوری و ئانیی دەق هێندەی بە بەرەرەوە نییە کە بەش بکا، تا هەر ئەوە ببێ بە دەسپێکرانی دەق. جا لەبۆ کەسێکی کە مانای فەوری و ئانی و یەکەندەردووی دەق بەشی لێ حاڵیبوونی وە بەرەوە نەوێ، ئەوە تەئویلکردنی دەق دەبێ بە کارێکی ناچاری.

یۆنانییان هێرمسیان وە پەیامهێنی خودایان دەناسی. سوقرات لە گفتوگۆیێ دەگەڵ کراتیلۆس ئەفلاتووندا، وە زوان ئەفراندە و ئاخاوتن ئەفراندە و تەئویل ئافەرینی لە قەڵەم داگە.

"لەو بڕوایەدام کە نێوی هێرمس هەر بۆ خۆی دەلالەت لە قسەکردن دەکا و بەو مانایەس کە بە تەئویلکەر، یان پەیامهێن، یان دز، یان ئاڵووێرچییان زانیوە کە ئەمانەش گشتیان ڕاستەوڕاست سەروکاریان وە زمانەوە ئەوێ. هەر وەك پێم گوتی نێوی ئیریس لە قساندا زۆر بەکاردەبرێ و واژەیەکیشە کە هۆمەر فرەی وەکاردەبرد، واتە: ئەمساتو کە دەلالەت لە ئاوها مانایێ دەکا: ئەو تەرحڕێژیی کردووە. یاسادانەر لەم دوو واژەیە نێوی خودایەکی داتاشیوە کە زمان و ئاخاوتنی داهێناوە و دەتوانین بێژین: گریمان کە ئەو بەکاربردنی ئەم نێوەمان قێردەکا و دەڵێ: دۆستی من، لەبەر وەی کە ئەو تەرحڕێژی چیرۆکەیل و گەپەیل (ئاخاوتنان)ە، نێوەکەی وە ئیرەمس

بخۆنەوە و ئەی واژەیەمان دوایی وە هرمس گۆڕی. ئیریس هەروەها لە فیعلی ئیریە "گوتن"ەوە کەوتۆتەوە. ئیریس پەیامهێنی خودایانیشە."

سوقرات وە تان و پۆی قسەکەیدا چووگە کە قسە هەموو چتێکە، دەتوانێ جارێ ڕاست بێ و جارێ درۆ، بەڵام سەروکاری وەل "پان" واتە: خودایێ کە نیوەی وە سایبی ڕاستییەوەی بەرز و باڵایە و مرۆڤانە و نیوەکەی دیکەی لەبەر درۆزنیی پەست و ئاڵۆاخە و پێوەندیی لێل بزندا هەیە. دەتوانین خوداوەندی قسە واتە: هێرمس بە بابی "پان" بزانین، زمانیش جارێ ڕاست و مرۆڤانی و جارێ ناڕاست و ئاژەڵانی و کەرانییە. وەلێ سروشتی هێرمس تەمومژاوییە و تەمومژاوێتیش گەوهەری قسەیە: لە پێواربوون (غیاب)ی هێرمس، لە سەردەمی نوێدا ناچاری هێرمینۆتیك (تەئویل) بووگین. با قسەکەم خەستتر کەمەوە: هێرمینۆتیك سەروکاری وە ئاخاوتن و نووسینەوە هەیە و لەم ڕێگوزەرەوە سەروساختی لێل تەئویل (هێرمینۆتك)یشدا پەیداکربووە. (ئەگەر لە لێکدانەوەی قورئان، کە بەر لە هەر کەسێ مافی پێغەمبەر بوو و بۆ کەسی دیکە ڕەوا نەبوو بەو کارە ڕابگا بیربکەینەوە، چ لێکدانەوە، چ تەویلکردنی ئایەتە "متشابهات"ەکانی قورئان پاش مردنی پێغەمبەر، بوو بە کارێکی ناچاری بۆ یارانی پێغەمبەر و پاش وان بۆ پەیرەوان و پەیرەوانی پەیرەوان.) پول ڕێکۆر پێی وایە ڕێبازێکی تایبەتی نییە کە زانین و کاربردی وی چتێکی تایبەتیی زانایان و پسپۆڕان بێ، بەڵکو بەشێکە لە مەسەلەیەکی هەموانیی ناسین (معرفە)، هەروەك "هێرمنیا" بە لای ئەرەستووەوە بە مانای تەواوی قسەوە، بریتی بوو لە دەلالەت و مانا. ئەمە گرینگترین پێشەکی گریمانەکراوی "ڕەوشتی ئەتویلی دەقان"ە کە "هەمیشە لە خوێندنەوەدا، تەئویلی خوێندە ماناسازە". جیا هەروەك کاربردی ئوستوورە یۆنانییەکان لە ئەندێشەی فەلسەفیدا (فیزیك و ئاکار)ی ریواقییان، مانایەکی بەم ئوستوورانە بەخشی، یان چەند تەئویلێکی بۆ "عەهدی عەتیق" هەبوو کە دەگەڵ یەکدیدا ئاقوجووت بوون و لەپاش پەیدابوونی مەسیحییەت سروشتێکی تازە ـ بە پێی تەئویلێکی تازە ـ لەبۆ ڕووداوان، مەبەست و کەسایەتییەکانی عەهدی عەتیق

هاتنەگۆڕێ کە دەگەڵ دەسکەوتە کەونارایەکاندا جوداواز بوون. هەڵبەتە لە مێژووی هێرمینۆتیکدا لێوەکۆڵینەکانی خوداناسە جوورەکان و تەئویلکەرانی کتێبی پیرۆز کارێگەرییەکی بەرچاویان هەیە و ڕێگایان لە پێش فرە لە نوێهێنییەکانی نووسیارانی عیسەوی کردۆتەوە. بە هۆی کتێبەکەی ئۆگۆستینی پیرۆزەوە، دەسکەوتەیلێکی نوێ لە چەمکەیلی کتێبی پیرۆز ڕێیان کەوتە مەیدانی فەلسەفەشەوە. بە بڕوای ئۆگەستین ئەگەر دەقێ مانای جۆراوجۆری وەبەرەوە هەبێ، ئەڕای نموونە وەک: مانا دیرۆکییەکان، یان مانا فەلسەفییە چەندانەکان، وەلێ دەلالەتی دەق زێتر لە دەلالەتەکانی وی بەکارتر دەبێ. خوێندنەوە و تەئویلی زیهنیی دەق کە هەرچۆنێکی لێ دەڕوانی لەگەڵ دەقدا جوداوازە، ماناگەلێکی تازە دەئافرێنێ کە ڕەنگوڕوویەکی نوێ دەبەخشێ. خوێندنەوە، یان بەرەوڕووبوونەوە دەگەڵ دەقەکان لە بیری یۆنانی و ڕۆمیدا دوو جۆر بوو: تیئۆری بەیان و هێرمینۆتیک. ئەم دووانەش لێکدی جوداواز نەبوون. "هێرمینۆتیکی ئۆگۆستین ڕیشەی لە تیئۆریی سیسرۆن ئاوی دەخواردەوە." هەروەها: "پێوەندی لە نێوان زانست (وەک پەیڕەوی کردن لە یاسایەکانی مەنتیق و بەیان (وەک پەیڕەویکردن لە هونەرەکانی تەشبیە و ئیستیعارە و مەجازی ئەقلی و کینایە و هتد ) لەو واقیعییەتەدا وەشارتییە کە تەواوی کاری ناسین (معرفة) شێوەیەکی دیکە لە بەیانە. ئەسڵەن ناسین و وەسفکردنی کارێکی هونەری لە حوکمی ڕەنگدانەوە، یان لەنوێسازکردنەوەی چتێکدایە کە بە ڕەخنەگرتن لە شێوەی دروستکراوێکدا هەیە. ناسین و وەسف لە حوکمی کردارێکدایە. ناسین وەسفێکی بەیانکراو و جاروبار بەیان نەکراوە کە بە شێوەی لێکدانەوەیەکی زەینییانە خۆی دەنوێنێ. ئۆگۆستین پێی وایە کە تەئویلی دەق بۆ خۆی زانستێکە دەکرێ و یاسا و ڕێسایەکانی بە نووسین بنووسرێنەوە. بۆ تەئویلی کتێبی پیرۆز، ئەوەی کە تەئویل دەکا پێویستە بە لانی کەمەوە، سێ زمان عیبری، یۆنانی و لاتینی بزانێ و لە زانستەکانی خۆڕسک شارەزا بێ. ئەمن پێم وایە، وەرگێڕانی دەقێکیش لە زمانێکەوە بۆ سەر زمانێکی دیکە هەر بەو ڕەنگەیە.

هێرمینۆتیک بە لای ئۆگوستینەوە لە جوداوازیی مانای یەکەمین یان گەوهەریی هەر واژەیێ، وەل مانای ڕەمزیی وی دەست پێدەکا. دەیجا کەواتە: ئۆگوستین گوتەنی دەشێ هەر جۆرە بەیانێکی مەجازی بە "تەئویل هەلگر" بزانین، بەڵام مەرج نییە هەر مەجازێ مانایەکی مەجازیی هەبێ. کەواتە: بەیان چتێکە و مانا چتێکی دیکەیە. لە ئاییني عیسەوییەتدا باس لە ڕەمزی ژمارەکان و واژەکان کریاگە. بە مەزەنەی ئۆگوستین لە نێوە تایبەتییەکاندا کە لە کتێبی پیرۆزدا نووسراون ماناگەلی ڕەمزی شاردراونەوە و دەپرسێ کە چما عیسای مەسیح بە نێودانانی شەمعوون بە پترۆس ئەوەی ساغ نەکردۆتەوە کە نێوی پیرۆزەکان بە خوایشت و بە ئیختیاری تاکەکەسی نییە؟ بە لای ئۆگوستینەوە ژمارەکانیش لە کتێبی پیرۆزدا بە ڕەمزەیلی ڕاستەقینە لەقەڵەم دەدرێن. ئەوەی کە جیهان لە ماوەی شەش ڕۆژاندا سازکراوە، ڕەمزێکی کلیلییە و هەر ڕەقەمێکی دیکە کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتگیشە نیشانەیەکی لە واقیعییەتێکی نادیار هەس. ئۆگوستین ڕێگای دروستی ڕەمزخوێندنەوەی کتێبی پیرۆزی بە سوودوەرگرتن لە کتێبەکە هەر خۆی دەزانی و بڕوای وەسا بوو کە دەبێ بە یارمەتیی هەر پاژێ لە دەق، ڕازی پاژێکی دیکەی دەق هەڵبێنێ و کەشف بکا. ڕێگایێ کە تۆماس قەشە ـ ئەتۆ لە ڕەقی و زۆر بە زەحمەت تێگەیشتنی گەڕێ ـ هەر بە تەواوەتی بە دروست و ڕاست زانی. ئاییني مەسیحی بە "تەئویلی زمان" پشت ئەستوورە و نیشانە، ڕەمز و "نهێنی" لێک جودادەکاتەوە. دەتواندرێ هەر چتێ بە یارمەتیی نیشانە بناسرێ، یان بە یارمەتیی ڕەمز، ترووسکەگەلێکی لێ ئاشکرا کرێن، وەلێ هەرچی "نهێنی" (سر)یە، ئەوە پێناوی داپۆشینی "حەقیقەتی وەشارتی و پەنامە". تەئویل هێندێ جار و بۆ هێندێ کەسان "نهێنی بەدیارنێخی "نهێنی"یە. لە دوای قەشە ئۆگوستین تەئویلکردنی کتێبی پیرۆز ڕێگایەکی نوێی دیتەوە. خاڵی وەرچەخانی دیرۆکی تەئویلەکانی مەسیحی لە پەیدابوونی ئۆلی پرۆتستان ئاوی دەخواردەوە. خوداناسانی پرۆتستان پاژێ-بەش بە حاڵی خۆێ، لە گرینگترین تەئویلەکانی کتێبی پیرۆزیان نووسی؛ باسەکانی سوێدنبورگ لە پیرۆنەندیشەی

هێرمینۆتیك (تەئویل)دا گرینگییەکی زۆری هەیە. ئەو بڕوای وابوو کە هەروەك سێ ئاسمانی ژووریین، ناوین، ژێرین هەن، هەر بەو جۆرەش سێ جۆرە تەئویلیش بۆ کتێبی پیرۆز هەن. مانای پیرۆزان، مەعنەوی، خۆڕسکانە. مانای خۆڕسکانە هەر هەمان مانا دیار و ئاشکرایەکەیە (کە پێی دەڵێین مانای ئەدەبیی دەق) هەرچی مانای مەعنەوییە ئەوە چەمك و مانای نادیار و ئاشکرایەکەیە کە لێ حاڵیبوونی وی کارێکی هەستەم و دژوارە، وەلێ لەتوانست وەدەریش نییە. مانای قودسی، دەرك کردنی ناخی ناخەوەس،، کە دەرکی وی بۆ ئێمە، مرۆگەلی فانی و ناپایەدار، لە ئیمکان وەدەرە. بە لای سوئێدنبورگەوە مانا قودسی و مەعنەوییەکان دە نێو مانا سروشتییەکاندا حوزووریان هەس، هەروەك کە واقیعییەتی ئاسمانی بە یارییەی ڕووداوەگانی مەعنەوییەوە دە ژیانی خۆڕسکانەدا ڕەنگدانەوەی هەیە، بەڵام نە بە ژیانی خۆڕسکانە دەتواندرێ واقیعییەت (خودا)ی ئاسمانی بناسرێ و نە بە مانای خۆڕسکانە دەتواندرێ مانای قودسی بناسرێ.

دووبارەبوونەوەی ڕووداوەکانی جیهانی باڵا لە دنیای خاکیدا، لە عیرفانی ئیسلامدا باسێکی یەکسەر ئاشنایە. هەر "حیکایەت"ێ دیارنێخەر، یان لاساییکردنەوەی ڕووداوێکی لە کات و شوێن بەدەرە. گۆیا واژەی "حکایە"ی عەرەبی بە دوو مانای "داستان" و "دووبارەبوونەوە"یە. سەرلەبەری حیکایەتهایەکی کە لەم جیهانەدا ڕادەبرن، لاسایی و دووبارەبوونەوەی ڕووداوەیلێکن کە لە گیان، واتە: لە ئاسمانەکاندا ڕوودەدەن. هەر لەبەر هەندێ مانای وانیش لە جیهانێکی دیکەدا، واتە: لە جیهانی قودسدا زاندراوە. حیکایەتهایەکی کە لە قورئاندا هاتوون، ماناگەلی قودسی، پەنامەکی و ئەسرارامێز و ڕەمزاوی و تەمومژاوین کە ڕووداوەیلێ لە "جیهانی مانا"دا دووبارەدەکەنەوە. ئەمانە قسەی هانری کربن. کربن جارەها لە هاومانەندی هێرمینۆتیکی قورئانی و هێرمینۆتیکی عیرفانیی مەسیحیی دوواوە. بۆ نموونە: ئەو وێچوونی تەئویلی عیرفانیی سوئێدنبورگ لەمەڕ ژیانی حەزرەتی ئادەم و حەزرەتی نووح بە هێرمینۆتیکی گوستیك (گنۆستی)ی ئیسماعیلییە بە بیردێنێتەوە. بۆچوونی

سوئێدنبورگ لەمەڕ مانا پەنامەکییەکان نەك تەنها لەگەڵ بۆچوونەکانی خوداناسانی ئیسماعیلییە، بەڵکو زێتر وەك بنیاتی کاری زێتر مانالێکدەرەوەکانی قورئان دەچن؛ چونکە ئەگەر دابەشکردنی مانایەکان بە ماناگەلی ئاشکرا (ظاهری) و ماناگەلی پەنامەکی (باطني) نەبا، کاری مانالێکدەرەوەکان هەنگێن تەنها دەبوو بە ناسینی ئاستی ئەدەبی و ئاخاوتەنیی کتێو. بە پێی ئەم بنیاتە بیرەکییە، ئایەتەکانی قورئان جودا لە مانا ئاشکرایەکانیان، مانای پەنامەکی و باتینییان هەس کە بە پێی پلەوپایە بۆ هەڵوژێردە گەل و ئەهلی ماریفەت و سولووك ڕوون کەشف دەبن. فەرمایشتێکی پێغەمبەر کە لە زمانی سەلمانی فارسیڕا وەگێڕدرایە، هەیە دەڵی: "إنَّ لکلّ أمرأ جوَّانياً وبرانياً". واتە: هەر چتێ دیوی ناوەوە و دیوی دەرەوەی هەیە. لە فەرمایشتێکی نامێی دیکەیدا هاتووە، دەڵێ: "إنَّ للقرآن ظهراً و بطناً ولبطنه بطن إلى سبع أبطن". بە گوزارشتی مەولانا لە مەسنەویدا:

"همچو قرآن که به معنی هفت توست
خاص را و عام را مطعم در اوست"

سوڵتان وەلەد، کوڕی مەولانای ڕۆمی گوتوویە: "زانا و ئەولیا هەرچییەکیان لەمەڕ لێکدانەوەی قورئان گوت، لە چارەم تێنەپەڕی و خەبەری نەدا. بەڵام ناتواندرێ بگوترێ: کە ئەولیا بە حەوتەم نەگەیشتن. گەیشتن و تێشپەڕین، وەلێ لە لەفز و عیبارەتدا هەمان بەتنی چارەمیان توانی بگونجێنن... مەنزڵگایەکانی دەریا بێ ناوونیشانن، ناتوانرێ قامکیان لەسەر داندرێن".

ئیخوانوسسەفا لە بابەتی نوخشەی ئەندێشمەنداتی ئیسلام بوون کە نە تەنها بڕوایان تەنێ بە جوداوازی لە نێوان دیوی ناوەوە و دیوی دەرەوەی قورئاندا هەبوو، بگرە بڕوایان بە جوداوازی لە نێوان دیوی ناوەوە و دیوی دەرەوەی زانستی ئایین و شەریعەتیشدا هەبوو. ئەوان بە سێ جۆرە جوداوازییان بڕوادەکرد، یەکەم: زانستی ڕەواڵ و ئاشکرا لە گوێن ئەحکام و شارەزایی لە زانستی ئەخبار و لێکدانەوە و ڕیوایات

و حیكایات، دووەم: زانستێ كە لە نێوان ئاشكرا و پەنامدا كە بیركردنەوە لە ئەحكام و وردەكاری و مووقلآشی لە مانازانیدا، لێكدانەوە و تەئویل كردن و تەنزیل لەویدا جێی هەیە، سێیەم: زانستی پەنامەكی كە شایستەی ئیماندارانی ڕاستەقینە و پەیجووی زانست و حیكمەتە و هەروەها لە تهێتییەكانی ئایینناسی و ڕوونكەرەوەی ڕێمسایەكانی پرسیار لە ڕووداوەكانی ئاسمانییە.

ئیسماعیلییەكان لەمەڕ گرینگترین پرسی "زانستی پەنامەكی"، واتە: بڕوا بە جوداوازیی مانایی لە نێوان قورئان و شەریعەتناسی دەگەڵ ئیخوانوسسەفادا هاوبیربوون. لە سەرێكی دیكەوە دەتوانرێ كاریگەریی بیروبڕوای ئیخوانوسسەفا لە ئیبن ڕوشددا بدیترێ. لە حیكایەتی "البقال"دا ئەوە دەخوێنینەوە كە "ئەگەر ماریفەتی ڕەوالەتە و ئاشكرا، بە پێی بەلگە، لێل شەرعدا ڕێك نەكەفت، دەبێ پەنا بۆ تەئویل ببرێ. مانای تەئویلیش ئەمەیە كە دەبێ دەلالەت لەسەركراو (مدلول)ی واژە و زارلوەكانی شەرع لە مانای ڕاستەقانی بترازێندرێ و بەلای مانا مەجازییەكانی ویدا بشێكێندرێتەوە". بەلآم ئیبن ڕوشد ئەم كارەشی هەر بە چتێكی تەسكبوار لە قەلەم دا. لە جوداولزیی ڕەوالّ و ئاشكرا و پەنام و ناناشكراوە بە جوداوازیی لێكدانەوە و تەئویلكردن دەگەین. هەروەك لە بەرایی باسەكانەوەش دیاردیمان بۆ كرد، لێكدانەوە (تفسیر) بودیارنێخستنی مانا ئاشكرایەكانی قورئانە، هەروەكو دەق لە ڕەوالی ئەدەبیی ویدا بەدیاردەكەوێ. لێكدانەوە بەو سان و ئاوایە، واژەناسی، ڕێزماننناسی، ئەدەبیاتناسی و زماننناسییەكان، دیاریییە دیرۆكینەكان، یاسایەكان و هتد .
مەبەستی لە لێكدانەوە دەركی هەرچی وردتر و موقلآشانەتری دەق لە لایەن خوێندەوەس. واژەی "تفسیر" لە قورئاندا زۆر جاران هاتووە، بە نموونە ئایەتی:" ولایأتونك بمثل إلاّ وجئناك بالحقّ وأحسن تفسیراً" (سوورەتی فورقان، ئایەتی ٣٣) لێرەدا مانای تەفسیر " بەیان و ڕوونكردنەوە و شرۆڤەكردن"ە. تەنانەت خالبەندی كە وێڕای وەی كە بە "جوداوازیگەل لە ڕاەستان"دا نامێیە، ئەمەش دەورێكی گەورە لە جوداوازیگەلی قوولی ماناییدا دەگێڕێ. ئەگەر لە ئایەتی: "وما یعلم تأویلە إلاّ الله

والرّاسخون في العلم " (سوورەتی ئـال عیمـران، ئایـەتی ٧) لـە پـاش "الله" ڕاوەستی مانایەکەی ئەوەیە کە لە مانای ئایەتە موتەشابیهاتەکان، لێکدانەوەکەی خودا بۆ خۆی نـەبێ کەسـی دیکـە نـایزانێ؛ نـەختێر ئەگـەر لـەپاش "والرّاســـخون" ڕاوەسـتی، ئـەوە مانایەکـەی وای لێ دێ کـە خـوداش و ئـەو کەسـانەی کـە پێیـان لـە ڕێـی زانسـتدا چەسپاندووە و پایەدارن لە مانایان دەگەن.

هێندێ سێ جۆرە لێکدانەوە بـۆ لێکدانـەوەی قورئـان دادەنێـن: لێکدانـەوەی سوننی مەزەبانـە کـە شـرۆڤەی دەق دە چـارچێوە و ئاسـتی دەلالـەتی واژە دەرنـاچێ. لێکدانەوەی شیعییانە کـە زێـتر بـەلای ئـەتویلدا دەلـەنگێ و لـە دەلالـەتی زمانیی واژە بەولاوە دوورتر دەڕوا و لە مانای نهێنی پتر سەری دەخورێ. ڕوونە، کلیلی ئـەوەش بـە دەستی ئەهلی بەیتەوەس. سێیەمیان لێکدانـەوەی عیرفانییـە کـە ئـەمیش هـەر جۆرە تەئویلێکە. هەموو ئایەتێ، دەقە شیعرێ، فەرمایشتی پیرێ، باوەڕێ دوو مانای هـەس: ڕەوالّی و پەنامی. بۆ نموونە: قەنـەوی دیوانەکـەی حـافزی شـیرازیی ئـەمری بـە زمـانی تورکیی عوسمانی شرۆڤەکردووە، پاش وەرگێڕانی واژە بە واژەی شیعرەکان جـارێ بـە مانـای حـەقیقی و جـارێ بـە مانـای مـەجازیی شـەرح کـردوون. جگـە لەمـە تـەئویل لـە عیرفانی ئیسلامیدا بە مانای "نـهێنیزانی و ئەسرارناسـی"ی خەونانیشـە. ئیـبن عـەرەبی دەڵێ: حەزرەتی یووسف لە تەئویلی خەونەکەیدا وەک کەسێکە لە خەونیدا وا ببینێ کە بەخەبەرهاتووە و خەونەکەی خۆی لێك دەداتەوە و نەزانێ کە خەونە. بەڵام پەیامبەری ئیسلام "وێنەبەرهەستەکانیشـی وەك وێنەخەیاڵییـەکان دیت و ئەوانـەی بـە تـەجـەللای خوداوەند و مەزهەری مانای بەرچاو و ڕاستەقینە خوداییەکان زانیوە. لە پێشترێ باسی ئەوەمان کرد کە ئۆگوستین لێکدانەوە و تەئویلی ئایەتـەکانی کتێبی پـیرۆزی بـە هـۆی خـودی ئایەتـەکان لێـك دەدایـەوە و تـەئویل دەکـرد. ئـەم تـەرزە لێکدانەوەیـە دە لێکدانەوەی قورئانیشدا هەبووە. بە نموونە: ئایـەتی ٨٩ لـە سورەتی "نحـل" "ونزلنـا علیـك الکتـاب تبیانـاً لکل شیئ" بـە بەڵگـەی ئـەوە دێنێتـەوە کـە ئەگـەر" قورئـان ڕۆشـنکەرەوەی هـەموو چێـێ بـێ" کـوو دەبـێ" ڕۆشـنکەرەوەی خۆشـی نـەبێ؟"

ڕاستییەکەی ئەم لێکدانەوەی دەق بە دەقە کارێکی زۆر سەخت و دژوارە، بەڵام هەر ئەوەندەیە کە دڵنیایەکی زێتر بەلێکدەرەوەکان دەبەخشێ کە( لە لێکدانەوە بە" ڕای" بە"بۆچوونی شەخسی ") دوور کەتیتەوە. لێکدانەوە بە ڕەئی خودی ،خۆ شێوەیەکە هەمیشە ئەندێشمەندانی موسڵمان بە کارێکی پەسندیان دانــاوە ،فەرمانیشتەکەی پێغەمبەر:" هەر کەس قورئان بە ڕای خۆی لێکبداتــەوە لە ئاوری دۆزەخ دەسووتێ" بەڵگەی ئەو لێکدانەوە بەڕای خۆیە بەناپەسەند زانینەیە. گرایشت (لایەنگری،نزعە)ێ لە سەدەکانی سێیەم و چوارەمدا لە نێو بیرمەندانی سورماناندا سەری هەڵدا کە هەر جۆرە لێکدانەوە و تەئویلێ لە قورئان بە ناڕەوا و گوناهباری دەزانــی. بە بڕوای پەیرەوەانی ئەو گرایشتە هەر لێکدانەوەیێ لەبەر حوکمی لێکدانەوە بە ڕەئیە". بە لای منەوە لێکدانەوەی هەر دەقێ بە مێتۆدناسی زانستانەی لێوەکۆڵینەوە بەسترایە.

باشە کێهە ڕامانەی ڕاستی ناسین سەر پشکە؟ ئەمن پێم وایە شتێك هەیە پێی دەڵێــن" گەوهەر و دیاردە ". هەر بە ئەزموون زانست و چالاکی بە کردەوە لە ژیانی ڕۆژانــەماندا بۆمان بە دیار دێخی کە هەموو شتێ لەو دنیایەدا دوو ڕووی هەن: ڕوویەکی دیوی نێوەوە و ڕوویەکی دیوی دەرەوە، ئەوەکەی دیوی نێوەوە هەمیشە شتێکی پەنام و لەمەوەش هاتییە کە هەرچتێکی ئەوەی دیوی دەرەوەیە ئەوە لەبەر دەستی هەموومانداپە و بە چاو و بە گوێ و لووت و زمان و دەست، هەستی پێدەکەین. ئێمە کە دەمانەوێ چتان بناسینەوە دیارە بە هۆی ئەندامانی هەستمانەوە ئەو کارە دەکەین، لە پێشان تەنێ هەر تاکە تاکەی ڕەواڵەکانی چتان دەرك دەکەین نەك هەموویان، واتە تەنها پێوەندییە دەرەکییەکانی وان و بەس. کەوا بوو ئەوەی لە پێش چاومان زەق و زۆپ لە پێشدا ڕادەوەستێ ئەوە دنیای ڕەواڵ و دیاردەکانە، بەڵام زانست و چالاکیی کردەنیی مرۆڤ تەنها بەوە داناکەوێ کە چتان دە خانەی دەرکیی بەرهەستدا جێ بکەنەوە و هەر بە وەسفێکی ڕووت چتان بە دیار بێخن، بەڵکو هەوڵ دەدەن یاسا گەوهەرییە پایەدارەکانی ئەو دیاردانە و هاوسەروکارییان لە ڕووی هۆی پەیدابوونیانەوە لەگەڵ واندا پێوەندیی نێوەوەشیان بەدیاربێخن. یاسایەکانی، خۆڕسك و

کۆمەڵ تەنێ بەھەستەکان، ڕاستەوخۆ دەرک ناکرێن، چونکە لەگەڵ دیاردەکاندا ڕێک ناکەون و جووت نابن. کەواتە: دۆزینەوەی ژاکوون (یاسا)ی گۆڕانی چت، دۆزینەوەی سروشتی ناوەوەی وییە، چوونە نێو دەرککردنی ئەو چتانەیە کە دیاردەکان لە یەک چتدا ھەموو پێکەوە دەبەستێ، دەرک کردنی ئەوەیە کە چتە بنەڕەتە سەرەکییەکەی تێدا سازدەکا.

جەوھەر ئەوەیە کە لە پشت دیاردە ڕۆژبەڕۆژەکانەوە، واتە: پێوەندییەکەی ناوەوەی، منیچەکەی و یاسای تەشەنەکردن و گەشەکردن و گۆڕانەکەی ئاشکرا نییە و وەشارتییە. بۆ نموونە: لە کۆمەڵێکی لە دوو نەتەوەی لەڕووی زمان و نەژاد و مێژوو و کەلەپوور و ھتد ..وە لێکدی جوداوازی بە ڕۆیەتێرداوەکی لێکدی گرێدراوی وەک کورد و عەرەب، یان تورک و کورد، یان فارس و کورددا کە دیاردەی بالادەستیی یەکێکیان وەک عەرەب لە سووریە و عێراق و تورک لە تورکیە و فارس لە ئێراندا و بە چاوی کەمتر نواڕینی بالادەستەکە لە ژێردەستەکە و ژێردەستەکە لە دوو سەرەوە (چینایەتی و نەتەوایەتی) بچەوسێندرێتەوە و ھەموو ڕۆژێ ژێردەستەکە بۆ داکۆکی لە پێناوی مانی مان ئاساییی خۆی، لە پێناوی زمانی، لە پێناوی کەلەپووری خۆی لە بالادەستەکە ڕاپەڕێ و بالادەستەکەش ھەر جار نا جارێ بە ھەموو شۆڤینییەتی خۆیەوە سەرکوتی کا و وەک کابرای لە ھەردوودین بوو کێیەتیی خۆی لێ بێ بە مەتەڵ و موعەمما و منداڵی نەزانێ خێوی چ کێیەتییەکە، عەرەبە، تورکە، فارسە، جندۆکەیە، ڕەمووزتە، چییە و چی نییە؟!" یان ھەر دیسان بۆ نموونە: قەیران و بێکاری و ھەژارکردنی کرێکاران و ترانکردنی ژیانی فەلا و وەرزێران و مانگرتنەکان و خۆپیشاندانەکان کە سەرتاسەری جیھانی سەرمایەدارییان گرتۆتەوە و بە جارێ قانگیان داوە، ھەمووی لە چاو ڕژێمی نا مرۆڤانەی بۆ قازانجی ھەرچی زۆرتر ھەڵپەکردن دەزاندرێ کە ئەویش ڕژێمی سەرمایەدارییە.

*ئیدی بەم جۆرە دەبینی کەوھەر بریتییە لە پێوەندیی دیوی ناوەوەی جیھانی بەرھەست و ھەر ئەمەشیشە بنەمای جۆربەجۆریی دیاردەکانی دنیایێ. ئەوجا مایەوە*

*بپرسی باشە، ئەدی دیاردەکان چن؟ هەرچی دیاردەیە ئەوە ڕەواڵ و مەزهەری گەوهەرە، شێوەی دیوی نێوەوەی تەجەللا و بەدیارکەوتنی ویە.*

ئەوەی کە زۆر ڕوونە گەوهەر ئەوەیە کە چتێك نییە دەپێش دیاردەکاندا هەبووبێ و ج دەخلی پێیانەوە نەبێ و هەروا چتێکی سەربەخۆ بێ. گەوهەر و دیاردە ڕەنگ بە خودی هەموو لایەنە جوداوازەکانی یەك واقیعییەت دەدەنەوە: گەوهەر ڕەنگ بە لایەنەکانی دیوی نێوەوەش و بنچینەییەکانیشی دەدەنەوە؛ هەرچی دیاردەکانن ئەوە تەنێ ڕەنگ بە لایەنە دەرەکییە ڕاستەوخۆیەکان دەدەنەوە.

ئەوجا، ناشبێ لە یەکیەتیی گەوهەر و دیاردە بەو جۆرە بگەین کە ڕاستەوخۆ دەگەڵ یەکدیدا لێك و لووس جووتن و پڕاوپڕی هەڤدوون. ئەگەر هاتبا هەموو چتێ بە سەر ڕووی دیاردەکانەوە با، دەکرا بە یەك جار و ڕاستەوخۆ یاسا و ڕێسایەکانی خۆرسك و کۆمەڵ دۆزرابانەوە، وەلێ کارەکە بەو جۆرە نییە: دوورناسی و گەوهەرناسی ئەرکێکی گەورە و کارێکی فرە بەگرێوگۆلی گەرەکە کە مەگەر هەر زانایان ئەنجامی بدەن. گەوهەردۆزینەوە لێوەکۆڵینێکی زانستانەی پشوودرێژی چالاکیی کردەنیی پێویستە. بۆ نموونە: ئێمە وا دەزانین خۆر بە دەوری گۆی زەویندا دەخولێتەوە و وەك زەوین هیچ جۆرە جووڵەیەکی نەبێ. بەڵام ئاواها زانینی کارەکە دەگەڵ گەوهەرێکی کە زانست و ئەزموون دۆزیویتیەوە ڕێك ناکەوێ و دووفاقە. ڕاستییەکەی، ئەوەیە کە زەوین بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، نەك خۆر.

فەیلەسووفانی فەلسەفەی ئایدیالیستی گەوهەر لە دیاردە جوێ دەکەنەوە، گەوهەریان پێ چتێکە و دیاردە چتێکی دیکە. ئەمانوئێل کانت واقیعییەتی بە دوو بەشەوە کرد: جیهانی دیاردەکان و جیهانی گەوهەران. بە ڕای وی ناسینی جیهانی گەوهەرەکان یان وەك بۆ خۆی نێوی لێ ناوە "چتەکان دە خۆیاندا" بەڵام فەلسەفەی ماددی ئەوەی بە تەواوەتی یەکلاکردۆتەوە و بڕیوەتەوە کە ناسینی گەوهەری چتان کارێکی مەحاڵ نییە، دۆزینەوەی یاسایەکانی گۆڕان و گەشەکردنی جیهان کارێکی لە ئیمکانبەدەر نییە..ئەوانەی پێیان وایە جیهان مەتەڵێکە و هەرگیز هەڵناهێندرێ. بەرەی

نازانمکاری agnosticisme یان پێ دەگوترێ. دیارە نازانمکاری کارێکە خۆی خۆی بە درۆینخیتەوە و لە ئەقڵ و ئاوەزیەدەرە. گریمان مرۆڤ لەم جیهانەدا تا دەمرێ دەستەپاچە و داماوانە تەنێ لە دەوروبەری خۆی دەتۆپێ و هەرپی لە بری جیاناکاتەوە و لە هیچ حاڵی ناوێ، بەڵام کەی وایە؟ ئەدی ئەو هەموو کون و کەلێنی جیهان پشکنین و گۆڕانکارییانەی کە بە ئەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ ئەنجام دراون بە پێچەوانەی "نازانمکاری"یەوە، نیشانەی "دەزانمکارکاری" نییە؟! مرۆڤ بوونەوەرێکی لەدوورڕا تەماشاکەری شانۆی وجوود نییە، مرۆڤ بوونەوەرێکی وەکار و ئەفرانکارە. لە مەیدانی کار و ئەزموونا ڕاستی و ناڕاستیی چتان بەدیاردەکەوێ، مرۆڤ بە دەم کار و چالاکیی ڕەنێوهێنانەوە پەی وە گەوهەری جیهانی چاردەوری خۆ دەبا.

ناسینی چت، پلەی یەکەم و پلەی دووەمی هەن: ناسین لە ڕێی هەستەکان: دیتن، بیستن، چەشتن، لەشبەرکەتن و بێنکردنەوە. ناسین لە ڕێی ئەقڵ، مەنتیق، بیرکردنەوەی ڕووتەوە. بەڵام ئەم دوو پلە ناسینە بە بێ چالاکیی بەکردەوە سەرناگرن. بە بێ ئەزموون ناچنە ڕیزی لە ڕاستی نزیک کەوتنەوە.

تەئویل، لە زۆر سەری دیکەوە لێوەکۆڵدراوە و قسەی لەسەر کراوە. شلایر ماخەر و دیلتای دەڵێن، نیچە گوتەنی: چتێ بە ناوی دیاردەی ئاکاری (أخلاقی)یەوە نەبووە و نییە، ئەوەی کە هەیە لێکدانەوەی ئاکاریانەی دیاردەکانە و بەس. هەرچی هوسرل و هایدگەرن، پێیان وایە: "مرۆڤ کە قسان دەکا قسەکەی هەر هێندەی وەبەرەوە هەس کە بە زمان وەڵامی دەداتەوە". هوسرل دیاردەناس بڕوای بەپێشەکی ئەنجامگری (استنتاج قبلی) و قیاس نەبوو. ئەو تەنێ بڕوای بە ڕاستەوخۆچت دەرکردن (شهود) intuition ی بە ئەزموون و ورد و مووقڵاش هەبوو. تەئویلی بە کارێکی ڕاست نەزانیوە. گادامەر، لە مەڕ تەئویل و مانا، دەڵێ: "پرسی ئەسڵی لە هێرمینۆتیکی فەلسەفیدا ئەمە نییە کە ئێمە چدەکەین، یان دەمانهەوێ چبکەین؛ بەڵکو پرس ئەوەیە: کە چ چتێ لەو دیوی ویست و کرداری ئەوە ڕوودەدا؟

ریکۆر پێی وایە، فلوبەر گوتەنی: یەکێ لە ڕێگایەکانی دەگەڵ ژیاندا هەڵکردن (تحمل کردن)، ئەوەیە کە دە نێو ئەدەبیاتدا نقوم ببی، وەك بڵێی لە جێژنێکی ئەمردا هاوبەشی بکەی. ریکۆر بە کارلۆس ئۆلیۆی گوتووە کە هەمیشە: "شیفتە و کەمەنکێشی چەندسەرە بووە."، حەزی لەوە بووە دەق زۆر مانا هەڵبگرێ. ئەو پێی وابووە کە "ئێمە هەموو کوڕی ڕەخنەین" ئەو ستاییشت لە مامۆستایانی گومانی ڕەخنەییی نوێ دەکا، بەڵام جەختیش دەکا کە "دەبێ لەگەڵ ڕەخنەدا ڕەخنەگرانە ڕووبەڕووبینەوە". ئەمە پرسێکی گرینگە لە ئەندێشەی ویدا: چۆن چۆنی ئەندێشە هەم سەربەخۆ نییە و سەربەخۆشە؟ ئەو وەڵامی نە لە "من بیردەکەمەوە" و نە لە زاڵبوونی جیهانی بەرهەستدا دۆزیوەتەوە. ریکۆر دە ئەندێشەی ئایینیدا،هەر هێندە نوێخوازە کە دە ڕامانەی ئەدەبیدا،پرۆتستانتە، وەلێ ئەوەندەی کە لەم ئایینە فێربووە ڕەخنە و ناقابلییە. ئەو پێی وایە کە لە نووسیندا دەبێ بیروبڕوای خۆمان لە نێوان دووکەوانەدا "......" دابنێین و هەرگیز بە چتی سەلمێندراویان نەزانین. ئەم جۆرە ئەندێشانە دەکرێ لە تۆولۆی بیروباوەڕی نوقتەوییەکانی بەرەی عیرفانی ئیلحادیی دنیای ئیسلامیشدا ببینینەوە.

هایدگەر دەیگۆ: زمان قسان دەکا، و ئەمەیە حوکمی ئەسڵیی وی: زمان قسان دەکا نەك مرۆڤ. مرۆڤ تەنها لەوێدا قسان دەکا کە دەگەڵ زماندا پێکەوە بێ. بە پێچەوانەی وەی کە لە یەکەم نیگادا بەرچاودەکەوێ ، ئاگایی لە قەڵەمڕەوی زماندا زاڵ نییە. لە نواوە وا بەدیاردەکەوێ کە ئەگەر ئاگایی تەنێ لە یەك زەوینەدا زاڵ بێ، ئەو زەوینەیە زمانە، بەڵام وا نییە. زمان هەروەك ئامێری هاوسەروساختی دەگەڵ یەکی دیدا، سنووری ئاگاییی یەکی دیکە و سنووری ئاگاییی مە دیاری دەکا. ئەم قەڵەمڕەو و کاری زمانی ڕاستەوخۆیە لە سەرپشکایەتیی "من" بەدەرە؛ و لە پراکتیسدا ڕامان دەگرێ و یەکمان دێخی. خۆلاسە قسەکە بەمە دەشکێتەوە کە مانا، بوودێکی فیزیکیی نییە(!؟) بەڵکو بابەتی بێ خەوشی ئەندێشەیە و بەس، بەڵام دەلالەت ئێمە بە واقیعییەتەوە

شەتەك نەدا. دەلالەتیش بە كات و شوێنەوە، بە پێوەندیی دەگەڵ یەكدیی چنانەوە گرێدراوە(شەل نییە، لاقی شكایە. ش. م).

هەروا بەدەم سەرەمەقەستی قسانەوە و زۆر خێرا باسكردنی تەئویلەوە، ولفگانگ ئایزەر و هانس ڕۆبەرت یاس، لەمەڕ ئاسۆی دەق، بە سەرناوی "جوانی ناسیی دەرك كردن"ەوە باسی تەویلیان كردووە. ئەندێشمەندان لە مەڕ تەئویلی ئەدەبی دەگەڵ یەكدیدا فرە نارێك و لێك دوور بیریان كردۆتەوە. هێرش لە تەئویلدا، *مانای كۆتایی و ڕوون و نێتی نووسەری كەرەكە*، گادامەر *وتوێژ دەگەڵ ئاسۆی، مانایی زەمانیی پێخوستكراوەی لێ دەوێن*، ڕێكۆر *سازكردنی جیهانی دەق*، هایدگەر *دۆزینەوەی ڕازی دەقی لێ دەوێن*. هەشن خوێندنەوە و تەئویلی دەق دە حوكمی "لێكدی ئاشكرابوون (مكاشفة)ی مانا" دەزانن و گرۆیەكی دیكە بە "مانائەفراندن" دەناسێنن. بە پێی لێكۆڵینە تازەنەفەسەكان لەمەڕ هێرمینۆتیكی ئەدەبی تەئویلی، دەق دە حوكمی بایەخ بە ئاستی ئەدەبیی دەقدایە و مانا ئەنجامەكەیەتی، كە ئەوەش لە بەستێنی دەق خوێندنەوەدا دەردەست دەكرێ.

ئەم باسە بەلای ئەوەماندا ڕادەكێشێ كە ئایا خوێندنەوە بە مانای یەكسەردەرككردن و فەوری، یان پێشبینیشە؟ زۆر جاران دەستی خەڵك دەخوێنینەوە، فنجانی قاوەیان بۆ دەگرینەوە، لە دەموچاویاندا باری دەروونییان دەخوێنینەوە، یان خواجا حافزێكیان بۆ دگرینەوە، یان خەونسان بۆ لێك دەدەینەوە، گەلۆ ئەم خوێندنەوەیە مانای ئەوە نییە كە فیعلی خوێندنەوە و زیندەگی كردن (زیندەگی وەك دەق) دەگەڵ فیعلی "ئەفراندن"دا هاوەسەروكارن؟ سۆفییەكی نەقشی كە خۆی لە خەڵك دووردەخاتەوە و دەچێتە خەلوەخانەوە، بە "تأمل و مراقبە"ی ڕۆحی دنیایەكی، با خەیالیش بێ، لە واقیعییەت بەدەر بۆ خۆی سازناكا؟ كەواتا، ئەتۆ كە دەقێ وەدەخوێنی، دنیایەكی لە دەقبەدەر سازدەكەی خوێندنەوە واتە: فەرامۆشكردنی دنیای وقیعییەتی خواساییە تا بە ئەفراندنی واقیعییەتێكی نوێ بكەین، بۆ نێو دەق ڕێدۆزینەوەیە، دەردەستكردنی جۆرە جیهانێكی دڵخواز لە دەقدا، ئارەزوو، یان ئامانجی كاری خوێندنەوەیە.

هێندێ جار خوێندنەوە هەر هەمووی سەرلەبەر دەبێ بە کارێکی تەئویلکاری، دەبێ بە بیانووی سەرلەنوێ جیهانێکی دیکە دروستکردن. ئەمن بۆ خۆم زۆر جاران کە چتێ دەخوێنمەوە، مەبەستی خاوەن دەقم وەك بڵێی هەر مەبەست نەبێ وایە. کاتێ ئەفسانەی چیای ئاگریی یەشار کەمالم بە کوردی کرد، لەو شوێنەدا کە گوڵبەهار و ئەحمەد لە سەر چیای ئاگری بە یەکدی دەگەن و شەو پێکەوە ڕادەکشێن، ئەحمەد شیرەکەی لە نێوان هەردتکیاندا دادەنێ، بۆچی؟ ڕەنگە ئەتۆ بڵێی ئەوە لاسایی داستانەکەی مەم و زینی کردبێتەوە کە ئەمیش هەر لە داستانەکەی ئەشقی ئیزۆلدای ئەسکەندیناڤی ئاودەخواتەوە. بەڵێ، دەشێ وابێ، بەلام ئەمە زێتر لە ئەخلاقییەتی شۆڕەسواریی سەردەمی ڕژێمی فیودالْ هەڵێنجراوە و یەشار کەمالی لەنوێوە وەگێڕی ئەفسانەی چیای ئاگریش هەر وەك وەگێڕی داستانی ئیزۆلدا و وەگێڕی داستانی مەم و زینی فۆلکلۆری و ئەحمەدی خانیی ئەمر، ئەحمەدی بە سۆفییەکی پابەندی ئاکاری شۆڕەسوارێکی داوێنپاك و ئەشقی بێ خەوشی ئەو سەردەمە لە قەڵەم داوە. وەلێ ئەگەر یەشار کەمال وەك کافکا کە لە کاغەزێکیدا بۆ بابی ناردووە و هێندەی پەسن و ستایشت لێ کردووە سەری گەیاندۆتە حەلحەلەی ئاسمانی، ئەو کەسانەی کە لە سای دەسەلاتی پووڵەوە لە مرۆڤایەتی شۆراوەتەوە و پەسنەکەی لێ بووگە وە فڕ و شۆڕبنەوە و هەجوو، بخوێنمەوە، ئەو جیهانێکی لەسەر دەستووری "ڕیشەبەندی" rhizomeی ئاسۆیی نەك "درەختبەند)ی" ستوونی ڕاناوە. یەشار کەمال گوڕینی چارەنووسی نەتەوەی کوردی بە دەست کورد خۆی، بە هەلومەرجی خۆیی (ذاتی)یەوە گرێداوە. دەیەوێ بێژێ، کورد هەتاوەکو لە هەلومەرجی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و خێڵەکیدا، تا ناقرەی نقوم بێ و لە غەفلەتی ئەو جۆرە ئایدیۆلۆجییەدا بخولێتەوە، بە ئامانج ناگا.. گوڵبەهار، مادامێکی هەر بە هەمان زیهنییەتی کیژە دەرەبەگێکەوە بۆ ئەحمەد لە زیندان ڕزگارکردن، سازشت و موساوەمە لەگەڵ مەمۆی وەردییانی زینداندا بکا و کلاڤەیێ لە قژەکەی پێشکێش بکا، دیارە هێشتا هەر لە خەونی غەفلەت، نائاگایی و متمانە بە گوێ لەمستی مەحموود خانی دەرەبەگ، مەمۆ، دەکا. لەبەر

هێندێ بۆ ئەوە ناشێ بیکا بە هاوسەری خۆی، چونکە لەگەڵ مەمۆی وەردییاندا کارێکی نابەدڵی ئەحمەدی ئەنجام دابوو و ناکرێ بە بەو جۆرە سازشکارییە بە ئامانجی ڕاستەقینەی خۆیان بگەن، ئەم ڕەمز و بە ئامانج نەگەیشتنە، کینایەتە لە بە ئامانج نەگەیشتنی نەتەوەی کورد کە تاوەکوو دەسخەڕۆی زیهنییەتی فیودالْ بێ، بە هیچ ناگا، تا دەگەڵ ڕژێمی ڕزیوی فیودالْدا سازشتکار بێ، ناتوانێ لە چوارچێوەی میرنشینێکی دەرەبەگایەتی خۆی قوتار بکا. بەڕاستی ئەحمەدی خانیی ئەمریش هەر بەم جۆرەی بیردەکردۆتەوە. ئەو هەتوانی دەردی کوردی لە یەکگرتنی نەتەوەی کورد لە دژی پچڕ پچڕیی دەیان میرنشینی ئاڵقەلەگوێی عەجەم و تورك و عەرەب، یان بۆرە سەربەخۆدا، دەدیت. پەشار کەمال ڕەمزکردنەوەی گوڵبەهاری لە لایەن ئەحمەدەوە کردووە بە ڕەمزکردنەوەی چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەی کورد بەو شێوە پچڕ پچڕ و کاڵ و کرچەی درێژاییی مێژوو، کە لە ڕژێمی فیودالْدا پەنگی خواردبۆوە و تا ئێستاش هەر پەنگی خواردۆتەوە و قەتیس ماوە، هیچی بە هیچ نەدەکرد.

هەروەها لە شوێنێکی دیکەدا پەشار کەمال لە پەسنی زەینکێ عەقدال، بەیتبێژی فۆلکلۆریی نامیی کورد، لە داستانی "زەوین ئاسن و ئاسمان مس"دا دەڵێ: "بەیتەکانی عەقدالْ زەینك هەموو کەسێ تێی دەگا، لە کورد، عەجەم، عەرەب، تورك ." ئەمنیش لە وەرگێڕانی ئەم چەند دێڕەدا "هێرمینۆتیکانەی ڕیزۆمیانە تێ هەڵچووم و ئەمانەم بە دەمیەوە دا: "ئینگلیس، فەرەنگ، ڕووس و هندیش . تێی دەگەن" ئەمن لێرەدا مانای ئەم دەقە، ویلهلم دیلتای و R. G. Colingwood ئاسایی بە پێی بنەمای "باجایش" segf- transposition لێکدایەوە، (بەیتەکەی عەقدالْ زەینك بە بەیتی نەبڕاوەی ئازادیی نەتەوەی کورد کە هەموو گەلانی دنیا تێی دەگەن، تێ دەگەم، بەڵام بە داخەوە تا ئێستا تەنێ هەر بە گوێگرتن نەك بە کردەوە ئاوڕمان لێ دەدەنەوە.)

واتە: خوێندەی دەقێ مافی ئەوەی هەیە کە لە لێکدانەوەی دەقدا خۆی لە جێی نووسەری دەقەکە، لە ڕووی کارایی، کاتی و شوێنییەوە، دابنێ. یەکەم ئەوەیە کە: لە ڕووی کارایی و شەخسییەوە، خوێندە دەبێ ببێ بە هەمان نووسەری دەقەکە، بچێتە

نێو ناخی قاڵبی نووسەری دەقەکەوە و خۆی لە جیاتیی نووسەرەکە حسێوکا. دووەم: ئەوەیە کە لە ڕووی کاتییەوە دەبێ خۆی لە هەلومەرجی کاتی - مێژوویی ویدا بسەپێنێ و بزانێ کە لە کێهە برگەی "کاتی"دایە: دەبێ لە گۆڕانکاری، ڕووداو و سەربووره سیاسی و بیرەکی و فەرهەنگی و مێژوویینە و ئابووریی ئەو سەردەمە حاڵی بێ و بزانێ دە کێهە برگە، یان دابڕانی "مێژوویینە"دایە. سێیەم ئەوەیە کە: لە ڕووی شوێنییەوەش دەبێ لە بارودۆخی جوغرافیایی و زێدی شوێنیی نووسەر بە تەواوەتی شارەزا بێ و بزانێ "لە کێهە قولینچکی جیهان"دا گیرساوەتەوە. ئیدی بەم جۆرە خوێندە بە دوورخستنەوەی هەر جۆرە پێشداوەریی پێشوەختانە و بیروبۆچوونی شەخسی، یان بە لاوەنانی هەر جۆرە زیهنییەتی خۆیی و بەرەوبڕی لە خۆتێهەڵقورتاندنی زەوینەکانی ئەندێشەیی - بیروباوەڕیی پێشوەختانەی خۆی و قوبوولکردن، یان وەرگرتنی قاڵبە زیهنییەکانی نووسەر (لە هەر سێ ڕەهەندەکانی کارایی، یان شەخسی، کاتی یان مێژوویی و شوێنی، یان جوغرافیایی) و گونجاندنی خۆ لەگەڵ ئەو هەلومەرجانەدا بە سەر ئەو دابڕانەدا کە لە نووسەرەکەی جودا دەکاتەوە، زاڵ دەبێ. ئەمە هێرمینۆتیکی کۆنەباوە. بەڵام بە پێی هێرمینۆتیکیی هەسیناسی بە پێچەوانەی هێرمینۆتیکی کۆنەباوەوە، جەخت لەسەر "ناوچەقاییەتیی زمان" (مەرکەزییەتی زمان) دەکا. دەرک و لێکدانەوە وەک تێهەڵکێشی ئاسۆیەکان لە بنەڕەتدا پرۆسێسێکی زمانناسییە. بە هۆی زمانەوەیە کە ڕابردوو و ئێستاکانێ بە شێوەی هاوبەرانبەر سەرەتاتکێ و لێکدی تێ هەڵدەکێشرێن. بەش بەحاڵی مارکس، هەرچەند هی وەهەن دەیانەوێ بڵێن کە ئەویش بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ و با مێتۆدی بە ئیستیلاحی خۆی "زانستانەی بەکارهێنا بێ"، بەلای ئەودا لەنگیوە.

خوێندەی بەڕێز ئەم باسە وەکوو مەتەڵی مێش وایە، لە بڕانەوە نایە و پێم وابە زۆرم سەر پێوە ئێشاندن، بمبەخشە.

*ئازادی* و ناچاری دوو مەقوولە (کەتەگۆری)ی فەلسەفین، واتە: پێوەندیی هاوبەرابەری جموجووڵی مرۆڤ لەگەڵ یاسایەکانی خۆڕسك و کۆمەڵدا. ڕوونتری بڵێم، مرۆڤ بەرابەر بە ڕۆژئاوابوون و ڕۆژ هەڵاتن، بوومەلەرزە، بارانبڕان، بێ وەرگرتنی ئۆکسیجین یەکسەر مردن و هتد چدەکا؟ یان خۆڕسك: بەرابەر بە مرۆڤ کە زۆر لە یاسایەکانی گەیشتووە و دەزانێ چۆنیان دەگەڵدا ڕەفتار بکا، دە کاتێکدا مرۆڤ وێڕای ئەوە کە لە یاسای بارانبارین گەیشتووە ناتوانێ، مەگەر لە چارچێوەیەکی بەرتەسکدا، جڵەوی ئەم یاسایە بە دەستیەوە بگرێ؛ کەچی دوای ئەوەی کە لە یاسای کێشمان (جانبیة) گەیشتووە، تا ڕادەیێ بەسەریدا زاڵ بێ و بۆ سوودی خۆی بەکاری بەرێ: دەتوانێ لە قەڵەمڕەوی کێشمانی زەوین، وەك باڵدار، بە فڕۆکە بفڕێ و بگرە بە مووشەك (فیشەکەشێتە)ی فەزاپێودا، هەر بە ئەواوی لە کێشمانی ڕزگاری بێ و بۆ ئەستێرەکانی دیکە بچێ. کەواتە: لە هەردوو حاڵەتەکەدا، مرۆڤیش دەگەڵ یاسای خۆڕسکدا جاری پۆزەتیڤانە و جاریێ نەگەتیڤانە هاوسەروکارە، پێوەندیی و کار دە یەکدیکردنەکە هاوبەرابەرن.. مرۆڤ دە بەرابەریدا هیچی پێ ناکرێ، ئەو زاڵە بە سەریدا، مرۆڤ دەتوانێ بەرەوبڕیی، بە ئەرێنی (ایجابی) یان نەرێنی (سلبی) لێ بکا، ئەمجا مرۆڤ بە سەریدا زاڵە. ئەمە بەش بە حاڵی پێوەندیی چالاکیی هاوبەرابەری مرۆڤ دەگەڵ یاسایەکانی خۆڕسکدا.. بەش بە حاڵی چالاکیی پێوەندیی مرۆڤ دەگەڵ کۆمەڵدا، دەتوانین مالیکییەتی زەوین بە نموونە بێنینەوە: مرۆڤ پاش ئەوەی لە یاسای پێوەندیی ڕەنێوهێنانی مالیکییەتی زەوین حاڵی بوو، توانی بە پەڕینەوە بۆ قۆناخی سەرمایەداری لەو یاسای مالیکییەتی زەوینە یاخی بێ و بەتاڵی کاتەوە. بەڵام لە کوێ؟ دیارە لە وڵاتێکدا کە هەلومەرجی گۆڕانکاریی تێدا فەراهەم ببوو.. خۆ لە مالیکییەتی سەرمایەداری ڕەهاکردن، هەرچەندە لە ناو وڵاتانی کۆمۆنیستدا دەستی پێ کرد، بەڵام نەیتوانی لە چارچێوەی گشت دنیادا بە سەریدا زاڵ بێ. کەواتە: هەر وەك مرۆڤ کار لە یاسایەکانی کۆمەڵ دەکا، هەروەها کۆمەڵیش کار لە مرۆڤ دەکا.

لەمەڕ ئازادی و ناچاری لە فەلسەفەدا، بۆ یەکەم جار سپیۆنازەی بە ئـاپین جوولەکـە، کەم تا زۆریێ بە دروسـتیی ڕوون کردۆتـەوە کـە ئـازادیی چـالاکیی مرۆڤـی بـە سـەنگ و تەرازووی قازانج و زیان دیاری کردووە، واتە: مرۆڤ هەرچییەکی کە دەیهەوێ بیڵێ یـان بیکا، بە ڕەوابوون و ناڕەوابوونی ئەو قسـە و کردەوەیەوە گرێدراوە. هـەرچی هیگڵـە، لەم بوارەدا زێتری پێ لێ هەڵبڕیوە و دەیکوت: ئازادی ناچارییەکی دەرك کـراوە. (بـەڵێ لە هێندێ چندا دەر کردنی ناچارییەکـە بـە مانـای لـە یاسـای دیاردەکـە گەیشـتن و بـە خوایشتی مرۆڤ مل بادانی، هاتووە، بەڵام لە زۆر چندا ئەتۆ یاسـای دیاردەکـەت دەرك کردووە، وەلێ ئەم دەرك کردنە تەنها هەر لە چارچێوەی دەرك کردندا ماوەتەوە، واتـە: تۆ نەتتوانیوە ملی بەلای سوود و قـازانجی خۆتـدا بـادەی، بەنموونـە، وەك: بـەرەوپری کردن لە ڕوودانی بوومەلەرزە) ئەتۆ دەزانی بوومەلەرزە بە پێـی ج یاسـایێ ڕوودەدا، لێ تا ئەوڕۆکـەش ئـەتۆ دە بەرابەر ئـەم دیـاردە ماڵوێرانکـەرەدا دەسـەپاچەی و چـت پـێ ناکرێ، یان دەبەرابەر یاسای مەرگدا، کە تێشـی گەیشـتووی، چـە دەسـەڵاتێکت نیـیە، بەڵام ئازادی بە پێی فەلسەفەی مارکسیستی ئەوەیە کە سوود بە دەرك کردنـی یاسـا و ڕێسـا بابـەتی (موضوعـی = عـەینی)یەکانی ڕاستی و ناچاری بوونـی وی لـە پێنـاوی کۆمەڵدا وەرگری. هەرچی "ناچاری"یە ئەوە لـە پێوەندییە نێوخۆیـەکی و کاریگەرییە هاوبەرابەرییەکانی ڕوودەدا و دیاردەکان دێتەگۆڕێ بۆ نموونە:

دیاردەی لەناچاری خولانەوەی گۆی زەوین بە دەوری خۆردا.ئایا مـرۆڤ ئـازادە؟ هـەر لە کۆنەوە دوو ڕای وەك "جەبری" و" ئیرادی" لە مەڕ ئازادی و نائازادییەوە هەبووگن. خاوەن ڕای ئیرادی "هەموو شتێ دەبنەوە بـۆ ئـیرادە و خوایشتی مـرۆ، واتـە: مـرۆ لـە گۆڕانی جیهاندا دەوری سەرەکی و بنەبڕ دەبینێ، ئـەم خـاوەن ڕایـە هیـچ حیسـابێ بـۆ هەلومـەرجی مـەوزوعی و عـاملی خـاریجی و یاسـا مەوزووعییـەکان و ناچارییـە مێژووییەکان ناکا و ئازادیی بەلاوە بە مانای لە هەموو بەندێ ڕەهاییە، واتە هیچ بەندێ ئیرادە و خوایشتی مرۆ ڕاناگرێ. بەڵام ئەم ڕایە هەڵەیە. هیچ شتێ لە دنیادا بە بێ هۆ و هۆکار دروست نابێ و نایەتە گۆڕێ و کاری خۆی پێ ناکرێ؛ جا لەبەر هـەندێ ئـیرادەی

ئینسانیش ناتوانیٚ بیٚ پشتیوانیی شتیٚ، هەروا بە خوایشتی خۆی، چیی ئارەزوو لیٚ بوو بیکا، یان نەیکا. بە پێچەوانەی ئەم رایەوە، رای جەبرییەکانە کە باوەریان وایـە هـەموو چتیٚ هەر پێشەکی چارەنووسە و ئیرادەی ئینسان بۆی نییە چارەنووس بگۆرِیٚ و دیارە ئەم باوەری قەدەرییەتە مـرۆی بـە دەسـت تەمبـەڵی و تەوەزەلییـەوە داوە. ئەگـەر بـە قسەی وان بکەین دەبیٚ دەستەپاچە دانیشین و هیچ نەکەین و لامان وابیٚ هــەموو شتیٚ پێشـەکی بریـار دراوە: برسـیەتی، نەخۆشـی، کوێلــەتی، ژێردەســتیی سیاســی ، نەخوێندەواری و نـەزانی هـەتا هەتایە، ئاغایـەتیی سـەرمایەداری و چەوسـاندنەوە و تاد...... ئەمە هەستی باوەر بە قەزا و قەدەر و چارەنووس لـە مێشـکی مرۆدا دروست دەکا. لەبەر ئەمە ئەم رایە متمانەی مرۆ بە هێزی خۆی، بـەوەی کـە دەتوانـیٚ دنیـا بـە باری بەرژەوەندی خۆیـدا بگـۆرِی، رژێمـە کۆنـەکان بگـۆرِیٚ، دنیایـەکی نوێیـاو دروسـت کاتەوە، دەپووچێنێتەوە . مرۆ لەم حاڵەتەدا وەك سۆفی و دەروێـش دەبـیٚ چـاوەنۆرِی ئیرادەی هـێزێکی لـە خـۆی گـەورەتر بکا، کـە ئـەو هـەموو شـتێکی لـە سـەرەتاوە بـۆ برِیوەتـەوە و هـەر چتێکـی لـە چوارچێوەی ئـەو چارەنووسە بـەدەر، بـیر لیٚبکاتــەوە بێهوودەیە.

دیارە ئەمە بیرکردنەوەیەکی زیاندارە. هەن دەڵێن شەرِهەڵایسان چتێکە پێشەکی بریـار دراوە و مرۆ ناکاریٚ خۆی لە ناچاریی رەهاکا. شەرِەکانی جیهان دەبەنەوە سەر (قەزا و قەدەر) و پێیان وایە مرۆ بیٚ شەرِوشۆرِ پێش ناکەویٚ بەڵام بەدیارکەوت کـە ئـەخێر ئەو وڵاتانەی خۆیان ( بە نموونە وەك سوێد) تووشی شەرِ نەکردووە ( دەڵێـن ٥٠٠ سـاڵ زیاترە سوێد شەرِی نەدیوە) زیـاتر پێشـکەوتوون. ژیـانی رۆژانـە و خوایشـتەکانی دژی شەرِهەڵایسان ئەوەی ئیسپات کرد، کە شەرِهەڵایسان قانوونێکی حەتمی و ناچاری نییە و دەکریٚ کۆمـەڵگای بەشـەری خـۆی لیٚ رزگارکـا. جـا لەبـەر هـەندیٚ دەبینـین هـەردوو رایەکـە قەدەرییــەتیش و ئیرادییــەتیش ـ هەڵــەن، چونکــە کێشــەکە بــە شــێوەیەکی میتافیزیکانەی دوور لە واقیعەوە چارەسەر دەکەن. دەڵێن: یان ئازادی، یـان ناچـاری و نائازادی یان هەموو چتیٚ بە چالاکیی ئازادانەی مرۆ، یان لە چارچێوەی ناچاری و

زەرووەرەتدا، دەکرێ. لە حاڵەتی یەکەمدا ناچاری و زەرووڕەت نییە و هەموو چتێ بە کەیف و خوایشتی بەشەرە کە ئەمەش وا نییە، لە حاڵەتی دووەمدا، ئازادی نییە و ئازادی لەگەڵ ناچاریدا رێك ناکەوێ و ئەمەیە بنەمای ئەم رایە.

باشە ئەدی چارەسەری راستەقینە کێهەیە؟ لە ژیانی رۆژانەدا زۆر جار مەبەست لە وشەی ( ئازادی) وا لێك دەدرێتەوە، کە هیچ قەید و بەندێ بەسەر کردەوەی مرۆوە نەبێ. جا لەبەر هەندێ وا بیردەکەنەوە کە زەرووڕەت، ناچاری، بێ ئیرادەیی، دژی ئازادییە: مادامێکی ناچاری و زەرووڕەت و داماوی هەبێ کەواتە لەوێدا کۆت و زنجیر، کۆسپ و لەمپەر هەیە، کەوابوو بەم مانایە نە ئازادی هەیە و نە تەرەماش . ئیدی وای لێ دێ کە چارەسەری کێشەی ئازادی بەم چارەسەرە بێ: ئایا مرۆ دەتوانێ ئازاد بێ دەکاتێکدا ملکەچی یاسایەکانی زەرووڕەتی خۆڕسك بێ؟

مرۆ تا یاسایەکانی خۆ لە یاسای کێشمانی گەردوون رزگار نەکرد نەیتوانی، بگاتە مانگ. ئەمە مانای چییە؟ مانای ئەوەیە کە مرۆ بەبێ رەچاوکردنی یاسای کێشمان ناتوانێ ئەم کارانە بکا.

بۆ ئەوەی مووشەکێ بە خولگەی خۆی بگەیەندرێ، دەبێ بە خێراییەك بفرێ کە هێزە ناوین بەربەرەکانێکەرەکەی لە کێشمانی زەوین زیاتر بێ (ئەمەش وەختێ سەردەگرێ کە خێراییەکەی لە چرکەیەکدا لە ٨ کیلۆمەتر برین زیاتر بێ). بەم جۆرە زانایان توانییان مووشەکێ بۆ ئاسمان هەڵدەن، بەڵام نەك بەدژی یاسای کێشمانی گۆی زەوین و بێ گوێ بەودان، بەڵکو لەسەر بنەمای دیراسەکردنی کاریگەریی ئەو زۆر بە وردی

بۆ یەکەم جار کە مانگیان بەرەو قەزا پەرتاو کرد، پشتیان بە یاسای کێشمانی کۆسمۆ بەست. مووشەکەکەیان بە جۆرێ بە هێز کرد. کە بتوانێ لە هێزی کێشمانی زەوی زێتر بێ. کە وەختێ مانگ کە لە مەودای حوکمی کێشمانی زەوین رەها بوو، یەکسەر کێشمانی مانگ بەرەو لای خۆی قۆستیەوە و ناچاری کرد لەسەری بنیشێتەوە. جا ئەمە هەر بە تەواوەتی ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە ئەوانەی لایان وایە ئەگەر

ئێمە ملکەچی یاساییەکانی زەروورەت بین، ئازادی لە دەست دەدەین، یـا ئـەوە ئـازادی نییە و لە ڕێگایەك دەگەڕێن کە خۆیانی پێ لەو یاسایانە بدزنـەوە، لـەو ناچارییـەی کـە لەقەفەی ئازادی دەکێشێ، هەڵدێن. ئەمانە ئازادی بە ڕەها بوون لە یاسایەکانی ناچاری تێدەگەن، کە ڕاست نییە. کەواتە ئازادیی ڕاستەقینە لە کوێدا، ئایا لە وێدا کە هــەرگیز ددان بە یاسا و ڕێسایەکدا نـاندرێ، یـان لـە وێدا کـە ددان بـە یاسـایەکاندا دەنـدرێ و دەزاندرێـن و لـە سریشتیان شـارەزا دەبـین و لـە زمانیـان حـاڵی دەبـین و لــە هــەموو دەلاتەکانیان تێ دەگەین و سوودیان بۆ بەرژەوەندی ئیسان لێ وەردەگرین؟ "ناچـاری کوێرە، تا کەشفی نەکەی، چاوی نابینێ، بەلام هەرکە کەشفت کرد، هەرکە یاسـاکەییت کەشف کرد، بۆ بەرژەوەندی خۆنت بەکار هێنا، هەنگێن ئەتۆ ئاغای خۆرسکی." ئازادی لەوەدا نییە کە تۆ بەخەیاڵ خۆت لە یاسایەکان ڕەهاکەی، بەڵکو ئەوەیە کـە تـۆ تێیـان بگەی و تا چ ئەندازەیەك ئیمکانی ئەوە هەیە کـە تـۆ بـە شێوەیەکی بەرنامەبۆداڕێژراو لەوە بگەی کە چۆن یاسایەکان ناچار بکەی ملکەچی جێ بـەجێ کردنـی ئامانجگەلێکی دیاریکراوین.

ئەم قسەیەش نەك هەر بەش بە حاڵی دیاردەکانی خۆرسك، بگرە بەش بە حاڵی ژیانی کۆمەڵکیش هەر بەهەمان جۆرە. پێش پـەیدا بوونـی زانسـتی مارکسیزم. یاسـایەکانی گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵەکی نەدەزاندران، خەڵك بـە سـەتان چەرخ و چاخ بـەندە و ئاڵقەلەگوێی ناچاریی مێژوویینە، (زەروورەتی ئاریخی) بوون. بەلام مارکسیزم پــەردەی لـە ڕووی ئـەم یاسـایانە هـەڵماڵی و کەشفی کردن. ئەمـەش یەکـەم هــەنگاو بـوو کـە چەوساوانی دنیـا لـەم ڕاستییە بگەن و بـەم یاسـایانە پڕچـەك بن و ئەوسـاکە خۆیـان چارەنووسی خۆیان دەنووسن، نەك مێردەزمە و جندۆکە و چتی خـەیاڵاویی لـەو جـۆرە بابەتانە.

خولاسە ئازادیی مرۆ لەوەدایـە کـە لـە یاسـایەکانی خۆرسـك و کۆمـەڵ بگـا. و زۆر بـە مەهارەتەوەیان لــە کـار و کـردەوەی ڕۆژانـەدا بـەکار بێنـێ. ئـازادیی مـرۆ لـە سنووری

زەرووڕەت تێ ناپەڕێ. جوزئی ئیختیارەکەی ئەشاعیرەش، هەر ئەمە دەگرێتەوە، بەڵام بە تێ گەیشتنێکی میتافیزیکانە.

فەیلەسوفە بۆرجوازییەکانی هاوچەرخ لایان وایە مرۆ ئازادە، مادامێکی بتوانێ، ئیختیاری بە دەست بێ، کێهە چتی خوایشت کرد بیکا.

بەڵام ئەمە خەیاڵە، شتی وا نییە. ئەمەش لە حیکایەتی کێشە و دەمەتەقێیەکەی نێوان فڕفڕۆکە و چنووی ڕووگەنمای موقناتیسدا بە ڕوونی بەدیار دەکەوێ:

فڕفڕۆکە بە خۆ دەنازێ دەڵێ: ئەمن ئازادم، بە هەر لایەکیدا کەیفم لێ بێ ڕووی دەکەمێ و کەچی ئەتۆ بەرت بە هەر لایەکەوە بکەی، هەر ڕوو لە یەک لای دەکەی.

چنووی ڕووگەنما وەڵامی دەداتەوە:

کێهە ئازادی؟! ئەتۆ بە خوایشت و ئیرادەی خۆت ناخولێیەوە، با بە خولت دێخی، با یاریت پێ دەکا، دەنا چۆن دەتوانی بخولێیەوە؟ ئازادییەکەت پشووکورتە، لە بایەکی بۆ بایەکی دەچی. نزیکترین با کارت تێ دەکا. بەڵام ئەمن پشت بە هەڵسوکەوتی کەش و هەوا نابەستم و هەمیشە هەر ڕوو لە یەک لای دەکەم و بە هۆی ئەم ڕوو لە یەک لاکردنەم ڕێگای ڕاست بە خەڵك نیشان دەدەم، بەڵام ئەگەر بە وردی بیر لەم قسەیە بکرێتەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ناکرێ لە ئازادی بەو جۆرە تێ بگەین کە مرۆ بۆی هەیە هەر چارەسەرێکی بۆ خۆی ئیختیاری دەکا هەر ئەوەیە و نابێ گوێ بە هیچ چتێ بدا.

هێندێ لایان وایە ـ مەبەستم ئەوانەیە کە لە وڵاتانی سەرمایەداریدا دەژین ـ کە بە خوایشتی خۆیان ئەرز و شێوازی بەوپەڕی ئازادییەوە بیرکردنەوەیان هەڵ بژاردووە و هەبوونیان بەرهەمی ئارەزوو و ئاکار و ڕەفتاری " ئازادانەی شەخسی " یە، کەچی لە ڕاستیدا ئەوانە کۆیلەی هەلومەرجێکن کە تێیدا دەژین، کۆیلەی ڕەمەکییەتێکن کە لە مالیکییەتی تایبەتەوە هەڵ دەقوڵێن و تەرزی چۆنیەتیی ژیان پەروەردەیان دەکا. کامەتا " ئازادیی شەخسی؟ "بەو مانایەی زانایانی بۆرجوازی لێکی دەدەنەوە. هەرچی

چت هەیە لێرە ملکەچی" زەرووورەت"ە و ئەم زەروورەتەش دە شکڵ و شێوازی هێزی کۆمەڵەکیی کوێرانەدا بە دیار دەکەوێ و زۆر لە باهۆز و ڕەشەبای سەخت دەچێ.

بەڵام ئەو ئازادییەی کە پشت بە ناسینی زەروورەت دەبەستێ لە بارودۆخی سۆسیالیزمدا، ئەوە شتێکی دیکەیە. یاسایەکان لە ژێر سێبەری سۆسیالیزمدا کوێرانە کارناکەن، چونکە چالاکیی خەڵک لەسەر بنەمای بە قووڵی ناسینی یاسایەکانی گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵەکی دادەمەزرێ. بۆ نموونە، تاکە کەس نییە و بەس، بەڵکو دە پلەی یەکەمدا کۆمەڵە و ئینجا تاکە کەس.... بەڵێ ڕاستە، شاعیری، زانایی، هونەرمەندیێ لە چاو ئەفرادی کۆمەڵدا فەرقی هەیە، بەڵام ئەمە مانای وا نییە لە کۆمەڵەکەدا ئازادیی تایبەتی هەیە، یا دەبێ هەبێ، ئەسڵەن ئەو شاعیر و زانا و هونەرمەندانە، بە کۆمەڵپەروەری و مرۆڤدۆستییەوە و بەوە کە لە یاسایەکانی کۆمەڵیش و تاکیش چۆن تێ دەگەن و چۆن بە بەختەوەری دەگەیەن، بەوە هەڵدەسەنگێندرێن، نەك ئەمانیش هەروەك سەردەمانی پێشوو، ببن بە دەستە ـ دەستەی لامژ و توفەیلیی وەك: شامان و کاهین و پیر و مەشایەخ و فاڵچی و ڕەمڵ لێدەر و سیاسیی دیکتاتۆر و چاوچنۆك و پووڵپەرست کە لەسەر ورگی سۆفی و دەروێشی لە گوێی گادانووستوو و لە دنیا بێ خەبەر دەژیێن. تەرزی ژیانی سۆسیالیزم هەر بۆ خۆی مانای تاك و کۆمەڵ بە جۆرێکی دیکەی جیاواز لە ژیانی سەرمایەداریی کۆمەڵ فت کردن و تاك پەرستی، دێتە گۆڕێ. ئازادی لێرەدا مانای چتێکی دیە.

ڕەنگە بپرسی باشە، ئەگەر جیهان بە هۆی کاریگەریی یاسا مەوزووعییەکانی جیهانەوە، کە هیچ دەخڵیان بە خوایشت و ئاگاییی خەڵکەوە نییە دەگۆڕێ، ئەمە مانای ئەوە نییە کە دەچێتەوە سەر قەدەرییەت و ناچاریی مرۆ و بەفشە دەرچوونی ڕای چالاکیی ئازاد و بەکاری خەڵك؟

بەم قسانە دەیانەوێ، بڵێن مارکسیزم گۆڕانی جیهان بەکارێکی قەدەری دەزانێ و هەموو چتێ پێشەکی بڕیاری لەسەر دراوە و هیچ دەخڵێکی بە ئیرادە و خوایشتی مرۆڤەوە نییە. هەروەها دەڵێن با مارکسییەکان باسی چالاکی و کردەوەی ئازادی

مرۆڤیش بکەن، بەڵام لە پاشان تووشی دووفاقی (تناقض) ـ دەبن لە فەرهەنگیاندا. بە نموونە: دەڵێن، ئەگەر سۆسیالیزم چتێکی حەتمی و ناچاری بێ و ڕۆژێ دێ، کە بتەوێ و نەتەوێ، جیهانی تێدا دەبێ بە سۆسیالیست، دەی جا ئیدی ئەو هەموو خەبات و شەڕەشەقەی بۆ چییە، لێی گەڕێ با خۆی بێ، چ پێویست بە خۆ دامەزراندن و ئامادەگی بۆ سەرکەوتنی سۆسیالیزم دەکا؟ ڕوونە، کە هیچ کەسێ حیزبان بۆ ئەوە دانانێ تا ڕۆژگێڕانی پێ پێکبێنێ. بەڵێ وا دەڵێن ڕەخنەگران لە مارکسیزم. بە ڕاستی مارکسیزم هیچ فڕێکی بەسەر ئەم جۆرە قسە قۆڕانەوە نییە. بەڵێ ددان بەوەدا دەنێ کە سۆسیالیزم دەبێ سەر بکەوێ. بەڵام نەك بەو مانایەی کە ئەم سۆسیالیزمە هەروا لە خۆڕا بێتە گۆڕێ.

دەبێ ئەوە بزانین، کە دوو جۆرە ناچاری (ضرورة) هەن: ناچاریی خۆڕسکانە و ناچاریی کۆمەڵایەتییانە، ئەم دوو ناچارییە لە جەوهەردا لێکدی جوداوازن. ناچاری لە گۆڕانی کۆمەڵدا بە شێوەیەکی جیاواز لە گۆڕانی شەو و ڕۆژ و هاتنی چوار وەرزەی ساڵ و هتد ڕوودەدا. ڕوودانی شەو و ڕۆژ و چواروەرزەی ساڵ هیچ دەخڵێکی بە خواهشت و ئیرادەی من و تۆوە نییە، بڵێ و نەڵێی، ئەمانە هەر ڕوو دەدەن. بەڵام لە کۆمەڵدا، هیچ چتێ بێ کردەوەی مرۆڤ نایەتە گۆڕێ، بەبێ چالاکیی بەکردەوەی مرۆڤ چێ بابێ، بێ چالاکیی شۆڕشگێڕانەی مرۆڤ نایەتە گۆڕێ. بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە ناچاریی کۆمەڵەکی، پاسایەکانی گۆڕانی کۆمەڵەکی، ئینسان دروستیان دەکەن؟ نەخێر. بەڵێ ناچاریی کۆمەڵەکی هێندەی ناچاریی نێو خۆڕسك ناچارییە. وەلێ، وەك دیتمان فەرقێکی جەوهەرییان لە نێوانـدا هەیە. لە خۆڕسکدا زەروورەت (ناچاری) چالاکی و کاری مرۆ، بە زۆر ناسەپێنێ. بەڵێ ڕاستە سەرما و سۆڵە وات لێ دەکا خۆت بە جۆرێ بگونجێنێ کە لە تاو سەرمایێ نەمری، بەڵام ئەمە وەك ئەوە نییە کە تۆ لەناو کۆمەڵدا ڕەفتار دەکەی. چالاکیی خەڵك دەچێتە خانەی ئەو هەلومەرجەوە کە بەبێ فەراهەم کردن و مەیسەرکردنی ناچاری (زەروورەت) نایەتە گۆڕێ و بە دیار ناکەوێ. ئەگەر خەڵك ملیان لەکار نەنا، یان نا، بەڵام بە زەغەلی بۆ ئامانجێکی کە بیگەنێ، ئەمە مانای

وایە ئەو ئەرك و كارەی كە بۆ ئەو ئامانجەیان بە خەرج داوە، بەشی ئەوە ناكا، بەوەندە كاتەی بۆی داندراوە. ئایا دەكرێ، ئاوهێنان بۆ شاری هەولێر بەبێ ئەرك بە خەرجدان سەربگرێ، داخوا بەبێ رێك كەوتنی پارتی و یەكیەتی دەكرێ قسەمان دەبەرابەر نەیاری سوار و ئێمەی پیادەدا سوارتر بێ ؟ دیارە نا.. ئەگەر هەوڵدان بۆ ئاوهێنان بۆ هەولێر سست و تەمبەڵانە، یان نەزانانە بێ و هیچی بۆ نەكرێ، دیارە بێ ئاوی و ئەنجامە خراپەكانی هێندەی دیكە ناڕەزامەندیی خەڵكەكە زێتر دەكا. كەوا بوو گۆڕان لە كۆمەڵدا بە دەست مرۆیە، لە خۆڕسكدا بە دەست مرۆ نییە، ئەتۆ ناتوانی مانگگیران و ڕۆژگیران و شەو ڕۆژ و بەهار و هاوین و زستان و پاییز ڕاگری. بەڵام دەتوانی لەناو كۆمەڵدا بەرنامەیەك دابنێی، ڕێگایەك، پردێك، شۆڕشێك بەرێوەبەری، كارەكە دەكەوێتە ئەستۆی خەڵكەكە، ئاستی وشیاریی، توانستی، یەكیەتیی و هتد.. (هایدەگەری ئازیست، ئازادیی بە چەمچی هەستییەوە گرێداوە ئەو ئازادی مرۆڤ و ئازادی غەیری مرۆڤی لێك جوێن نەكردۆتەوە ).

نموونەیەكی دیكە، هەن دەڵێن مرۆ بێ شەڕ هەڵناكا. شەڕ چارەنووسە و هەر دەكرێ، دیارە ئەمە لە كۆششتی كورد بۆ شەڕهەڵنەگیرسان كەم دەكاتەوە. هەن دەڵێن، كورد نابێ بە هیچ، چونكی قەدەری وایە، پێغەمبەر دوعای لێ كردووە، بە قسەی دیرۆكنووسی تورك "نعیما" ئەفەندی، توركی "بدنژاد" دەڵێن: "نە سوگوتدن ماشا،:نە كوردن پاشا"، بەڵام كە ڕاستیی دەرك كرد، ئەگەری هەڵایسانی شەڕ دیارە كەمتر دەبێتەوە و كار بۆنەو ئامانجە دەكا و ئەگەری هەڵایسانی هەر بە جارێ گۆڕدەكا. ئەوانەی كە دەڵێن كورد نابێ بە هیچ و قەدەرییانە بیردەكەنەوە، ئەزموونی زیندووی ژیان، بیانهەوێ و نەیانهەوێ بیریان دەگۆڕێ و بە جۆرێكی دیكە ناچار بیر لە نەتەوەكەیان دەكەنەوە..

ئیدی بەم جۆرە دەبینین زەرووورەتی مێژوویینە (ناچاریی مێژوویینە) هەڵوێستێكی بە كردەوە و ڕاستەقینە بەرابەر بە ڕووداوێ بە تاڵ ناكاتەوە، بە پێچەوانەوە دەی سەپێنێ، ئەگەر شاقەلی كار بۆ ئاوهێنان بۆ هەولێر بە پێی بەرنامەیەكی زانستانە و

پروڵێکی باش و پسپۆڕی چاوساغی خۆی، بۆ لێ هەڵبکرێ. "ناچاریی مێژوویینە" ملکەچی ئیرادەی ئینسان دەبێ:

اگر فلك با مراد ما نگردد     باید کاری کنیم تا بگردد

+ +

إذا الشعب يوماً أراد الحياة     فلابد أن يستجيب القدر

ولابدَّ لليـل أن ينجلي     ولابدَّ للقيد أن ينكسر

دەبێ ئەوەش بزاندرێ کە سەریەهای هەموو کارەکە ئازادیی بەکردەوەی ئەرك بە خەرجدانە، دیارە ئەم ئەرك بە خەرجدانە ئازادانەیە، هۆکاری خۆیەکیشی پێ دەگوترێ، واتە ئەو هێزانەی کە پشت بە خەڵکەکە خۆی دەبەستن، بە وشیارییان، بە زانستییان و کردەوەی سەروەرییان و توانستی کاروباری خۆ ڕێکخستنیان دەوری خۆیان هەیە. دیارە دەوری هۆکاری خۆیی لە کۆمەڵگای ئازادی سۆسیالیزمی ڕاستەقانیدا دەگاتە چڵەپۆپە.

فەیلەسووفانی بۆرجوازی و زانایانی کۆمەڵناسیی بۆرجوازی چەمکی ئازادییان شێواندووە. ئەوانە ئازادییان تەنها بەوە زانیوە کە "ڕۆح بگاتە ئازادیی نموونە". ئەمانە دەڵێن: ئەتۆ بیە بە کۆیلە و کۆت لەمل، ئەگەر هەستت بەوە کرد لەو کۆیلەتی و بەندەگییەدا ناڕەحەت نیت و ڕۆحت ئازار نادا، کەواتە تۆ ئازادی.

لە کۆمەڵی بورجوازیدا هەموو خەڵك ئازادن گۆیا کەس کرێکار بە زۆر ناچاری کارکردن ناکا و سەرمایەداریش هیچ مەجبوور نییە کار بە کرێکار بدا. کرێکار هەر کاتێ ویستی دەتوانێ بچێتە کن سەرمایەدار و دەشتوانێ نەچێ، بۆ خۆی سەرپشکە، نەك هەر ئەمە بگرە ئایدۆلۆجیکەکانی ئیمپریالیزم زاراوەیەکیان داتاشیوە، ئەوەش زاراوەی "جیهانی ئازاد" ە، بەلام کامەتا جیهانی ئازاد؟ جا ڕاستە ئەو کەسە لە جیهانی بەناو ئازاددا، سەربەخۆ و ئازادە؟

بۆ ئەوەی مرۆڤ ئازاد بێ، دەبێ بەسەر هەلومەرجی ژیانی کۆمەڵەکیدا زاڵ بێ و دەسڕۆ بێ. بەلام گەلۆ ئەمە لە جیهانی سەرمایەداریدا کە لەسەر بنەمای چەوساندنەوەی خەڵکی ژێر دەستدا دامەزراوە و، "مارکۆزە" گوتەنی، مرۆڤی کردووە

به چتێکی یەك ڕەهەند، چۆن فەراهەم دەبێ؟ ئەزموون ئیسپاتی کردووە کە ئازادی لە کۆمەڵێکدا مرۆ، مرۆ بچەوسێنێتەوە و نەتەوەیەك، نەتەوەیەکی دیکە بچەوسێنێتەوە ولاتێکی دەوڵەمەند، ولاتێکی دواکەوتووی هەژار بچەوسێنێتەوە، لە خەون و خەیاڵ بەولاوە چیدیکە نییە و لە خەڵك فریودان زێتر تێ ناپەڕێ. ئازادی کامەتا؟ ئازادی جابۆڵقا و تەیری عەنقا و پلاوی خانەقایە.

ئازادییەك کە لەسەر بنواشەیەکی ماددیدانەمەزرابێ، ئازادیی پووت، ئازادیی تەنها لە مێشك و دەروون و ئاوات و هەویا و سەر نەخشەی ددان پێدا نەنراودا، تەنها هەر وەك ئەندێشەیێ، وەك گڵۆکێك کە ڕەگی نەبێ و ڕیشەی دە ناخی خاکدا ڕۆنەچووبێ، با زۆرجوانیش بێ، هەر کاتێ دەزانی لەپڕ دەژاکێ و سیس هەڵ دەگەڕێ و هیشك هەڵدێ.

بۆرجوازییەتی شۆڤینیستی عەرەبی عیراق بۆرە ئازادییەکیان بە نێوی "ئۆتۆنۆمی"یەوە بە بەشە بە زۆری ئیمپریالیزم بە عەرەبەوە جووتبەقێ کراوەوە ددان پێدانا، کەچی زۆری پێ نەچوو سیس هەڵگەڕا و لەبار چوو، بگرە نزیکەی ۲/٤ میلیۆن کوردیش بوو بە گوری و کاوگەردوونی بێقەڵتوبڕ و ئەنفالکردن؛ چونکە لەسەر بنەمایەکی ماددیی موشەخخەس دانەمەزرابوو.

لە لایەکەوە باسی خودموختاریی بۆ کورد دەکرد، هەر دە هەمان کاتدا، کوردی بە عەرەب دەکرد، کوردستانی لە کورد خاوێن دەکردەوە، لە هەموو بڕیارەکانی پەژیوان دەبۆوە. ئەوجا چلۆن بۆرجوازییەتێکی چینی چکۆلەی سەرمایەدار، کە سەرچاوەی فاشیزمە، چۆن ددان بە ئازادی و مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەیەکی فەلەکزەدەی بێچارەی وەك کورددا دەنێ؟!

تۆ باسی چارەسەرت کرد ئەگەر چارەسەرەکە لە ڕوانگەی سێ خولگەکانی ئەقڵییەتی ئەو کەناڵانەوە کە دەگەڵ مەشرووتییەت (دەستووردانان)دا لە دنیای ئایدیۆلۆژییەکی ئایینیی یەکپارچەدا وەسەر ئاوکەوتن، بخوێنینەوە بەرەوڕووی ئەم پرسیارانە دەبینەوە: تا چ ئەندازەیێ کورد لە چارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیی سەروبەندی "تنظیمات" و هەروەها لە چارچێوەی مەشرووتەی ئێرانیشدا دەرکی بە

چەمکی گرنگیی زانست و فەلسەفەی خۆڕۆشنبیرکردن کردبوو؟ ئایا کوردیش هەروەك عوسمانییە "نوێخوازەکان" تا چ ڕادەیێ لەگەڵ چەمکەکانی یەکسانی، دادپەروەری، ئازادیی شۆڕشی فەرەنسەدا، لە پێناسەی هەبوونی خۆی حاڵی بیوو؟

دیارە پرسیارەکانم شەقڵی فەلسەفییانەی زێتر پێوە دیارە؛ چونکە من لە فەلسەفە دەدوێم، یان کە باسی ئازادی دەکەم لە ڕوانگەی فەلسەفەوەی، جارێ وەك "بیرونەندێشە" دەنوڕمێ؛ (چونکە لەو بڕوایەدام کە بیری سیاسی، فەلسەفەی سیاسی، ئایدیۆلۆجیای سیاسی، تیۆریی سیاسی، هەن ۰۰۰۰) نەك وەك ئایدیۆلۆجیا و تیۆریی فلانە حیزب یان فیسارە ڕێکخراو، هەرچەندە هیچ فەلسەفەیەکیش هەروا بەو ئاسمانەوە مۆلەق ڕانەوەستاوە و بێ شەقڵ و مۆرەی چینایەتی: کۆمەڵەکی ـ ئابوویی خۆی نییە. بێ گومان ڕۆشنبیری کوردیش و عەرەبیش و بگرە سەرلەبەری نەتەوە موسڵمانەکانی ژێر ئاڵای ئیمپراتۆریی عوسمانی لە یەك سەرچاوەی ئەو ڕۆژگارە ئاویان دەخواردەوە. ئەتۆ لە بیرونەندێشەی هەر نەتەوەیێ دەنۆڕی، هەر هیچ نەبێ یەکێ لەم سێ خولێنك (تەوەرە)انەی، یان موتوربەیەکی ئەم سێ خولێنکانەت لە دۆزێنکی تایەن (معین)دا بەرچاودەکەوێ. واتە: تابلۆیەکە ئەو ڕۆژگارە چۆن بوو، ئەمڕۆش تا ئەندازەیێ وەك وی دەچێ. تەواوی ئەو خەڵکە سورمانانەی کە لە پاش ڕووخانی ئیمپراتۆریی عوسمانی، بە نموونە: وەك عەرەب و کورد، وێڕای سەربەخۆییەکی نەتەوەییانە لە سێبەری ئینگلیس و فەرەنگدا بەش بە حاڵی عەرەب و چەند فێرگەیێ بۆ خوێندنی زمانی کوردی بە پێی یاسای ناوخۆیی، بەش بە حاڵی کوردی ناوچەی سلێمانی و هەولێر لە کوردستانی عێراقدا، بۆڕە بیرونەندێشەیەکی فەلسەفییانەی سەدەی ۱۹امی تورکی لێ بترازێ؛ کارەکە بە گشتی لە چەمەرەی بیرونەندێشەگەلێ کە پێوەندیی زێتر بە کۆمەڵ و ژیانی سیاسی و گەڕان لە دووی چارەسەرکردنی بەولاوە نەترازاوە. ئەم بیرونەندێشەیە کە لە چەمەرەی سەرەنگرێی دەوڵەت و میللەت چۆن ڕزگارکردن و ڕێگایەکی تازە بۆ ژیان و گوزەران دۆزینەوەدا گیرکلەی خواردبوو، هیچ کاتێ و هەرگیز لە بیرکردنەوەی سەرپێیانە و لە تەنگاودا مەلەکردن و سەتحییەت

بەولاوە چیدیکە نەبوو. ئەو کەسانەی کە لە دنیای فەرهەنگێکی وشکەسۆفییانە (دۆگماچییانە) و ئایینپیشەییدا پەروەردە ببوون، بە جۆرێ ج لە بیروئەندێشە و ج لە زانستی ڕۆژئاوا نزیک بوونەوە و بڕوایان پێ هێنان وەک بڵێی لە گومان بەدەرن و ڕاستین، واتە: لە لاسایی کردنەوەی ڕووت بەولاوە چیدیکە نەبوو. بە ناخیاندا نەچوونەخوار، کارەکەیان لە سەرڕا. تاوتوونەکرد، شییان نەکردەوە، شەن و کەویان نەکرد، بە هێڵەک و والا، لە مێلەکیان نەدا و واڵابێژیان نەکرد. ئەم کەسانە پێیان وابوو، ئەم جۆرە بیروئەندێشانە، با هی کابرایەکی ڕۆژاوای لاوەکیش بن و هیچیشیان تێدابەستەنەبێ، مادامێکی ڕۆژاواییانەن و لە کتێباندا نووسراون، تەواوە و کێشەی لەسەر نییە.. مام هەژار بۆی وەگێڕام، گوتی: چوومە خزمەت بەهەشتی محەممەد عەلی عەونی لە قاهیرە، هێندێ کارم لەمەڕ تەرجەمەی شەرەفنامە پێ هەبوو. گوتی: هەروا بەدەم دەمەتەقێوە، قسەم بۆ دەکرد، فەرمووی ئەتۆ ئەو هەموو زانیارییانەت لە کێندەر هێناوە؟ ئەمنیش گوتم: قوربان، ئەوانەم هەموو دەماودەم لە زاری خەڵکی نەخێندەوار بیستییە. گوتی: کوڕە هەژار، تا زووە ئەوانە هەموو بنووسەوە و بیانکە بە کتێب، پاش پەنجاساڵی دیکە دەبن بە سەرچاوەی زانست و ڕاستی... بیستوومە زانایەکمان لێ هەڵکەوتووە، گۆیا زەڕەی - حاشا لە خوێندە - چارەوێشی تۆمارکردووە، کە گۆیا ئەوەش هەر کارێکی ئانتیکییە و ڕۆژێ دێ بڵێین "چارەوێی کوردەواری" ئەوها زەڕیوە. بە کورتی دەمهەوێ بڵێم: ئێمە، کوردی پاشماوەی ڕژێمی دەرەبەگایەتیی عوسمانی، دە کاتێکدا دەم لە مۆدێرنیتە و مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم دەکوتین هێشتا هەر دە خولێنکەکانی پان ئیسلامیزم و ماتریالیزم و ناسیۆنالیزمی پارادایسی تێهەڵکێشدا دەخولێینەوە و بۆ خۆشمان نازانین بە ڕاستی بەرمان بە کوێوەیە..

چارەسەرەکە بۆ دوو جۆرە کێشە: کێشەی گشتی کە لە هەموو دنیادا هەیە و کێشەی ناوخۆیی و تایبەتی هەر وڵاتێکیش بۆ خۆی هەیە. من با باسی وڵاتەکەی خۆم بکەم لە پێشدا.. بۆ نموونە: من پێم وایە چارەسەرەکە لێرەوە دەست پێ دەکا، لە گۆڕینی ئەقلییەتی چینی دەسەڵاتدار، ئایدیۆلۆژیای ڕەسمیی حوکمڕانەوە دەست پێ دەکا.

ڕەنگە بپرسی: باشە، تا ژێرخانی کۆمەڵ (بنەمای ماددی) نەگۆڕێ؛ ئەقڵییەت (ئایدیۆلۆجیا) چۆن دەگۆڕێ؟ وەڵام: ئەگەر ئەتۆ بڕوات بە کاریگەریی هاوبەرابەری ژێرخان و سەرخان (واقیعی ماددی و واقیعی مەعنەوی) کرد، واتە: هەروەکو واقیعی ماددیی تازەکووره کار لە ڕووخاندنی سەرخانی پۆسیدە و ڕەنگ و بێن و تام تۆڕاو دەکا، هەروەهاش واقیعی مەعنەوی (بیروبڕوای تازەنەفەسی) واقیعی ماددیی (ژێرخانی) دواڕۆژی نزیکی ناچارەکی، کار لە ڕووخاندنی بیروبڕوا (سەرخان)ی کۆن دەکا..

ئەو ئایدیۆلۆجیا ڕەسمییەی چینی حوکمڕان ئەگەر سوود لە مانەوەی ئافرەت بەو شێوە بەدبەختییەی کە دە وڵاتی مەدا هەیە وەریگرێ: بۆ ئەوەی بە مانەوەی ئەو حاڵەتە پاشکەوتووە، درێژە بە ئایدیۆلۆجییەتە ڕەسمیەکەی خۆی بدا، بێگومان ئەوە یەك لە کۆسپ و تەگەرە هەرە گەورەکانە کە دەبێ، لەپێشدا ئەوە بگۆڕین. جا کە ئەوەمان گۆڕی، هەنگێ بەرنامەیەکی کۆمەڵایەتی نوێ دادەنێین، بەرنامەیەکی چاکسازی دادەنێین، کە یەکەمین کاری ئەوەیە ئافرەت فێرە خوێندەواری بکا، لە سەتا چەندی ئافرەت لە کوردستاندا خوێندەوارە؟ تا ئێستا نازانین ئەو ڕێژەیە بە دروستی بچەسپێنین    با ئێمە بیکەینە دوو بەشەوە، ئەوەی پیرە و لە ماڵییە و تەمەنێکی زۆری هەیە، ئەوە لێی دەگەڕێی؟ چیی لێ دەکەی؟ بڵێین لە ٢٠٪ ئەو ئافرەتانە قابیلی ئەوەن کە فێری خوێندەواری بن، بڵێین لە سەتا پازدەی لە فەرمانگەکان کار دەکا، ئەم لەسەتا پازدەیەش کە لە ڕاستیدا بە دنیایەك بیروباوەڕی سەیر و ئەفسانە و سیحر و فاڵچێتی و ترس و خورافیاتەوە گۆش کراون، خوێندەوارن. ئەمە بەبێ هیچ جۆرە ڕۆشنبیرییەك، ئێمە ئەگەر بێت و ئەوانە (غسل دماغ)ێك نەکەین، ئەوانە نەڕووخێنین و جارێکی دیکە سازیان نەکەینەوە ئیدی چۆن باسی ماف مرۆڤ و ئەم شتانە بکەین، هەر هاوار بکەین و بڵێین لە ژنەکەت مەدە، ژنەکەت مەکوژە، تۆ دەبێ ماك و ڕەگ و ڕیشەی ئەو دواکەوتنە بدۆزییەوە. دەبێ ئەو بنیچە ماددییە بدۆزییەوە کە ئەو تێڕوانینە خراپەی پیاوی لەسەر ئافرەت بە زەقی قوت کردۆتەوە،

ئەوە بڕووخێنین. ئەوەش هەر بە قسە نابێ، بە خوتبەی مزگەوت نابێ، بە شیرەت و نسحەتان نابێ، بەڵکو دەبێ بنیچە مادییەکەی بدۆزینەوە، بۆ نموونە: ئەگەر هاتو لەو هەولێرەدا چوار ئوتێلی وەکو ئەو چوارچرایە هەبن. لەو ئوتێلەدا بڵێین ژن و پیاو هەموویان پێکەوە دانیشن ڕەنگە بتوانن زیاتر یەکدی بناسن. ئێمە ئەگەر تەنانەت ڕێ بەمانە نەدەین، چۆن بڵێین دەبێ مافی ئافرەت بپارێزین و کۆمەڵ پێش بخەین، ئێمە دەبێ بۆ لێکدی ئاشکرابوونی پێوەندییەکانی ژن و پیاو، پێناو و پەردی مینایی (شەففاف) دروست بکەین، بۆ نموونە: تا ئێستاش ئافرەتێ ناوێرێ کەسێ بۆ کارێکی تەنانەت ڕۆشنبیری ـ کۆمەڵەکی، ئازادانە و بێ پەروا بۆ شوێنێکی خەڵوەت بانگهێشت بکا؛ چونکە بە پێی مەزهەبەکەی کە شافیعییە، ئەگەر ژنێك و پیاوێ تەنها لە (خەڵوەتێکی دوو کەسیدا دانیشن، ژنەکە بۆی هەیە داوای مافی ژن و مێردایەتی لە پیاوەکە بکا.. ئەم زۆر بە گومانەوە لە نیهادی ژن و پیاو تۆڕینە مرۆڤ دەخاتە خانەی ڕەمەکایەتیی ڕووت و وەك مرۆڤ لە هەر کاتێکدا بۆی هەڵکەوێ جووتبێ.... با دەداتەوە سەر ئاژەڵایەتی و نە حیساب بۆ ئەقڵ و ئەخلاق، نە حیساب بۆ مرۆڤایەتیی لە ئاژەڵ جوداوازی خۆی دەکا. کەچی ئیسلام بۆ خۆی مرۆڤی بە گشتی بە (موکەڕەم) لە قەڵەم داوە "ولقد كرّمنا بني آدم". ئەمن پێم وایە ئیمامی شافیعی لە نیگای بابسالارییەوەی کە بەسەر کۆمەڵی عەرەبستاندا زاڵ بوو و ژن لە پیاو بە کەمتر دەزاندرا و زیندەبەچاڵکردنی مێیینە کارێکی خواسایی بوو، لە پێوەندیی مێیینە و نێرینە ئۆڕیوە. باشە ئەو جۆرە لە پێوەندیی ژن و پیاو تۆڕینە لە ژیانی ئەمڕۆی هەموو کۆمەڵانی ئیسلامەتیدا، ئەگەر بە کردەوە وەسەر پێ ئێخرێ کاروباری ئەو کۆمەڵانە چیی بەسەر دێ؟! ئەوەشت لەبیرنەچێ، ئەمن لەگەڵ فەمینیزمدا، بە مانای وەگەڕانەوە بۆ سەروبەندی داکسالاری، نیم؛ چونکە چ بابسالاری و چ داکسالاری، هەر یەکە لە هەلومەرجی کۆمەڵەکی ـ ئابووریی مێژوویینەی خۆیدا هاتۆتە گۆڕێ و بۆ هەلومەرجی ئەمڕۆ ناگونجێ، تەرزی پێوەندیی ژن و پیاو ئەمڕۆ شێوەی پێوەندییەکانی

ڕەنێوهێنان و هێزەکانی ڕەنێوهێنان دەیسەپێنێ، نەک بیروبڕوای من و تۆ یان فلانە تاک یان فیسارە تاک.

***هونەر*** شێوەیەکی جۆرەکیی ئەوتۆیە کە ئاگایی (وعی) و چالاکیی ڕەنگ بە واقیعدەرەوەی مرۆڤە و یەکێ لە ڕێگا هەرە گرینگەکانە کە جیهان بە تەرزێکی جوانکاری وێنەدەکێشێ و دەنوێنێ. مارکسییەت ئەو بۆچوونانەی کە هونەر بە بەرهەمی ڕۆح (esprit)ێکی ڕەها و بێ سەرحەد و سنوور، یان ویستی بتوون (الإرادة الكلية) و سرووش (الوحي)ی خودایی، یان بەرهەمی هەستوخوست و سۆسەی ئاگاییی هونەرمەند دەزانن، بەرپەرچ دەداتەوە و نایانسەلمێنێ. سەرچاوەی داهێنانی هونەری و ڕێڤازۆ (وتیرە)ی پێکهاتە (شکلّ و قالّبگرتە)ی هەستوخوستی جوانکاری و پێداویستییەکانی مرۆڤ، ئەرك بە خەرجدان و کارە. ئێمە ئاسەواری هونەرە سەرەتاییەکان لە دەورویەری نێوان ٤٠٠٠٠ تا ٢٠٠٠٠ سالّی سەرویەندی دێرینناسی (paleontholic)ی لەمەوبەر سەرەتاتکێمان دەگەلّدا دەکەن. سەروکار و پێوەندیی نێوان هونەر و کار، لە سەرویەندی چەرخ و چاخە سەرەتاییەکانی مرۆڤدا، سەروکار و پێوەندییەکی ڕاستەخۆ بوو. بەلاّم پاشانەکێ ئەم پێوەندییانە دە قالّبێکی تاق و جووت و نووفاق و ناڕاستەوخۆدا گیرسانەوە. ئەگەر بەم مەنتیقە لە کارەکە بڕوانی، شیعری شاعیرێکیش و جۆمالّکردنی جۆگەلەیەکیش، خۆ هەرتك هەر بە کار لەقەلّەم دەدرێن، وەلێ ئەوەندە هەیە، کە ئەویان کارێکی ڕووت (داڕندراو = ئابستراکت)ی بیر و خەیالّ و سۆز و ئەوی دیکەیان کاری پێمەڕە و ماسولکەیە. بەلاّم هەرتك هەر کار و ئەرك بە خەرجدانن، بەلاّم مێشکیش و ماسولکەش هەرتك هەر ماددەن. بناخەی هونەر ئەو گۆڕانکارییانەیە کە دە بنیاتی کۆمەلاّیەتی ـ ئابووریی کۆمەلّدایە و لە پەرەساندنی هونەردا خەلّکەکان (جەماوەر) لە هەموو دەور و زەمانێکدا دەورێکی گەورەیان تێدا گێڕاوە. پێوەندییە جۆراوجۆرەکانی نێوان خەلّك و هونەر لە نیشانە و شەقلّ و مۆرکە نەتەوایەتییەکاندا کە یەکێ لە تایبەتمەندییە جۆرەکییەکانی هونەرن، بە ئاشکرایی بەرچاو دەکەن. واتە: هەر نەتەوەیێ، هونەری شەقلّ و مۆرکداری خۆی هەیە. دیاردەکانی دیکەی ژیانی هونەر و کۆمەلّ کە یەکێ لە شێوەکانی ڕەنگدانەوەی هەبوونی کۆمەلّە، واتە: لە نێوان زانست و تەکنیك (بەش بە حالّی تەکنۆلۆجیا)،

ئایدیۆلۆجیای سیاسی (بەش بە حاڵی هونەر و جیزبایەتی) و ئاکار (بەش بە حاڵی پێوەندیی جوانکاری دەگەڵ ئاکار)دا لایەنی زۆر هاوبەش هەن. مەبەستم ئەوەیە کە زانستیش و تەکنیکیش و بیروباوەڕی سیاسییش و ئاکار و ڕەوشتیش، بەڕێکیان بە لای هونەرەوەیە، واتە: زانست و تەکنیکی جوانیش و ئایدیۆلۆجیای سیاسیی جوانیش و ئاکار و ڕەوشتی جوانیش هەن. بەڵام وێڕای ئەمەش، هونەر تایبەتمەندیی جوداوازی خۆی هەیە و سنوورییان لە یەکدی دەگەڕێتەوە. هونەر چێنێکە و ئەوانیتر چێتێکی دیکەن. کەرەستەی بابەتی تایبەتیی خودی هونەر، پێوندییەکی هونەرییانەی نێوان واقیع و مرۆڤە. ئەرکی سەرشانی هونەر ئەوەیە کە جیهان هونەرکارانە وێنە بکێشێ. جا هەر لەبەر هەندێیە کە مرۆڤ، وەك پێناو ئامێری پێوەندییە جوانکارییەکان، ناوچەق و ئاوێنی سەرلەبەری کارەکانی هونەرە. بابەتی سەرەکیی هونەر (بە هەموو جۆرەکانیەوە) لە لایەن هونەرمەندەوە بە صالّ (تبنی)دەکرێ و لە شێوەیەکی ڕەنگدانەوەی جۆرەکیدا لە حاڵەتی وێنە هونەرییەکاندا کە پێوەندیی ئۆرگانیکی نێوان بەرهەستی (حسی) و مەنتیقی، نابەرجەستە و بەرجەستە، تاك و کۆمەڵ، بە دەنگ دێنن، ئاراستە و پێشکێش دەکرێ. وێنە هونەرییەکان، دامێنانێکی هونەریی ئەوتۆیە کە پشت بە زانیاریی هونەرمەند لەمەڕ ژیان و دەسڕەنگینیی وی دەبەستێ. جا لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشێ کە داخوا جوداوازیی هونەرمەندێ کە بۆ خۆی، بە نموونە وەك شاعیرێ، نێوەڕۆکی شیعرەکانی تا ئەندازەیێ بەشێ لە ژیانی خۆی بێ، یان نەبێ؟ یان ئایە مەیگوساری و خەراباتیەتی و ئاشقێنی بۆ شاعیرێ کە شیعری مەیگوساری (الخمریات) و ئاشقانە بڵێ مەرجە؟ ڕەنگە شاعیری سۆفی مەشرەبی ئەوتۆ هەبن کە هەرگیز خۆیان لە قەرەی شەراب و ئافرەت نەدابێ، کەچی شیعری زۆر چاکیشان لەم دوو بابەتەدا گوتووە. نەك هەر ئەوە، بگرە یەکێکی وەکو ئەبو نەواسی خەراباتی و مەیگوسار، لە پاش مردنی، وەك دە کتێبانمدا خوێندۆتەوە، ئەم شیعرە زاهیدانە سۆفی مەشرەبانەیان دە بن بەرە شرەکەیدا دیتۆتەوە:

ولقد دلوت مع الغُواة بدلوهم     وأسمتُ سرح اللهو حيث أساموا

وبلغت ما بلغ امرؤٌ بشبابه     وإذا عصـــارة كـلّ ذاك أثامُ

جا، ئەبو نەواس بەم دوو بەیتە شیعرانەی، لە خەراباتیەتی و فیسق و فوجوور پەشیمانیی خۆی دەربڕیوە، یان بە هەر مەبەستێکی دیکەی گوتبن، دیارە مەزەی لە شیعری زاهیدانەی زۆر چاکیش خوراوە..

ئەمن لەو بڕوایەدام کە حافزی شیرازیی مەزن، کە لە وەسفی شەراب و مەستیدا، کەس دەسکی لە دوو نەکردووە و کەسی بە تۆزی قولەپێدا نەگەیشتووە، هەرگیز توخنی شەراب نەکەوتووە. خۆ شاعیری واش هەن کە مەیتۆش و ئاشقیش بووگن، کەچی شیعری ئاشقێنی و مەیگوساریی زۆر بێتامیان گوتووە. نێوەرۆک (بابەت) و ڕوخساری ڕەنگ پێ دانەوەی واقیع لە هونەردا، ئەرکی سەرشانی جۆرەکیی هونەر بەدیاردێخی؛ ئەم ئەرکە جۆرەکییەی سەرشانی هونەر، ئەفراندنی ئەو ڕاز و نهێنییانەی کە بەختەوەری و ئارەزوو بە مرۆڤ دەبەخشن و لە مانادا دەوڵەمەندی دەکەن و لایەنی هونەرییەکانی، واتە: ئەو ڕاز و نهێنییانەی کە لە بواری چالاکیی خۆیدا، دەتوانێ بە پێی یاسا و ڕێسایەکانی جوانی دایان بنێ، مانای ئەوەیە کە پێشوازی لە جێ بە جێ کردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ دەکا. جا، هەر ئەم ئەرکانەی سەرشانی هونەرە کە هونەر، مانای زانستانەمان وەک ڕاستییەک لە بەردەمدا قووت دەکاتەوە و هەروەها کاریگەریی ئایدیۆلۆجیانە و پەروەرشتکارانەی خۆی پیشان دەدا. مارکسییەت، سروشتی بابەتییانەی گەشەکردنی هونەر، کاتێ کە ڕێگا بۆ چارپشکووتنی جۆرە سەرەکییەکانی هونەر: لە گوێن ئەدەبیات، نیگارکێشان، مووزیک، شانۆ، سینەما و هتد خۆش دەکا، دێنێتەبەرەوە. مێژووی هونەر، مێژووی تادێ قووڵبوونەوەی ڕەنگدانەوەی واقیع و بۆچوونی هونەریانە و گۆڕینی جیهان بە دەست و مێشکی مرۆڤ، بەرەو گەیشتن بە فرەوانترین ڕەهەند و گەشەکردنەکانە. بەڵام گەشەکردن و پێشکەوتنی بە ڕەوڕەوەی گەشەکردنی کۆمەڵەوە، بە گۆڕانکارییەکانی بنیاتی چینە کۆمەڵایەتییەکانەوە شەتەک دراوە. هێڵی گشتی ڕەنگدانەوەی گەشەکردنی، دەگەڵ پتر

قووڵبوونەوەی ڕەنگدانەوەی هونەرییانەی واقیع و بە شێوەی بەرە ـ بەرە کامڵبوونی میتۆدەکاندا، هەر وا ڕاستە و ڕاست و لە سەر یەك بار ناڕوا. هێڵی گشتی گەشەکردنی هونەر، لە دنیای دێریندا دە کاتێکدا کە لە سەرێکەوە بەرەو هەوراز چووە و بە ئاستێکی ستاندارت گەیشتووە، دەبینین، وەك مارکس ڕوونی کردۆتەوە، کۆمەڵی سەرمایەداری کە لە سیستەمی بەردەگی زۆر پێشکەوتووترە، دژمنی سەرسەختی هونەر و شیعرە (دیارە تەرزە هونەر و شیعرێ کە داوای ڕووخانی سیستەمی سەرمایەداری دەکا)؛ چونکە تەرزی سیستەمی ڕەنێوهێنانی سەرمایەداری، بە چاوێکی پەست و خوار لە بیروبارەڕی کۆمەڵەکی و مینەوی (مەعنەوی)ی سیستەمە ئینسانانە و باڵایەکان، دەڕوانێ. بەڵام وەنەبێ لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا، هونەری پێشکەوتنخوازی بۆرجوازی کە سەردەمانێ هێشتا خەسیەتەکانی چینێکی پێشکەتخوازی بە بەرەوە مابوون، واتە: لە سەروبەندی تازە هاتنە مەیدانی سەرمایەداریدا؛ یان لەو بەرهەمە هونەرییانەدا کە ڕەخنەی (بە نموونە: وەك بێلزاك و ئەناتۆل فرانس) لەم سیستەمە دەگرت، بەرچاو نەکەوێ. ـ نموونەی ئەمەش لە واقیعییەتی ڕەخنەگەریدا ئاشکرا دیارە. لوتکەی هەرە بەرزی بیری جوانکاری لە جیهانبینیی زەحمەتکێشان، لە جموجوڵی پراکتیکدا، بە دەم کار و ڕەنجدانەوە، بەرجەستە دەبێ و بە گوێرەی بیری مارکسییەکان، هەر ئەمەیە کە بنەڕەتی هونەری واقیعییەتی سۆسیالیست پێك دێنێ.

ئەگەر کەمێ زێتر درێژە بە باسەکە بدەین، ڕەنگە خراپ نەبێ.. مرۆڤ کە هێشتا زۆر سادە بووە، واتە: پێکهاتەی مێشکی هێشتا هەندێك خانەی تێدا دروست نەببوو و لە قۆناغی چت بە ڕاستەوخۆ دیتندا بوو. نەیدەتوانی بە بێ لەبەرچاوبوونی ماددەی چت، بیر لە هیچ چتێ بکاتەوە، ئەم قۆناغەمان بە قۆناغی چت بە چاو دیتن نێونا، بەڵام وردە ـ وردە مرۆڤ لە ئەنجامی ئەزموون و تاقیکردنەوەی ڕۆژانەیدا مێشکی گەشەی کرد. ئەو بە ڕاستەوخۆ چت دیتنە، دواتر وردە ـ وردە بەرەو ناڕاستەوخۆیی چوو، لە "تەجسید"ەوە بۆ "تەجرید"هەڵکشا. هەر لەبەر ئەوەشە کە هەندێك جار تۆ لە ڕەخنەی ئەدەبیدا دەڵێی: فلانە دەق، شیعرەکەی، داهێنانەکەی کزە بۆچی؟ چونکە

ڕاستەوخۆیانەیە(موباشرییەت و تەقریرییەت و خیتابیەتی بەسەردا زاڵە) واتە: وەك بڵێی مرۆڤ حەزی لەوە نەبێ بە زەقی و بەرەوڕووی پێ بڵێی: ئەوە دارە و ئەوە بەردە. حەزدەکا دە پەردەی خەیاڵ و هەستوخوست و سۆزی وەرپێچی، ڕوونتری بێژم: وەك بڵێی هونەر حەز لە چتە وردەکان، ڕەگوریشەگان (جزئیات و تفصیلات)ی ژیان دەکا.. ڕەنگەکان بە خەستوخۆڵتر، سیفەتەکان بە قەتمەرتر، یان کاڵتر یان سووکتر پیشان دەدا.. بەکورتی: زۆری پێوەدەنێ، بەرزدەفڕێ، وەك لە بەلاغەتدا دەگوترێ (مبالغە، إغراق، غلو، تغریب، شێواندن و هتد..) بەکاردەبرێ، بۆچی؟ یان بۆچی مرۆڤ لە جیاتیی وەی لەسەر زەوین لە ڕاستی بگەڕێ، لە ئاسمان لێی دەگەڕێ؟ یان ئەوەی لە ئاسمانیش لێی دەگەڕێ، هەروەکو مرۆڤی سەرزەوینی وێنەدەکێشێ، هەر سیفەت و ڕەنگوڕووەکانی مرۆڤی سەرزەوینی ئاساییی پێ دەبەخشێ.. بەڵام دە شێوەیەکی بڵندتر و لە ئاستی مرۆڤی خواسایییەدەریدا وێنەدەکێشێ: زیۆس، هەموو چتێکی پێ دەکرێ، خودلوەند بەبەزەییە، توانایە، زانایە، دەسڕۆیە، دەوڵەمەندە، داهێنەرە، خۆلاسە هەروەك ئەهلی کەلام دەفەرموون: چەندین سیفاتی ئەزێنی و ئەرێنیی هەن، بەڵام (وەك هیچیش ناچێ "لیس کمثلە شیء"ە. دیارە هەر ئەم بەرزنۆزینەی مرۆڤی ناواقیعیی بە تاڵان چووی دەسخەڕۆی وەهم و خەیاڵە بوو کە یەکێکی وەکو ئەفلاتوونی وەسەر کەڵکەڵەی ئەوە ئێخستییە کە بیر لە نموونە پێشەکییەکانی هەبوون بکاتەوە و پێی وابێ هەر وێنە (صورة)یێ لە سەر بنەمای دەڵەمە (هیولا) یێ، شکڵ و شەماییلی خۆی گرتووە. ئەم دیاردەیە وەك لە شوێنێکی دیکەشمدا عەرزکردوون، لە قسەی زانایانی زانستی بەئاوەژووشکانەوەی چت لەسەر تۆڕینە(شەبەکییە)ی چاو و سەرلەنوێ لە لایەن مێشکەوە ڕاستکرانەوەی (هەرچەندە لێشی دوودڵم) بووەتە هۆی ئەم بە هەڵەداچوونە چتەکە زۆر ڕوونە مرۆڤ وردە - وردە لە چتی ڕاستەوخۆ و تەقریری و ئەوانەوە بەرەو ناڕاستەوخۆیی و خەیاڵ و وەهم نشێوبۆتەوە. کاتێ مرۆڤ سەیری دنیای هەموو چالاکییەکانی مێشکی دەکا، دەچێتە چوارچێوەی وەهمەوە، لە ڕاستیدا ئەو وەهمە ئێمە گوتمان جادووە، سیحرە. گوتمان

مرۆڤ هەوڵی ئەوە دەدا چتێکی کە پێی ناوێرێ (یاسایەکەی دەرك ناکا) بە شێوەیەکی ئیەتۆ ڕەفتار دەگەڵ دەکا کە کار لەو چتەی پێویستیەتی بەسەریدا زاڵ بێ، بکا. بۆ نموونە: ئەو کاتەی مرۆڤ وێنەی کەسێکی کە تیری هاویشتۆتە کەڵەکێوییەکی، لە دیواری ئەشکەوتەکەی کێشاوە، ویستوویە وا بزانێ، وا بەتەمابێ بە (ایحاء) ئەوەی لەسەر دیوارەکەی وێنەکێشاوە، سبەینێ دەتوانێ بەڕاستی ڕلوی بکا. مرۆڤ ئەو کاتە واقیع و وەهم، خەیاڵ و ڕاستیی لێك جودانەدەکردەوە، پێی وابووە "مشبّه و مشبّه به"، "مستعار و مستعار له"، "کینایه و مکنّى به (لازم و ملزوم)"، "رمز و مرموز إلیه"، "پەیکەرە و خاوەن پەیکەرە زیندووەکە" یەك چتن. ئەمەش لە خەتی هیرۆگلیفیدا ئاشکرا دیارە. کابرایێ کە وێنەی ماسییەکی دەکێشا، وێنەکە و ماسییەکەی بە یەك چت دەزانی، یەکی دیکە کە پەیکەرەی بۆ خودایەکەی دادەتاشی و دژمنەکەی "بە نموونە: حەزرەتی ئیبراهیم کە بتەکانی نەمروود دەشکێنێ" دەیشکاند، یان دەیدزی، شەڕێکی گەورەوگرانی لەسەر هەڵدەگیرسا؛ چونکە پێی وابوو، هەر بەڕاستی خودایەکەی کوشتووە یان بە تاڵانی بردووە. جارێکیان فتیشیستێ وانێکێکی لاستیکی دەبێ، زەلامێ بە کێردێ لەتوپەتی دەکا. ئەم کارە لە ڕووی دەستدرێژی کردن لە (ئازادیی شەخسی)ی مرۆڤەوە، بەر دەمەتەقێ و وتووێژخرا. واتە: ئایا خاوەنەکەی دەتوانێ شکات لە کابرای "قاتل"ی وانێکەکەی بکا؟ نەك هەر ئەمە، بگرە بە هەر جۆرێ بە نیازی تەوهینەوە خۆ لە قەرەی تەولوی تابوو "پیرۆز"ەکانی مرۆڤ دان، بە دەستدرێژی لە "حەیسییەت و کەرامەت و قودسییەت"ی مرۆڤ لەقەڵەم دەدرێ

ئەمەش لە بنەڕەتدا پێوەندیی بە بیروبڕوا، بە سیستەمێکەوە هەیە کە داکۆکی لە بەرژەوەندی ئابووریی چینی حوکمڕان دەکا. بتپەرستیی سەروبەندی پێش ئیسلامەتی بیروبڕوایەك بوو کە داکۆکیی لە بەرژەوەندی (تەواغیت)ی قورەیش دەکرد، پیرۆزی و تابووبوونی لات و مەنات و عوززا و هوبەل و غەرانیقەکانی مەککە لە بەرژەوەندی چینی حوکمڕانی ئەو سەردەمە ئاوی دەخوارد.. خۆلاسە، هونەر هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و لەسەتا سەت پێوەندیی بە بژێوی مرۆڤەوە هەبووە. مرۆڤ بۆ

بەرگری لە هەبوونی بایۆلۆژیی خۆی و مانەوەی خۆی پەنای وەبەر ئەو چتانە بردووە.

دیارە لە هەر سەرویەندێکدا هونەر هەبووە. لە سەرویەندی پێش مێژوودا، سەردەمی بەردینی کۆندا، هونەری جادوو و خۆڕسککگەری هەبووە. سیما و ڕەنگ و ڕووی ئەم جۆرە هونەرە دە قەوەارەدا هێشتا هیشك و ناقۆلایە و وردبیاتەکانی ئەرکێکی زۆری تێدا بە خەرج دراوە و ئەمە هەر بەو ڕەنگە پێش دەکەوێ و دە شکڵ و شێوازێکدا دەگیرسێتەوە کە زیندوو و بە ڕۆح و تا ڕادەیەك ئیمپریسیۆنیستییە. دە قاڵبی وێنەکیدا (زێتر دەگەڵ تەماشاکردندا دەدوێ و زووڕەفتەنی و بە ڕەواڵ خۆڕسکانە)یە. زۆر زەریفی و وردەکاریی پێوەدیارە. ئەم جۆرە هونەرە خۆڕسککگەرییە بە هیچ کلۆجێ خێوی فۆرمۆڵی چەسپ و پایەدار و مت و بێ جموجووڵ نییە، بەڵکو شێوەیەکە زۆر بزۆز و زیندوو و دەیهەوێ واقیعییەت بە یارمەتیی جۆراوجۆرترین هۆو و پێناو (وسائل)ەکانی دەربڕینی بەیان (مەجاز، ئیستیعارە، تەشبیە، کینایە، ڕەمز، تەلمیح، تەمسیل، تەعریز، تەورییە، تیباق و هەموو جۆرەکانی جیناس و هتد ) پیشان بدا و ئەرکی سەرشانی خۆی هێندێ جار کەموزۆر بە دەسڕەنگینی و مەهارەتی تەواوەوە بە ئەنجام دەگەیەنێ. ئەم بارودۆخە ڕەمەکییەی لە جوداوازیی خۆڕسکبەدەرە، ئەوەتا لەمێژە لەبیرکراوە، وەلێ بۆ گەیشتن بە قۆناخێ لە فەرمەنگ کە لە سای وی، فۆرمۆڵهایەکی وردی هونەری بڕسکێندرێن و دابهێندرێن، ڕێگایەکی دووورودرێژ لە پێشییە و دەبێ پەی کرێ.

بەڵام ئەوەی مایەی هەرە سەرسوڕمانە کە ئەم هونەری پێش مێژووە و هونەری "منداڵانە"یە، یان هونەرەکانی سەردەمانی پاشینی نەتەوە سەرەتاییەکان، هیچ وێکچوونێکیان دە نێواندا نییە؟

دیارە هونەر لە سەرویەندی جادوو و خۆڕسککگەریدا، بۆ ڕازاندنەوە و تەجەممولات و کەمالییات نەبووە. تەنانەت لە نێو تاریکیی ئەشکەوتاندا وەشێردراینە و پێوەندیی تەولوی بە شێوەی ئابووریی ئەم سەرویەندەوە، کە ڕاووشکارە، هەبووە..ئەمە هونەری سەردەمی بەردینی کۆن. هەرچی هونەری سەرویەندی بەردینی نوێیە، ئەوە ڕووی لە

پڕچ و شێوەی ئەندازەیی کردووە. شێوەی خۆڕسککەری تا دوای سەردەمی بەردینی کۆن، واتە: بە درێژایی هەزاران ساڵ، بەردەوام بوو. بەڵام تا سەرەتای سەردەمی نوێ هیچ گۆڕانێ لەم شێوازەدا ڕووی نەدا و تا ئەم سەردەمە دەستی پێ نەکرد، شێوەی "خۆڕسککەری" کە ئازادانە دەرکەی لە ڕووی دنیای ئەزموون وەسەر گازی پشت ئێخستبوو بەسەر نەچوو، شێوەی بە سنووری "ئەندازەیی" نەهاتە گۆڕێ. لەمەوپاش لە جیاتیی پەیڕەویی سەرومڕ لە خۆڕسك (ڕاستەوخۆیی)، وەك لە پێشترێ عەرزم کردن، هونەر زێتر بە تەنگ وردەکاریی تێکەڵ بە سەبر و سەلیقەی ئاشقانەوە دێ، خۆی پتر بە چتی ورد و جوزئیاتی چتەوە سەرقاڵ دەکا. ئیدی ئەوە نەما، بێ یاسا و ڕێسا کووی ئارەزوو لێ بوو، وە بکا. لەمەوپاش پەیڕەویی لە برێ نیشانە و ڕێسای بڕیاردراو و جۆرە تەرح و تێزەیلێ دەکرد. وەك لەبەرەوە گوتم، هیرۆگلیفانە ڕەفتار دەکا..واتە: لە جیاتیی وەی وەك جاران ئەگەر ویستی بێژێ؛ ماسی، وێنەی ماسییەکت بۆ بکێشێ، ئەمجارە تەنها "ن" ێکت، بۆ وێنە دەکێشێ، واتە: "ماسی".. لێرەدا، ڕەمز جێی واقیعی گرتەوە. لە جیاتی ئەوەی جەخت لەسەر پیشاندانی تەواوی چتی مەبەست بکا، بە سووکە ئاماژەیێ دڵی دادەکەوێ. هونەر ئیدی لە جیاتی نیشاندانی ئەزموونەکانی واقیعییەتی ژیان هەوڵ دەدا، تا ئەندێشە و بیروبۆچوون، ڕوونتری بڵێم، لە جیاتی وەی جەوهەری ناخی چتان دەستیشان بکا، لە جیاتی (مشابە)ی چت "هێماگەل"ێ دەخولقێنێ. وێنەکانی سەردەمی بەردینی نوێ، مرۆڤ بە یاریی دوو یان سێ هێڵ بە قەرەنتووی ئەندازەیی (jiometrical) پیشان دەدا: هێڵی ستوونی، لەشی دەنوێنێ و دوو نیوە جغز: یەکیان ڕوو لە هەوراز، هەردوو باسکی و یەکیان ڕوو لە نشێو، هەردوو لاقی دەنوێنن. مەنهیر (مسلات)ەکان، کە هێندێ پێیان وایە پەیکەرەی مردووگەلێکن کە بە کورتکراوەیی (shorthand) پیشاندراوە، ئەوپەڕی دووری و بێگانەیی لە واقیعییەت دوورکەوتنەوە و بیانیبوون نیشان دەدەن.. کێلەبەردێکی ڕێك و هەموار کە لە سەرووی هەر گۆڕخانەیێ داندراوە، ئەوە سەری مردووەکە دەنوێنێ، بەڵام خەڕی و ڕێکوپێکییەکەی هیچ وەك قەوارەی خواسایی ناچێ. دوو

نوختەی لە باتی چاو بۆ کراون، کەپۆی بە شێوەیەکی ئەندازەیی ساکار لەگەڵ زاری، یان هەردوو برۆیدا تێهەڵکێش کراون، پیاو بە وێنەی چەکێ دەگەڵیدا،جویێ کرلوەتەوە. ژن بە دوو چتی زەقورۆپ لەسەر سینگی جیاکراوەتەوە. لە مۆزەخانەکەی هەولێری دێریندا، کێلەبەردی خەنجەر و شێر و خۆر لەسەر هەڵکەندرای و کێلەبەردی دە شێوەی زەکەر بۆ پیاو و کێلەبەردی کونکرای بۆ ژن هەن و لە ناوچەی دوین، گۆیا زێدی سەلاحەددینی ئەیووبی لە کوردستان دۆزرایتەوە. هەروەها کێلەبەردی سێیینەش هەیە، کە ڕەمزی مەلا و زانایە. کێلی ناوەندیێ بە پێچەوانەی دووەکەی دیکەوەیە.

ئەم شێوازکورینە کە بەم جۆرە شکڵە تەجریدییانە گەیشتووە، بۆ خۆی لە ئاکامی گەشەکردنێکی هەموانییە کە لە فەرهەنگ و شارستانیەتیدا ڕووی داوە و ڕەنگە قووڵترین گەشەکردنی مێژووی تیرەی مرۆڤ بێ. دەورروبەری ماددی و ڕۆحیی مرۆڤی پێش مێژوو، ئیدی بە جۆریێ دەگۆڕێ و گەشەدەکا کە هەرچییەکی پێشە وی هەیە، مرۆڤ دە سەروفەسالّی جانەوەری ڕەمەکی (غریزی)دای دەبینێ و لە پاش ئەوە دەبێ بە جەرەیانێکی گەشەساندنی بەردەوام و مەبەست بەدیهێن. ئەم گۆڕانە گرینگە ئەوەیە کە مرۆڤ ئیدی بە ملی خۆڕسکەوە چەل و لامژ و توفەیلی نییە، وەکی پێشکە و گەنە بژێ. بژێوی ڕۆژانەی بە گردوکۆ، یان ڕاووشکاری جانەوەران دابین ناکا، بەڵکو بۆ خۆی ڕەنێوی دەهێنێ. بە کەویکردنی جانەوەران و چاندنی گیاوگژوڵان، واتە: بە ئاژەڵوانی و کشتوکاڵ کردن، کەم کەمە بەسەر خۆڕسکدا زاڵ دەبێ (لە یاسا و ڕێسایەکانی خۆڕسک تا ڕادەیێ دەگا) و لە دووبەختیی چارەنووس و ڕێکەوت تا ئەندازەیێ دووردەکەوێتەوە. سەردەمی تەدارەك و ڕەنێوهێنانی ڕێکوپێکبووی پێداویستییەکانی ژیان دەست پێ دەکا و مرۆڤ دەپەرژێتە ئاژەڵوانی و دەسەبەر کردنی پێداویستییەکانی. دواڕۆژی پێشبینی دەکا و شێوەکانی سەرەتاییی سەرمایەدانان دادەمەزرێنێ.. بەم پێشەکییانە ـ واتە: بوون بە خاوەن زەوییوزاری چێندراو و پەز و گاوگۆتاڵ و ئامراز و ئەسپاب و ئازووقە ـ بێ گومان لە بەش بەش بوونی کۆمەڵ بە چینی دەوڵەمەند و دەسڕۆ و چینی هەژار و لە هەموو چتێ بێ بەش، کۆمەڵی چینەکی پەیدا دەبێ. بە

دەرککردنی پێوەندی دەگەڵ ئاووهەوای سازگار و ناسازگار و گرەوگەرما و هەورەتریشقە و بروسکە و تەزرە و نەخۆشی و پەتا و ئاهۆی گیزۆ و قات و قڕی و بڕشت و بێ بڕشتیی زەویوزار و کەموزۆریی زاوما و زاوزێی ئاژاڵ و پاتاڵان، بیرکردنەوە لە ئەرواحی جۆراوجۆری خێرخواز و بەدخواز، هاتەکۆڕێ و ئەمانە لە نیگای قازانج و زیانەوە هەڵدەسەنگێندران و بیر لە هێزی نهێنی و مەرموز و نەزانراو کە کاریان لە کۆنترۆڵکردن و دەسەڵاتی مرۆڤ بەدەر بوو لە هەستوخوست و زەینی مرۆڤدا ڕەگ و ریشەی داکوتا و ئیدی جیهان لەمەڕا دەبێ بە دوو کوتەوە؛ بە دوو جیهانەوە. ئەمە، قۆناخی بڕوا بە ڕۆحە کە بە بنەڕەت و بنواشەی ژیان دەزانرێ و لەبەر ئەمە بە سەردەمی پەرستنی ڕۆح و بڕوا بە نەمری ڕۆح و لە ڕێوڕەسمی ڕەچاوکردنی ڕێز لە مردووگرتن لەقەڵەم دەدرێ. بە هاتنەکۆڕێی بڕوا بە پەرستن، پێویستی بە بت و تکا و نزا و دوعاخوێندن و نوشتەکردن و کشتەك برین و ڕەمز و نمای پیرۆز و نەزر و گۆری سەرژێکردن و قوربانی کوشتنەوە و خێرات بۆ مردووکردن و گومەز لەسەر پیر و مەشایەخ ڕۆنان، دێنەکایەوە. لەمەبەپاش جوداوازی لە نێوان هونەری پیرۆز و هونەری دنیایی، هونەری پیشاندان و نمایشتی کاروباری ئایینی و هونەری دنیایی و جوانکاری و ڕازاندنەوە، زەق دەبێتەوە. لە لایەکەوە ئاسەوار و پاشماوەکانی بت و هونەری مردووناشتن دەبینین و لە لایەکی دیکەوە تووشی سیرامیکەیلێ کە شێوەی جوانکاری و ڕازاندنەوەیان پێوە دیارە، دێین.

لە نیگای گیانگەرایی (ئەرواگەری = ئانیمیسم) یەوە جیهان دوو بەشە: بەشێکی واقیعییت و بەشێکی سەرووی واقعییەت، واتە: جیهانی دیار و جیهانی نادیار و پێوار. کەواتە مرۆڤ تووشی دوالیزم بوو، تووشی ناڕاستەخۆ لە چت نواڕین بوو. بەڵام بۆچی بەرەو ئەم ناڕاستەوخۆییە ڕۆیشت و ئەم ناڕاستەوخۆییە لە کوێوە دەست پێدەکا؟ لە دووفاقیەوە دەست پێدەکا، لە دوالیزمەوە دەست پێ دەکا. ئەو دوێنێ چتێکی دیتووە، کەچی وێنەکەی هێشتا لەنێو مێشکیدا ماوەتەوە، دوێنێ قسەیەکی بیستووە کەچی هێشتا لەیادی ماوە، خەون دەبینێت، خەیاڵ دەکاتەوە، مێژوو دروست دەکا.

لێرەوە مێژووی زارگۆتی دروست دەبێ. واتە: تۆ بتوانی ڕابردووی خۆت بگێڕیەوە، ئەوەی کە ڕوویداوە جارێکی دیکەی لە مێشکی خۆتدا وەبیر بهێنییەوە. نەک هەر ئەوە دواتر مرۆڤ فێری نووسین دەبێ و دەزانێ ئەو ڕابردووە بنووسێتەوە، مۆزەخانەی بۆ دروست دەکا، واتە: مرۆڤ دەچێتە نێو مێژوووەوە، چوونە نێو مێژووەوە واتە: ڕەسم کردنی ڕابردوو، نوسینەوەی ڕابردوو.. ئەمەش مانای وایە کە ئەم مرۆڤە لەو مرۆڤەی کە ڕاستەوخۆ هەموو چتێکی (لە گوێن هونەر) بۆ بژێوی خۆی بەکاردەهێنا، جوداوازە. باشە لەنێوان وەهم و واقیعدا چی پەیدا بوو؟ کە دەڵێم ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ واتە: نێوان (بەرزەک)ی وەهم و واقیع. کابرایەک کە بروسکەیەک لێی دەدا و دەبووڕێتەوە هێندێ چتی لەو داستانی بوورانەوەیە، ئەوجا ئەو حاڵەتە وڕێنە(هەلوەسە)، بزرکاندن (شطحات)، شێتی (شیزۆفرینا (فصام)، خەمۆکی (کئابة)، تۆقین (رُهاب)، وەسواسی (وسوسة)، توورەیی (عصاب)، نیشانەی سرووش بۆهاتن (إرهاصات)، بەگوێداخوێندن (إيحاء) و هتد..... یان هەرچییەکی دیکە بێ، کە سەروکاری بە تێکچوونی پرۆسێسی کیمکیی مێشکەوە هەیە، لە بیردەمێنێ و دێ بۆ خەڵکی وەدەگێڕێ و بەمە دەبێتە شامان، دەبێتە پیرۆز. لە ڕاستیدا پێش ئەوەی وای لێ بێ کابرا بۆ خۆی واقیعێکە و هەیە، بەڵام کاتێ دەچێتە ئەو حاڵەتەوە و جارێکی دیکە (گۆیا) زیندوو دەبێتەوە، یان بەخۆ دێتەوە ئەوەی کە لە مێشکیدا دەمێنێتەوە، ئەوە وەهمە، واقیع نییە. کەوابوو لێرەدا مەودایەکی کاتشوێنی (زمکانی) لە نێوان دوو دنیای ئەو کەسەدا، هاتەگۆڕێ: دنیای پێش مردن و دنیای بە وەهم پاش مردن. بەڵام هەردوو دنیایەکە وەنەبێ لێکدابڕاوین، بەڵکو هەردوکیان دنیایەکی مامنێونجیشیان لە نێواندا هەیە کە بە سروشتی پێوەندیی ماددیی پێش قۆناخی تەجرید، ڕەمز، بەرزەکی دروست کردووە. ئەبو عەلای مەعەڕیش، لە رسالە الغفران و دانتیش لە کۆمیدیای ئیلاهی و جەلال نووری تورکیش لە "دنیادن آخرتە و آخرتدن جهان استقبالە"دا ئەم "بەرزەک"ەیان لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا دروست کردووە. خۆلاسە بە دوو کەرت کردنی واقیع بە وەهم و خەیاڵ یان لە ژێر کاریگەریی ئەو تەخۆشینانەدا باسم کردن، مردن و

زیندووبوونـەوە، چ لـەم دنیـا و چ لـەو دنیـا، دوو دنیـای ئاخیرەت و دنیـای ئێسـتای لا دروست کردووە.

مرۆڤ بۆ خۆی پـاش ئـەوەی واقیعـی لـە دەرەوەی زەیـن (موضوعـی) و واقیعـی لـە نـــاوەوەی زەیـــن (ذاتـــی)دا لـــە ئـــەنجامی پرۆسێســـی ڕەنگدانـــەوەی واقیعـــی بابەتی(موضوعي)دا، بە دوو حاڵەت زانیوە، تووشی چەواشەییە مێژووییەکە بووگە.. تووشی "فصام" بووگە تووشی "هەلوەسە" بووگە تووشی کوڕی تـووش بووگـە. مرۆڤ بەنگ، تریاك، جۆرەها ماددەی هەست و مێشك سستکەر بە کـاردەهێنێ. ئـەتۆ کە بە هەر شەقامێکدا دەڕۆی و تووشی سەدەها ڕەمز و ئاماژەکانی هاتوچوو دێی ئەوە کورت کردنەوەی ناو و وێنـەکانی ژیانـە، کـورت کردنـەوەی هـەزارەها شـت لـە چتێکـی چکۆلە تردا، ئەوە مانای ئەوەیە تۆ لە قۆناغێکدای دنیات بە دوو چنەوە کردووە، خۆت بە دوو بەشەوە بووگی، بەشێکی ئـەوە خۆتـی، بەشـێکی تریشـت ئـەوەتای کـە ڕۆحـت تێدایە. کەوایە، لێرەوە ڕۆح پەیدا بوو کە پێت وابـێ هـەموو شـتێ لـە پشـتیەوە ڕۆحـێ هەیە، هێزێ هەیە، تۆ هەمیشە ڕفتار لەگەڵ دوو چتدا دەکـەی، ئـەوەی کـە نـابیینی و نازانی وردەکارییەکانی چین، بـۆ خـۆت چتێکـی بـۆ دادەنێـی. ڕەمزێکـی بـۆ دادەنێـی، یاخود بۆ خۆت تەسەوورت کردووە، بەڵام ڕەنگە لەبـەر هۆیـەك لـە هۆیـەکانی نەتهـەوێ ڕەسمی بکەی، ئەمڕۆ بۆچی پێغەمبەر وێنەی ناکێشرێ، بۆ وێنەی خـودا ناکێشـرێ، بـۆ وێنەی ڕۆح ناکێشرێ؟

من لە منداڵییەوە کە دەیانگوت، خودا زگێکم بە خەیاڵدا دەهات پێم وابوو ئـەو زگـە هەروەك تەنها زگی ئینسانێکە نەدەستی هەیە و نە سەری هەیە و نە لاقی. هـەر زگێکـە و هیچی دیکە. بۆچی خودا لـە مێشکی منـدا ئـاوابوو؟ چونکە ئـەوەی لـە مێشـکم چەسپیبوو ئەوەبوو کە خودا دەست و لاق و سەر و هتد ـی نییە و تەنها هەر زگێکە و بەس.. کە دەیانگوت پێغەمبەر، مرۆڤێکم لە زەیندا نەخش دەبوو کـە هەمیشـە جلێکـی سەوزی لەبەردا بێ و پریشکیشـی لێ بێتـەوە؟ ئـەوە دوور نییـە دایکـم یـان ئـەنکم ئـەو حکایەتەیان بە منداڵی بۆ وەگێڕابم و لە زەینم چەقی بێ، بۆ چـی دەبـێ ڕەنگـی سـەوز

نیشانەی پێغەمبەر و ئالآی ئیسلام و شێخ و مەشایەخ و ئەولادی پێغەمبەرین؟ ئەتۆ لەوە گەڕێ کە ئەو ڕەنگە هەر کە بە خۆرسك دەگەڵ گیاوگوڵ و داروبرەختدا هاوسەروکارە، وێرەوەتر وەرە، عەجەم بە دەسکیسەی جهوودان ڕەنگی کەسکی، ئاوریان کە نیشانەی مەجووسییان بوو، بێ وەی عەرەب بەخۆ بزانن بە فەسالی عەلەوییانەوە ساویوە، هەروەها ڕەنگی ڕەشیشیان کە نیشانەی تۆلەساندنەوەی عەلەوییان لە ئومەوییان بوو و ئەبو موسلیمی خۆراسانیی کورد بە دروشمی تووڕەبوون لە قەڵەم دا، تا ئێستاکەش نیشانەی سەییدە مووسەوییەکانی شیعەیە. کەوابوو تەسەوورکردنی نادیار بە ڕەمز، چەند هۆکارێکی خۆی هەن: یەکەمیان ئەوەیە کە وردەکارییەکانی نازانێ. دووەم ناتەوێ لە "تەفاسیل" بدوێ. گرایشت و مەیلی مرۆڤ لە تەجسیدەوە بەرەو تەجرید دەچێ، واتە: قۆناخی کورتکردنەوە، خۆ لە وردەریشەکانی چت دزینەوەیە. تەجرید قۆناغی کورت کردنەوەیە "اختزال" shorthand ە. ئەوانەی پێیان وایە مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە بیری لە هەموانییەکان (کلیات) کردۆتەوە یان ئەقڵ چتێکی زگماك (فطری)یە بە هەڵەدا چوون، ئەو بیروبڕوایە کۆنەخولزانەیە. ئەمن بڕوام بەوە نییە کە مرۆی سەرەتایی وەك ئەفلاتوون فەیلەسووف بووە و بیری بۆ دەرکی کوللییات چووە، ئەوە هەڵەیە؛ چونکە عەقڵی مرۆڤ و مێشکی مرۆڤ لەو ئاستەدا نەبووە کوللییات تەسەوور بکا. هێورین و توێتکە گرتن نەبوو، هاوکاری نەبوو، فەردی بوو بەڵام لەو قۆناغەدا کۆمەڵێك چت پەیدا دەبن، مرۆڤ گوند دادەمەزرێنێ، دابەشکردنی کار پەیدا دەبێ، هاوکاری دەس پێ دەکا، کار لە جیاتی ئەوەی تاکە تاکە ئەنجام بدرێ، بە کۆمەڵی و هەرەوەزی دەکرێ. واتە کۆمەڵگایەك دروست دەبێ، چتێکە لە بابەتی ئالێم سۆسیالست، بەڵام چتێکە خەڵکی تێدا موحتاجی یەکدین و فێری ئەوە دەبن کە لەگەڵ یەکدیدا کار بکەن.

من باسی ئەوەم کرد کە مرۆڤ بۆچی لە شتی ڕاستەوخۆ وەڕەز دەبێ، بۆچی لە ڕۆتین جاڕس دەبێ، بۆچی دەیهەوێ لەگەڵ چتان ناڕاستەوخۆ ڕووبەڕوو بێ؟ پێم وایە ئەمە لەوەڕا هاتووە کە مرۆڤ هەنگاوێ دەهاوێ، هەنگاوی دووەمی کە دەیهەوێ

بیهاوێ نازانێ هەنگاوەکەی بەرەو کوێ دەڕوا، ئەمە دووبارە وەهمی بۆ پەیدا دەکا، دووبارە دوودڵیی بۆ پەیدا دەکا. واتە: ئاگایی نییە، بەڵام ئەگەر هات و سەدان هەنگاوی دیکەی هەڵێناوە و هەمووی بۆ ئاشکرا بوو، ئیدی دوودڵییەکەی نامێنێ، ئەو نیگەرانییەی نامێنێ، بەڵام بێ سەرحەد و بێ سنووری، هەمیشە دوودڵیت بۆ دروست دەکا، هەر خۆی کۆتایی نەهاتن، سیفەتی ناکۆتابوونی گەردوون سەرچاوەی دوودڵییەکانی مرۆڤە لە ڕاستیدا.

تۆ کە تەسەووری دنیایەکت کرد کۆتایی هەیە، منیش تەسەووری ئەوە دەکەم، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو گەردوونە کۆتایی نییە دوو دڵیش کۆتایی نییە. ڕەنگە ئەم مەسەلەیە ڕێژەییش بێ، دوودڵیی ڕەها هەیە و دوودڵیی ڕێژەییش هەیە.

دوودڵیی ڕەها لە ئەنجامی دۆزینەوەی زانستی و پێناوی زانستی و چت دۆزینەوەی زیاتر، ڕەهایەکان هەموو دەبن بە ڕێژەیی. بۆ نموونە: ڕۆژێ لە ڕۆژان من لەوە نیگەران بووم کە دەمەویست ئەمڕۆ لە هەولێرەوە بگەمە کەرکووک و دەبوا ١٥ سەعات بەپێ بڕۆم. گوێ دڕێژم نییە. دوایی گوێدرێژ پەیدادەکەم. ئەمە مانای وایە ڕۆیشتنەکەم بۆ ئەوێ کە نەمدەتوانی بڕۆم ڕەها بوو، بەڵام کە سواری کەر بووم و بە ١٠ سەعات گەیشتمە کەرکووک، ئیدی ١٥ سەعاتەکە بوو بە ڕێژەیی. باشە دواتر کە ئوتومبێلم پەیدا کرد، ١٠ سەعاتەکە بوو بە ١ سەعات، کەواتە: ١٠ سەعاتەکە بوو بە ڕێژەیی، کەواتە: هەموو ڕەهایەك لەبەردەم ئەوەدایە کە دوای دۆزینەوە زانستییەکان و گەیشتن بە ڕاستی دیکە ئەو ڕاستییە ڕەهایانە ببنە ڕێژەیی. ئینجا با بزانین ڕاستی ڕێژەیی مانای چییە؟ بۆ نموونە: من ڕۆژێ لە ڕۆژان پێم وابوو مرۆڤ ناتوانێ وەك هەباسی کوڕی پەرناسی بەبێ پێناوێکی ماددی، یان سیحرێ یان خودایێ بە ئاسماندا بفرێ. ئەوە تێڕوانینێکی ڕەها بوو، واتە: نەتوانینی مرۆڤ لەو شێوەیەیدا کە هەیە بۆ فرین لەو سنوورەدا ئەوە فکرێکی ڕەها بوو، بەڵام دوایی کوڕی پەرناس کە باڵی بۆ خۆی دروست کرد و وەکو کابرای یۆنانی ئەم ڕەهاییە کەمێ کز بووەوە. دواتر کە زانست پەیدا بوو مرۆڤ تەماشای باڵندەی کرد و لە یاسای فڕین حاڵی بوو، فڕۆکەی دروست

کرد و ئەو ڕەهایەش بوو بە ڕێژەیی، ئەو حەقیقەتە ڕەهایە بوو بە حەقیقەتێکی ڕێژەیی. دەتوانێ لە سەنتەری کێشمانی زەویین خۆی ڕزگار کا. ڕۆژگارێ کەس تەسەووری ئەوەی نەدەکرد مرۆڤ بتوانێ لە سەنتەری کێشمانی زەویین خۆی ڕزگار کا، بەڵام ئێستا کارەکە بووگەسە مەسەلەیەکی ڕێژەیی و هەموومان دەیزانین.

دەپرسی: ئایا مرۆڤ بەشێکە لە پرۆسێسی پێکهاتنی مرۆڤ؟ ئەگەر لە ڕووی بایۆلۆژییەوە دەڵێی، هەر چەندە مرۆڤ خۆی دەزگایەکە کە توانایی وای تێدابەستەیە کە بە سەر هەموو چتەکان ڕابگا، بەڵام ئەو بەسەرڕاگەیشتنانەش بە ئەنگێزە و پێداویستییە مرۆییە کۆمەڵەکییەکانەوە شەتەك دریاگە.

من دەمهەوێ بزانم ئەگەر هونەر بەشێکە لە پرۆسەی پێکهاتنی مرۆڤ، ئایا مرۆڤی ناهونەرمەند تەسەوور دەکرێ؟

هونەر، بە مانای ئامێری ڕامکردن و بەسەر واقیعییەتدا زاڵبوون تێ بگەین، یان بە عینوانی پێناوێ بۆ خۆ بە خۆڕسك ئەسپاردن وەکار ببرین، ڕۆژگارێ (بە نموونە: لە سەردەمی جادوو و خۆڕسیککەریی سەروبەندی بەردینی کۆندا کە تەنها پێناوی جادووگەرانەی هاسانکردنی ڕاوشکار بووە، هەموو مرۆڤێکی سەرەتایی هونەرمەند بووە. بەڵام لە سەروبەندی ئانیمیسم و ئەندازەییدا مەرج نییە هەموو مرۆڤێ هونەرمەند بووبێ دیارە هونەر هەر لە سەرەتای سەروبەندی بەردینی کۆنەوە تا دەگاتە ئەمڕۆی هونەری فیلم، تا بەرەو پسپۆڕی (دابەشکرانی کار) هەوراز هەڵکشاوە، هونەرمەندایەتی ڕووی لە دەگمەنایەتی کردووە، ڕووی لە قۆرخکران کردووە، ڕووی لە ئایدیۆلۆجیای چینێکی دەسەڵاتداری توفەیلی یان بێ دەسەڵاتی شۆڕشگێڕ کردووە، خۆلاسەی کەلام هونەر بێ مانا چینەکییەکەی ناتوانی هەروا لە خۆڕاکی بە ملی سەرلەبەری مرۆڤەکانیدا ببڕی یان هەر بابایەکی بگری بە بەشداری خەرمانی هونەری لە قەڵەم بدەی. کێهە هونەرت مەبەستە؟ ئەوەی کە دەوری تەماوە و وەکو گۆماوی ڕەنگ و بێن و تامپەڕیوی لێ بەسەرهاتووە؟ یان ئەوەی کە تازە ڕۆحی مان و زیندوێتیی تێ دەگەڕێ و پەنجە بۆ سوارۆژی مرۆڤی توێباو درێژ دەکا؟ خۆ ئەگەر بەوە بێ، زمانیش بەشێکە لە

هونەر بە مانای ئامێری لێکدی حاڵی بوون، زمانیش هەر هونەرە ئەگەر بێتە سەر ڕاستی. تۆ تەسەووری زمان دەکەی ئەگەر مرۆڤ وەکو تاکێ لە کۆمەڵدا نەژیابا؟ نەخێر زمان ئەسڵەن هەر دروست نەدەبوو. کەوابوو مەبنای هەموو مەسەلەکان پێویستییەکانی کۆمەڵە. تۆ بە شێوەیەکی بایۆلۆژییانە کە ئاوا دەژی ناچاری سەما بکەی، هەڵپەڕی و شیعر بڵێی و مۆسیقاش بژەنی ــ کەوابوو دووبارە دێینەوە ناو کۆمەڵ. مەسەلەکە تەنها بە تاکەوە هاوسەروکار نییە. مەگەر هەر بابیی ئەوەندە ڕێژەیە نەبێت کەوا پێوەندیی لەگەڵ کۆمەڵدا هەس. کەس بەبێ هونەر نییە، چونکە کەس بەبێ کۆمەڵ نییە. کۆمەڵیش بەبێ ئەو پێداویستییە سەیروسەمەرانە نییە. ئەو پێدلویستیانەش ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەیە.

مادام تۆ بووگی بە دوو ڕەهەند: ماددی و مەعنەوی، واتە شتی ڕاستەوخۆ و چتی ناڕاستەوخۆیشت هەیە و بە زۆرییش گەشەی مرۆڤ کە بەرەو تەجرید ڕۆیشتووە ئەوەش دەلالەتی هەڵکشان و گەشەی مرۆڤە. واتە بەرەو ناڕاستەوخۆیی چوون دەلالەتی گەشەیەکی یەکجار گەورەیە لە کۆچ و ڕەوی مرۆڤدا. هەتا چت بە ڕاستەوخۆیی بڵێی، ئەوە نیشانەی سەرەتاییانەیە. ڕاستەوخۆیی دەلالەت لە سادەیی و دواکەوتوویی دەکا، هەتا بەرەو ئەبستراکت و تەجریدیش بڕۆی، تەجرید نەک بەو مانایەی تۆ بۆ لای نادیار و وەهم بڕۆی، نەخێر بۆ لای شتی بەرز، بەڵام پردێ هەبێ پێیدا ڕۆیشتبی، نەک فڕیبی و بە مانایەکی ئایینی بە سواری بوراق، نەک وەک پێغەمبەر ، بۆ ئاسمان چووبی و نەک وەک حەزرەتی مەسیح باڵت گرتبێتەوە بۆ کن خوداوەند چووبی و نەک وەکو تەموز شەش مانگ زیندوو بی و شەش مانگ مردوو و نەک وەک ئیزیریس و ئەدۆنیس [1]. کە بە وەهم دروست کراون. ئەم جۆرە بیروبڕوایە بە مەنتیقی

---

[1] واژەی ئەدۆنیس بە بنەچەکە فینیقیانەیە، بە مانای "ئاغا"یە. دلداری ئافرۆدیت و خوداوەندی دار و درەخت و گیاوگۆڵە. زۆری کار لە مەسیحییەت کردووە. کوڕی میرایە. میرا کیژی ثنیاسی پاشای سووریایە. لە داخی ئافرۆدیت بڕیاری دا دەگەڵ بابی خۆیدا ناشایستانە و ناشەرعییانە و بە یارمەتیی هیبۆلیتی دایەنیەوە بە مرادی خۆی بگا. میرا دوازدە شەوی خشت دەگەڵە بابی شەویاخەڵیێ دەکا.

ئەفسانە نەبی قوبوول ناکری و بە مەنتیقی زانستی بەرهەست (نەک ئایین) بە وەهم دەزاندری.

لیرەوە ئەو جوانییەی کە هونەر دەیخولقینی، ئەو تابلۆیە، ئەو نووسینە، ئەو شیعر و سەما و مۆسیقایەم، هەر کامیان دەگری کە هونەر لە ئەنجامی ژیانی نیو کۆمەل دەیخولقینی بۆ پیناسە بکە و ئەمە بۆچی پیویستە؟

بەم پرسیارە دەکەومە نیو دنیای ئیستاتیکاوە. ئیستاتیکا واتە: زانستی یاسا و ریساگەلی بە ئیستاتیکانە تواندنەوەی دنیا لە لایەن مرۆڤەوە؛ یاسا و جەوهەری دەوری بە کۆمەل گوزەرانکردن و بەریوەچوون و گەشەکردنەکانی هونەر شیوەی تایبەتیی ئەم تواندنەوە(ئاسیمیلاسیۆن)یە. ئیستاتیکا لە نزیکەی ۲۵۰۰ سال لەمەوپیش لە بابلستان، میسر، هندستان و چین وماچینی کۆمەلی بەردەگی و کۆیلەتیدا لە داییک بوو. لە یۆنانستانی کۆن لە نووسینەکانی هیراکلیتۆس، دیمۆکریتۆس، سۆکراتیس، پلاتۆن، ئاریستۆتیلسدا و لە رۆمی کەونارا، لە نووسینەکانی لوکریتیۆس، هوراتیئۆس گەشەی پی درا. بیرمەندانی رینەسانس (ف. پیترارچ، ی. ب. ئالبیرتی، لیۆناردۆ دا ڤینچی، ئا. دوبرەر، ژ. برووتۆ، م. مۆنتایگنی و ئەوانی دیکە) لە رۆژاوا، لەو خەبات و تیکۆشانەدا جەرەیانە هومانیست و ریالیستانەکانیان دە بەرابەر ئەو دۆکتۆرینانەی "جوانی"ی

---

لە شەوی دوازدەهەمدا ئێتیاسی بابی بەو کارە ناشەرعییە دەزانی، دەست دەداتە کێریکی و دەکەویتە پەیجۆری میرای، بەلام میرا پەنا وەبەر خودایان دەبا، ئەوانیش ناکەنە نامەردی، دەیکەن بە درەختی میر. پاش دە مانگان، درەختی ئاپەن دەترەکی و ئەدۆنیسی لی دەزی. ئافرۆدیت زۆری بەزەیی پیدا دیتەوە ، پەرسفۆن رادەسپیری بە خیوی بکا، پەرسفۆن لەبەر وەی ئەدۆنیس زۆر جوان دەبی ، بە ئافرۆدیتی نادلتەوە و لەسەر ئەمە دەبی بە کیشەیان. پاشانەکی قازیی لە لایەن خوداوەندانەوە بۆ فەزاوەت دەنیردری، قازی بریاردەدا ئەدۆنیس سییەکی سالیکی لە کن ئافرۆدیت و سییەکی سالیکی لە کن پەرسفۆنی بەسەربەری و سییەکی دوایینی سال لە هەر کوییەکی بۆ خۆی حەزی لییە، لەویی بەسەربەری . بەلام ئەدۆنیس دووسییەکی سال لەکن ئافرۆدیت و سییەمیکی لەکن پەرسفۆن بەسەردەبرد. پاشان ئارتمیس لیی هەلگەرایەوە، بۆچی؟ نەزاندراوە و گرازی لی هان دا، ئەدۆنیس دە هەلپەی راوکردنیدا، زۆر بە سەختی بریندار بوو و مرد.

خودایی سەردەمی ناوینیان ئاگوستینۆس و تۆماس ئەکویناس گەشە پێ دا و تیئۆریسیەنەکانی سەرویەندی ڕێنەسانس هوگارت، دیدرۆ، وینکلمان و هتد..) و گۆتە و چیللەر کە لەسەر هەمان بیروبڕوابوون دڵنیان بەوەدا نا کە لە نێوان ژیانی واقیعی و هونەرە جوانەکاندا پێوەندی هەیە و هەوڵیان دا تخوویی بیروبڕوا ئێستاتیکییە ئەرستۆکراتییە کۆنەپەرستانەکان لەم ڕێگایەوە بیەزێنن. وێڕای وەی کە کانت و شێللینگ و هیگڵ (واتە: کلاسیکەکانی فەلسەفەی ئاڵمان لە ئاخروئۆخری سەتەی ١٨ و سەرەتای سەتەی ١٩ دا) لە هێندێ گیروگرفتی ئێستاتیکیان بە شێوەیەکی دیالێکتیکانە وەکۆڵی، دەڵێ ئەو تیۆرییانەی تەرحیان کردبوون لە بنەڕەتدا بە دووفاقی و لێک تاق و جووتی دەمانەوە، بەلام بێلینیسکی و هێرزن و دۆبرۆلیوبۆف دەرۆستی کۆمەڵی گیروگرفتی ئێستاتیکا هاتن .

جوانی بە چەمکێکی زانستانە، واتە: ئەتۆ بگەیە گەوهەری ڕاستین، زیاتر لە گەوهەر بگەی، بگەیە قوڵاییەکانی گەوهەر. ئەمەیە مانای جوانی؛ لەبەر ئەوە لایبنتس کە خۆی ئایدیالیستە تا ئاستێک ئەو، بابی هێندەمان یارمەتی دەدا کە وا بزانین ڕێگەی چەشکەکردنی جوانی مەرج نییە تەنها وەکو ماددییەک لێی بڕوانی بەڵکو دەتوانی وەکو ئایدیالیستێکیش لێی بڕوانی. بۆ نموونە: ئەو خاوەنی تیئۆریی (مۆنادۆ)یە مۆنادۆ واتە: هارمۆنیکای گەردوون کە پێی وایە هیچ شتێک لەو دنیایەدا ناشیرین نییە، هەمووی هاوئاهەنگی و هاوکێشی و دەست لە ملانێکی ئێستاتیکیی تێدایە. ئەوە بۆ خۆی نهێنییەکە لە نهێنییەکانی ئەویندارییی مرۆڤ بە هەموو شتێکی ئەو دنیایە، تەنانەت یەکیەتیی وجوود و فەلسەفەی مەولانا و ئەوانەش هەر دووبارە لەگەڵ ئەوەدا تێکەڵ دەبنەوە. بەلام جوانی، مەعنەوی یان ماددی، هەر دووبارە ڕەنگدانەوەی واقیعە، تەنها ئەوە نەبێ کە ڕەنگدانەوەکە بەو مەرجەی هاوجووت بێ، نەک من ئاژەڵێک تەسەوور بکەم کە دەستی بە جۆرێک بێ و قاچی بە جۆرێکی دی و سەریشی بە جۆرێکی دیکە، واتە: هەر یەک ئاژەڵ بێ، بەلام لە دوازدە ئاژەڵ دروس کرا بێ.. ئەمە بۆ باسی خەیاڵ، وەهم، بیر، مانادۆزکێ، زیرەکی، مەزەنە، بۆچوون، سۆزـ مان دەبا: زارلوەی

"خەیاڵ"[*] و "خەیاڵکردنەوە" کە کالریج دایهێناون، وا باوە کە وەك دوو زاراوەی لێکدی جوداواز تێیان دەگەین. ئەم دوو زاراوەیە کاتێ کە دە بابەتی ئەدەبیدا بەکاردەهێندرێن، مەبەست داهێنانکار(ابداع)ی یان داهێنانی ئەدەبییە. هێندێ ڕەخنەگر پێیان وایە لە چۆنیەتیی داهێنانی بەرهەمێك وەکۆڵین و تاوتووکردن، بۆ نرخاندن و هەڵسەنگاندن و ناسینی نرخە ئەدەبییەکانی وی، هیچ کۆمەگێکمان ناکا. بە زمانێکی فەلسەفییانە بڵێم: کە ڕوونکردنەوە و بەیانی "چۆن پێکهاتنی" بەرهەمێ، هیچ سەروکاری بە نرخاندن و نرخ لێنانەوە نییە، واتە: ئەتۆ کە باسی چۆن هاتنەگۆڕێی شیعرێکی دەکەی، ئەوە هیچ سەروکاری بەوەوە نییە کە ئەو شیعرە بایی چەندە یان چەند نییە ئەگەر لە نیگای دەروونناسییەوە لە بەرهەمێکی ئەدەبی دەنۆڕی، خۆ یەکێکی وەك ئەرەستوو ئەسڵەن بەلای دەروونناسیی داهێنانی ئەدەبییەوە هەر نەچووە و ئاوڕیشی لێ نەداوەتەوە، چونکە ئەرەستوو ئەدەبیاتی لە نیگای کەسێکەوە ڕەچاوکردووە کە پەروەردەی زانست و خولیای بنەڕەتی وی زانستەکانە؛ لەبەر هەندێ شاعیر و نووسیارانی کۆنی وەك هۆمەر و لەم جۆرە بابەتانە هونەریان بە جۆرێ لە ئوستوورەوە گرێ دەدا. شاعیر لە خوداوەندی هونەر سرووش وەردەگرێ. سەیر ئەوەیە، کە ئەم خوداوەندە سرووشبەخشە بۆ خۆی کیژی بیر هاتنەو(حافظة)یە. هاوسەری زیۆس نیوی Mnemosyneە و دایکی خوداوەندانی هەر نۆ هونەرەکانە. کەواتە: مرۆڤ هەر لە کۆنەوە لە نیگای ماددییەوەی ئۆڕیوەتە بەهرەی هونەری و پێی وابووە کە خەیاڵ بە لەبەر کردن (حافظة) گۆش دەکری و عەمباری بیرەوەرییەکانیەتی و بەو لەبەر کردن (حافظة)ەی، نەتەوە و هۆز و عەشرەت بەرجەستە دەکا و ئازایەتیی پەرجووئاساییانە و دەسکەوتەکان و خۆشی و ناخۆشییەکانی ڕابردووی نەتەوە لە دڵ و زەینی هاوسەردەماندا بە زیندوویی دەپارێزێ و پشتاوپشت تەحویلی بەرەکانی دوارۆژیان دەدا. بەلام پاش چەند سەتەیی، ئەفلاتوون سرووشی شاعیرانەی بە موقناتیس تەشبیە کرد و گوتی: هەروەك موقناتیس بە هێزێکی نادیتە ئاڵقەئاسن دەبەرابەر یەکدی رادەگری، هەروەها خوداوەندی

هونەریش شاعیران و گوێگرانیـان بە کێشمانێکی نهێنی پێکەوە جۆش دەدا. لەبەر هەندێ شیعر بەلای ئەفلاتوونەوە هونەر نییە، سنعەتێ نییە مرۆ بتوانێ فێری ببێ، بەڵکو کێشمانی خودایی (جذبة الهي)یە "شیعر بوونەوەرێکی لەتیف و باڵسووك و پیرۆزە، تا مەودایێ هاونشینیی سرووش نەکا، بە دڵاوێزیی داهێنان مەست نابێ. کاتێ سرووش دێ، لە کەمەندی مەست و ئەقڵ و هۆش ڕەها دەبێ و لە خود بێخود دەبێ.

بەڵام زەینی زانستانەی ئەرەستوو بەم جۆرە شرۆڤە و پێناسەکردنانە کە زێتر ئوستوورییانە و مێتافۆرا (ئیستیعاری)یانەن، دڵی ئاوناخواتەوە و پێی وایە کە ئەم دیاردەیە دەکرێ بە زارلوەگەلی خۆرسکانەتر و بەرچاوتر ڕوون کرێتەوە. لاسایی‌کردنەوە، نواندن (سەرلەنوێ دارشتنەوە)، وەگێڕان، لە پێکهاتەی تیرەی مرۆدا چێنیکی زگماك و خواسایی (فطري و غريزي)یە و ئەمەش لە ڕەفتار و کرداری منداڵاندا ئاشکرا بەدیاردەکەوێ. مرۆڤ لە سەرەتاوە هەموو چتێ بە لاسایی‌کردنەوە فێردەبێ و هەڵبەتە لەم لاسایی‌کردنەوەیە لەزەت وەردەگرێ. ئەرەستوو پێی وایە هونەری شیعر لەم لەزەت لە لاسایی‌کرندنەوە ورگرتنە، ئاودەخواتەوە و ڕوونی کردۆتەوە کە مرۆڤ چۆن لە کاتی هونەرکاری و لە کاری هونەری وردبوونەوە و بیرکردنەوە، لەزەت وەردەگرێ. دیارە ئەرەستوو هونەری بە باری ماددیدا شکاندۆتەوە و فەلسەفەی ئازار و لەزەتەکەی ئەپیکۆر هەر لەمەڕا سەری هەڵداوە. بە ڕاستی ئەرەستوو هەرچەندە هەنگاوێکی هەراوی بەرەو پێش هەڵێناوە، بەڵام لە دەروونناسیی داهێنانی شاعیرانە تا ڕادەیێ حاڵی بوونمان کەم فراژوو و کامڵ بووە. دەروونناسی تا سەتەی ١٧م گەشەی نەکرد. بە درێژاییی سەتەکانی ناوین باسی شیعر و شاعیر لە چارچێوەی مەنتیقدا قەتیس مابوو و گێنگڵەی خواردبوو، کەچی دەبوا لەم سەرووبەندەدا وەڵامی هێندێ پرسیار لەمەڕ چۆن هاتنەگۆڕێی شیعر دراباوە. وەلێ لە کاتێکدا کە بیروئەندێشەی سەتەکانی ناوین لە بارەی ئەم بابەتەوە دەسخەڕۆی کاریگەریی ئەرەستوو بوو، تەرزی بیرکردنەوەی سەردەمی ڕێنەسانس، ئەمیش بە دەست بیروئەندێشەی ئەفلاتوونەوە گیری خواردبوو، یان هەوڵی دەدا ئەرەستووگەری لە شێوەی بەمەسیحی بووی

ئەفلاتوونگەری مارەبەجاش بکا. پێناسەکردنی نامێی شێکسپیر بۆ خەیاڵکردنەوە لە *خەونی شەوی نیوەی ئاوساندا* کە شاعیری تێدا لەگەڵ شێت و ئاشقدا (گەلۆ ئەشق جۆرە شێتییەك نییە؟) حەشر و نەشر کردووە، لەگەڵ بۆچوونی ئەفلاتووندا جوداوازە:

شێت، ئاشق و شاعیر

هەموو لە خەیاڵەوە نزیکن

عەرەبی سەرویەندی جاهیلی پێغەمبەری ئیسلامیان جارێ بە شاعیر و کاوێ بە کاهین و تاوێ بە شێت نێودەهێنا... شاعیر و نووسیارانی سەردەمی ئەلیزابێت لە ڕامانەی ئەفلاتوون لەمەڕ شیعر بەولاترەوە چوون. چون پێیان وابوو کە مرۆڤ لە تووڵۆی شیعرەوەش دەکارێ پەی وە نۆژینەوەی ڕاستی بەرێ. دیارە ئەم ڕوانگەیە نوخشەی بەرهەمی جۆرە ئەفلاتوونگەریی مەسیحییانەی ئەوتۆیە کە خەیاڵکرنەوە بە چتێکی خودایی دەزانێ و پێناو و پردێکە بۆ لە دابڕان و ناوبڕ پەڕینەوە کە مرۆڤ لە نێوان ئاسمان و زەوین و بەهەشت و دنیای خۆڕسکدا تووشی هاتووە، هاتۆتەگۆڕێ. ئەمن پێم وایە حیکایەتی دروستکرانی باوە ئایەم و دایە حەووا و پاشان لەسەر ناگوێڕایەڵیی دایکە حەووا و بە قسەی وی فریوخواردنی باوە ئایەم لە بەهەشت وەدەرنرانیان، مانای لە خوداوەندی خانەنشین کردن و لە مەلەکووتی لاهووتی بۆ دنیای پەستی ناسووت دەرکرانیانە. بەڵام وێڕای وەش خودلوەند بە بەزەییە و تروکەیەکی بۆ پەژیوانبوونەوەیان هێشتۆتەوە (ولا تقنطوا من رحمة الله) و ئەگەر بە تەواوەتی لەو نافەرمانییەی کە لە بەهەشتێ کردیان بەشیمان ببنەوە و تۆبە و ئەستەغفار (عیبادەت)بکەن، یان وەك بوودا دەڵێ بە هەر حەوت شێوەکانی قۆناخەکەی عیرفان: *خواست، ئەوین، ناسین، بێ نیازی، تەوحید، سەرسوڕمان و نەمان ـ دا* تێپەڕن، هەنگێ لەولەیە خوداوەند لە بەرزەخ، نێوان ئاسمان و زەوین و بەهەشت و دنیای خۆڕسکەیان بەرەو سەروو هەڵکشێنێ (هەر بۆیەش مرۆڤ پێی وایە بە خوداپەرستی لە خودا نزیك دەبێتەوە، دەگەڵ خودادا، کە بە ئەسڵ بەشێ لەوی بووە، تێکەڵ دەبێتەوە... سیدنیی شاعیریش شیعر بە لاسایی‌کرنەوە لە قەڵەم دەدا و

ئامانجی لەزەت بەخشینە. تـامس هۆبـز تـەواوی ناسین و فێربوونی مرۆڤـی لـە چـاو ئەزموونی هەستەکی دەزانێ و بە دیاردەیەکی مادییانەی لـە قەڵەم دەدا. خولاسەی قسە مەسەلەی هونەر تا ئێستاش لە نێوان بیروبڕوای ماتریالیستانەی نادیالێکتیکانە و ئایدیالیستانەدا ئەمسەر و ئەوسەری پـێ دەکرێ و هەمووشـی لـە نیگـای بـەرژەوەندی چینەکیی مرۆڤ ناو دەخواتەوە.. .

خەیاڵ مانای ئەوە نییە کە چتێکی لە هیچە دروست بکا، بەڵکو هەرچییەکی دەیکا و ئێمە نێوی داهێنانی لێ دەنێین لە چارچێوەی واقیعی مادی بەدەر نییـە. جوانـی یـان دزێوی، دووبارە لـە پێداویستییەکانی مـرۆڤ دووردناکەوێتـەوە، بـەڵام پێداویستییەکە ئەوەندە مشتوماڵ کراوە، ئەوەندە تەجریدکراوە، ئـەوەندە شـەفاف کـراوە وەکـو چـی لێهاتووە، وەکو ئەوەی لێـهاتووە تـۆ گڵۆپێکی کـە پـاك بـە سـابوون دەیشـۆی، نـابێ دەستی لێ بدەی، چونکە بەڵێی پەنجەت دەگرێ، ئـەو پـیرۆزە (تـابوو)ی کـە بـۆ خـۆت دروست کردووە، هەر بـۆ خـۆت لـە خۆتـی قەدەغـە دەکەی، بە جۆرێکـی دیکـەی لـە مێشکتدا دەڕەنگێنێ.بۆچی؟ ئەمەش دووبارە هـەر ئەوەیـە شـتی ڕەهـا کـە دەبێتـە ڕێژەیی تۆ مێشکت هەر لەگەڵ ڕەهادا خەریکە، وەکو باسم کرد هەندێك شت هەر مـاوە کـە حـەز دەکـەی بـیزانی. حەقیقـەت لـەنێو زگـی سروشـت و گـەردووندا هەمیشـە موعەممایەکی گەورەیە، یان بۆ خـۆت وا دەکـەی کـە هـەموو چتـێ دڵنەخزێنیـە ئاسـتی هەڵدێری ئارگۆ (ابتذال) کە ئەمەش هەر لە نیگای چینایەتی ئاودەخواتەوە.. حەز لەوە دەکەی هەمیشە شتێکی وەشارتی لەنێو کەونداء بمێنێتەوە و نابێ من و تـۆ بـیزانین و دەبێ هەمیشـە عـەودالی بین. دیـارە ئـەم قسـەیەی مـن لـە ئاڵهایـەکی میستسـکییەوە هـەڵدەقوڵێ و ئـەمن بـۆ خۆشم کە لافی ماتریالیستانە لێ دەدەم نـازانم بۆچـی بـەو جۆرەم؟! ڕەنگـە ئـەم چەواشـەییە لـە کـەم ئاگاییمـەوە چەکـەری کردبـێ، هـەر بۆیـە عیمادەدینی نەسیمی دەڵێ:

Mende sıgar Iki cahan
Men bu cahana sıgmazam
Gevher i lamekan menem
Kevn mekane sıgmazam.

هەرتوو جیهان لە مندانە

جێم لە هەرتکاندا نابێتەوە

منم گەوهەری بێ جێگا

بوون و جێگا، جێگەی من نین

تۆ بزانە ئەو ئینسانە چی لێهاتووە؟

یان وەك خەییام دەڵێ:

یکچند بە کودکی بە استاد شدیم

یکچند ز استادی خود شاد شدیم

پایان سخن شنو مارا چە رسید

از خاك برآمدیم و برباد شدیم

بە کوردی ڕۆحی مانایەکەی ئەمەیە:

"لە هەرەتی لاوێتیدا هاتوچووی ماحۆستایانم دەکرد و لە هەریەکەم گوێ لە بەڵگەی پاساوی بیروبڕوای خۆی دەگرت، بەڵام لەو دەرکەی کە لێوەی وەژووردەکەوتم، هەر لەوێڕا وەدەگەڕام"

دڵەخورتێی مرۆڤ ئەو جەوهەرەیە کە هەر لەناو خۆیدا بانزینی بەردەوامی و سووتەنیی نەبڕانەوە دروست دەکا کە لە دوایی نەهاتنی گەردوون و هەتاهەتایی ئاودەخواتەوە.. ڕەنگە پێت وابێ شیعر دەڵێم، بەڵێ ڕەنگە وابێ؛ کە دەڵێم شیعر، واتە: لایەنێکی توانستی دیکەی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی ڕاستی... ئەمن سوود لە ئەقڵیش و دڵیشم بۆ وەسەر ڕێگای ڕاستیی ڕێژەکی کەوتن، وەردەگرم، سەری ڕێز بۆخاوەنی یەکەم پرسیاری مێژووییەنەی "پیلات"ی جێگری ئیمپراتۆری ڕۆم کە نیچە بە تەنها ڕوخسارێکی شایانی ڕێزلێگرتنی لە سەرتاسەری تەوراتدا لەقەڵەم داوە، دادەنەوێنم.. بەڕاستی توانجی نەجیبانەی ئەم ڕۆمییە کە واژەی "ڕاستی"ی لە پێش ئیمپراتۆردا کە بە چاوێکی زۆر خوار و کەمەوەی دەتۆڕدرایێ، بە ڕستەی پڕبەهای "ڕاستی چییە؟"

**تەوراتی لە پووچی ڕزگار و دەوڵەند و خەنی کرد. لە مەولانای ڕۆمیش کە سەرچاوەی هەموو ئازارەکانی دڵ و مێشکی مرۆڤی لە لێکدی دابڕان و پەرتەوازەییدا دەسنیشان کردووە، دەرزی خۆشمەزە وەردەگرم، لە جۆن لۆك، هۆبز و مێل تا ڕادەیەکی زۆر ڕێز لە هەستوخوست و ئەزموونی ماددی کە یەکەم کوناباچکەی زانست و ئاگاییە دەسخۆشی دەکەم [1]، هەروەها هیگلیش و مارکسیش و ئنگلسیش بە کێلەڕێی ئاشکرای هەزارڕیانی دنیای نەزانستانی خۆم دەزانم···· "وانك جِرمٌ صغير و فيك انطوى العالم الأكبر"**

**مەبەستم لە هونەرمەند چەمکە سادەکەی ئەمڕۆی نییە، هونەرمەند بەو تێڕوانینە فەلسەفییە بەرفراوانە، لەوانەیە ئانیشتاین بێ، نیوتن بێ، ئەدیسۆن بێ.**

**هونەرمەند، فەیلەسوفیشە، زاناشە و هونەرمەندیشە، واتە: عەقڵیشی هەیە، خەیاڵیش بەکاردەهێنێ، هەروەها توانایی دۆزینەوەی (تەشابوهات)ی شتیش بەکاردەهێنێ و (تفارقات)یش بەکاردەهێنێ. زاناشە و فەیلەسوفیشە و هونەرمەندیشە واتە: لەسەر سێ شەپۆل کار دەکا، خەیاڵ و بیر و ئیدراکی عەمەلیی قانوونەکانی سروشتیش. لەبەر ئەوە وێنەکێشێ کە دێ تابلۆیێ وێنە دەکێشێ بەڵێ سەر و فەسالێکت بۆ وێنە دەکێشێ، ڕەنگە من و تۆ تابلۆیەکانی ئیسماعیل خەیات (وەك خۆی بۆی وەگێڕام) کە دەچێتە بن دار و نێو کون و کەلێنی دار و درەختەوە و وێنەکانی لەوێدا دەکێشێ، نەزانم چدەکا، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە بە قسەی زانستی ئەندازە ناکا، بەرزایی و درێژایی و پانایی و شێوەی ئەندازەییان تێدانییە، بە**

---

[1] ئەم سێ فەیلەسووفانە دەیانگۆ: "کە ئەگەر ئەقڵ بوێرێ لە پشت بەرهەستەکانەوە سۆسەی ڕاستی بکا و لیی بگەڕێ، ئەوە کارێکی بێهوودە دەکا. بەڵام کانت گوتی: کە ڕیازییات دەخلی بە هەستەکانەوە نییە و لە پێش تەجرەبە و تاقیکردنەوەدا ئەوانە ڕستین، جەزری ژمارەی پێنج بیست و پێنجە و لەم حوکمەدا هیچ پێویستییەك بە تەستیقکردنی هەستەکان نییە، مێل لە وەلامدا گوتی: وا نییە، ئەگەر دوو جار دوو دەکا چار، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە تەجرەبەی بەردەوامی ئێمە و جۆری مرۆڤ کە پشتاوپشت بۆیان ماوەتەوە، ئەمە پشت ڕاست دەکەنەوە.

پێچەوانەوە دەكرێ هەموویان لەو تابلۆیانەدا بدۆزیتەوە بەڵام گرنگ ئەوەیە كلیلەكـەیت بداتێ، بزانی ئەوە چوار گۆشەیە، پێنج گۆشەیە یان شێوە ئەندازەییـەكانی چین، یـان بۆ نموونە رەنگێكت دەداتێ بەڵام مانای ئەوە نییە هەر یەك رەنگ هەیە لە دنیادا. ئـەو دەتوانێ تێت بگەیەنێ، بڵێ ئەو رەنگەی من مانای ئەوەیـە یـان ئـەوە نییـە، مـن یـەك رەنگم دڵویتێ من لەسەر یەك شەپۆڵ دەڕۆم، خـۆی رەنـگ چییـە؟ كۆمەڵـە شـەپۆڵێكە خۆت دەزانی. ئەوە مانای وایە دەیەوێ لەگەڵ عەقڵیش و لەگەڵ ئیدراكـی قانوونـەكانی رەهەندەكانی مادیی سروشتیش و لەگەڵ خەیاڵیش رەفتار بكا؛ لەبـەر ئـەوە تـارژەنێ كە لە: "دۆ"وە. بۆ. "دۆ"، لە "بەم"ەوە بـۆ "زیـر" دێتـە خـوار، ئـەوە بـە هـەزاران شەپۆل، بە هەزاران بەرزبوونـەوە و نزمبوونـەوەی دەنگـە كـە پێـی وایـە هـەر یـەكێكی كۆمەڵە هەست و سۆزێكی لەگەڵە. بۆ نموونـە (بیمـۆل) زیـاتر وەك گریـان دەچـێ، نیـو بیمۆل چتێكی دیكە دەبەخشێ. یان ئیبن سینا، وەك خوێندوومەوە و ئەگەر ڕاست بێ، كە قانوونی دەژەند هەندێ جار خەڵكی دەگریاند و هەندێ جاریش خەڵكی شاد دەكرد. واتە: چەمكی دڵتەنگی یـان دڵشادی،. یـان وەكـو یۆنانییەكان كـە شـانۆگەرییەكانیان پێشكێش دەكرد شانۆی كۆمیدی و تراژیدییان هـەبوو.. كـەوابوو مـرۆڤ ئارەزووەكـانی خۆی دەردەبڕێ . كەواتـە هونـەر سـێ چتـە، هونەرمـەندان سـێ چـتن بـەڵام لـە یـەك خاڵدان "هەبوو"ت لە سێ ڕێگاوە لە یەك خاڵدا بـۆ خەسـت دەكاتـەوە كـە "تایبەتـە"، نەك گشت. هونەرمـەند هەمیشـە عـەودالی دوای تایبەتمەندێتییـە، بـە دوای جوزئییـەتی كەونەوەیە نەك عموومییەت و كوللییـەتی گـەردوون. دێ زەردەخەنەیـەك وەسـەر لێـوی مۆنـالیزا دێخـی كـە تـەواوی دنیـای لـە گێـژاوی حـەیرەت و سەرسـوڕماندا حـۆل و گێـژ كردووە. یان بۆچی ڤان كۆخ هەمیشە عەودالی ڕەنگی زەردبووە؟ چییە ئـاگرە، خـۆرە ئـەوەی ئـەو كابرایـە چتێكـی لـە خـۆڕا نییـە، ئـەوە زانـاش بـوو، فەیلەسـوفیش بـوو، هونەرمەندیش بوو.

چەندی لەو داهێنانەی تاكی هونەرمەند دەگێڕیتەوە بۆ پێكهاتەی تایبەتمەندییەكانی ئەو لە ڕووی فسیۆلۆجی و لە ڕووی سایكۆلۆژییەوە، چەندیشی دەگێڕیتەوە بۆ واقیـع و

کۆمەڵگا؟

من گوتم تاك بۆ خۆی چتێکە کە ڕۆڵێکی گەورەی هەیە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە ئەو خودە بۆ خۆی چت بشێوێنێت. وەهم و خەیاڵ هەندێ جار دەگاتە شێتایەتی، دەگاتە پلەی بێ بەندیواری (لامنتمی) و پشت بەندیواری (ما بعد اللامنتمی) ئەمن بڕوام بە ئاگایی (وعی) هەیە، دەگەڵ پشت ئاگاییدا ناتوانم ڕەفتار بکەم.

مانایەك بۆ ئەو قۆناغەی ئێستا باسم کرد دادەنێم؟ ئایا مانایەکی هەیە؟ ئەگەر مانای نییە مرۆڤ بۆ تووشی دەبێ؟

من پێم وایە مانایەکی هەیە و زۆر سروشتیشە، بەڵام گرنگ ئەوەیە هۆشیاری ئەو کەسە بۆ خۆی یان هۆشیاری کۆمەڵگا گەیشتبێتە ئاستێك نەکەون بە وەهمێکی دیکەدا کە لەوە تێ نەگەن. واتە: بۆ نموونە بە شێتی نەزانن

ئەمە بۆ خۆی هەر لە بیروبڕوای بەرزەخیگەریی ,neutral monists, neutralists و demonی دیۆجین ـ ەوە ئاودەخواتەوە. خۆلاسە، لە بیروئەندیشەی "نە ماددە و نە ڕۆح"ەوە دەڵێوەتە نێو بیروبۆچوونەکانی مرۆوە.... جۆن ستیوارت میل ڕەهەندی ماوین بە هیچ دەزانێ، واتە: "خیر الأمور أوسطها" و "جەمسەری هاوتایی" بە چتێکی وەهمی، ڕەفتەنی دەزانێ.

پەیامی هونەر لە چیدا دەبینرێ؟

پەیامی هونەر پێم وایە ئەگەر تۆ نەت لە کۆمەڵ کرد و نەت لە ژیان کرد و نەت لە خەبات و نواڕۆژ و نەت لە حەقیقەتت کرد و نەت لەوەی کە هەمووی بۆتە بەها "قیمة"و پیرۆزییەکانی کۆمەڵگا ئەمڕۆ، تۆ کە نەت لە هەموو ئەوانەت کرد، ئیدی حەتمەن دەبێتە شتێکی هیچ و پووچ، بەڵام مادام هونەر لە چوارچێوەی ئەوانەدا دەخولێتەوە، مادام لە گردلوی واق واقدا نەچەقیوە و چتێکە هەیە، حەتمەن پێم وایە هونەر لەو قۆناغەدا بۆ خۆی چتە. من کە دەچمە پێشانگای هونەرمەندێك، دەبێ بۆ خۆم هۆشیارییەکی وەهام هەبێ چتێکی لێ حاڵی بم، واتە: ئاگاییی دەسەجەمعیم هەبێ......

باشه، چۆن هونەر بەشێکی جیانەکراوەی مرۆڤە. مرۆڤ ناتوانێ بێ هونەر هەبێ، باسی ئەوەم کرد کە چۆن هونەر لەنێوان کەسێك و کەسێکی تردا لە داهێنانی هونەریدا دەبێتە دوو بەرەوە، باسی سەرچاوەی داهێنانم کرد، باسی (دڵەڕاوکێ) م کرد. باسی ئەوەم کرد کە مرۆڤ لە دڵەڕاوکێ قوتاری نابێ و هەر دەمێنێ.

ئێمە قسەکانمان لە سەرەتاوە بەپێی قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤ دەست پێکرد. لە پێشدا ئەو ڕاڤە و شیکردنەوانەی کردمان زۆربەی لەلایەنە فەلسەفییەکەوەی پێوەندیی بە ڕۆژگاری سیحر و جادووەوە هەیە کە دەکاتە چەرخی بەردی کۆن یان باستان، واتە: سەرەتای گەشەی مرۆڤ کە فەرهەنگەکەی و ڕۆشنبیرییەکەی سیحر و جادووە، ئابوورییەکەشی هەر ڕاوی ئاژەڵ و شتی وایە.

بێگومان لەو قۆناغەدا نە نیشتەجێ بوون هەیە، نە هێورین. کۆمەڵ هەموو چتێکە و دابەشکردنی کار نییە. چتەکان ڕاستەوخۆن و مرۆڤ هەموو چتێك بە چاو دەبینێ. کە وێنەی ئاژەڵێك دەکێشێ و زیاتر خەریکی (جزئیات)ە. واتە: لە قۆناغی تەجسیددایە و چتەکان تەنها بە چاو دەبینێ. بەڵام پاشان دێتە قۆناغێکی دیکە کە پێی دەڵێن قۆناغی چاخی بەردینی نوێ کە مرۆڤ فێری کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێو کردن دەبێ. لێرەدا کۆمەڵێك گەشەکردن ڕوودەدا کە لە پێش هەموو چتێکدا من دەبێ ئەوە ڕوون بکەمەوە کە لێرەدا چی ڕووی دا؟ لە ڕووی فەلسەفییەوە، ئەوەی ڕووی دا، لە ڕاستیدا مرۆڤ پێش جادوو و چاخی بەردینە کۆنەکە، چتێکی دیکە هەبووە.. خۆ لە خۆڕا و لە ئاسمان نەهاتۆتە خوارەوە، ئەو ئەزموونەی وێنەکێشانە پێش سەردەمی جادووش هەبووە، چتەکان هەموو لە قۆناغی ڕێکەوت و بێ نەزمی و بێ (سبق التصميم)و بێ ئەوەی فیکری لێ کرابێتەوە، هەمووی چۆتە حاڵەتی ڕێکەوت و لەخۆوە ڕوودانەوە، ئینجا من دەبێ ئەوەت بۆ باس بکەم ڕێکەوت و زەرووڕەت مانای چییە. سێ کەتەگۆری هەن: زەرووڕەت (ناچاری) ، ئازادی، ڕێکەوت.

ناچاری مانای چییە و ڕێکەوت مانای چییە، ئایا هەردوکیان یەك چتن یان هەر یەکەیان چتێکە و دژی یەکن، یان هەردوکیان لەنێو یەکیدان؟ واتە: ئایا هەموو چتێك

لەو دنیایەدا لە ژێر یاسای جەبرییەت و قەدەرییەتدایە و تۆ هیچ دەسەڵاتێکت نییە و هەموو چتێك موقەددەرە و دەبێ روو بدا، یان هەندێك چت هەیە هیچ هۆیەکی نییە و ڕووش دەدا و پێی دەگوترێت ڕێکەوت یان قەدەر. زاناکان دەڵێن ڕێکەوتیش هەیە و زەروورەت و جەبرییەتیش هەیە، حەتمیەتیش هەیە، بۆ نموونە: بڵێین ئەوەی کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (إعصار) زریانی دەریا، کە هەڵدەکا ئەوە بۆ خۆی هۆکاری زانستیی هەیە، بەڵام هۆکارەکە لە نێو خۆیدایە لە نێوجەرگەی جەوهەری خۆیدایە. ئەوە کە ڕوودەدا، زانست پێی سەلماندووین کە هۆکارەکەی چییە. بەڵام ئەوە دەبێتە هۆی وێرانکارییەکی یەکجار زۆر و شاران وێران دەکا، ئەوەیان ڕێکەوتە. ئەو وێرانکارییەی لێی دەکەوێتەوە پێوەندیی بە جەوهەری ناوەکیی پەیدا بوونی زریانەکەوە نییە. لێرەدا کە ئەوەی ئەو وێرانکارییە دێنێتەگۆڕێ، ڕێکەوتی پێ دەگوترێ. ڕەنگە ئەگەر ڕووی بدایە یان نەدایە، مەرج نییە ئەسڵەن هەر ببێ، بەڵام زەروورەتەکە مەرجی بنچینەییە؛ چونکە هۆکارەکەی دیارە دەبێ ببێ. مادام زەوی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، دەبێ شەو و ڕۆژ ڕوو بدا. مادام زەوی بە دەوری خۆریشدا دەسووڕێتەوە دەبێ چوار وەرزەکە پەیدا ببن. ئەوە یاسای زەروورەتە، بەڵام جاری وا هەیە ساڵێ باران دەبارێ، یان نابارێ، ئەمەیان دەکەوێتە خانەی ڕێکەوتەوە؛ کەواتە ڕێکەوتیش یاسای خۆی هەیە و زەروورەتیش یاسای خۆی هەیە. زەروورەت قانونییەتەکەی لەوەدایە کە هۆکارەکەی لە جەوهەری سروشتی خۆیدایە. نموونەیەکی دیکە دەهێنمەوە، داری مانگۆیە ئەوە تەنها لەناوچە گەرمەکاندا دەڕوێ، یاسایەکەی دۆزراوەتەوە، بەڵام ئەو دارە یەکێکیان دە هەزار گەڵای پێوەیە، یان گەڵاکەی لەوی دیکەیان جیاوازە، ئەو شەش پەڕە و ئەو دە پەڕە، یان ئەوی دیکەیان بەرزە و ئەمیان نزمە و ئەوەندەی باران بەسەردا دەبارێ، ئەوە هەمووی دەکەوێتە خانەی ڕێکەوتەوە و ناکەوێتە خانەی زەروورەتەوە. هەروەها نموونەیەکی دیکە: ئەو ڕێکەوتە، یاسایەکەی چییە؟ ئەویان هۆیەکەی ناوەکییە، ئەمیان یاسایەکەی باوی ئامارگرییە باوی ئامارگری مانای چییە؟ زانست پێیسەلماندووین کە تۆ ئەگەر هات و ٥٠٠ جار پارچە دراوێکت

هەڵدا بە ئاسماندا ئەمە ساغ بۆتەوە کە (٢٥٠)ی بەلای شێرەکەدا دەکەوێت و (٢٥٠)ی بەلای خەتەکەدا بە ملیۆن جار ئەوە تاقیکراوەتەوە. ئەمە چییە؟ ئەمە یاسایەکی باو (تقلیدی)ی ئامارگریی تێدایە. ئــەوە لێرەدا هۆکارەکە داخڵی جەوهەری خۆی نییــە، بەڵکو دەرەکییــە؛ چونکــە مــن هــەڵی دەدەم، هۆکارەکــە منــم.. چتێکــی دیکــە، ڕەنگــە ئەگەر فاکتەرێکی دەرەکی دیکە خۆی لەوە هەڵبقورتێنێ، ئەنجامەکەی جۆرێکــی دیکــە بــێ. مەبەســتم ئــەوە بــوو کـــەوا ڕێکـــەوت هەیـــە و زەروورەت هەیـــە و ئـــەوەش جیاوازییەکەیانە. ئینجا هەندێك چت لە سیاسەتدا ڕوودەدا: تــۆ دەبینــی لــە ڕێکخــراوی سیاسیدا، لە بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکاندا هەندێکیان بەر ڕێکەوت دەکەون و هــەندێکی دیکەیان بەر زەروورەت. زۆربەی ڕێکەوتەکان وا بەدەردەکەوێ کــە لەگــەڵ زەروورەت و ڕێکەوتدا تێکەڵ دەکرێن و وا دەزانرێ کە ئەوە حەتمەن دەبــێ ڕوویــدا، کەچی دەبینــی مــەرج نییــە وابــێ؛ بۆیە لێمــان تێك دەچــێ و دەکەوینــە هەڵـــەی زۆر گــەورەوە.. لــە مەسەلەی ستراتیژییەت و تــاکتیکدا، داخــوا ئێمە ســەختگری دەکــەین، یــان شــــلگری دەکەین؟ ئەوە بە نیسبەت ڕێکەوت و زەرووڕەتەوە، ئینجا زەروورەت و ئازادی هەیە.

کە زەروورەت بەرامبەر بە ئازادی ڕادەگرین، ئەوە مانای ئەوە نییە کە زەروورەت کۆش لە ئازادی دەکا، یان ئازادی ڕێگە لە زەروورەت دەگرێ. ئازادی ئەوە نییە کە تــۆ هــەر چتێکت بوێ بە ئارەزووی خۆتی بکــەی، نــەخێر ئــازادی ئەوەیە تــۆ بێــی، یاسـایەکانی وجوود، یاسایەکانی خۆڕســك بدۆزییــەوە. کــە دۆزیتــەوە ئــیرادەی خۆتــی بەســەردا زاڵ دەکەی، بەو ڕێگایەدای دەبەی کە ئەوت بیێ بە خزمەتکار، بۆ نموونە: یاسای کێشــمان (جاذبیة)، ئێمە پێش ئەوەی بزانین یاسای کێشــمان هەیــە، هیــچ کارێکمــان لەگــەڵ پــێ نەدەکرا؛ لەبەر ئەوە جۆرەها هەوڵ و تاقیکردنەوە، کە دەکــرا بــۆ ئــەوەی بفڕین، هیــچ ئەنجامێکی نەبوو، تا یاسایەکەی دۆزرایەوە، ئیدی مرۆڤ زۆر بە ئاسانی توانــی ســواری ئەو یاسایە بیێ، نەك هەر لە مەداری هەوا و بەرگە هەوای زەویدا بەڵکو مرۆڤ توانی لــە یەك تروکەدا هەشت کیلۆمەتر بە موشــەکێك تــۆ بگەیەنێتــە ئاسمــان کــە لــە کێشــمانی زەوی ڕزگاری بــوو، ئینجــا هــێزی کێشــمانی مــانگ ڕایکێشــا و ئــەوەبوو لــە ســەر مــانگ

نیشتیەوە. تۆ لە زەویدا یاسای کێشکردنت هەیە لە مانگیشدا هەروەها، یاسای کێشکردنی زەوی چۆن کەشف کرا؟ گوتت ئەگەر تەنێکم بە جوولەی لە یەك چرکەدا هەشت کیلۆمەتر بەو خێراییە بڕوات مانای وایە دەتوانم لە هێزی کێشکردنی ئەو زەوییەی تێپەڕێنم. کە تێپەڕی ئینجا ئەستێرەیەکی دیکەی نزیك کە هێزی کێشکردنی هەیە دەتوانیّ رایبکێشیّ. ئینجا کەشفی ئەم زانستەیە کە بە هۆیەوە ئازادیمان دەست کەوت. ئازادی بەدیهێنانی زەرورەتێکە کە تۆ پێویستیت پێیەتی. کەوابوو ئازادی زۆر جار دەگاتە بەردەم دەرگای زەرورەت و لە دەرگای دەدات. بەڵام مەرجیش نییە تۆ بتوانی هەموو یاسایەکانی سروشت بزانی، ئەوەی کەوا کەشفی ناکەی و نایزانی هەر بە زەرورەتی کوێرانە دەمێنێتەوە و هیچی لەگەڵ ناکریّ. بۆ نموونە: کەشوهەوا و مەسەلەی باران بارین و گەرما و ئەم شتانە هێشتا ئێمە کۆنترۆڵمان نەکردووە، بەڵام توانیومانە چ وەکو ڕێکەوت و چ وەکو زەرورەت لە ئەنجامە وێرانکارییەکانی کەم بکەینەوە و بەلای کەمەوە بتوانین تا ڕادەیەك خۆمانی لیّ بپارێزین. بۆ نموونە: هەورەبروسکە کە ئێمە یاساکەیمان کەشف کردووە، ئەگەر چتێکی کانزای نووك تیژمان لەسەر سەریان دانا ئەو چتە بروسکەکە پەرت دەکاتەوە و بارگەی خاڵی دەکاتەوە. ئەوە مانای ئەوەیە کە ئێمە لە کاتێکدا کە ناتوانین کەشفی یاسایەکانی زەرورەت و تەنانەت ڕێکەوتیش بکەین، بەڵام بایی ئەوەندە، ئازادی خۆمان دەسەبەر دەکەین کە خۆمانی پێ بپارێزین، مەبەستم ئەوەیە ئێمە چونکە دێینە ناو ئەو بابەتەوە لە مەسەلەی هونەردا ناچارین ئەو دوو چتە بزانین، چونکە دەبێتە بنچینەیەك بۆ زۆر تەفسیری دیکە.

من دەمەویّ بێیتە سەر بواری ئەمەی کە باسم کرد: ئەمە تێڕوانینی فەلسەفی بوو بۆ مەسەلەی زەرورەت و ئازادی، جەبر و ئیختیار. ئەگەر ئەمە نەزانین ناتوانین باسی چتەکانی دیکە بکەین.

ئێستا ئێمە باسیّ لەوە دەکەین کە ئەم زەرورەت و ئازادییە لە بواری کۆمەڵایەتیدا کە کێشەیەکی یەکجار گەورەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە و گرێیەکی گەورەی خودی

مرۆڤە و تاکو ئێستا بە تەواوەتی خاوەنکردۆتەوە.... ڕاستە هەنگاوی بۆ هاوێشتووە بەڵام بە تەواوی نەڕواندۆتەوە. ئازادی لای مرۆڤ چ شوێنێك لە پێکهاتنی مرۆڤدا داگیر دەکات؟ هەروەك چۆن باست کرد کە هونەر بریتییە لەو کۆششتە جوانکارییەی کەوا هەمیشە مرۆڤ بە سروشتی مردوو یان زیندووی دەبەخشێ تاوەکو بە تایبەتی هەست بە جوانی بکا.

بەڕاستی ئازادی یەکێکە لەو چتە زەرووریيانەی کەوا مرۆڤ دەبێ هەیبێ. ئەگەر نەیبێ چی دەقەومێ؟ لە مێژوودا کە نەیبووە یان بە ڕێژەیەکی کەم هەیبووە دەرئەنجامەکانی چۆن بووە؟.

بێگومان ئێمە چەند چتێك هەیە کە ئەگەر ئەوانە بزانین ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.. خۆت دەزانی مرۆڤ سەرەتای هونەری لە چییەوە دەست پێ کرد. سەرەتای هونەری لەوەوە دەستی پێ کرد کە مرۆڤ بە تاقیکردنەوە مێشکی هێواش ـ هێواش فێری ئەوە بوو کە جیاوازی لە نێوان (ئەسڵ و بەدەل) بکا. بۆ نموونە: ئاژەڵێکی بینیوە، عەقڵی دەرکی بەوەکردووە کە ئەوە ئاژەڵێکە دەسووڕێتەوە و جووڵە و دەنگی هەیە، بەڵام ئەوەش بە ڕێکەوت بوو، نەك بە یاسای زەرورەت؛ بۆیە دەڵێم ئەو قانوونانەمان پێویستە کە هەمیشە بەکاری بهێنین. لێرەدا مرۆڤ بە ڕێکەوت ئەوەی تاقیکردەوە کەوا دەتوانێ ئەوە بەخەتکێشان وێنە بکێشێ. بە ڕێکەوت مرۆڤ لە ڕێگەی تەشبیهەوە هاتۆتە نێو ئەدەبیاتەوە، نێو هەموو هونەرەکانەوە.. لاساییکردنەوە، تەواوی دنیای سیحر و جادوو لەسەر ئەو تەشبیە (قیاس)ە بۆ ڕانراوە. سەرەتای هونەر لێرەوە دەست پێ دەکا، تۆ ئیدراکی ئەوە بکەی نوسخەی بەدەڵ بدۆزییەوە بۆ ئەوەی کە دەیبینی. ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە، ئەمە گەورەترین کاری لە ڕێڕەوی هەموو گەشەکردنێکی مرۆڤ کرد.

ـ دۆزینەوەی نوسخەی بەدەڵ؟!

ـ بەڵێ، ئینجا ئەوە بە دەنگ دەیکا، بە جووڵە و سەما دەیکا، بە وێنەکێشان و پەیکەر دروست کردن دەیکا، هەزار و یەك پێناوی هەیە بۆ لاسایی کردنەوە و بۆ

دۆزینەوەی نوسخەی بەدەلْ. لێرەدا ئایا یەکەمین جاری نوسخەی بەدەڵی بە مەنزووری جوانکاری و ڕازاندنەوە بووە، یان بە مەبەستی پێویستیەکی ڕۆژانەی ژیانی بووە؟ لە سەرەتادا هیچ جۆرە ڕازاندنەوەیەك، هیچ جۆرە هەست بە جوانکاری کردنێك لە ئارادا نییە. بۆچی؟ بە بەڵگەی ئەوەی زانایەکان چەندین پاشماوەی هونەرییان وەکو پەیکەر، وەکو وێنە و چتی سەیر لەنێو ئەشکەوت و شوێنە دێرینەکاندا دۆزیونەوە کە هەرگیز ناگونجێ شوێنی پێشانگا و نمایشگا بوبێ و بۆ ئەوە دانرابن خەڵك لە بینینیان چێژ وەربگرێ، نەخێر تەنها بەو نیازەوە بووە کە ئەوە سیحر و جادووە و بە بڕوای خۆی دەتوانێ شتێکی پێ بە شتێ بکا و بەس و پێداویستییەکی ژیەکیی پێ دابین بکا، کار لە هێزە سروشتییەکان بکا، واتە: ئامانجەکە ئامانجێکی سیحری بووە. ئامانجی سیحری مانای بەجێهێنانی ئامانجێکی ماددی و پێویستی ڕۆژانە بووە و بەس. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە هونەر لە سەرەتاوە هیچ ئێستاتیکا و چێژی ئێستاتیکی و هەستی ئێستاتیکی لەگەڵدا نەبووە، بەلام ئەوە وردە ـ وردە ڕۆژگارێك گەشە دەکا، دەبینی نوێژ، سەمای هیندییەکان، ئەوانەی چۆلگەڕان دوو چتن و تێکەڵ بە یەکدی بوورگن. جووڵەی تەقلیدیی و جووڵەی سیمبوڵی، یان جۆرە جووڵەیەك کە با لێرەدا ناوی بنێین جووڵەی هونەری. جووڵە تەقلیدییەکان هیچ پێیوەندییەکی بە چێژی ئێستاتیکی و زەوقی ئێستاتیکییەوە نییە، بەڵکو تەنها لە دەورووبەری (عیبادەت و تەقدیس و تەمجید)ی بنەکەیە. خودایەك هەیە، هێزێك هەیە کە کاری بۆ دەکا. تۆ ئەو هەستانەوە و کڕنووش و ئەو چتانەی وەك سەما و جووڵە و ئەو چتانە لە حەقیقەتدا ئەمە هیچ هەستێکی ئێستاتیکییان تێدا نییە، بەلام دوایی دەبینی مەسیحایی کڵێسەی دروست کردووە، خۆی کڵێسەکە لە بنچینەدا بۆ ئەوەیە کە جێگایەك لە شێوەی چارمێخەکێشانی حەزرەتی عیسادا ڕۆیندرێ و ئازارەکانی مەسیحی تێدا بەرجەستە بکا، بەلام تۆ دەبینی جۆرەها سیرامیك و نەخش و نیگار و هونەر لەنێو ئەو کڵێسەیەدا دروست کراوە کە تۆ وا دەزانی پێشانگای هونەرییە، ئەوە لە چییەوە هاتووە؟ هەر لە ڕێگای ئەو جووڵە تەقلیدییەوە پەیوەندییەك پەیدا بوو کە مرۆڤ لە کاتی

خودابەرستیدا هەستی کردووە کە ئەوە خۆشیشە. کەسێ قورئانی خوێندووە، لە سەرەتاوە قورئان خوێندن ئەوە نەبووە تۆ وەك گۆرانیی بڵێی. هەرگیز تەجوید [1] نەبووە. بە "مقامات" نەخوێندراوە، بەڵام دوایی وردە ـ وردە کە ئەویش هەر بە ڕێکەوت بیری کردۆتەوە بۆچی وەکو بەیات و حیجاز و ئەوانە نەیخوێنێ و نەیکاتە گۆرانی؟ ئەو قۆناغی قورئان خوێندنە، بێگومان قۆناغێکی گەشەکردووە. قۆناغی دوالیزم، "ثنوية"ە کە تۆ خۆشت ببی بە دوو چت، هەموو چتێکیش بە دوو چت بزانی ئینجا بۆ خۆت دەکەویتە گێوکاڵی جۆرەها خەیاڵات هۆنینەوە و جۆرەها تەسەووڕات. لێرەدا بنچینەی کارەکە کە ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە ئامانج و پێداویستییە مادییەکەوە هەیە چییە؟ دروەنی بۆ ئەوەی بتوانن هەموو پێکەوە داسەکانیان دلوەشێنن و گەوز لێ بدەن و سواڵە بکەن و لەسەر یەکدی دابنێن، بەکرەیی بڵێن. ئەمە بۆ ڕێکخستنی جووڵەی دەست داوەشاندن و دروێنەکە، واتە: جووڵاندنی ماسولکەکان لەگەڵ ئامێری داسدا. بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەبینی ئەو جووڵە تەقلیدییە زەوقێکیشی لێ وەردەگیرێت، واتە: مۆرکێکی ئێستاتیکیش وەردەگرێت و دەبێ بە هونەریش؛ چونکە مادام چێژی ئێستاتیکی لێ وەردەگیرێت، واتە: خۆشی لێ دەبینی ئەو خۆشییەی کە تۆ هەستی پێ دەکەی، ئینجا خۆشییەکە لە سوجدە بردندا، لە دروێنەدا، لە بیاباندا قەتارە وشتر ئاژۆتن "حداء"دا، ئەوەی کە کراوە بە شیعاری سوعوودییە لە ڕادیۆکەیاندا.. دەڵێن گۆیا تەواوی شیعری عەرەبی لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەوەش هەر ئەوە نییە "حادی" حوشترەکانی پێ داژوێ، بەڵکو زەوقیشی لێ وەردەگرێ؛ هەر لەبەر ئەوەیە ئێستا بۆتە گۆرانی. ئەمە لێرەدا سەرەتایەکە بۆ ئەوەی

---

[1] وشەی "جوَد" بە زمانی عەرەبی بە مانای "ترتیل" نەهاتووە. ئەم وشەیە بە ئەسڵ ئاڤێستاییە، "گات"ە، گات بووگە وە "گاە" واتە: "مقام". وەك::( یەك گاە، دو گاە، سێ گاە، چوارگاە و هتد ). پاشان عارەب "گات"ی عەرەباندووە و کردوویە بە "جاد" و "جوَد ـ یجوَد"ی لێ داتاشیووە و بووگە بە ناوی ئەو زانستەی کە بە عارەبی :"هو العلم الذي يعرف به إعطاء كلّ حرف في القراءة حقّه و مستحقّه من إدغام وإظهار وإخفاء وإقلاب وقلقلة و مدٌّ و وقف و إشمام و إشباع وإلخ"ە.

ئێمە بزانین بە ڕێکەوت ئەم چتانە پەیدا بوو.... بەڵام کە وەختێك لە چەرخی بەردینی خۆڕسککەرییەوە دێینە چەرخی بەردینی نوێ، ئینجا کارەکە دەگۆڕێ. ھەنگێن کارەکە ئەوە نییە تۆ ھەر وێنەی ئاژەڵێکی کێوی بکێشی و بەس، لێرەدا تۆ واز لە وردەکارییەکانی دێنی؛ چونکە پێت وایە ھەموو چتێك، مادام گەیشتنە قۆناغی ئەبستراکت ئەوجا خەتی ھیرۆگلیف پەیدا دەبێ. ئەم خەتە لە پێشدا وێنەیە.. ئەگەر کەسێ ویستبای بڵێ: ماسی، وێنەی ماسییەکی دەکێشا. ئەوە ھی قۆناغی چاخی بەردینی کۆن. بەڵام ئەو ڕەسمی ماسییە دوایی تەنھا دەبێتە ھێمایەك لەو ڕەسمە، تەنھا "ن" دەمێنێتەوە. "ن" بە زمانی فینیقی و عیبری و بە ھەموو زمانەکانی سامی بەمانای ماسییە. ئەم نوونە تەنھا چاوی ماسییەکەیە ماوەتەوە. مانای وایە ئەتۆ وردە ـ وردە کلك و گوێی ماسییەکە دەکەی و تەنھا چاوی دەھێڵیتەوە، مانای وایە تۆ ھێمات بۆ دۆزییەوە، واتە: ھەموو چتەکە بە جوزئییاتی لەشەکەوە ھەمووی کورت دەکەیەوە و یەك چتی لێ دەھێڵییەوە کە چاوەکەیەتی و دەبێ بە نون. ئەمە پرۆسەی تەجریدە. ئەم عەمەلییەتە مانای چییە؟ تۆ سەدەھا چت، ھەمووی خەست بکەیتەوە لە یەك ڕەمزدا و بکەیتە قۆناغی گوزارشت کردن بە ھێما. باشە، لە ئەدەبیاتدا چی پەیدا بوو؟ مەجاز پەیدا بوو، کینایەت پەیدا بوو، کینایەت مانای چییە؟ کینایەت ئەوەیە تۆ ڕاستەوخۆ گوزارشت لە چتان نەکەی.... ئەتۆ ھەروا بیر لە خرخاڵ و بازن و گوارە و ملوانکە و خەزێم و ئەم جۆرە چتانە بکەوە..... ئەمانە ئەوڕۆ ھەموو بۆ ڕازاندنەوەی ژنان بەکاردەبرێن، بەڵام ڕۆژگارێ ھەر یەکە بۆ چتێکی پێویستی ژییەکی بەکاردەھێندرا، کە ئەویش ژن وەکو ئاژەڵ ھەوسار لە ملکردن و پێ بە سندمەوە بەستن و بۆ لەدووخۆدان ئاڵقە لە گوێ کردن و ھتد.... بوو.

پ

ح



خ

ش

ک

گ



ل

ن



و

## ی